


# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز

بەرگی چوارەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی چوارەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا

---

**لەئایەتی(٤١)ی ئەم سوورەتەوە دەست پێئەکەین بە جزمی دەیەم بە یارمەتی و پشتوانی خوای میهرەبانمان، ئەم جزمە لەم ئایەتەوە دەست پێئەکات تا ئەگاتە ئایەتی(٩٣) لەسوورەتی(التوبة).**

**بەشی یەکەم لەم سوورەتەی کە تێپەڕیکرد چەند شتێکی گرنگی نیشاندا لەبارەی ڕووداوی بەدرەوە، لە یەکەم جارەوە باسی دەست کەوتەکانی جەنگەکەی کرد کە ئاژاوەی تێدا پەیدابوو کە مافی کێیە، ئینجا خوا لەدەستی هەمووی سەندنەوەو گێڕایەوە بۆلای خۆی و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، ئینجا بانگی هەمووانی کرد بۆلای لە خواترسی و خۆپارێزی لە هەرشتێ کە مایەی خەشم و ناڕەزایی خوایە، ئینجا بارو شێوەی بڕوای ڕاستەقینەی نیشاندان و ڕێنموونی کردن تا بەرزببنەوە بۆ ئەو ڕادەو پلە بەرزە، ئینجا تەگبیرو بڕیاری خوای بۆ دەرخستن لەو جەنگەدا کە ئەوان ئاژاوەیان پەیداکرد لە دەست کەوتەکانیدا، بەشێك لە هەڵوێستەکانی خستە بەرچاویان، کە دەرکەوت بۆیان تەگبیرو یارمەتیەکان هەمووی لە لایەن خواوەیە، ئەو جەنگە هەربۆ بەدیهێنان و پێك هێنانی خواست و ئیرادەی خوایە، ئەوان هیچ نین بێجگە لەوەی کە چەك و کەرەستەیەکن بەدەستی قودرەتی خواوەو لەسەر دەستی ئەواندا کارەکە فەراهەم ئەهێنێ، ئینجا داوای خۆگری و دامەزراوی لێکردن، دڵنیای کردن بە کۆمەکی و یارمەتی دانیان، بەژێرخستن و سزادانی دوژمنەکانیان بەهۆی گوناهو تاوانەکانیانەوە، فەرمانیدا بە موسڵمانەکان کە جەنگ و کوشتار بکەن تا هێزی بێبڕواکان بشکێنن و نەتوانن ئازاری کەس بدەن لەسەر ئایینەکەی و ملکەچ کەن بۆ بەرنامەو یاسای خوا، هەروەها لەبەشی دووەمی سوورەتەکەدا هەر لەو باس و مەسەلە ئەدوێ، لە یەکەم جارەوە دەست پێئەکات بەباسی بڕیاری خوا لەو دەستکەوتانەدا، ئینجا بانگی بڕواداران ئەکات بۆ بڕوا بە خواو بەوەی هێنایە خوارەوە بۆ سەر بەندەکەی لەو ڕۆژەدا کە**

هەق‌و ناهەق‌و چاك‌و خراپی تێدا جیاكرایەوە، ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ تەگبیرو بڕیاری خوا لەو جەنگەدا كە ئەو دەست كەوتانەی بۆ هێنان، بەشێكی تر لە هەڵوێستەكانی ئەو جەنگە ئەخاتە بەرچاویان كە ئەو تەگبیرو بڕیارەی تێدا ڕوون ئەبێتەوە، دەرئەكەوێ كە ئەوان چەك‌و كەرەستەیەك بوون بەدەست قەزاو قەدەری خواوەو بەوان كارەكەی فەراهەم هێنا، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا فەرمان ئەدات بە خۆگری و دامەزراوی لەكاتی جەنگ‌و تێڕژانەكەدا، بانگیان ئەكات بۆلای باس‌و یادی خوا، بۆ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی(ﷺ)، ئینجا ئەیان ترسێنێ لە ئاژاوەو دووبەرەكی تا بەهۆی ئەوەوە نەترسن‌و نەشكێن، بانگیان ئەكات بۆ خۆگری‌و خۆپارێزی لە كەشخەو ڕووپامایی لە تێكۆشانەكەیاندا، ئەیان ترسێنێ بە دمواڕۆژی ڕەشی ئەوانەی كە بە كەشخەو ڕووپامایی‌و خۆ بە زل زانی دەرچوون‌و هاتن تا خوا ئەوەی بەسەر هێنان‌و دووچاری سەرشۆڕی هەردوو جیهانی كردن، هەروەها ئامۆژگاریان ئەكات بە چەند شتێكی گەورەو گرنگ وەك بەیارمەتی خوا ئاگادار ئەبین پێیان لە ئایەتەكاندا، وە لەكاتی خۆیدا دەست نیشانی ئەكەین بەو شتە گرنگانە، بەم كورتەیە كۆتایی ئەهێنین‌و ئەڕۆین بۆ ژێر سایەی ئایەتەكان. لەیەكەم جارەوە مولكایەتی ئەو دەست كەوتانەی داڕنی لە موسڵمانەكان‌و گێڕایەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەكەی(ﷺ) تا كارەكە پاك‌و خاوێن بێ بۆ خواو پێغەمبەر(ﷺ) تا موسڵمانەكان پاك‌و خاوێن بن لە هەموو نیازو مەبەستێك بێجگە لە نیازو مەبەستی گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەری خواو هەر لە ژێر ئاڵای خوادا جەنگ‌و كوشتار بكەن‌و فیداكاری بكەن بە ماڵ‌و بە گیانیان، هەر ئەو بكەن بە حاكم‌و كاربەدەست لە گیانیان‌و لە سامانیان، بەبێ هیچ جۆرە ڕەنخنەو ملە جەڕەیەك كە بڕوای ڕاستەقینە ئەوەیە، لە یەكەم جارەوە ئەو مولكایەتیەی لێ سەندن‌و ڕووتی كرن لە هەر نیازو مەبەستێكی دەست كەوت‌و بەرژەوەندی ئەم جیهانە، تا بەتەواوی مل كەچ بوون‌و خۆشنود‌و ڕازی بوون بە حوكم‌و بڕیاری خوا، بەهۆی ئەوەوە بڕوای ڕاستەقینە جێگیرو دامەزراو بوو لە دڵیاندا، لەو كاتەدا گەڕایەوە سەر سەریان چوار لەسەر پێنجی دەست كەوتەكانی بڕیاردا بۆیان‌و یەك لەسەر پێنجی هێتەوە بۆ خۆی‌و

پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، فەرمووی: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ﴾ بزانن ئەوەی کە دەست کەوتان بووبێ بەزۆر بە ماڵو سامانی بێبڕواکان لە جەنگ دا ئیتر لە هەر شتێك ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾ هەقو پێویست ئەمەیە کە یەك لەسەر پێنج بۆ خوایە، ﴿وَلِلرَّسُولِ﴾ بۆ پێغەمبەرە(ﷺ) ﴿وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ بۆ خزمی زۆر نزیکیەتی کە خۆی لە حەدیسێکدا دیاری کردن بە نەوەو بەچەکانی هاشمو موتەلیب، ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ وە هەتیوەکان ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾ وە هەژارەکان ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ وە میوانو ڕێبوارێ کە بێنەوا بێتو داماو، کۆمەڵو جەماوەر لەسەر ئەوەن کە بەشی تایبەتی دانانرێ بۆ خواو ناوبردنی خوا بۆ پیتو فەڕ وەرگرتنە، کەواتە ئەو پێنج یەکە ئەکرێ بە پێنج بەشەوە، هێدێ لەسەر ڕووکەشو ڕواڵەتی ئایەتەکەن، کەواتە پێنج یەکەکە ئەکرێ بە شەش بەشەوەو بەشی تایبەتی بۆ خوا دیاری ئەکرێو ئەدرێ بە پێغەمبەر(ﷺ) بەلای هێندێکەوەو بەخت ئەکرێ لە پێویستیاتی کەعبەدا بەلای هێندێکی ترەوە، لەبارەی دابەش کردنی ئەو پێنج یەکەو چۆنێتیەکەی شەش ڕا هەیە با تەماشای کتێبەکان بکرێ بەتایبەتی تەفسیری(منار) کەبە درێژی باسەکەی هێناوەو ڕای زانایانی باس کردووە خوا پاداشتی خاوەنی بداتەوە، بە پێویستم نەزانی ئەو باسە درێژبکەم هەرکەس ئەیەوێ با خۆی ئەو زەحمەتە بکێشێو تەماشای ئەو جۆرە کتێبانە بکات، ئینجا ئەو بڕیارە بەهێزتر ئەکاتو دڵنیایی لەسەر ئەکات بەمەی ئەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ﴾ واتە بزانن کە یەك لەسەر پێنجی ئەو دەست کەوتانە بەو جۆرە دابەش ئەکرێ، کەواتە بڕوادارەکان بەتەمای نەبنو ڕازی بن بەو چوار لەسەر پێنجەی کە بۆ خۆتان ئەگەر ئێوە بڕواتان هێناوە بە خوا ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ بەوەی کە ناردمانە خوارەوە بۆ سەر بەندەکەمان، واتە محمد(ﷺ) مەبەست بەوەی کە هێنایە خوارەوە ئەو ئایەتانەو ئەو فریشتانەو بەو سەرخستنو زاڵکردنەیە کە پەروەردگار بەخشیو گەیاندی لەیەکەم جارەوە بە بەندە بەڕێزەکەی، ئینجا بە بڕوادارەکان لەژێر ئاڵاو سەرکردایەتیەکەی ئەودا، کە بەوانەی بەخشیو گەیاند ﴿يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ﴾ لە ڕۆژی جیاکردنەوەدا،

﴿يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ ئەو ڕۆژەی کە دوو دەستەو کۆمەڵەکە گیشتن بەیەکو تێک ڕژان، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی جەنگی بەدر بوو کە خوا کردی بە هۆی جیاکردنەوەی هەق لە ناهەق، هەق و ناهەق لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، جیاکەرەوەی هەق بوو لە ناهەق لەکانی دڵدا، جیاکەرەوەی بڕوای بە تاکو تەنیایی خواو جێگیربوون چەسپاندنی ئەو تاکو تەنیایی یە لە دەروون و هەست دا، لە خو ڕەوشت دا، لەپەرستن و عیبادەت دا، جیاکەرەوەی ئەو تاکو تەنیاییيە لە هاوبەش ڕەوادان لە هەموو شێوەو جۆرەکانی دا کە پەرستن و بەندەیی دەروون ئەگرێتەوە بۆ هەرشتێکی تر بێجگە لە خوا ئیتر هەرکەس و هەر شتێ. جیاکەرەوەی ئەو هەموو بەندەیی و پەرستنەبوو کە جیهانی داگیر کردبوو، لە گەڕانەوە هەر بۆلای خوای تاکو تەنیاو گێڕانی تەنها خوا بە حاکم و کاربەدەست و دانەرو داهێنەری شەرع و یاساو بەرنامە، تا بەهۆی ئەوەوە سەری بەندەییان بەرز بوویەوەو دانەخراو کەچ نەکرا بۆ غەیری خواو حاکمێتی شەریعەت و یاسای خوا، ئادەمی و ئادەمێتی ئازادی وەرگرت، بەڵێ ئەو ڕۆژە جیاکەرەوەی دوو چەرخ و سەردەم بوو لە مێژووی ئیسلام دا: چەرخ و سەردەمی خۆگری و چاوەڕوانی، چەرخ و سەردەمی هێزو بزوتنەوەو ڕاپەڕین، ئیسلام بەمەی بۆچوونێکی تازەبوو بۆ ژیان، بەرنامەیەکی تازەبوو بۆ بوونی ئادەمی و بوونێکی ئادەمیانە، ڕژێمێکی تازەبوو بۆ گەل و کۆمەڵ، شێوەیەکی تازەبوو بۆ میرو دەوڵەت، بەوەی جاڕدانێکی گشتی بوو بۆ ئازادکردنی مرۆڤو ئادەمی لە زەوی و جیهاندا بە چەسپاندنی خوایەتی خواو حاکمێتی خوا بەتاکو تەنیا، نوڕدان و فڕێ دانی هەموو زۆرو سەرکێشەکان کە خوایەتی و حاکمێتی خوایان داگیر کردبووو داگیری ئەکەن، ئیسلام کە بەو جۆرە بێ و بۆ ئەوە هاتبێ ئەبێ هێزو بزووتنەوەو ڕاپەڕینی هەبێ چونکە خۆی بۆ ناگیرێ هەروا بەبێ دەنگ و بەبێ دەرکەوتن، واز ناهێنێ بەوەی تەنها بیرو باوەڕێکی دەروونی بێت و دەرکەوتنی تەنها لە عیبادەت و پەرستن و هێندێ

خوو ڕەوشت دا بێت، ئەبێبەوە كۆتایی نەمێنێ، بەڵكو ئەبێ ڕاپەڕێو بكەوێتە تێكۆشان بۆ پێك هێنانو بەدی هێنانی بۆچوونی تازەو بەرنامەی تازەو دەوڵەتی تازەو گەلو كۆمەڵی تازە، ئەبێ ڕێگاكانی پاكو خاوێن بكاتەوە لە هەر چڵو چێوو دارو بەردو كۆسپو گرێو ڕێگرێك، هەروەها جیاكەرەوەی دوو چەرخو سەرەم بوو لە مێژووی ئادەمیدا، بێگومان كۆمەڵی ئادەمی لەپێش هاتنی ئیسلام دا كۆمەڵێكی زۆر دوورو جیاوازی بوو لە گەلو كۆمەڵی پاش هاتنی ئیسلام، وەك دوژمنیش شایەتی داو ئەدا لەسەر ئەوە، ئەو بۆچوونە تازەی كە ئەو ڕژێمە تازەی لێ هەڵقولا، ئەو ڕژێمە تازەی كە هەڵقولا لەم بۆچونە، ئەو گەلو كۆمەڵەی كە نموونەو نوێنەری پێك هاتنی ئادەمییەكی تازەبوو، ئەم بیرو باوەڕە گرنگەی كە ژیانی لەسەر دامەزرا، ڕژێمی كۆمەڵاتیو یاساو قانونی لەسەر بەرپا بوو، ئەو هەموو خێرو بەرەكەتە تەنها بۆ ئەو موسڵمانانە نەبوو نەمایەوە، بەڵكو بەرەبەرە پەرەی سەند بۆ جیهانو ئادەمی، هەموو پێ گۆڕا چ لە وڵاتی ئیسلامو چ لەدەرەوەی خاكی ئیسلام دا، ئیتر بەهۆی دۆستایەتیو تێكەڵی ئیسلامو موسڵمانان یان بەهۆی وژمنیایەتییان، ئەو صەلیبیانەی كەلە ڕۆژئاواوە هاتن، بۆ ئەوەی جەنگ بكەن لەگەڵ ئیسلام داو لەناوی بەرن لە جێو شوێنی خۆی دا، باوو ڕەوشتی پاكی ئەو گەلو كۆمەڵە موسڵمانەیان وەرگرتو بەهەرەمەند بوون پێی، گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان ڕژێمی دەرەبەگی كە پیس ترین شێوەی باو بوو لەناویاندا، ئەو ڕژێمەیان لەناوبرد، لە پاش ئەوەی لە وڵاتی ئیسلام دا ئەو ئەندازە ڕژێمی كۆمەڵایەتی ئیسلامەیان بینی كەبەو كەمو كوڕیە مابووەوە لەناو موسڵماناندا! تەتار كە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتن بە جەنگ كردنو لەناوبردنی ئیسلام بە هاندانی ئەو جولەكەو صەلیبیانەی كەلە وڵاتی ئیسلام دا بوونو ئیسلام ئازادیو سەربەستی پێدابوون! ئەو تەتارانە ئەوەندەی پێنەچوو عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامیان وەرگرتو گرتیانە گەردن، بوون بە هەڵگری ئاڵای ئیسلامو بڵاویان كردەوە لە بەشێكی تازە لە زەوی جیهاندا، خەلافەتی ئیسلامیان دامەزراندو لە جەرگەی ئەورووپادا بۆ ماوەی پێنج چەرخ واتە لە چەرخی پانزەهەمی زاینی تا چەرخی

بیستەم! بەهەرحاڵو لەسەر هەربار هەموو مێژووی ئادەمی ـ لە ڕووداوی بەدرەوە ـ سوود بەخشو بەهرەمەندبوو بە پیتو فەڕی ڕۆژی بەدر ئیتر لە وڵاتو خاکی ئیسلامدا یان لەو خاکو وڵاتانەی کە دوژمنو دژی ئیسلام بوون. بەڵێ ئەو ڕۆژە ڕۆژی جیابوونەوە بوو لە نێوان بۆچوونی هۆی سەرکەوتنو زاڵبوونو بۆچوونی هۆی ژێرکەوتنو ڕیسوابوون، ئەوە بوو شکانو ژێرکەوتنو ڕیسوابوون ڕووی کردە بێبڕواکان لەکاتێکدا کە هەموو هۆی زاڵبوونو سەرکەوتن لای ئەوانو لە ڕیزی ئەواندا بوو، بەدیمەنو ڕواڵەت هەموو هۆی ڕیسوابوونو ژێرکەوتنو شکانو تێکشکان لای موسڵمانەکانو لەڕیزی ئەماندابوو، بەجۆرێ ناپاکو بێبڕواکانو دڵ نەخۆشەکان گاڵتەیان ئەکرد بە موسڵمانەکانو ئەیانگوت: ئەمانە هەڵخەڵەتاونو ئایینەکەیان هەڵی خەڵەتاندون، خوا ویستی کە جەنگو بەربەرەکانیەکە لەسەر ئەو بارەبێت، کەئەو جەنگە یەکەم ڕووداو بوو لە نێوان کۆمەڵی زۆر بەهێزی بێبڕواو کۆمەڵی کەمی لاوازی بڕوادار تا ئەوە ببێ بە جیاکەرەوەی ئەو دوو بۆچوونو بڕیارە، تا بەهۆی ئەوەوە دەرکەوێ کە سەرکەوتنو زاڵبوون بۆ عەقیدەو بیروباوەڕی پاکو چاکە، نەك بۆ تەنها چەكو ژمارەی زۆرە، تا دەرکەوێ کە پێویستە خاوەنی عەقیدەو بیروباوەڕی ڕاست پەلامار بداتو تێ جەنگێ لەگەڵ ناهەقو چاوەڕوانی ئەوە نەبێ کە یەکسان بن لە چەكو ژمارەدا، چونکە ئەمە هێزی گەورەتری لایە کە هێزی بڕوا ڕاستەکەیەتی، ئەوەش قسەی ڕووت نییە بەڵکو شتێکە بە چاو بینراوە.

لەپاش ئەوانەی کە باسکران بەڕاستی ڕووداوی بەدر جیاکەرەوەی هەق بوو لە ناهەق لەبارێکی تریشەوە: ئەوەی کەلە ئایەتی(٧-٨)دا دەست نیشانی بۆ کرد: ﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ ﴾ وەك تێپەڕی کردوو تەفسیرمان کردەوە بێگومان ئەو موسڵمانانەی کەلە مەدینە دەرچوون بەنیازی ئەو کاروانەوە دەرچوون کە شتێکی زۆر قەڵەوبوو، هەنگوینی مێش بوو بەڵام خوا ئیرادەی شتێکی تریکرد، خوا ئیرادەی کرد ئەو کاروانە دەرباز بێو ئەمان کارە زۆر گرانو قورسەکەیان بۆ ببێ کە ئەو جەنگە گەورەو سامناکەبوو،

وەك دەست نیشانیکرد بۆ هۆی ئەوە کە فەرمووی: ﴿لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ﴾ بۆئەوەی هەق بە هەق دەربخات و نیشانی بدات و ناهەق بە ناهەق دەربخات و ئاشکرای بکات، کەئەوەش مایەی خۆش بەختی هەردوو جیهانەو بەهرەیەکی گەورەیە، هەرچی لاری و ئالەباری و بەد بەختی بووەو هەیە لە جیهاندا، هەموو سەرەنجامی ئەو دەرنەکەوتنەی هەق و ناهەقەیە، ئینجا پێویستە بیربکەینەوە لەو مەبەستە گەورەو گرنگەی ئەو فەرموودە کورتەی دەست نیشانی بۆ ئەکات، بێگومان بەڕوونی بۆمان دەرئەخات کەئەو هەق و ناهەقە دەرناکەوێ و بەدی نایەت لەناو گەل و کۆمەڵدا تەنها بە باس و گوتن و ڕێنموونی بۆ کردن، بەڵکو پێویست ئەکات بە شکاندن و نەمێشتنی هێزو دەسەلاتی ناهەق و بەهێزکردن و بەرزکردنەوەی ئالای هەق، کەئەوەش ئەبێ کە لەشکری هەق زاڵببێ و سەرکەوێ بەسەر لەشکری ناهەقدا، ئەو هەق و ناهەقە دوانزە سیانزە ساڵ باسکراو ڕێنموونی بۆکراو هەوڵ و تێکۆشان کرا بۆ دەرخستنی هەر دەرنەکەوت و ئاشکرا نەبوو تا ئەو ڕۆژە هات و ئەو ڕووداوە ڕوویدا، کەواتە لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژە جیاکەرەوەی هەق بوو لە ناهەق، لەو ڕۆژەدا هەق بەهەق دەرکەوت و ناهەق بە ناهەق، بەڵێ بەڕاستی ئەو ڕۆژە بوو بە جیاکەرەوە لە بەرنامەی ئەم ئاینەدا، سروشت و هەقیقەتی ئەم ئایینە ئەو ڕۆژە ڕوون بوویەوەو دەرکەوت لە هەست و دڵ و دەروونی موسڵماناندا، ئەمڕۆ کەئەو هەموو شل و شۆڵی و بێسەرو پێی و پەراکەندەییە ئەبینین لەناو موسڵماناندا، بۆمان دەرئەکەوێ بەڕوونی کە چارەسەر ئەوەیە هەر ئەو ڕێگایە بدرێتە بەر کەئەو موسڵمانانەی لەسەر بوون و دایانە بەر لەو ڕۆژەدا، ئەو ڕۆژە پیرۆزە ڕۆژی جیاکردنەوە بوو لە هەموو بارو ڕوویەکەوە کە گوتراو دەست نیشانی بۆکرا، لەو ڕۆژەدا وێنەو نموونەیەك لە توانین و دەسەلاتەکەی خوا دەرکەوت، بە جۆرێ هیچ کەس ناتوانێ دەمە دەمێ و دەمبازی تێدا بکات، ئەو ڕووداوەو بەدی هاتنی هیچ هۆیەکی نەبوو ئەمە نەبێ کە لە کۆتایی باسەکەدا فەرمووی: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خوا تواناو دەسەلاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا.

وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ

---

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر باس و نیشاندانی ئەو ڕۆژو ڕووداوە بە شێوەیەکی زۆر نایاب، لە ئامادەکردنی چەشمەندازو هەڵوێستەکانی، لەسەر ئەو بارو شێوەی کە ڕوویداو بەدی هات، هەرکات بیری لێبکرێتەوە وەك لەو کاتەدا بەبەرچاوەوە بێت وایەو وەك بەئاشکرا دەستە قودرەتەکەی خوا بەچاو ببینرێ کە کارەکە فەراهەم ئەهێنێ و تەگبیری ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ﴾ واتە باسی ئەو کاتە بکەن کە ئێوە لەتەرەف و قەراغی شیوەکەدابوون کەنزیك بوون لە مەدینەو بەرەو مەدینە بوو، لەشکرەکەتان بەوێدا خستبووی، ئەوانە واتە بێبڕواکان لەتەرەف و قەراغێ بوون کەبەرەو مەککەبوو دوور لە مەدینە بوون و لەشکرەکەیان لوێدابوو ﴿وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ﴾ کاروانەکە لە شوێنێکدا بوو لای خوارو نزم تر لە ئێوەو بەرەو قەراغی دەریای سوور، لەنێوان هەردوو لەشکرەکەدا گردو تەپۆڵکەیەك هەبوو جوێی کردنەوە، خوای میهرەبان سەرنجی موسڵمانەکان ڕائەکێشێ و ئەیخاتەوە بیریان ئەو بارو حاڵە سەختەی کەلەسەری بوون کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خوا سەری خستن، بێگومان لەشکری موسڵمانان، وەك خۆیان ئەزانن لە یەکەم جارەوە لە ئەوپەڕی ترس و لاوازی دا بوون، لەبەر کەمی خۆیان و کەرەسەو چەکیان، لەبەر ئامادەنەبوونیان بۆ جەنگ، لەشوێنێکدا بوون دوور لە ئاو بوو، هەروەها لم بوو لە ڕۆشتن و گەڕان تێیدا زۆر ناڕەحەت و سەخت بوو، بەڵام بە پێچەوانە لەشکری بێبڕواکان کەلە خۆشی و کەشخەدا بوون بەهۆی زۆری خۆیان و چەك و کەرەسەو خۆراك و پێویستی تریان، نزیك بوون لەئاو و شوێنەکەشیان چاك بوو بۆ هات و چۆو گەڕان، بوونی کاروانەکەش لە دوورەوە مایەی هێزی دڵنیابوو و هاندەرێکی بەهێزبوو بۆیان لەسەر تێکۆشان بۆ پارێزگاری کردنی، وەك لە لایەکی ترەوە بەهۆی دوور کەوتنەوەو قوتاربوونی بێباك بوون و مەترسییان لێ نەئەکرد، کەواتە دڵشادو شادمان بوون، هیچ کام لەو دوو لەشکرە ئاگایان لەویتر نەبوو، بەبێ نیازو زانینی خۆیان خوا لەو شوێنەدا کۆی کردنەوە بەم دیووو ئەو دیووی ئەو گردو تەپۆڵکەدا، تەنانەت ئەگەر لە پێشەوە بیانزانیایە لەبەر بەڵێن و وادە

بوونایە ئەو گەیشتن بە یەکە بەو جۆرو شێوەیە نەئەچوون بە دەم بەڵێن و وادەکەیانەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ﴾ ئەگەر ئێوەو ئەوان بەڵێنتانە بدایە بەیەکتر بە کۆبوونەوەو ڕووبەڕووەوەستان لەو جێ و شوێنەدا بێگومان نەئەچوون بەدەم وادەو بەڵێنەوە بە پێچەوانەوە ئەجووڵانەوە، ئێوە نەئەچوون، چونکە مەترسیتان ئەکرد لەوان بەهۆی هێزو دەسەڵاتی ئەوان کە بەرواڵەت چەند قاتی ئێوە بوون، ئەوانیش لەبەرئەوەی خوا ترسی خستبووە دڵیان و هێندێکیشیان ئەیانزانی کە خۆیان لەسەر ناهەقن و جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەر(ﷺ) ناکرێ کەواتە بەبێ نیازو زانینی خۆیان خوا ئەوەی ڕێکخست و فەراهەمی هێنا، ئەگەر بەپێی نیازو زانینی ئەوان بوایە کارەکە بەو جۆرە نەئەهات، ﴿وَلَٰكِن﴾ بەڵام بەو جۆرو شێوەیە هات ﴿لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ بۆ ئەوەی خوا کارێك بەجێبێنێ کە کراوو بەدی هاتووە لە زانینی خۆیدا، لەپێشەوە، یا بەجێی بێنێ کارێك کە شیاوو شایانە بۆ بەدیهێنان، ئەو کارەش ئەمەی: ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ﴾ بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کە لەزانین و بڕیاری خوادا تێدا چووەو بە کوژراوو مردوو دانراوە با تێدا بچێ و نەمێنێ بەزانین و بەڵگەو موعجیزەوە، ئەوەی کەلە زانین و بڕیاری خوادا زیندوو بووەو بەزیندوو دانراوە با بژی و زیندوو بێت بەزانین و بەڵگەو موعجیزەوە، واتە ئەو ڕووداوەی بەدرە موعجیزەیەك بوو لە موعجیزەکانی خوا، دەستی قودرەتی خوای تێدا ئاشکرا بوو کەواتە ئەو کەسەی کەلەو ڕووداوەدا تێداچوو، چاك بێ یان خراپ بەڕوونی بارو حاڵی خۆی ئەزانێ، ئەوەی کە خراپ بووە هیچ بڕو بیانوویەکی بەدەستەوەنییە، هەروەها ئەو کەسەی کە نەمردو قوتار بوو بە زانینەوە ئەژی و هەق و ناهەقی بەلاوە ئاشکرایە، لەپاش ئەو ڕووداوە هەرکەس بڕوانەهێنێ سەرکێشی بەکار ئەهێنێ و هیچ بڕو بیانوویەکی بە دەستەوە نییە، ئەگەر بەپێی ڕووکەش و ڕواڵەتەکە ڕەفتار بکەین بەو جۆرە تەفسیری ئەکەینەوە، ئەگەر لەڕواڵەت و ڕووکەشەکە لابدەین، بەم ڕەنگە بڵێین: مەبەست لە تیاچوون بڕوا نەهێنانەو مەبەست لەزیندوو بوون بڕوا هێنانە ـ لەڕاستیدا ئەمەش بەهێزو جێگیرە لە دڵدا ـ ئەو کاتە ئەڵێین: خوا ئەو ڕووداوەی بەو جۆرو شێوەیە بەرپا کرد و ئەو موعجیزەی نیشاندا، تا ئەوەی کە بڕوای نەهێنا هیچ بڕوو بیانووی نەبێ و هیچ نیشانەو بەڵگەیەکی نەبێ لەسەر بێبڕواییەکەی و هەر سەرکێشی بەکاربێنێ، ئەو کەسەی کەبڕوای وای هێنابێ بە بەڵگەو ڕابەرو نیشانەیەکی ئاشکراوە بڕوا بێنێ و بەو بڕوا بەهێزەوە بژی.

وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾

---

﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا بیسەری زانایە بە ئەو پەڕی ڕادەو پلەی بیستن‌و زانین، کەواتە هیچ شتێ لەکردارو وتارو نیازو مەبەستی ئەوانە شاراوەو پۆشیدەنییە لە خواو بەپێی ئەو ڕەفتاری کرد لەگەڵ هەر دوو دەستەو تاقمەکەدا، ئینجا هێندێکی تر لەتەگبیرو کار دروستی خوا نیشان ئەدات لەو ڕووداوەدا، ئەوەش ئەمەیکە ئەفەرموێ: ﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە خوا بێ بڕواکانی نیشاندا لە خەوەکەتدا بە کەم‌و ژمارەیەکی کەم کە هێزو نرخێکیان نەبێ دیارە کە ئەو خەوەی گێڕایەوە بۆ موسڵمانەکان دڵشادو دڵنیا بوون، چونکە بڕوایان بە ڕاستی خەوەکە بوو، بێگومان خەوەکەش ڕاست بوو، چونکە هەرچەند ئەوانە لە دیمەن‌و ڕواڵەتدا زۆر بوون بەڵام لە ڕاستیداو لە ترازووی خوادا کەم بوون، چونکە هێزی خوایان لەگەڵ نەبوو، بە هێزی خوا هێز پەیدا ئەبێ بۆ هەر هێزدارێك، ﴿وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ ئەگەر ئەوانەی بە زۆر نیشان بدایتایە، واتە تۆیش ئەو خەوەت بگێڕایەتەوە بۆ موسڵمانەکان، ئەوا پەکتان ئەکەوت‌و سەرپێچیتان ئەکرد لە جەنگکردن بە هۆی بیم‌و ترس لێیان، ئاژاوەو پەرتەوازەییتان بۆ پەیدا ئەبوو لە کارەکەداو لە بڕیاری جەنگدا، بەم ڕەنگە ئەوەی کە دڵی لاواز بوو نەئەهاتە پێشەوەو لەوانە بوو بە هۆی ئەوەوە کەسانی تریش نەیەنە پێشەوە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ﴾ بەڵام خوا سەلامەتی کردن‌و پاراستنی لەو ترس‌و ئاژاوەو پەرتەوازەییە ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا زانایە بە خەتەرەو نیازی دڵ، لەبەر ئەوە ئەو میهرەبانیەی کرد لەگەڵ ئەو دەستەو کۆمەڵە موسڵمانەداو پاراستنی لەو بەسەرهاتە بەدانە، لە پێش ئەوەی ئەو دوو لەشکرە بگەن بە یەك خوای میهرەبان ئەو تەگبیرو چارەسەرەی کرد بۆ موسڵمانەکان،

وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾

---

ئینجا له كاتی بەیەك گەیشتن‌و تێك ڕژان بەم جۆرەی كرد كە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا﴾ باسی ئەوە بكەن كاتێ گەیشتن بە یەك خوا ئەوانی لە بەرچاوتان بەكەم نیشاندا تا نەحەپەسێن‌و بیم نەكەن لێیان ﴿وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ﴾ ئێوەشی بەكەم نیشانداو خستنیە بەرچاویان تا بە گرنگ نەیانگرن‌و ئەوانیش هەموو هێزیان بەكار نەهێنن لە جەنگەكەدا، ئەو كاتە موسڵمانەكان بەبێ ترس‌و باك لێیان بدەن‌و بیانشكێنن. ﴿لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ خوا كارێكی وایكرد كە موسڵمانەكان بەچاوی هەقیقەت‌و ڕاستی ئەوان ببینن كە ئەوان لەڕاستیدا كەم بوون‌و بێبەش بوون لە هێزو یارمەتی خوا، موسڵمانەكانی نیشانی ئەواندا لەسەر ڕواڵەت‌و ڕاستەقینەكەی ئەمان لە ڕاستیدا ئەمانە ژمارەیان كەم بوو، بەو كار دروستی‌و لێزانییە كارەكەی برد بەڕێوە، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ هەر بۆلای خوا هەموو كارەكان ئەگێڕێنرێنەوە، هەر بەدەست خوایەو تەنها بە خوا ئەو كارانە ئەنجام ئەدرێ.

ئینجا ماتوڵ تەگبیری كارەكە هینی خوایە، یارمەتی‌و سەرخستن هەر بە دەست خوایە، ژمارەو زۆری چەك‌و كەرەسەو چەكدار كار ناكات بەبێ یارمەتی‌و ئیرادەی خوا، كەواتە با بڕواداران گوێ بگرن لەم بانگەوازەو گوێڕایەڵ بن بۆ ئەم فەرمانەو ئیتر باكیان نەبێ لە هیچ. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟﴾ كاتێ كە گەیشتن بە هەر دەستەو كۆمەڵێك لە دوژمن لە جەنگدا دامەزراوبن‌و خۆتان بگرن‌و ڕانەكەن ﴿وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ یادو ناوی خوا زۆر بەرن لەناو بەناوی جەنگەكەدا، ئیتر بە وتەی ﴿ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ كە زۆر باو بووە یان بەنزاو لالانەوە یان هەر جۆر كە پەیوەندی دڵی تێدا بێت بە پەروەردگارییەوە ﴿لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵكو بەئومێدێ ئەوە بگەن بە ئامانج، ئامانجی سەركەوتن‌و گەیشتن بە ئەجرو پاداشت‌و ڕەزامەندی خوا،

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾

---

﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ گوێڕایەڵو فەرمانبەری خواو فروستادەکەی بن لە هەر کارێك کە ئەیکەن یان نایکەنو وازی لێئەهێنن کەمێندێ لەوانە ئەم فەرمانو جڵەوگیریی یەیە کەلێرەدا ئاڕاستەی کردن، ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ﴾ ئاژاوەو دووبەرەکی مەکەن ﴿فَتَفۡشَلُواْ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە پەکتان بکەویو بەهۆی ترسو لاوازی دڵتانەوە نەتوانن پەلاماری بدەنو کارەکەتان ئەنجام بدەن، ﴿وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ﴾ هێزتان بڕواو نەمێنیو دەمارتان شل ببیو شەوکەتتان نەمێنێ، یان مەبەست باو نەسیمی سەرکەوتنە، چونکە سەرکەوتنو زاڵ بوون هەمیشە بەهۆی بایەکەوە کە خوا ناردوویەتی لەو کاتەدا. ﴿وَٱصۡبِرُوٓاْ﴾ خۆگربنو دان بە خۆتاندا بگرن لە کاتی ڕووداوو بەسەرهاتی سەختو بەتینـدا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆگرو دان بە خۆگران دایە بەکۆمەکیو یارمەتیدان، ئەمانەیە کار کەرو هۆی ڕاستەقینەی سەرکەوتنو زاڵبوون: دامەزراویو خۆگری لە کاتی گەیشتن بە دوژمن. پەیوەستی دڵ بە خواوە بەیادو باسو نزاو لاڵانەوە لێی، گوێڕایەڵیو فەرمانبەری خواو پێغەمبەر(ﷺ)و دوورکەوتنەوە لە ئاژاوەو دووبەرەکیو دان بەخۆدا گرتنو ئارامی لەسەر ئەرکو زەحمەتی جەنگو بەربەرەکانێ، ئینجا با یەکە یەکە لەمانە بدوێین تا باش ڕوون ببێتەوە گرنگیو بەکاری ئەم سیفەتانە: بێگومان دامەزراویو خۆگری یەکەم هەنگاوە بۆ سەرکەوتنو زاڵبوون، هەردوو دەستەو کۆمەڵێك کە تێجەنگن، هەرکامیان دامەزراو تربێت ئەوە زاڵترو سەرکەوتوو ترە. بەڕاستی دامەزرایو خۆگری هەر ماف بڕوادارە، چونکە ئێشو ئازارو زامو کوشتنو بڕین هەرچۆنێ بۆ ئەمان هەیە، بۆ دوژمنانیشیان هەیە، بێجگە لەوە ئەمان ئومێدو چاوەڕوانی لای خوایان هەیەو ئەوان بێبەشن لەوە کەواتە ئەمان پشت پڕن بەوەو ئەبێ لەخشە نەکەنو

دامەزراوبن، ئەوان مافی خۆیانە کەلنگە لەرزەیان ببیٚ و خۆیان بۆ نەگیریٚ، ئەمان ئەبیٚ دلشادو پشت پڕ بن بەوەی یەکیٚ لەو دوو شتە گرنگەیان هەیە: سەرکەوتن. یان شەهیدی. لە کاتێکدا دوژمن ئەوپەڕی ئەم ژیانەی هەیە کە لەڕاستیدا شتێکی بێنرخەو بەزوویی ئەڕواو نامێنیٚ، ئینجا بابێینە سەر باس و یادی خوا لە لەکاتی جەنگدا، قورئان بۆمان باس ئەکات کە باوو پشەی بڕواداران هەر ئەوە بووە لەو کاتانەدا، وەك جادوبازەکانی چەرخی فیرعەون کەلە پاش هەڕەشە سامناکە کەی فیرعەون گوتیان: ﴿رَبَّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾، وەك ئەودەستەوکۆمەڵەی کەجەنگیانکرد لەگەڵ جالوت و لەشکرەکەی و گوتیان: ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، وەك چەند دەستەو کۆمەڵ کە جەنگیانکرد لەڕێی خوادا لە چەرخی پێغەمبەرەکانی تردا، نزاو قسەیان هەر ئەمەبوو: ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، بێگومان یادو باسی خوا لە کاتی جەنگ لەگەڵ دوژمن چەند شتێکی گرنگی لیٚ دەستکەوت ئەبیٚ:

١- پەیوەندیو پەیوەستی بەهێزو دەسەڵاتێکەوە کە هەرگیز داگیر ناکریٚو لەچاوی هیچ کەس دانییە.

٢- دڵنیایی بەو باوەڕی بەهێز کە کۆمەکیو دۆستایەتی، لە هەمان کاتدا ئامادەکردنی باری ڕاستەقینەی ئاژاوەو جەنگە کەیە لەگەڵ هۆو ئامانجەکانی، چونکە ئەو جەنگە بۆ خوایەو بۆ چەسپاندنو ڕوون کردنەوەی خوایەتی خوایە لەوڵاتدا، بۆ دوور خستنەوەی هەر ستەمکارو سەرکێشێکە کە داوای خوایەتی ئەکات بۆ خۆی، کەواتە جەنگو ئاژاوەیەکە بۆ بەرز کردنەوەی وتەی خوا، نەك بۆ داگیرکردنو هیچ دەست کەوتێکی ئەم جیهانەیە، نەبو خودپەسەندیو خۆ بەرزکردنەوەو خۆزاڵ کردنە، نەبۆ خۆیو نەبۆ گەلو نەتەوەی، هەرچۆنیٚ بەجێهێنانە بۆ کارێکی پێویست لەکاتێکی سەختو سامناکدا، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ)، بۆ ئەوەیە کە موسڵمانان هەر لە یەکەمجارەوە بچنە جەنگەکە بەمل کەچیو داوای ڕەزامەندی، کەواتە هەرچی هۆی ئاژاوەو دووبەرەکییە نامێنیٚ، چونکە ئاژاوەو دووبەرەکی کاتیٚ ئەبیٚ کە تەنیا

سەرکردایەتی و تەمێ و پەندێك لەئارادا نەبێ، ئارەزووی نەفس لەکایەدا بێت، کەواتە هەرکاتێ کە خەڵکی ملکەچ بن بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، یەکەم هۆی سەرەکی ئاژاوە نابێ و نامێنێ، جا لەبەر ئەوە ئەو گوێڕایەڵی و فەرمانبەرییە شتێکی پێویستە و ناچاری هەیە پێی لەکاتی جەنگ و تێهەڵچووندا، گوێڕایەڵییەك سەرکردایەتی پێویستە، ئیتر هەرجۆرە سەرکردایەتییەك، چ جای سەرکردایەتی ڕاستەقینەی هەرە بەرز کە هەموو گوێڕایەڵییەك ئەبێ هەر لەو پەیدابێ، چ جای ئەو سەکردایەتییە کەلە ناخی دڵەوە هەڵئەقوڵێ و لەئاشکراو نهێنیدا هەر هەیە بەبێ جیاوازی، نەك وەك گوێڕایەڵی سەرکردایەتی ئەم جیهانە کەلە ترسداو هەر بە ڕووکەش و ڕواڵەت هەیە و لە پەنهانیدا بێجگە لە خەشم و سەرپێچی هیچ شتێکی ترنییە! ئینجا ئەو ئارامی و خۆگرییە کە فەرمانی پێدا، ئەوە شتێکە پێویستە بۆ هەر بەربەرەکانێ و جەنگ و تێکۆشانێك! ئیتر لە مەیدانی نەفسدا یان لە مەیدانی جەنگ و کوشتاردا، ئەو بەڵێنی لەگەڵدا بوونی خوا گەورەترین شتە کە دڵی پێوە ببەستری و بەهێزترین پشتیوانە بۆ گەیشتن بە هەموو ئامانجێك.

لەپاش ئەوەی فەرمانیدا بەو کردوەوە سیفەتە شیرینانە کە مایەی سەرکەوتنن، جڵەوگیریی کردلە ئاژاوەو دووبەرەکییەك کە دەردێکی کوشندەیە لەناو گەل و کۆمەڵدا، لەپاش ئەوانە ئینجا جڵەوگیریان لێ ئەکات لەو سیفەت و ڕەوشتە بەدەی کە دوژمنەکانی لەسەربوون کاتێ کەلە مەککە دەرچوون و هاتن بەهاواری کاروانەکەیانەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَـٰرِهِم﴾ وەك ئەوانە مەبن کەلە وڵاتەکەی خۆیان دەرچوون ﴿بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ بە فیزو کەشخەو لە خۆگۆڕان و خۆ بەزل زانییەوە، بە ڕووپامایی و خۆپیشاندانی خەڵکییەوە تا وەسف و سەنایان بکەن و ئازاو چالاك و گەورە ناویان ببەن ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە کاتێکدا ئەوانە ڕێ ئەگرن و بەربەست ئەکەن لە ڕۆشتن بە ڕێگەی خوادا، واتە ئایینی ئیسلام، کە ئەم سیفەتەشیان بۆ پەیدا بوو لە پاش هاتنی ئیسلام، نەك وەك دوو سیفەتە بەدەکەی پێشوو کە شتێکی هەمیشەیی و دامەزراو بوو

تیایاندا، وەك وتەكان ئەوە ئەگەیەنن بەپێی ڕێزمانی زمانی عەرەب کەلە عیلمی ڕەوانبێژیدا دەست نیشانی بۆ کراوە.

خوای میهرەبانی پەروەردگار پەندو ئامۆژگاری دەستەی بڕوادارانی کرد کەکاتێ دەرپچن بۆ جەنگ و کوشتار هەر لەبەر خوا دەرچن، بۆ بەجێ هێنان و بەدی هێنان و چەسپاندنی بەندەیی هەموو بەندەکانی خوا بەتاك و تەنیا، دەرچن بۆ فڕێدان و نەهێشتنی هەموو زۆرداریی ستەمکارو سەرکێشێك کەلاف خوایەتی لێئەدەن بەسەر بەندەکانی خواوە، بەمەی بەبێ ئیزن و ڕەزامەندی خوا حوکمڕانی ئەکەن، لاف حاکمێتی لێئەدەن لە ولاتدا، دەرئەچن بۆ جاڕدانی ئازادی و سەربەستی ئادەمی لە هەموو بەندەیییەك بێجگە لەبەندەیی خوا، دەرئەچن بۆ بەرگری و پارێزگاری کردن و پارێزگاری ناموس و ڕێزو ئازادی ئادەمیزاد نەك لەبەر داگیر کردن و زاڵبوون بەسەر ولات و دانیشتوانەکانی ولات، نەك بۆ فیزو کەشخە و یاخی بوون و بەهۆی نازو نیعمەتی خوا کەڕشتوویەتی بەسەریاندا، دەرچن بە جۆرێ خۆیان ڕووت کەن لە هەموو نیازو مەبەستێك بێجگە لە نیازی فەرمانبەری و ڕەزامەندی خوا، کەواتە مەبەست بەشێ لەزاڵبوون و سەکەوتن هیچ نییە بێجگە لە پێکهێنانی گوێڕایەڵی خواو فەرمانبەریی ئەو فەرمانەی کە پێی سپێراوە لە تێکۆشان و فیداکاری، بەرپاکردن و ڕاگیر کردنی بەرنامەکەی خوا لەژیاندا، بەرز کردنەوەی وشەو ئالأی خوا لە زەویدا، داوای بەهرەو ڕەزامەندی خوا. بێگومان شێوەی دەرچوونی ئەو بێبڕوایانە بەفیزو کەشخەو ڕووپامایی و بەنیازی ڕێ گرتن و بەربەستکردنی ئایینی خوا، ئەو شێوەیە کە موسڵمانەکان بینیان و بە بەرچاویانەوە بوو کاتێ دەرچوون لە مەککە و هاتن بەرەو ناوچەی مەدینە، هەرچۆنێ شێوەی شکست و شکان و زەبوونی و ڕیسواییشیان بە بەرچاویانەوە بوو لەپاش کات و لە جەنگەکە بەهۆی نیازو کردەوە بەدەکانیانەوە، وەك دەست نیشان ئەکات کە کۆتایی ئایەتەکەئەهێنێ بەم ڕستەیە:﴿وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ خوا بەباشی ئاگا و زانایە بەوەی کەئەوانەکردیان وئەیکەن ودەوری هەمووی داوەوهەمووی بەپێش چاوی قودرەتی ئەوەوەیە،

وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَـٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ ۗ

---

**ئینجا شێوەی هەڵخەڵەتاندنی شەیتان و هاندانی بۆ ئەو بێبڕوایانە ئەخاتە بەرچاو و ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە شەیتان ئەو کردەوە بەدانەی ئەو بێبڕوایانەی ڕازاندەوە بۆیان و شیرینی کردن لەدڵیانداو لەبەرچاوی دڵیاندا، ﴿وَقَالَ﴾ گوتی پێیان: ﴿لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ هیچ زاڵ و سەرکەوتوویەک نییە ئەمڕۆ بۆ ئێوە و بەسەر ئێوەدا لەخەڵکی و لەناو ئادەمیدا ﴿وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ﴾ من پەنادەر و پارێزەرم بۆ ئێوە ﴿فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ﴾ ئینجا کاتێ هەردوو دەستەکە نزیک کەوتنەوە لە یەکتر بەجۆرێ یەکتریان بینی ﴿نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ پاشەکشێی کرد و پاشەڵپاش بەدوای خۆی دا گەڕایەوە و ﴿وَقَالَ﴾ وتی پێیان: ﴿إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ﴾ بەڕاستی من بەریم لەئێوە ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ﴾ بەڕاستی من شتێ ئەبینم کەئێوە نایبینن، واتە کۆمەڵی فریشتەکە هاتن بۆ یارمەتی موسڵمانەکان، یان جوبرەئیل کەلەپێش دەمی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەڕۆیشت یان هەر شتێکی تر کە نیشانەی سەرکەوتنی موسڵمانەکان و شکستی بێبڕواکان بوو ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی من ئەترسم لە خوا ﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ خوا تۆڵەی بەتینە و سەخت و بەتینە لە تۆڵەسەندن دا، هیچ پێویست نییە لادان لەڕووکەش و ڕواڵەتی ئایەتەکە، بەڵکو بەبێ بەڵگەیەک دروست نییە لادان و تەئویلێك، بەتایبەتی کە چەند ڕیوایەتێك هاتووە**

کەڤۆڵگیرو کۆمەکی ڕووکەشەکەیە: یەکێ لەو ڕیوایەتانە ئەوەیە کە(طبري) ئەیهێنێ لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: لەو ڕۆژەدا شەیتان خۆی بردە شێوەی(سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جەعشە)ەوە بەو شێوە بەڵێنی دا بە بێبڕواکان و لەپاشان پەشیمان بوویەوەو ئەو وتو وێژە ڕووی دا لەنێوانیان دا، کەواتە نازانم لەبەرچی دەستەیەکی زۆر لەزانایانی تەفسیر ئەو دەقە لائەدەن و بە پێی ڕواڵەت و ڕووکەشەکەی تەفسیری ناکەنەوە؟! هەر هیچ نەبێ ـ ئەگەر دڵنیا نەبوون لەو ڕیوایەتانە ـ ئێمە لانادەین لەدەقی ئایەتەکەو بەڵام چۆنێتیەکەی لێ ئەگەڕێین و حەواڵەی خوای ئەکەین، شەیتان بەو شێوەیە هانی بێبڕواکانی داو کردەوە بەدەکانیانی شیرین کرد لەپێش چاویان ﴿إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ لەکاتێکدا کە ناپاکەکان و ئەوانەی کەلەدڵیاندا نەخۆشی هەیە، ئەڵێن و ئەیانگوت: ﴿غَرَّ هَٰؤُلَاءِ دِينُهُمْ﴾ ئەوانە ـ واتە موسڵمانەکان ـ ئایینەکەیان هەڵی خەڵەتاندن، هەتا خۆیان دووچاری ئەم تەنگ و چەڵەمەیە کردو خۆیان خستە ئەم تەنگییە، بێگومان ناپاکەکان ئەوانەبوون کە لاف بڕوایان لێ ئەداو بەدەم ئەیانگوت: بڕوامان هێناوە، بەڵام لە دڵەوە بڕوایان نەبوو، ئەوانە مەدینەیی بوون، ئەوانەی کە دڵ نەخۆش بوون دەستەیەك بوون لە مەککەییەکان، مەیلیان بوو بە موسڵمان بوون بەڵام هێشتا دامەزراوو دڵ ئارام نەبوون پێی و لەگەڵ بێبڕواکان دا هاتن بۆ ئەو جەنگە تا بزانن چۆن دەرئەچێ. ئینجا کاتێ کە موسڵمانەکانیان بینی بەو کەمی و کەم دەسەڵاتییەوە، بێبڕواکانیشیان بینی بەو زۆری و هێزو دەسەڵاتەوە، ئەمانیش وەك ناپاکە بێبڕواکان ئەو وتە بەدەیان گوت. ئەمان و ئەوان چاوی دڵیان نابینابوو لە هێزو دەسەڵاتی بڕواو عەقیدە بێئاگابوون، بڕواو پشت بەستنیان بە خوا نەبوو، کەواتە هەر تەماشای ڕووکەش و ڕواڵەتیان ئەکرد،

وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾

بەپێی ڕووکەش و ڕواڵەتیش ئەبێ هەر ئەوە بڵێین و ئاگایان لەوەنییە کە ئەوانە پشتیان بە خوا بەستووە و خوایش ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ هەرکەس پشت بە خوا ببەستێ بێگومان خوا توانا و زاڵێکی کاردروستە، کەواتە دۆست و سەربازی خۆی سەر ئەخات و زاڵی ئەکات لەکات و شوێنی دیاریی کراوی خۆیدا، لە هەموو کات و چەرخێکدا دەستەی بڕواداران ئەبێ بە ترازووی بڕوا و عەقیدەکەی هەموو شت و هەموو کاروبارێ هەڵسەنگێنن، نەترسن و هێزی ناهەق سواری دڵیان نەبێ، هێز و نرخی خۆیان بەکەم و کوڕ سەیر نەکەن، چونکە خوای لەگەڵە، ئینجا شێوەیەکی سامناک و چەشمەندازێکی دڵتەزێنی بێبڕواکان ئەخاتە بەرچاو لەکاتی مردن و گیان کێشان دا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ ئەگەر ئەبینی ئەو کاتەی فریشتە گیانی ئەوانەیان ئەکێشان کە بڕوایان نەهێنا بوو لە کاتێکدا ﴿يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ﴾ ئەیاندا لە ڕووو دەم و چاو و پشت و دوایان، واتە ئەگەر ئەتبینی کە فریشتەی سزا گیانی ئەوانەی ئەکێشا کەگیان کێشان و ئەو پەڕی سزایە و سەرباقی ئەوە بەو ڕیسوایی و سەر شۆڕی کردنە گیانەکانیان ئەکێشان، ﴿وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ پێیان ئەگوتن بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر، ئەگەر ئەوەت ئەبینی بەڕاستی شتێکی سەخت و سامناک و سەرسوڕهێنەرت ئەبینی، ئینجا ئایا مەبەست بەم وتەیە ترساندن و هەڕەشە کردنە لەلایەن ئەو فریشتانەوە بەوەی کەلە داهاتوودا دووچاری ئەو سزایە ئەبن کە ئەوەندە هاتنی ڕاستە وەك لەو کاتەدا بەدی هاتبێ و ئامادەبێت و ئەوانی تێ توڕ درابێ و بەو وتەیە شەریان لێ بدەن بۆ سزادنی دەروونیشیان؟ ئایا ئەوە مەبەست بێت، یان هەر دەست بەجێ لەگەڵ گیان کێشانەکەدا ئەو سزایەشیان بۆ ببێ، وەك لە ڕیوایەتیش دا هاتووە کە ئەو فریشتانە لە ڕۆژی بەدردا گورزی ئاسنیان بە دەستەوە بوو کە هەرجارێ ئەیان دا لەو بێبڕوایانە ئاگر بڵێسەی ئەسەند لە زامەکانیان دا؟ هەرکام هەڵئەگرێ و خوا ئەو سزایانەشی پێچەشتوون یان پێیان ئەچەژێ، لەسەر باری دووەم وتەکە بۆ تەشەر لێدانە،

ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ

---

وەك ئەمەش كە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی کە باس کراو ئەربارەتان کرا ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ بەهۆی بڕوانەهێنان‌و کردەوەی بەدی خۆتانە کە کردتان‌و پێشتان خست ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ کار ئەوەیە کە بێگومان خوا ستەمکارو خاوەن ستەم نییە بۆ بەندەکانی، بەڵکو ئەوپەڕی داد بەکار ئەهێنێ لەسزادان‌و تۆڵە سەندندا، بەبێ گوناهو تاوان تۆڵە ناسێنێ لەگەڵ ئەوەدا خوا هەرچۆن بکات مافی خۆیەتی‌و خۆی خاوەنی هەموو شتێکەو ناگونجێ هیچ کارێکی ئەو بە ناڕەواو ستەم دابنرێ، هێندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون: ئەم ڕستەی: ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ واتە ئەو سزاو بەسەرهاتی ئێوە کە باسکرا بەهۆی کردەوەکانتانە کەلە پێشەوە کردتان، بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا خاوەن ستەم نییە لە بەندەکانی، واتە بوونی کردەوەکانتان بوو بەهۆی ئەو سزاو ئازارەتان، بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا بەبێ گوناه سزا نادات، هەرچەند ئەگەر سزای بدایەو یان بیدات نابێ بە ستەمکار. لە بارەی وشەی ﴿ظلام﴾ لە سوورەتی(آل عمران)دا هێندێك دواوین بەجۆرێ گەردو غوبار نەمێنێ بۆ هەرکەسێك کە نەشارەزابێت، باسەرنجی بدرێت.

خوای پەروەردگار بەوجۆرە ئەو لەشکرو کۆمەڵە بێبڕوای دووچار کرد ئەو ڕیسوایی‌و سزای بەسە هێنان، ئەوەش تایبەتی نەبوو بەوانەوە، بەڵکو بەپێی باوو ڕەوشتی خوابوو لەگەڵە ڕابردووەکان دا کە بەپێی تاوان‌و بێبڕوایی‌و سەرکێشیان لە فەرمانی خوا دووچاری کردوون، وەك ئەفەرموێ: ﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ واتە باوو کارو کردەوەی بەدی ئەوانە ـ واتە قوڕەیش ـ بەردەوامیان لەسەری تا خوا دووچاری کردن، وەك باوو کارو کردەوەی بەدی دەستەی فیرعەون‌و ئەو دەستەو کۆمەڵانەی کەلە پێش ئەوانەوە هاتن وایە، وەك ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی ڕابردوو بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی خوا ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ ئینجا خوا گرتنی‌و دووچاری کردن بەهۆی

گوناهەکانیانەوە واتە سەرکێشی و بڕوا نەهێنانیان کە گەورەترین تاوان و گوناهە و سەرچاوەی هەموو گوناهو تاوانەکانی ترە، یان بەهۆی هەموو گوناهەکانیانەوە کە بێبڕواییەکەش ئەگرێتەوە و دەست نیشان ئەکات کە بێجگە لە بێبڕوایی گوناهو تاوانی تریشیان بووە، هیچ کام لەوانە نەیانتوانی خۆیان قوتار بکەن لەسزاو تۆڵەی خواو بەرگری بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ بەڕاستی خوا بەتوانای تۆڵەی بەتینە. ئەمانەو ئەوان خوا چاکەو بەهرەی ڕشت بەسەریاندا، دەسەڵاتی پێدان لە وڵاتدا، بێگومان خوا بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە بە چاکەو بەهرەو بەسزاو ناخۆشی تا دەرکەوێ بۆ خەڵکی کێ سوپاس گوزارەو چاو لەبەری چاکەی خوایە، کێ ناسوپاس و سپڵەیە؟ دەی ئەمانە هەموو سپڵەو ناسوپاس بوون، بەو دەسەڵات و نازو نیعمەتە یاخی بوون لە خواو دەست درێژییانکرد لە بەندەکانی خوا، ئینجا لەو کاتەدا باوو ڕەوشتی خوا هاتە پێشەوە، بەم ڕەنگە سپڵەو لە خۆ گۆڕاوو بێبڕواکانی دووچار کردو دەسەڵات و نازو نیعمەتەکەی نەهێشتن، وەك دەست نیشان ئەکات بەوەی کە گوتمان کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو سزادان و دووچار کردنە بە هۆی ئەو کردەوە بەدەی خۆیانەوە ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ﴾ بە هۆی ئەوەوەیە کە خوا نەبووە بە گۆڕەری چاکەو بەهرەیەك کە بەخشیبێتی و ڕشتبێتی بەسەر گەل و کۆمەڵێکدا، لە باوو کاردروستی خوادا ئەو گۆڕینە نەبووەو شایستە نەبووە ﴿حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ هەتا ئەوان نەیانگۆڕن ئەو بارو حاڵو کردەوەی کە بە خۆیانەوە بووەو لەسەری بوون لەکاتی نازو نیعمەتەکەدا، بەم ڕەنگە گۆڕابن بۆ دژو پێچەوانەی ئەو بارو حاڵە، ئیتر بارو حاڵی کاتی پێشوویان چاك بووبێ یان ئەوەن تر بووبێ لەم بارو حاڵی تازەیان، بە وێنەی قوڕەیش کە هەرچەند لە پێش هاتنی پێغەمبەردا(ﷺ) بت پەرست بوون بەڵام هێندێ کردارو ڕەوشتی چاکیان هەبوو وەك میوانداری و سیلەی ڕەحم و ڕاستی پەیمان و دەم گرتنەوەیان لە خراپە گوتن دەربارەی پێغەمبەران و ئایینەکانی خوا، بەڵکو ڕێزیان بوو دەربارەیان، بەڵام کاتێ کە پێغەمبەری هەمووان هات(ﷺ) کە مایەی شەرەف و سەربەرزی بوو بۆیان، بەرامبەری خۆی و ئایەتەکانی خوا وەستان و ئەوەی لە دەستیان هات لە دوژمنایەتی و جەنگ بەکاریان هێنا بۆ نەهێشتنی خۆی و ئایینەکەی، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆیەکی تر بۆ ئەو سزاو بەسەرهاتە سەختەی کە هێنای بەسەر ئەو بێبڕوایانەدا،

ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بەهۆی ئەوەیە کە خوا بیسەری زانایە، کەواتە هەرچی ئەوانە کردیان و نەیانکرد لە وتار و کردار خوا پێی ئاگا و زانایە پێیان ئەوەی شیاو و شایستەیە لەگەڵی کردن لەبەخشین و هێشتنەوەی ناز و نیعمەت و نەهێشتن و داڕنین لێیان.

پێویستە بۆ ئێمەی بڕوادار کەمێك بوەستین لەبەردەم ئەم ئایەتەدا لە چەند بارێکەوە:

١- لەم بارەیەوە کە خوا ئەوپەڕی داد و میهرەبانی بەکار ئەهێنێ لەگەڵ بەندەکانیدا، کە ئەو ناز و نیعمەتەی پێی بەخشیون ناسێنێتەوە مەگەر پاش ئەوەی ئەوان نیاز و نیەتی خۆیان بگۆڕن، لانەدەن لەڕەوشت و باری خۆیان، شایستەی ئەوە بن بۆ ئەوەی ئەو چاکە و ناز و نیعمەتەیان لێ بسێنرێتەوە کە ڕێزیان نەزانی و سوپاسیان نەکرد و سپڵەبوون.

٢- خوای میهرەبان ئەم ئادەمییەی ڕێزدار کرد و پایە و پلەی پێدا, ئەو ڕادەی قەزا و قەدەری خۆی بەو لەسەر دەستی ئەودا بەجێ ئەهێنێ، ئەو گۆڕانکاری قەزا و قەدەرەی کە بڕیاری داوە لەژیانی ئەم ئادەمییەدا، ئەو گۆڕان و گۆڕانکارییەی خۆی بەستووە بەگۆڕانی نیاز و کار و کردەوەی ئەوەوە بەجۆرێ تا ئەم گۆڕانکاری بەجێنەهێنێ لە خۆیدا خوا گۆڕان ناهێنێ بەسەر ئەوەی پێی بەخشیوە.

٣- بەرامبەر ئەو ڕێز و پایەوپلە بەرزە ئەرکێکی گەورەی خستۆتە سەرشانی بەجۆرێ کردوویەتی بەخاوەنی ئەوەی بتوانێ ناز و نیعمەتەکەی ڕاگیربکات و بیهێڵێتەوە و زیادیشی بکات کاتێ کە چاولەبەری و سوپاس گوزاربێ، هەرچۆنێ ئەشتوانێ نەیهێڵێ و بیبڕێ کاتێ کە سپڵەبێ بەو ناز و نیعمەتە لە خۆی بگۆڕێ و یاخی بێ.

﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَا ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا ظَالِمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾

بۆچوونی ئیسلامی بەرامبەر بەم ئادەمییە بەو جۆرەیەو بەو جۆرە سەرنجی ئەم ئادەمییە ئەدات!! ئەیگێڕێ بەدروستکراوێکی بەکاری ئیش کەر لە دوا ڕۆژو چارەنووسی خۆیدا بەئیزن و بڕیاری خوا، نایگێڕێ بە گیان لەبەرێکی دەستە پاچەو بێدەسەلات بەرامبەر ئەوەی کە لە نەفامی تازەدا ناو براوە بە(حتميات) ئەو بارو حاڵەتانەی کەبە ناچاری بەدی دێن: بارو حاڵەتی ئابووری، مێژوو، گۆڕان و تطور...هتد، مەبەستیان ئەوەیە کاروبارەکانی ئەم بوونەوەرە نەبەستێتەوە بە قەزاو قەدەری خواوەو دووری بخەنەوە لە بڕواهێنان، نەفرینی خوایان لێبێ، ئینجا وێنەیەك ئەهێنێ بۆ ئەو دوو گۆڕاندنە، گۆڕاندنی خەڵکی بۆ ئەو بارو حاڵەی کەلە پێشەوە لەسەری بوون، تا لەسەر ئەوە خوایش گۆڕاندنی خۆی کرد بەم ڕەنگە نازو نیعمەتەکەی گۆڕین بە سزاو بەش بڕاوی و تیاچوون بەسەرو ماڵەوە دەستەو بەستەکەی فیرعەون و پێشووەکان دووبارە ئەهێنێ و ئەیکاتەوە بە نموونەو وێنە کەبەسەرهات و ڕووداوی دەستەی فیرعەون زۆر بەناوبانگ بووەو لەڕاستیدا ئەوەی کە خوا بەوانی دابوو، بەنایاب شتی وابوو بێ لە مێژووی ئادەمیدا یان هەر نەبووە هەرچۆنێ لێ سەندنەوەو داڕنینەکەش و شێوەکەی هەر نایاب و کەس نەدیدە بووە ئەفەرموێ: ﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ واتە خوا گۆڕەری چاکەو بەهرەی خۆی نییە هەتا خەڵکەکە بارو حاڵی خۆیان نەگۆڕن بەوێنەی باوو کارو کردەوەی دەستەو بەستەکەی فیرعەون و ئەو گەل میللەتانەی کەلە پێش ئەوانەوە بوون و خوا نازو نیعمەتی ڕشت بەسەریاندا، ئینجا ئەوانیش بارو حاڵ و کردەوەی خۆنیان گۆڕی بەم ڕەنگە ﴿كَذَّبُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ ﴾ بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان لەپاش ئەوەی خوا فروستادەی بۆ ناردن و بانگیان کردن بۆ ئایینی خواو بەڵگەو موعجیزەشیان نیشاندان، ﴿فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ ﴾ خوایش ئەفەرموێ: ئینجا ئێمەش ـ بەپێی باوی خۆمان ـ ئەوانمان لەناو برد بەهۆی گوناهەکانیانەوە، هەرکام لەو گەلانەی بەجۆرێ لەناو برد وەك لە چەند شوێنێکدا هێندێکی باسکردووە، لێرەدا بەتایبەتی باسی جۆری لەناوبردنی دەستەکەی فیرعەون ئەکات کە جۆرێکی زۆر سەرسوڕهێنەرو کەس نەدیدە بوو، ئەفەرموێ: ﴿وَأَغْرَقْنَا ءَالَ فِرْعَوْنَ ﴾

دەستەکەی فیرعەونمان نوقم کرد لەدەریاداو خنکاندمان، ﴿وَكُلٌّ كَانُوا ظَٰلِمِينَ﴾ هەرکام لەوانە ستەمکار بوون و بەردەوام بوون لەسەر ستەم کردن، ستەم لە خۆیان و ستەم لە خەڵکیش، خوایش ـ هەرچەند مۆڵەتی ستەمکاران بدات ـ هەرگیز وازیان لێناهێنێ و تێپەڕ ناکات بەسەریاندا. ئەم وێنەیەی دووجار هێناوە، لەو بارەیەوە زانایانی تەفسیر چەند ڕایەکیان هەیەو بە چەند جۆرێ ئایەتەکانیان هۆنیوەو پەیوەستیشیان کردوون بەیەکەوە، لەناو ئەو جۆرو بارانەدا ئەم جۆرەم هەڵبژاردو بەلامەوە بەهێز تربوو، بەم جۆرە نابێتە دووبارە کردنەوەو جیاوازی هەیە لەیەکتر. خوا خۆی باش ئەزانێ.

ئینجا لەم ئایەتی داهاتووەدا تا دوای سوورەتەکە چەند یاسایەکی گەورەو گرنگ ئەمێنێ، هێندێکیان هەر لەڕێوە هەتاهەتایی و هەمیشەیی نین، هێندێکیان لە یەکەم جارەوە کاتییەو بۆ کات و ماوەیەکی تایبەتییە بەپێی بەرژەوەندی کات و شوێن و بارو حاڵی موسڵمانانە، بەڵام چەند گۆڕانکاریەکیان تێدا کراوە کە بەوە ئەبن بە هەمیشەیی و هەتا هەتایی، ئەو گۆڕانکاریانەش لە ئایەتەکانی سوورەتی داهاتوودا کراوە، وە کەواتە بۆمان دەرئەکەوێ لەمەوپاش، یەکێ لەو یاساو بڕیارانە کەلەم ئایەتانەدا هاتووە ئەمەیە: ئەوانەی کە پەیمان ئەبەستن لەگەڵ موسڵمانان و لەشکری ئیسلامیدا، ئینجا ئەو پەیمانە ئەشکێنن، ئەوانە بەلای خواوە بەدترن لە هەموو گیانلەبەران، جا لەبەرئەوە پێویستە لەسەر لەشکری ئیسلامی تەمێی ئەوانە دابدات بەجۆرێ کەسانی تریان پێ ژیربکات و نیازی شکاندنی پەیمانیان بەدڵدا نەیەت، یەکێکی تر لەو بڕیارو یاسایانە ئەمەیە: ئەو پەیماندەرانەی کە سەرکردایەتی ئیسلام مەترسی ئەکات لەناپاکی و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان، بۆ سەرکردایەتی ئیسلام هەیە کە پەیمانەکەیان هەڵوەشێننەوەو ئەوەشیان پێڕابگەیەنێ، جا لەبەرئەوە پێویستە لەشکری ئیسلام تەمێ خواریان بکات بەجۆرێ خەڵکی تریشیان پێ ژیر بکات لەوێنەی ئەوان، یەکێکی تر لەو یاسایانە ئەمەیە کە پێویستە تا دەسەڵاتیان بێ هەمیشە چەک و هێزی ئامادە بێت تا ئەم هێزە مامۆستاو ڕێنموونی کەرە بەرزترین هێز بێت لەزەویدا، کە هەموو هێزی ناهەق بیمی لێ بکات و نەتوانێ ڕێ بگرێ لە ئیسلام و موسڵمانان، نەتوانێ داوای کار بەدەستی و حاکمێتی بکات لەولاتدا، جا بە هۆی ئەوەوە تێکۆشان و جەنگ لە ڕێی خوادا هەرگیز دوایی هاتنی نییە، نابێ بوەستێ تا دنیا دنیایە، هەرکاتێ وازی لێهێنرا بەم جۆرەی لێ دێ کە ئەبینرێ و ئەبیسترێ لە جیهاندا، یاسایەکی تر ئەمەیە: هەرکاتێ گەل و کۆمەڵی نا موسڵمان حەزی کرد لەئاشتی لەگەڵ موسڵمانان و وازی

هێنا و لەڕوویاندا ڕانەوەستا، بێگومان سەرکردایەتی ئیسلامی ئەوەیان لێ وەرئەگرێ و پەیمانیان لەگەڵ ئەبەستێ لەسەر ئەوە، ئینجا ئەگەر لەدڵەوە ڕاست نەکەن و بەڵام دەری نەبڕن، کاریان ئەدرێتە دەستی خواو حەواڵەی خوا ئەکرێن، خوا چارەسەری خراپی و ناپاکییەکەی ئەوان ئەکات و شەڕو خراپەیان دوور ئەخاتەوە لە موسڵمانان، یاسایەکی تر ئەمەیە: کە جەنگ و جیهاد فەرزو پێویستە لەسەر موسڵمانان هەرچەند دوژمن چەند قاتی ئەمان بێت، ئەمان بەیارمەتی خوا سەرکەوتوو ئەبن بەسەریاندا، کەواتە فەرزی جەنگ و جیهاد نەبەستراوە بەوەی کە هێزی موسڵمانان هاوسەرو هاوتا بێت لەگەڵ هێزی دوژمندا، ئەوەی پێویست بێت لەسەر موسڵمانان ئەمەیە کە بەپێی توان هێز ئامادەبکەن، بڕوایان بەهێزبێ بەخوا، خۆڕاگرو دامەزراو بن لەکاتی جەنگەکەدا، ئیتر گوێیان لەهیچی تر نەبێ چونکە ئەوکاتە ئەمان خاوەنی هێزێکی ترن بێجگە لەهێزی ئاشکراو ڕواڵەتی، یاسایەکی تر ئەمەیە: کە مەبەستی سەرەکی لە جەنگ و جیهاددا سست و لاواز کردنی هێزی دوژمن بێت، کەواتە تائەو مەبەستە پێک نەیەت دیل گرتن ڕەوا نییە، بڕیارێکی تر ئەمەیە: کە دەستکەوتەکانی جەنگ حەڵاڵە بۆ موسڵمانان، ئەوە بەخشین و بەهرەیەکە خوا دای بەم ئوممەتە، هەروەها بۆ موسڵمانان فرۆشتنی دیلەکان و وەرگرتنی ماڵ و پارەکەی، پێویستە دیلەکان دڵخۆشی بدرێنەوە و ئیسلام خۆشەویست بکرێ لە پێش چاویان، بەمەی بەڵێنی خوا وایە، ئەگەر ئەمان باش بن خوا باشتریان پێ ئەبەخشێ لەوەی کە لێیان سەنراوە لەگەڵ ئەوەدا بترسێنرێن بەسزای خوا ئەگەر ناپاکی بەکاربێنن. یاسایەکی تر ئەمەیە: کۆبوونەوەی گەل و کۆمەڵی موسڵمان هۆی پەیوەندی و پەیوەستییەکەی عەقیدە و بیروباوەڕەکەیەتی، واتە ماتوڵ ئەو عەقیدەو بیروباوەڕە بێ بە کۆمەڵ و گەلی موسڵمان ئەناسرێ و ناو ئەبرێ، بەڵام یارمەتی و کۆمەک و دەستەبەرەیی(تکافل) تەنها لەسەر عەقیدە و بیروباوەڕەکە نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ئەبێ بەشداری بێ لەبزوتنەوەداو یەکێتی لە پەیوەندی و هۆنینەوەدا، کەواتە ئەو موسڵمانانەی کە کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە ئەگەر دەست درێژیان لێ بکرایە لەلایەن کۆمەڵێکی بێبڕوا کە پەیمانیان بەستبوو لەگەڵ موسڵمانان دروست نەبوو یارمەتی ئەو موسڵمانانە بدرێ، چونکە بەشداری موسڵمانەکانیان نەکرد لە بزوتنەوە و هۆنینەوەی خۆیان لەگەڵ گەل و کۆمەڵی مەدینەدا، پێش هێنانی ئەم ئایەتانەی داهاتوو تەفسیر کردنیان بەکورتی ئەم چەند یاسا و بڕیارانەمان هێنا تا کۆمەک بن بۆ تێگەیشتن و وەرگرتنی مەبەستەکانیان لەکاتی تەفسیر کردنیاندا،

إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ

---

**ئینجا با دەست بکەین بە تەفسیری ئەو ئایەتانە بە یارمەتی خوا. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڕاستی بەدترینی هەموو گیانلەبەران بەلای خواوەو لە حوکم‌و بڕیاری خوادا ئەوانەن کە بڕوایان نەهێناوە، واتە ئەوانە کە هەمیشەیی‌و بەردەوام ئەبن لەسەر بڕوا نەهێنان وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ کەواتە ئەوانە بڕوا ناهێنن ﴿ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ﴾ ئەوانەی کە پەیمانت لێ وەرگرتن، ئینجا لەپاش ئەو پەیماندان‌و پەیمان لێ وەرگرتنە پەیمانەکەیان هەڵئەوەشێننەوە لە هەموو جارێکدا، واتە جار لەدوای جار ئەو هەڵوەشاندنەوە ئەکەن‌و ئەوە کارو پیشەیانە، ﴿وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ﴾ ئەوانە خۆیان ناپارێزن‌و ناترسن لەو پەیمان هەڵوەشاندنەوە، ناترسن لە خواو نەلەسەرەنجامی ئەو بێباوەڕەکانی پەیمانییە، چەند ڕیوایەتێك هاتووە لەبارەی مەبەست بەمانە، یەکە یەکە لەسێ تیرە جولەکەکەی مەدینە: ﴿بني قريظة، بني قينوقاع، بني نظير﴾، ئەو عەرەبە کۆچەرانەی دەوروبەری مەدینە دیمەنی دەقی ئایەتەکە ڕووداوی مێژوویی وا ئەگەیەنن کە بە شێوەی گشتی مەبەستە، چونکە هەرکام لەوانە چەند جار پەیمانیان هەڵوەشاندووەتەوە، ئەوانە سروشتیان تێك چووەو سیفەتی ئادەمێتییان نییە، ئەوانە بەرەڵا‌و نەبەستراون بەهیچ بڕیارو پەیمانێکەوە بەوێنەی وڵاخ‌و چوارپێ، ئەوانە بەدترن لە گیانلەبەرانی تر، چونکە هەموو گیانلەبەرەکانی تر بە پێی سروشتی خۆیان ئەجووڵێنەوەو هەڵئەستن بە کارو کردەوەی سروشتی خۆیان، بەڵام ئەمانە دژی کارو**

پیشەی سروشتی خۆیانن چ جای ئەوەی هەڵسن بەکارو کردەوەی خۆیان، کەواتە ئەوانە لە هەموو گیانلەبەرانی تر بەد ترن! ئەوانە هیچکەس ئەمین نییە لێیان: کەواتە ئەبێ کارێکی وایان لەگەڵ بکرێ کە بێئارام بن و لەبیم و ترسدا بژین و ئەمین نەبن لەهیچکەس، ئەبێ کارێکی وایان لەگەڵ بکرێ کە کەسانی تری وەك خۆیشیان پێ ژیر بکرێن، وەك ئەفەرموێ: ﴿ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ ﴾ کەواتە ئەگەر تۆ ئەی پێغەمبەر هەروەها موسڵمانانیش ئەگەر تووشی ئەوانە بوون لە جەنگداو ئەوانەت دەستکەوت ﴿فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ ﴾ ئەوا بتارێنەو پرژو بڵاو بکەرەوە بەمان کەسانێکی تر لەبەدواو دەورو بەری ئەمان دا لە دوژمنانی تر، واتە سزاو کوشتن و برینێکیان دەربارەبکە کە ببێتە هۆی ترس و بیم بڵاوبوونەوەی دوژمنانی تر ﴿لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴾ بەڵکو ئەوانە بیربکەنەوەو لەمانەوە تەمێ خوار بن و بەوێنەی ئەمان کردەوەی بەد نەکەن، ئەوە بەکەم بڕیارە کە بەکاربهێنرێ لەگەڵ ئەوانەی کە پەیمانیان هەڵوەشاندووەتەوە، ئینجا بڕیار دەرئەکات دەربارەی ئەوانەی کە مەترسی بکرێ لە پەیمان شکاندنیان و هێشتا نەیان شکاندووە. ئەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةً ﴾ ئەگەر مەترسیت کرد لەناپاکی کۆمەڵ و دەستەیەك لە پەیمان دەران، واتە ئاگادار بویت بەناپاکییەکەیان ﴿فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴾ ئەوکاتە پەیمانەکە فڕێ بدەرەوە بۆلایان بەڕێك و ڕەوانی، بەم ڕەنگە دەری بڕە لایان و هەواڵیان بدەرێ کە تۆ پەیوەستی و پەیمانەکەت بچڕیوە، کۆمەڵێك لە زانایان لەسەر ئەوەن کەکاتێ پێویستە ئەو ڕاگەیاندن و هەواڵ پێدانە کەماوەی پەیمانەکە دوایی نەهاتبێ، یان ئاشکرا نەبووبێ پاشگەز بوونەوەو هەڵوەشاندنەوەکەی ئەوان، ئەگەر وابوو ئەو کاتە پێویست ناکات بەوە، لەبەر ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ ئەوەی پەیمانی مەککەییەکان بداتەوەو بەبێ ئەوەی هیچیان پێڕابگەیەنێ چوو بۆ سەریان و فەتحی مەککەی کرد.

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ

**هۆی ئەو پەیمان پێدانەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ بەڕاستی خوا ناپاکانی ناوێ‌و خەشمی هەیە بۆیان. بێگومان ئیسلام پەیمان ئەبەستێ بۆ ئەوەی ئەو پەیمانە بپارێزرێ، کەواتە ئەگەر زانی دوژمن نایپارێزێ‌و ناپاکی ئەکات ئەو کاتە بە ئاشکراو بەبێ پێچ‌و پەنا پەیمانەکەیان ئەداتەوەو هیچ ناپاکی‌و فێڵێك ناکات‌و بەئاشکرا ڕائەگەیەنێ کە پەیمان نەما لەنێوان خۆی‌و ئەو ناپاکانەدا، ئیسلام بەو جۆرو شێوەیە پاك‌و بێ‌لەکەیە، بەو جۆرو شێوەیە خەڵکی بەرزئەکاتەوە بۆ ئاسۆی هەرەبەرزی ڕاستی‌و شەرەف‌و کەرامەت، نایەوێ لەناکاودا بدات بەسەر دوژمندا، لەبەرئەو پەیمانەی کەکاتی خۆی بەستوویەتی، بەڵام پاش ئەوەی ئاشکرابوو کە پەیمان نەماوەو ئەوەی ڕاگەیاند، ئیتر چۆن بۆی بکرێ‌و بەرژەوەندی تێدا بێت جەنگی خۆی ئەکات‌و بەپێی ئەوە ئەجوولێتەوە کە گوتراوە:(الحرب خدعة) جەنگ بەفرو فێڵ ئەکرێ. ئینجا بابزانرێ ئیسلام ئەو کارو کردەوە شیرینانەی هێنا لە کاتێکدا کە هیچکەس ئەوانەی بەخەیاڵدا نەئەهات، بەڵکو لەو کاتەدا هەر یاسای زۆرو داپڵۆسین لەکاردا بوو، بەهەر جۆرو شێوەیەك کە بگونجێ وەك لە پاش هاتنی ئیسلامیش هەرئەوە لەکاردا بووو باو بوو لەناو بێگانەدا، تا چەرخی هەژدەهەمی زایینی کە بەهۆی ئیسلام‌و موسڵمانانەوە فێری هێندێ لەباوو وێڵ‌و کردەوەی پیاوانە بوون، بەڵام ئەوەش زۆرتر هەر قسەی ڕووت بوو، پێویستە لەسەر ئەوانەی کە نەشارەزان کە ئەم جۆرە شتە ڕاستانە بزانن، بزانن کە ئیسلام هات لەبەر بەزەیی‌و میهرەبانی خوا بە هەموو جیهان‌و جیهانیان بەبڕوادارو بێ‌بڕواوە. ئینجا بەرامبەر ئەو پاکی‌و بێگەردیەی ئیسلامە خوا بەڵێنی ئەدا بە موسڵمانان بە یارمەتی‌و سەرکەوتن، کارو کردەوەو فڕوفێڵی بێ‌بڕواکان بەبێ نرخ نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە با گومان نەبەن‌و لایان وانەبێ پێش کەوتوون‌و لە دەست قودرەتی خوا دەرچوون بەو ناپاکێتی‌و فڕو فێڵەی کە ئەیکەن ﴿إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ﴾ بێ‌گومان ئەوانە خوا دەستە پاچەو پەك**

کەوتوو ناکەن، بەڵکو خوا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ و پێغەمبەرو بڕواداران زاڵ ئەکات بەسەریاندا، ئەوانە لاوازو بێباوەڕەکانی نرخ ترن لەوەی بڕواداران دەستەپاچە بکەن، لە جای دەستی قودرەتی بێسنووری خوا کە دەسەڵات دارە بەسەر ئەم بوونەوەرەو هەموو شتێکدا، کەواتە با بڕواداران دڵ ئارامو دڵنیابن بەوەی کە پاشەڕۆژی سەرکەوتن و زاڵبوون هەر بۆ ئەوانە، بەڵام بە پێی یاوی خوا زاڵبوون و سەرکەوتن چەند هۆیەکی هەیە یەکێ لەو هۆیانە ئامادە کردن و بەکارهێنانی هەر شتێکە کە هێزو دەسەڵاتی پێ پەیدا بکرێ بەسەر دوژمندا، بەربەستیان بکات لە ڕێگرتن و دەست درێژیی، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾ ئامادەبکەن و فەراهەم بێنن بۆیان، واتە بۆ ئەو ناپاکانەی کەباسکران، هەروەها هەموو دوژمنانی ڕێگر لە ئیسلام، ئامادەبکەن بۆیان ئەوەی دەتوانن و دەسەڵاتتان هەیە بەسەریدا لە هێزو دەسەڵات، واتە هەر شتێك کەمایەی هێزو دەسەڵاتە، بێگومان دیاریی نەکردنی جۆرەکەی لەئایەتەکەدا ئەو گشتێتییە نیشان ئەدات، وەك لە(ئیبن و عەباس)یشەوە هاتووە -خوا لێیان ڕازی بێ- هەموو جۆرەکان ئەگرێتەوە کە بەگوێرەی چەرخ و چین ولات گۆڕان و جیاوازیان بەسەردا هات و بەسەردا دێت، کەواتە ئەو ئایەتە پێویستی کردووە لەسەر بڕوادارانی ئەم چەرخە ئامادەکردن و بەکارهێنانی ئەم هەموو چەکە جۆراو جۆرەی کە ئەمڕۆ وا بەدەست دوژمنەوەو بەبێ سەر لێکردنەوەو بە هەموو دڵ ڕەقییەکەوەو بەبێ جیاوازی بەکاری ئەهێنێ، باوەڕ وایە دیاری کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بڕینی ئەو هێزە بەسەر تیرەندازیی و لێدانی دوژمن لەدەرەوە وەك هاتووە لەو حەدیسەدا کە(ئیمامی موسلیم) ئەیهێنێ بە(عقبەی کوڕی عامر)ەوە کە ئەفەرموێ:(الا ان القوة الرمي) بێدار ببنەوە کەهێز هەر بڕیتییە لەلێدانی دوژمن لەدوورەوە، سێ جار ئەوەی فەرموو، باوەڕ وایە ئەو دیاریی کردن و بڕینەش بەسەر ئەوەدا دەست نیشان تێدایە بۆ ئەم هەموو چەکە جۆر بەجۆرەی ئەمڕۆ کەلە دوورەوە بەکار ئەهێنرێ، ئینجا کورت هەڵهێنانی بۆ سەر ئەم جۆرە دەست نیشانە بەوەی کە ئەم جۆرە گەورەترو گرنگ ترینی هەموو بەش و جۆرەکانی تر، بەوێنەی ئەو حەدیسەی کە ئەفەرموێ:(الحج عرفة) حەج هەر عەرەفەیە، واتە گەورەترو گرنگ تری بەش و پارچەکانی حەج عەرەفەیە،

ئینجا بە هەر حاڵو لەسەر هەر بار ئامادەکردنی ئەو هێزە ئامادەکردنی ئەو ئەسپو ماییانـەش ئەگرێتـەوە کـە ئـەیهێنێ لەدوایـداو ئەفـەرموێ: ﴿وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ﴾ واتـە ئامادەبکەن ئەوانە ئەو وڵاخە سوارانە کە ڕاگیرئەکرێنو ئامادەئەکرێنو بۆ لەشکرێ بەسەر سنووری وڵاتـەوە بۆ بەرگری کردنی دوژمن کەلە ناکاودا پەلامار بدا، بۆ گەیاندنی هەواڵ بەچەسپانی لەسنوورەوە بۆ ناو وڵاتو پایتەخت کە ئەوە بەکارترین شت بووە بۆ پێکهێنانی ئەو مەبەستانە تا ئەم چەرخی دواییە کە ئەم هەموو شتە تازانە پەیدا بوون، جا هەر چەند ئامادە کردنی هێز ئەمیش بگرێتـەوە بەڵام بەتایبەتی باسی کردو هێنای بەدوایدا، لەبەر بەکاریی و گرنگی ئەم لەو کاتو چەرخەدا و بەلای ئەو یەکەم چینەوە کە بەکەمجار ئەم قورئانەی هاتە سەر، ئەگەر فەرمانی بدایە لەو کاتەدا بە پێکهێنانی ئەم شتە تازانەی ئەمڕۆ ئەبو داوای شتێك بکات کە نەنووسراوەو نەلە تواناشدا ئەبوو، کەواتە سەرگەردانی ئەکردن، خوایش پاكو بێگەردە لەوەی شتی وا بکات لەگەڵ بەندەکانی، ئەوەی کە مەبەستو گرنگە ئەمەیە کە ئەبێ ئیسلام هێزو لەشکرو دەسەڵاتی بێتا هەڵسێ بەکارەکەی خۆی کە بریتییە لە گێڕانی تـەنها بەرنامەو شەریعەتی خوا بە حاکمو کاربەدەست لەجیهاندا، نەهێشتنو لابردنی هەر یاساو بەرنامەیەك کەلەلایەنە خواوە نەهاتبێ، پێویستکراوە لەلایەن خواوە لەسەر بڕواداران ئامادەکردنو پێك هێنانی هۆو کەرەسەی ئەو هێزو دەسەڵاتە بە پێی داخوازو پێویستی لە هەموو چەرخو چینو وڵاتێکدا، دوژمنیش ئادەمیو مرۆڤێکە وەك ئەمان، کەواتە هەرچۆنێ هۆی هێزو دەسەڵات فەراهەم ئەهێنن، ئەبێ بڕوادارانیش فەراهەم بێننو هیچ بڕوبیانویەکیان نییە، هەرچۆنێ دوژمن هەوڵو تێکۆشان ئەکات بۆ چەسپاندنو زاڵ کردنی بەرنامەو یاساو بیروباوەڕی پڕوپووچی خۆی، ئەبێ ئەمانیش ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکاربێنن بۆ چەسپاندنو زاڵکردنی یاساو بەرنامەو شەریعەتی پەروەردگاریان کە دادو خۆش بەختیو دەستکەوتنی هەموو ئەو فەرو بیرێك تەنها لای یاساو بەرنامەو شەریعەتی خوایە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ مەبەست لەم فەرمانی خوا،

تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ

---

**ئەفەرموێ:** ﴿تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ واتە ئامادە بکەن بۆیان ئەوەی کە باسکرا لە کاتێك ئەترسێنن بەو ئامادەکردنە، یان ئامادە بکەن بۆیان ئەوەی کەباسکرا لەکاتێکدا ئەترسێنن بەو ئامادەکردنە، یان بەئامادەکراوەکان، دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان ﴿وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ﴾ کەسانێکی تریش بێجگە لەوان کە ﴿لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ ئێوە نایانناسن و خوا ئەیانناسێ، واتە ئەترسێنن ئەو دوژمنانەتان کە ئاشکران و ئەیانناسن کە زانا و ئاگایە بە هەموو شتێ، ئیتر ئەمانە ئەوانە بن کە بەئاشکرا جاڕی دوژمنایەتی و جەنگ کردنیان نەدابێ، بەڵام لەدڵەوە ئامادەبن بۆ هەل و هەلکەوتێك کە دەستی تێدا بوەشێنن، یان ناپاکان بێت کە هەرچەند بەچەك جەنگ ناکەن بەڵام هەمیشە هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن بۆ تێکدانی نێوانی موسڵمانان و پڕوپاگەندە بۆ سووك کردن و بێ نرخ کردنی موسڵمانان، هەرجۆر مەبەست بێت شتێکی ئاشکرایە کەئامادەیی موسڵمانان و فەرزو پێویستە کە بەهێزترو دەسەڵاتدار تر بن لە جیهاندا بە جۆرێ سام و بیمیان لێ بکرێ، تا بەهۆی ئەوەوە بتوانن ئاڵای ئایینی خوا بەرز بکەنەوەو کۆسپ و ڕێگر نەمێنێ لە بەردەمیاندا، هەرچەند کوشتنی دوژمنی خواو موسڵمانان شتێکی ڕاست و ڕەوا بێت، بەڵام تا بگونجێ و دەست بدات ئیسلام نایەوێ بیکوژێ، بەڵکو هەر ئارامی و میهرەبانی بەکار ئەمێنێ لەگەڵی، جالەبەر ئەوە فەرمووی: ئەترسێنن نەیفەرموو ئەکوژن...هتد!! ئینجا بێ گومان ئامادە کردن و فەراهەم هێنانی هۆی هێزو دەسەڵات بەبێ ماڵ و سامان ناکرێ، لەبەرئەوەی ڕژێمی پاکی ئیسلام دامەزراوە کە بنەڕەتی دەستەبەرەیی موسڵمانان و کۆمەك و قۆڵگیریان بۆ یەکتر، لەبەرئەوە لەپاش بانگ کردن و فەرماندان بە ئامادەکردنی هێزو دەسەڵات فەرمان ئەدات بە بەخت

کردنی ماڵو بەڵێن ئەدات بەئەجرو پاداشت لەسەر ئەو بەخت کردنەو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ ئەوەی کە ئێوە بەختی ئەکەن لەهەر شتێك کەم یان زۆر لە ڕێی خوادا بەتێرو تەواوی پێتان ئەدرێتەوە ـ واتە ئەجرو پاداشتەکەی لەکاتێکدا ئێوە هیچ کەمو کوڕیەکاتن دەربارە ناکرێ لە ئەجرو پاداشتەکەتاندا، هێندێ ئەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە: ئێوە هیچ ستەمو زۆرێکتان لێناکرێ لەلایەن دوژمنەکانتانەوە، واتە بەو بەختکردنە ئێوە هێزو دەسەڵات پەیدا ئەکەن ئەو کاتە دوژمن ناتوانێ هیچ جۆرە ستەمێکتان لێ بکات، بەم جۆرەش هەرچاکە هەرچەنێ تەفسیری ئەکەم زیاتر لە دڵدا جێگیرە. وتەی: لەڕێی خوادا لەم جۆرە شوێنانەدا قورئان ئەیفەرموێ، بۆئەوەیە کە ئەبێ جەنگو جیهادو ماڵو بەختکردنە کە ڕووتو پاكو خاوێن بێت لە هەر نیازو مەبەستێك بێجگە لەنیازی ڕەزامەندی خواو فەرمانبەریی خوا، کەواتە هەر لە یەکەمجارەوە کاری جەنگو فیداکاری ئەبڕێتەوە کەنابێ لەبەر بەرزکردنەوەی کەسێك یان نەژادێك، یان تیرەیەك، یان گەلو ئوممەتێك، هەروەها هەر نیازو مەبەستێکی تر بێجگە لە نیازو مەبەستی ڕەزامەندی خواو بەرز کردنەوەی ئاڵاو وتەی خوا، چەسپاندنی خوایەتی خواو حاکمێتی خوا لە جیهانی خواداو لەناو بەندەیانی خوادا، کە هەر ئەوەش مایەی ئازادیو سەربەستیو پیتو فەڕو ڕێزە بۆ جیهانو جیهانییان، بەرامبەر ئەوانەی کە پەیمانیان بەستبێ لەگەڵ موسڵماناندا دوو بڕیاری دەرکرد: یەکەم دەربارەی ئەوانەیان کە پاشگەز ببنەوەو پەیمانەکەیان بشکێنن، دووەم دەربارەی ئەوانە بەئاشکرا نەیان شکاند بەڵام بەهۆی چەند نیشانەو بەڵگەیەکەوەمەترسی شکاندنی لێ ئەکرێ. ئینجا دێتە سەر بڕیاری سێیەم دەربارەی ئەو دوژمنانەی کە مەیلی ئاشتیو کەنار گرییان ببێ، وتارو کرداریان نیشانە بێ لەسەر ئەوە. دەربارەی ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا﴾ ئەگەر ئەوانە مەیلو ئارەزووی ئاشتیو جەنگ نەکردنیان هەبوو ئەی پێغەمبەر تۆش مەیلی ئارەزووی ئەوە بکە ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ پشت ببەستە بەخوا، واتە باکت نەبێ لەپیلانو فێڵو نیازی بەدیان،

﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڕاستی خوا بەتەنها ئەو بیسەری زانایە بەڕێکو ڕاستی بۆ هەموو شتێو بە هەموو شتێ، کەواتە هەر قسەو بڕیارو کەینو بەینێکی نهێنییان ببێو ئەبیستێ، زانایە بە هەموو نیازو ئیشێکیان. ئەمە ئەگەر ڕووکەشو ڕواڵەتی ئایەتەکە وا ئەگەیەنێ کە ئەم بڕیارە شتێکی گشتیو هەمیشەییە، وەك هێندێ لەزانایانیش بەو جۆرەیان داناوە، مەیل بۆ ئاشتیەکەشیان داناوە بەڕازی بوون بە(جزیە) سەرانەدان، بەڵام ئایا ئەم ڕایە ناگونجێ لەگەڵ ڕووداوی مێژووییدا، چونکە ئەم ئایەتە لەساڵی دووەمی کۆچیدا هاتووەتە خوارەوە لە ڕووداوی بەدردا، بڕیاری سەرانەدان لەپاش ساڵی هەشتەمدا هات، کەواتە ئەوەی کە ڕاستو ڕێك بێت ئەمەیە کە بڕیاری ئەم ئایەتە نەگشتییەو نەهەمیشەییە، بەڵکو بڕیاری هەمیشەیی ئەوەیە کە لەپاشدا هاتە خوارەوە لەسوورەتی(التوبة)دا، کە کورتەکەی ئەوەیە: خەڵکی بەسێ بەش بەرامبەر ئیسلام: جەنگ کەر کەجەنگی لەگەڵ ئەکرێ، موسڵمان کە هەر شەریعەتی خوای ئەوێ. ئەهلی زیمە کە سەرانە ئەدات گیانو ماڵو ناموسو مافی پارێزراوە تا لەسەر پەیمانی خۆیان بە ڕاستی بمێننێتەوە، بێجگە لەم بڕیارە هەر بڕیارێکی تر بووبێ هەموو شتێکی کاتی بووەو ئیسلام بەرەبەرە دەستکاری کردن تا گەیشتە ئەم دواترین بڕیارە، وەك دەست نیشانمان بۆکرد لە باسە پاڵفتەکەی(ئیمام ئیبن القیم)دا، کەواتە ئەم بڕیارەی لەم ئایەتەدا شتێکی کاتییەو بۆ قۆناغی تایبەتییە، ئەو بڕیارەی کە کرا بە هەمیشەییو هەتا هەتایی ئەوەیە کە لە سوورەتی(التوبة)دا هات، لەپاش ئەوە ئیسلام لەگەڵ خەڵکیدا بڕیاری هەر ئەمەیە: یان موسڵمان بوون، یان سەرانەدان. یان جەنگکردن تا بتوانێ بۆ ئەوەی ملکەچی هەر بۆ خوا بێو هەر ئاییني خوا حاکمو کاربەدەست بێ، نابێ بەهیچ جۆر گوێ بدرێ بە قسەو باسی زۆر لە نوسەران کە دووچاری شکانو شکستێکی دەروونیو ژێرپێ بوون بەهۆی زەختو زۆری واقیعەوەو بەو هەستەوە لەبارەی جیهاد لە ئیسلامدا نوسیویانە، لەبەر ئەوە زاتیان نەبوو ڕووبەڕووی جیهان بوەستنو ئەم دواترین بڕیارەی ئیسلامیان بۆ باس بکەن، کەیان ئیسلام یان سەرانەدانو پەیمانی ئاشتی، یان جەنگ وەك باسکرا، لەکاتێکدا ئەو نوسەرانە ئەبینین کە هەموو هێزی نەفامی بە هەموو چەكو کەرەسەیەکی تازەوە، ئەبینین کۆمەڵی موسڵمانی ڕاستەقینە زۆر کەمنو بێباوەڕەکانی دەسەڵاتو بێزراون لەناو کۆمەڵو جەماوەردا، لەم کاتەدا ئەو شکانو شکستە دڵو دەروونیان داگیر ئەکاتو ناچار ئەبن کە دەست بگرن بەئایەتو حەدیسەکان کە بڕیارەکانیان

کاتین و بۆ قۆناغ و ماوەیەکی تایبەتی هاتوون، ئەو ئایەت و حەدیسانەی کە دواترین بڕیاریان هێناوە لاریکەنەوە و لایان دەن لەبارو مەبەستە ڕاستەقینەکەی خۆیان بە تەئویل و پینەو پەڕۆی ناڕاست کە بەکاری دێنن، تا ئەو ڕادەی ئیسلام کورت هەڵئەهێنن لە چوار چێوەی وڵاتەکەی خۆیداو نابێ دەست درێژبکات بۆ هیچ شوێن و وڵاتێکی تر، تێکۆشان و جیهاد هەر بر ئەوەیە دەست درێژیی نەکرێ و پەلاماری وڵاتەکەی نەدرێ، ئیسلام پێویستە لەسنووری خۆیدا بوەستێ لە هەموو کاتێکدا، ماف ئەوەی نییە داوا بکات لەکەسانی تر کەبێنە ژێر سایەیی و بگرنە گەردن و ملکەچ بکەن بۆ بەرنامەکەی، نابێ هێزو چەك بەکاربێنن لەو مەیدانەدا، نابێ بەرەنگاری کەسانی تربکەن، مەگەر بەباس و وتارێکی ڕووت!! ئەو نووسەرانە ئەیانتوانی هەموو قۆناغەکانیان باس بکردایەو بیانگوتایە لەپاش بڕینی قۆناغە کاتیەکان، ئینجا دواترین قۆناغ دێتە پێشەوە ئەگەر بەو جۆرەیان بکردایەو بەرەنگاری واقیعیان بکردایەو بوەستانایە بەرامبەریان بەو قۆناغە کاتیانەی یەکەم جارو یەکەم چین، وەك دانیشتووەکانی ئەمڕۆ ئەڵێن: کاتی جیهاد نەهاتووە، هەر چاکتر بوو لەوەی دواترین بڕیارەکە بشارنەوە و دانی پیانەنێن. هەرچەند قسەو بڕیاری ئەمانیش زۆر ناڕاستە وزیانی گەیاند بەزۆر کەس لەوانەی نەشارەزان لە ئیسلامدا، بزووتنەوەی جیهادیان پەك خست لە دەروونیاندا، ئەگەر بەقسەی ئەمان بکرایە ئەبوو ئەم بێداربوون و وریا بوونەوە جیهانییەی ئەمڕۆ بەرپا نەبووایە، ئەبو خوا نەخواستە ئەفغانستان ئەمڕۆ پارچەیەك بوایە لە یەکێتی سۆڤیەت. بەڵام تێکۆشەرو مجاهدەکانی ئەفغان خوا سەربەرزیان بکات لە هەردوو جیهاندا بە گوێی دانیشتوانیان نەکرد تا ئەوەیان کرد کە کردیان و هەڵسان بە کارێ کەبوو بە موعجیزەی ئیسلام لە چەرخی پازدەهەمی کۆچیدا، ئەوان هەڵسان بە واجبی سەرشانیان، خوا نەخواستە ئەگەر نەگەن بەئامانجی ئەواویان سوچی ئەوان نییەو خەتاو سوچەکە ئەگەڕێتەوە بۆ هەموو موسڵمانان کە بەجارێ تاچن بەدەمیانەوە بەرامبەر پیلانەکانی هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو بەکرێ گیراوەکانیان. دوژمنانی ئیسلام بە یارمەتی دانی ئەو نووسەرانە توانیان هەست و ڕۆحی جیهاد سست بکەن و نەیهێڵن لە دەروونی موسڵماناندا، تا موسڵمانان دوورکەوتنەوە لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆیان کە جیهادو تێکۆشانە بەبێ وچان و وەستان تا بەربەست و کۆسپ نەما لەڕێگەی دوژمناندا، بە هۆی ئەوەوە بەئاسانی سەریان کردە وڵاتی ئیسلام بە پێست و ئێسکەوە هاڕییان و قوتیاندا، ئینجا ئەوا موسڵمانان هۆشێکیان کردەوەو خەریکن ئەگەڕێنەوە سەر ڕاستە شەقامەکەی خۆیان بە ئیزن و یارمەتی

خوا ئەو کاتە خوا ئەم هەموو گرێو کۆسپەیان بۆ تەخت ئەکات وەك یەکەمجار تەختی کرد بۆ موسڵمانانی یەکەمجار. ئینجا بۆ زیادە ڕوون کردنەوە بەجوانی ئەزانم چەند نموونەو وێنەیەك باس بکەن لەو کردەوەو بڕیارە کاتیانە پێش هاتنە خوارەوەی بڕیاری هەمیشەییو هەتا هەتایی کەلە سوورەتی(التوبة)دا هات:

شتێکی ئاشکراو بەناو بانگە کە پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەیەکەمجاری دامەزرانو نیشتە جێیی لە مەدینەدا پەیمانی بەست لەگەڵ جوولەکەکانی دەورو بەری مەدینەو بت پەرستەکان، پەیمانی ئاشتیو وازهێنان لە ئاژاوەو ناکۆکی، پەیمانی هاوبەشی کردن بە هەمووان لە بەرگری کردن لە مەدینە، لەگەڵ بڕیاری ئەوە کە دەسەڵاتی هەرە بەرزو جڵەوی کار بەدەست پێغەمبەرەوە بێت(ﷺ)، لەسەر بەڵێن دان بە بەرگری کردن لە مەدینە بەدژی قورەیش، یارمەتی نەدانی هەرکەس کە پەلاماری مەدینە بدات، یان بەستنی هیچ پەیمانو سوێندخوارییەك لەگەڵ بت پەرستانێ کەجەنگ کەرن بەبێ ئیزنو ڕەزامەندی پێغەمبەر(ﷺ)، لەو کاتەدا خوا فەرمانی پێدا کە ئاشتی بەکاربێنێ لەگەڵ ئەوانەی کە مەیلی ئاشتی ئەکەن، هەرچەند هیچ پەیمانێکی لەگەڵ نەبەستن، لەیەکەم جارەوە بەو جۆرە پەیمان بەسترا، بەڵام ئەوە شتێکی کاتی بوو بەجێ هێنرا لەو قۆناغەدا، لەڕووداوی خەندەقو جەنگی ئەحزابدا کە لەدەرەوە هاتنە سەر لەناوخۆیشەوە(بني قريظة) پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە لەو ڕووداوەدا پێغەمبەر(ﷺ) ناردییە لای(عویەینەی کوڕی حیسنو حاریسی کوڕی عەوف) کە یەك لەسەر سێی میوەجاتی مەدینەیان بداتێ لەسەر ئەوە کە بەخۆیانو تاقمەکەیانەوە بگەڕێنەوەو یارمەتی قورەیش نەدەن، ئەوەشی کەکرد مەبەستی ئەوە بوو مەدینەییەکان دووچاری زیانی گەورە نەبن، ئینجا ئەوانیش -خوا لێیان ڕازی بێ- ڕایان نەدا بۆ ئەوەو گوتیان بێجگە لە شمشێر هیچیان پێنادەین، ئەوەش دووبارە شتێکی کاتی بوو لەبەر ناچاری ویستی بیکات، نەك بڕیارێکی هەمیشەیی بێت، هەروەها لەپەیمانی حودەیبیەدا ئەو بڕیارانەش هەر شتێکی کاتی بوو نەك بڕیارێکی هەتا هەتایی، بەڵام لەبەر ڕووناکی ئەو کردەوانە ئەکاربەدەستی ئیسلام ئەتوانێ هەڵسێ بەوێنەی ئەو کردوەو بڕیارانە لەکاتی تایبەتیو پێویستو ناچاریدا، هەرکاتێ ئەو هۆیانە نەماو بەسەر چوون دیارە دواترین بڕیاردێتەپێشەوەکەیان ئیسلام یان سەرانە یان جەنگ بەپێی توانا، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆژێر سایەی ئایەتەکان،فەرمانیداکەئەگەرئەوان مەیلی ئاشتیان بووتۆیش مەیلت بێوئاشتیان لەگەڵ بکەوپشت بەخوا ببەستە،

وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾

**ئینجا هەمیتر دڵنیایان ئەکات و باکیان ناهێڵێ لە پیلانیان ئەگەر ناپاکی بکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانە ویستیان کە فێڵت لەگەڵ بکەن و بت خەڵەتێنن ﴿فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ﴾ ئەوا خوات بەسەو بزانە کە خوا یارمەتی دەرتەو چارەسەری شەڕو پیلانی ئەوانت بۆ ئەکات. ئینجا وێنەو نموونەیەك لە یارمەتی دان و چارەسەر کردنی ئەخاتە بەرچاو تا یەوە زیاتر دڵی بەهێز ببێ، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خوا ئەو خوایەیە کە تۆی بەهێز کرد بەیارمەتی دانی خۆی و بە بڕواداران ﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ هۆگری کردن بەیەکترو هۆگری خستە نێوان دڵەکانیان. ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ ئەگەر هەرچی وا لەزەویدا بەختت بکردایە هۆگریت نەئەخستە نێوان دڵەکانی ئەوان و ئەو دڵانەت هۆگر نەئەکرد ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾ بەڵام خوا هۆگری خستە نێوانیان و هۆگری کردن ﴿إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زاڵی لێزانی کاردروستە، خوا توانا و زاڵە بەجۆرێ هیچ شتێکی لێ یاخی نابێ و ناتوانێ سەرپێچی لێ بکات، کارزان و کارسازەو ئەزانێ چی ئەکات و چۆن ئەکات و هەرچی ئەو ئەیکات هەر ئەوە ڕاست و دروستە، بەڵێ بەڕاستی ئەوە موعجیزەی خوابوو، بەدڵی کەسدا نەئەهات کە ئەو هێزە یەکگرتووە پێك بێت لەو گەل و کۆمەڵە کە دوژمن و دڵتۆراوە بوون بەیەك و ئاژاوەو دوژمنایەتی دوورو درێژە هەبوو لەناویاندا و خوێنە خواری یەك بوون، ئیتر چ ئەوس و چ خەزرەج، چ کۆمەڵی کۆچکەران کە ئەوانیش وەك مەدینەییەکان بوون لەچەرخی نەفامیاندا، لەو گەل و کۆمەڵە ئوممەتێك پەیدابوو کەجیهان و زەوی شتی وای نەدیبوو بە خۆیەوە، مێژووی ئادەمی و وێنەی نەبیستبوو، ئوممەتێك پێکهات کەبەڕاستی نموونەو وێنەی دانیشتوانەکانی بەهەشت بوو کە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ:(ونزعنا ما في صدورهم من غل إخوانا) بێگومان دائەڕنین ئەژین! بەڕاستی ئەم عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامە زۆر نایاب و سەر سووڕهێنەرە، هەرکاتێ**

تێکەڵی دڵەکان بوو، وەرئەگەڕێ بە سۆزو بەزەیی و هۆگریی و خۆشەویستی و دڵ نەرمی، بەجۆرێ دڵ و دەم و چاو هەموو ئەندامەکان ئەو ئاوازە لێ ئەدەنەوە هۆش و هەست پڕئەکات لە ئاشنایی و کۆمەکی و چاوپۆشی و پەیوەندی و پەیوەستی، بە جۆرێ کەس لەوە تێناگات و هیچ کەس هۆکەی نازانێ بێجگە لەو پەروەردگارەی کە ئەو گۆڕان و گۆڕانکاریەی هێنا بەسەر ئەو دڵانەدا، هیچکەس ئەو تام و بۆنە خۆشە هەست پێناکات بێجگە لەو دڵە خوا پێداوانە کە خوا دروستی کردن و ئەو گۆڕانەی بەسەر هێنان!! ئینجا هەمیتر دڵنیایی و دڵئارامی ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) لەپاش ئەو بەو بڕوادارە هۆگرانە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەسە خوا بۆتۆو ئەو بڕوادارانەی کە شوێنی تۆ کەوتوون و پەیڕەوی تۆیان کردووە، یان تۆ لەگەڵ بڕوادارانـدا خوا بەسە بۆتان و بۆ چارەسەرکردنی کاروبارتان، یان خواو بڕواداران بەسە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر، بەم سێ جۆرە تەفسیر کراوەتەوە، بەپێی ڕێزمانی عەرەبی هەرسێ هەڵئەگرێ. دووەم لە مەبەستدا هەر یەکەم ئەگرێتەوە، ئەوەی جیاواز بێت لە مەبەستدا سێیەمە لەگەڵ هەردوو، هەرچەند ئەم سێیەمەش ئەگونجێ و دەست ئەدات، هێندێ لەزانایان باوی ئەدەن بەسەر ئەو دووبارەکەی تردا، بەڵام لەڕاستیدا لە چەند ڕوویەکەوە لاوازی هەیە، کەواتە چاك وایە هەر باری یەکەم بگرین بەدەستەوە، چونکە ڕێك ترە لەگەڵ بڕوا بەتاکو تەنیایی خوا کە یەکەم و سەردەستەیە و بنەڕەتە بۆ ئایین و شەریعەتی خوا، هەروەها ڕێکە لەگەڵ چەند ئایەتێکی تردا کە ئەو بەسیتی چارەسەرە هەر بۆ خوا دانێن و کورتی هەڵئەهێنن لە خوادا، ئینجا لەسەر ئەم بارەش نابێ بە دووبارە کردنەوە لەگەڵ ئایەتی ئایەتی پێشوودا کە فەرمووی: ﴿فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ﴾ چونکە مەبەست بەوە بەسیتی و چارەسەر کردنێکی گشتییە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) مەبەست بەم ئایەتی ئێرە بەسیتی و چارەسەرکردنێکی گشتییە بۆ خۆی و بۆ شوێن کەوتووەکانی لە هەموو بارو حاڵێکدا، پێویستە بیری خەڵکی لێرەدا بوەستێ لەبەردەم ئەم فەرموودەیەدا تا بەراووردێك بکات لەنێوان هێزی بێسنووری هەرە گەورە کە هیچ شت و هیچ هێزێك چاو ئەودا، بەراوردی ئەو هێزی بێباوەڕەکانی سنوورە بکرێ لەگەڵ هێزی لاوازی بێکەڵکی بێسەروبنی بێبڕوایان کە پەلاماری لەشکرو سەربازەکانی خوا بدەن لەناوبردن و لەکارخستنیان، بیر لەوە بکرێتەوە تا دەرکەوێ جیاوازن ئەو دوو هێزە و دڵنیایی ببێ لەدوا ڕۆژو چارەنووسی ڕیسوایی و سەر شۆڕیی و لەناو چوونی هێزە بێهێزو لاوازەکەی بێبڕواکان.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾

جا لەبەرئەوە بە هەموو هێزو بێباکییەوە ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِۚ﴾ زۆر بەتوندی هانی بڕواداران بدە لەسەر جەنگکردن لەگەڵ دوژمناندا، مەیلیان پێ پەیدا بکە لەو جەنگەدا، سووك و ئاسانی بکە لە پێش چاویان و بێباکی نیشان بدە لەو جەنگەدا، هانیان بدە، چونکە ئەمان هەرچەند کەمترین هاوسەرن بۆ ئەوان ئامادەی یەك بۆ دە، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِۚ﴾ ئەگەر ببێ لە ئێوە بیست کەسی خۆڕاگر زاڵ ئەبێ بەسەر دووسەد کەس لە بێبڕواکاندا ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەگەر ببێ لەئێوە سەد کەس زاڵ ئەبێ بەسەر هەزار کەس لەوانەی بڕوایان نەهێناوە ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی ئەوان گەل و کۆمەڵێکن نافامن و پەروەردگاری خۆیان ناناسن و لەبەر مەبەست و هۆیەکی پاك و بەڕێز جەنگ ناکەن، مەبەستیان فەرمانبەری و ڕەزامەندی خوا نییە، باوەڕیان هەر بەم ژیانی دنیایە هەیە، کەواتە دڵیان نایە هەروا بە خۆڕایی لە کیسی خۆیانی بدەن، بەپێچەوانەی بڕواداران کە خوای خۆیان ئەناسن و مەبەستیان فەرمانبەریی و ڕەزامەندی ئەوە، بەتەمای ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دوایین لای ئەو، ئەزانن ئەم ژیانە بەهەر جۆر ببێ شتێکی کەم و کەورتە و هەر ئەڕوا، ژیانی ڕاستەقینەی نەبڕاوە لەو دنیا ئەبێ و فیداکاریی و گیان بەخشین لەڕێگەی خوادا هۆی گەیشتنە بەو ژیانە پاك و خاوێنە نەبڕاوە کەواتە بەهێزی دڵ و سۆزو پەرۆشەوە پەلامار ئەدەن و جەنگ ئەکەن، ئەزانن لە جەنگەکەیاندا یەکێ لەدوو شتی گرنگیان دەستکەوت ئەبێ: سەکەوتن و [illegible] کەوتی سامان و غەنیمەت، یان شەهیدی و گەیشتن بەبەهەشت، کەواتە نەفامی و تێنەگەیشتنەکەی ئەوان هۆی ژێر کەوتنیانە، هەر دوو ڕستەکە وانیشان ئەدەن کە بڕوادار یەك بەدەیە لەگەڵ بێبڕوادا، هێنانی ڕستەی دووەم، لەگەڵ ئەوەی مەبەستەکەی وەرئەگێڕێ لەڕستەی یەکەم بۆئەوەیە ــ وەك زانایان ئەفەرموون ــ کە ئەم ڕادەو ڕێژەیە ناگۆڕێ و وەك یەك وایە لەکاتی کەمی و زۆری ژمارەی ئەو دوو دەستەو تاقمەدا، دیاریی کردنی ئەو ڕێژە یەك بە دەیان لەگەڵ سەدو بەسەدان لەگەڵ هەزاردا بە پێی باوی عەرەبە کە

هەزار دائەنێن بەئەو پەڕو دواترین ناوی ژمارە، باسی بیست و سەد بە تایبەتی بەپێی مەفرەزەکانی پێغەمبەربووە(ﷺ) کەلەبیست کەمتر نەبوون و لەسەدیش زیاتر نەبوون، ئینجا ئایا مەبەست بەم دوو ڕستەیە، هەروەها وو ڕستەی وێنەی ئەمان لەئایەتی داهاتوودا مەبەست پییان هەواڵدانەو بەڵێن و مژدە دان وەك هێندێ لەزانایان ئەفەرموون؟ یان مەبەست دەست نیشانە بەئەندازەی هێزی بڕواداران بەرامبەر بێبڕواکان لە تەرازووی خواداو ئاشنا کردنی بڕواداران بەوە تا دڵنیا بن و دڵخۆش و دامەزراو وەك هێندێکی تر ئەفەرموون؟ یان مەبەست بە فەرماندانە بە خۆگرتنی بڕواداران بەرامبەر بێبڕواکان بە پێی ئەو ڕادەو ڕێژەیە کەلەم ئایەتەو ئایەتی داهاتوودا هاتووە، کەواتە نابێ یەك بڕوادار ڕابکات بەرامبەر دەی بێبڕوا. یا دوو بێبڕوا وەك زۆریە ئەفەرموون؟ هەرکام لەم سێبارە ئەگونجێ و هەڵئەگرێ، بەڵام ڕای سێیەم لە دڵدا بەهێزترو دامەزراوترە، چونکە ئەگەر هەرکام لەدوو ڕای پێشوو مەبەست بوایە نەئەگۆڕاو دەستی نەدا بۆ گۆڕان و سڕینەوە، دەی گۆڕین و سڕینەوەش ڕووی کردە ئایەتی یەکەم بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ ﴾ ئێستا خوا فەرمانەکەی سووککرد لێتان ﴿وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ﴾ زانی کە لاوازیتان تێدایە، واتە ئەو لاوازییەی کە زانیویەتی لێتانەوە دەرکەوت و ئاشکرابوو، ئیتر مەبەست لاوازی و بێهێزی و بێدەسەڵاتی و دەستە پاچەیی، یان لاوازی ژیریی و لێزانی، خوا فەرمانی پێشوو سووککرد بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ﴾ بەم ڕەنگە ئەگەر ببێ لە ئێوە سەد کەسی خۆگر ﴿يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ﴾ زاڵ ئەبن بەسەر دووسەد کەس لە بێبڕوایان ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ ﴾ ئەگەر ببێ لەئێوە هەزارکەس ﴿يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ﴾ زاڵ ئەبن بەسەر دووهەزاردا بە ئیزن و فەرمانی خوا ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ خوا لەگەڵ خۆگراندایە، واتە بە کۆمەکی و یارمەتیدان. بێجگە لە ئایەتەکە چەند هەواڵ و حەدیسێك هەیە بەڵگەو نیشانەن لەسەر باری سێیەم واتە لەسەر ئەوەی کە مەبەست بە ئایەتی پێشوو فەرماندانە، بەم ئایەتی دواییە ئەو فەرمانە پێشووەی سووك کردو سڕیەوە، یەکێ لەو بەڵگانە ئەم هەواڵەیە کە بوخاری و موسلیم و کەسانی تر هێناویانە لە(ئیبن و عەباس)ەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە ئەفەرموێ: کاتێ کە ئایەتی پێشوو هاتە خوارەوە بووبە ناڕەحەتی بەسەر موسڵمانانەوە، چونکە فەرزو پێویست کرا لەسەریان کە یەکێك لە موسڵمانان ڕانەکات لە دە کەس لە بێبڕواکان،

ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِۚ

---

ئینجا سووککردنی ئەو بڕیارە هات وەك فەرمووی: ﴿ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ﴾ ئینجا ئایە ئەم ئایەتە سووککردن بوو یان سڕینەوە بۆ ئایەتی پێشوو، کۆمەڵ و جەماوەری زانایان لەسەر ڕای دووەمەو هێندێ لەسەر یەکەمە، کەواتە ئەگەر کەسێك لە موسڵمانان بەرامبەر بەدە کەس لە بێبڕوایان وەستا و کوژرا لەسەر ڕای یەکەم گوناهبارە، لەسەر ڕای دووەم گوناهبار نابێ، لەم دوو ئایەتەدا چەند قسەو باسێکی تری گرنگ هەیە لێیان بێدەنگ بووین لەبەرئەوەی زۆر درێژە نەکێشێ.

ئینجا دوای هاندان لەسەر جەنگ و موژدەو بەڵێن دان بە زاڵبوون بەوجۆرو شێوەی کە تێپەڕی کرد، ئینجا دێتە سەر باس و بڕیاری دی بە بۆنەی ڕاو کردەوەی پێغەمبەرو بڕواداران لە دیلەکانی بەدردا، ئەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ نەبووەو شایستە نەبووەو ڕاست نییە بۆ هیچ پێغەمبەرێك کە دیل و دەست گیرکراوانی ببێ هەتاکو کوشتنی زۆر نەکات لە وڵاتداو هێزو دەسەڵاتی دوژمن نەشکێنێ، واتە جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا بۆ ئەوەیە هێزو دەسەڵاتی ستەمکارو دەست درێژیی کەران نەمێنێ دەی ئەوەش بەمە ئەبێ کەئەوانە لەناو ببرێن و هەق خواهو دادپەروەران بێنە کایەو ئایین و شەریعەتی خوا زاڵببێ. دەی بەدیل گرتن و هێشتنەوەی ئەو ستەمکارانە دژی ئەو مەبەستە پاك و خاوێنەیە.(ئیبن و ئیسحاق) ئەفەرموێ: کاتێ موسڵمانەکان لەبەدردا زاڵبوون دەستیان بەدیل گرتن کرد،(سعدی کوڕی معاذ -خوا لێی ڕازی بێ- لە دەرگای شوێنەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) پاسەوان بوو لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵەکان، پێغەمبەر(ﷺ) هەستیکرد بە ناڕەزایی و پێناخۆش بوونی(سعد)و پێی فەرموو: ئەی(سعد) وەك پێت ناخۆشبێ ئەوەی کە ئەو موسڵمانانە ئەیکەن، ئەویش گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە یەکەم ساتمەو بەسەرهاتی گەورەو سەختە کە خوا هێنای بەسەر ئەو بت پەرستانەدا، ئینجا لەناوبردن و کوشتنی ئەوانەم پێخۆشترە لە هێشتنەوەیان!(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئیبن و

عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەویش لە(عومەر)ەوە کە ئەفەرموێ: کاتێ بت پەرستەکان لە ڕۆژی بەدردا شکان، بەم ڕەنگە حەفتایان لێ کوژراو حەفتایان لێ بەدیل گیرا، پێغەمبەر(ﷺ) پرس و ڕای کرد بە ئەبوبەکرو عومەرو عەلی لەبارەی ئەو دیلانەوە، ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە خزم و کەس و کارن، من ڕام وایە بە ماڵ و سامان بەرەڵایان بکەین، ئەوکاتەی ئەوەی کە لێیان وەرئەگیرێ ئەبێ بەهۆی هێزو دەسەڵاتمان بەسەر بێبڕواکاندا، بەڵکو خوا ڕێنموونیان بکات و موسڵمان ببن و ببن بە کۆمەک و قۆڵگیر بۆمان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کوڕەکەی خەتاب تۆ ڕات چۆنە؟ ئەفەرموێ: منیش وتم: واللە من ڕام وانییە لەوەی ئەبو بەکر لێیەتی، بەڵکو من ڕام ئەمەیە فەرمان بدەی من فلانی خزمم بکوژم و علی عەقیلی برای بکوژێ، حەمزە فلانی برای بکوژێ، تا دەرکەوێ کەلە دڵماندا نییە بەکاریبێنین بەرامبەر ئەو بت پەرستانە، ئەوانە سەرۆک و پێشەواو جڵەوکێشی قورەیش! ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) مەیلی بەلای ڕاکەی ئەبوبەکرەوەبوو ڕاکەی منی پێخۆش نەبوو، پارەو ماڵی لێ وەرگرتن و بەرەڵای کردن، ئینجا بۆ ڕۆژی دوایی چووم بۆ خزمەت پێغەمبەرو ئەبوبەکر تەماشام کردن ئەگرین، منیش گوتم: چی ئەتانگریەنێ؟ ئەگەر گریانم هات ئەوا ئەگریم. ئەگەر هۆی گریانم نەبوو ئەگریەم لەبەر گریانەکەی ئێوە: ئەویش فەرمووی: ئەگریەم لەبەرئەوەی ئەو خەڵکە فیدیەو ماڵی وەرگرت لەوانە، سوێند بەخوا سزای ئێوەم نیشان درا نزیک تر لەو درەختە، دەست نیشانی کرد بۆ درەختێکی نزیک لەخۆیەوە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:(ماکان لنبی... هتد)، ئەم حەدیسە(موسلیم و ئەبو داودو ترمزی و ئیبن و جەریرو ئیبن و مەردەویە)ش ڕیوایەتیان کردووە. وێنەی ئەم ڕیوایەتە لە چەند ڕێگەیەکی تریشەوە هاتووە بەکورت ترو درێژتر، بەکورتی ڕای فاروق لەدوو بارەوە بەرژەوەندی تێدابوو:

١- شکاندن و کەم کردنەوەی هێزی بێبڕواکان نەتوانن نیازی جەنگ و پەلاماردانی تر بکەن.

١- دەرخستن و دەربڕینی خەشم و قین و لەدوژمنانی خوا تا ئەو ڕادەی سۆزو بەوەیی خزمایەتی ژێرپێ بکرێ لەپێناو ڕەزامەندی خوادا، هەروەها گوێ نەدرێ بە دەستکەوت و شت و مەکی ئەم جیهانە هەر دەستکەوتی ڕۆژی دوایی بە گرنگ بگیرێ.

تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّمَن فِىٓ أَيْدِيكُم مِّنَ ٱلْأَسْرَىٰٓ إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِى قُلُوبِكُمْ خَيْرًا

---

ئەو دوو هۆیە بوو ڕاکەی فاروق –خوا لێی ڕازی بێ– لەو جەنگی بەدرەدا، لەبەر ئەوە ئایەت هاتە خوارەوە ئەو گلەییە سەختەی ئاڕاستەی موسڵمانەکانکردو ئەم سەرزەنشتە بەتینەی تێگرتن و فەرمووی: ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا﴾ شتومەك و پارەو ماڵی دنیاتان ئەوێ کەشتێکی دامەزراو نییەو دێت و ئەڕوا، ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ﴾ خوایش ڕۆژی دوایی ئەوێ. واتە بڕواداران ئێوە ماڵ و شتومەکی دنیاتان ئەوێ کەشتێکی دامەزراو نییەو دێت و ئەڕوات و نامێنێ، خوایش ئەجرو پاداشت و دەستکەوتی ڕۆژی دوایی ئەوێت بۆتان لەو بڕیارانەی کە داوێتی و ئەیدا، بێگومان موسڵمان و بڕواداران پێویستە شتێکیان بوێ کە خوا ئەیەوێ ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ خوا توانا و زاڵی لێزانی کاردروستە، هەر بەو پێیە ئێوەی سەرخست و زاڵی کردن، ویشتی زۆرو دەسەڵات و کەشخەی بێبڕواکان بشکێنێ، بۆئەوەی هەق بە هەق دەربخات و ناهەق بە ناهەق هەرچەند تاوانباران دڵ شکست و غەمبارو سەرشۆڕبن، ئینجا زیاتر کارەکەیان سەخت و سامناك ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ﴾ ئەگەر نامەیەك نەبوایە لەلایەن خواوە کەپێشکەوت و تێپەڕی کردبوو.

﴿لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ دووچارتان ئەبوو لەبەرئەوەی کە وەرتان گرت سزایەکی سەخت، مەبەست بەو نامەیە بڕیاردانی خوایە بە سزادانی ئەوانەی کەلە بەدرا جەنگیانکرد، وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە(بوخاری و موسلیم) و کەسانی تر هێناویانە لەبارەی(حاتبی کوڕی ئەبو بەلتەعە)وە کە نامەی نارد بۆ مەککەییەکان و هەواڵی پێدان کە پێغەمبەر(ﷺ) نیازی کردووە بچیچتە سەر مەککە بۆ گرتن و فەتح کردنی، ئینجا عمر –خوا لێی ڕازی بێ– گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێم گەڕێ بابدەم لە گەردنی(حاتب)، ئەویش فەرمووی: تۆ چووزانی ئومێد وایە کە خوا سەرنجی ئەوانەی بەدری داو فەرمووی: چی ئارەزوو ئەکەن بیکەن، بێگومان من لێتان بوردم. ئەمە بەلای هێندێ لە زانایانەوە، هێندێکی تر ئەفەرموون: مەبەست بڕیاردانی خوایە بەوەی سزای موسڵمان نەدات کە پێغەمبەر(ﷺ)

لەناویان دابێت. هێندێکی تر لەسەر ئەوەن کە مەبەست ئەوەیە خوا بڕیاری داوە کە میهرەبانی خوا پێش کەوتووە لە خەشم و سزای. هێندێکی تر ئەفەرموون: مەبەست بڕیاردانی خوایە بەوەی سزای هیچ گەل و هیچکەسێك نادات پێش ڕاگەیاندن و ڕوون کردنەوەی جڵەوگیریەکانی، بێجگە لەمانە شتی تریش گوتراوە، بەڵام بە پێویستم نەزانی باسی بکەم، هەرکام لەمانە بکرێ بە تەفسیری ئەو ئامەیە چاکە بە تایبەتی یەکەمیان، خوا خۆی باش ئەزانێ، لەپاش ئەوەی منەتی نا بە سەریاندا بە سزا نەدانیان، ئینجا منەتی زیاتر ئەنێ بەمەی دەستکەوتی جەنگەکانی بۆ حەڵاڵ کردن، کە لە شەریعەتەکانی پێش ئەمان قەدەغەو حەرام بووە لەسەر موسڵمانی پێشوو، ئەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا﴾ ئینجا بخۆن لەوەی کە گرتتان بە غەنیمەت و دەستکەوتتان بوو بە حەڵاڵی و پاك و خاوێنی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە خواو هەرشتێك کە هۆی خەشم و سزای خوایە ﴿ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە، بەرەئەوە خۆش بوو لەوەی کە کردتان و سەرەڕای ئەوە حەڵاڵی کرد بۆتان ئەوەی کە وەرتان گرت. بێگومان موسڵمانی ڕاستەقینە ئەبێ لەنێوان ترس و ئومێددا بەرامبەر پەروەردگاری وەك لە چەند شوێندا ڕێنموونی و دەست نیشان ئەکات بەوە، یەکێ لەو شوێنانە ئەمەیە لێرەدا کەلە پێشەوە ترساندنی بەرستەی ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئینجا باڵی ئومێد و میهرەبانی بەسەردا کێشان بەمەی کە فەرمووی: ﴿ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لە لوتف و میهرەبانیەکەی بەزیاد بێت و داوای بەشداری ئەکەین تیایاندا، ئینجا دەست کاریەکی دڵی دیلەکانی کرد و گیان و هەستی ئومێد و چاوەڕوانی تێدا فەراهەم هێنا و دەست نیشانی بۆ کردن بە پاشە ڕۆژێکی بەختەوەری و کامەرانی، بەدەستکەوتێکی چاك و لەوەی کە لێیان وەرگیراوە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾ بڵێ بەوانەی کەلە دەستتان دایە و گرتوتتانەتە ژێر دەستی خۆتان و زاڵبوون بەسەریاندا وەك لەناو مشتتاندا بن لەو دیلانەی کە ماڵ و فیدیەتان لێ وەرگرتن ﴿إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا﴾ ئەگەر خوا بزانێ لە دڵەکانتاندا خێرو چاکە هەیە، واتە ئیمان و باوەڕ وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: -خوا لێیان ڕازی بێ- واتە ئەگەر لەدڵتاندا ئیمان و باوەڕهەبێ کە بێگومان خوا ئاگا و زانا ئەبێ پێی،

يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٠﴾

﴿يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ﴾ ئەبەخشێ پێتان زیاتر لەوەی کە لێتان وەرگیراوە ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ﴾ ئەبورێ لێتان ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ خوا لێبوردەی میهرەبانە.

ئیسلام دیل ئەهێڵێتەوە لای خۆی بۆئەوەی خێرو چاکەو میوایەك کەلە دڵیاندا ببێ دەرکەوێ، بۆ ئەوەی بێداری بکاتەوەو سروشتی زیندوو بکاتەوە بۆ وەرگرتنی رێنموونی، نەك بۆئەوەی داگیرو ژێرباری بکات، وەك ئەوە باوو نیاز بووەو باوو نیازە لای گەلو میللەتانی تر.(زەهەری) ئەگێڕێتەوە لە چەند کەسێکەوە کە ئەفەرموون: قورەیش ناردی بۆ لای موسڵمانەکان لەبارەی گرتنو فیدیەی دیلەکانەوە هەر تاقمو دەستەیەك بەپێی رەزامەندی خۆیان، عەباس گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من موسڵمان بووم! ئەویش فەرمووی: خوا ئەزانێو ئاگادار ترە، ئەگەر وابێ کە ئەڵێیت ئەوە پاداشتت ئەداتەوە ئێمە تەماشای رواڵەتەکەت ئەکەینو بەو پێیە رەفتار ئەکەین، کەواتە خۆتو نەوفلو عەقیلی برازات لەگەڵ سوێند خوارەکەت عوتبەی کوڕی عەمر بکڕەو فیدیەیان بۆ بدە: ئەویش گوتی: دەسەڵاتی ئەوەم نییە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: ئەی ئەو ماڵەی کە خۆتو خێزانت(أم الفضل) داتشاری لەکوێیە، پێت گوت: ئەگەر من لەم سەفەرەدا تیاچووم ئەم پارەو ماڵەی کە دامشاردووە بۆ کوڕەکانم:(فضل عبدالله وقثم)؟ ئەویش گوتی: والله بەڕاستی ئەزانم تۆ پێغەمبەری، ئەوە شتێك بووە هیچکەس ئاگای لێ نەبووە بێجگە لەخۆمو خێزانم، دەی بیست هۆقە ماڵم پێبووە گرتووتانە بۆم حیساب بکەو بیخەرە بەر ئەوەی کە ئەفەرموێ: ئەویش فەرمووی: نەخێر ئەوە شتێکە خوا پێی داوین. ئینجا ڕازی بوو بە کڕینو فیدیەی هەر پێنج، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾،(عەباس) -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: لەباتی ئەو بیست هۆقەیە خوا لە ئیسلامدا بیست بەندەی پێدام هەرکام لەدەستیدا ماڵو سامانی بوو کە پێی ئەگەڕا بەوڵاتو بۆ بازرگانی، لەگەڵ ئەوەدا چاوەڕوانی لێبوردنی خوایش ئەکەم. لەگەڵ ئەو دڵنەواییو بەڵێن پێدانە بەو دیلانە، ئەشیان ترسێنێ لەناپاکی کردن لە داهاتوودا هەرچۆنێ لەمەوپێش ناپاکیان کرد ﷺ ئەوەیان بەسەرهات.

وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾

ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ ﴾ ئەگەر ئەو دیلانە ئەیانەوێ ناپاکیت لەگەڵ بکەن ئەی پێغەمبەر، بەم ڕەنگە ئەوە پەیمانە هەڵوەشێنەوە کە پێیان دایت ﴿فَقَدْ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ ﴾ بێگومان ئەوانە ناپاکیان کرد لەگەڵ خوادا لەپێشەوە بە هەڵوەشاندنەوەو پاشگەز بوونەوە لەو پەیمانە سروشتییەی کەلێی وەرگرتن، هەروەها باویان وابوو لەکاتی تەنگانەدا پەیمانیان ئەدا بە خواپەرستن و سوپاسی ئەگەر ڕزگاریان بکات، کەچی لەپاشان ئەچوونەوە سەر بێبڕوایی و سەرکێشی خۆیان، ﴿فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ﴾ بەهۆی ئەو ناپاکییە خوا تۆی توانا و زاڵکرد بەسەریاندا، وەك دێت لەم ڕووداوی بەدرەدا، کەواتە ئەگەر ئەمانە ناپاکییان لەگەڵ کردی خوا زاڵ و توانات ئەکاتەوە بەسەریاندا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ خوا زانای لێزانی کاردروستە، زنایە بە هەموو نیازو کردەوەیان و شیاو و شایستەن بۆ چ جۆرە سزاو تۆڵەیەك، لێزان و کاردروستەو بەپێی ئەوە کاروکردەوە ئەکات لەگەڵ هەموو کەس و لەم بوونەوەرە پان و فراوانەدا.

ئینجا کۆتایی ئەهێنێ بەباس و سوورتەکە بە ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان گەل و کۆمەڵی موسڵمان لەناو خۆیان و لەگەڵ گەل و کۆمەڵەکانی تردا، لەگەڵ باسی حوکم و بڕیاری ئەو پەیوەندیانە، بەهۆی ئەوەوە دەری ئەخات کە پەیوەندی گەلی موسڵمان بە پەیوەندی خوێن و دەماردا نەك خاك و وڵات و نیشتمانە، نەتیرەو بەرەیەو، فەرمان و مێژووە، پەیوەندی ئابووری و هەرشتێکی تر کەلەم زەوییە هەڵئەقوڵێ بەڵکو پەیوەندی گەل و کۆمەڵی موسڵمان پەیوەندی عەقیدەو بیروباوەڕو سەرکردایەتی و هۆنینەوەو بزوتنەوەیە، کەواتە ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و کۆچیان کردبێ بۆلای موسڵمان و سەرکردایەتی موسڵمانان، خۆیان داڕنیبێ لەهەر شتێك کە پەیوەستیان بکات بەخاك و وڵات و گەل و بەرژەوەندیان، تێکۆشانیان کردبێ لەڕێی خوادا بەماڵ و بەگیانیان، ئەوانە کە موسڵمانە کۆچەرەکانیان گرتیانە خۆیان و یارمەتی و کۆمەکیان کردبێ، ملکەچ بووبن بۆ عەقیدەو باوەڕەکەیان، بۆ سەرکردایەتیەکەیان، ئەوانە دۆست و کاربەدەست و کۆمەکی یەکترن، ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ، کۆچیان نەکردبێ، ئەوانە بچڕاون لە کۆمەڵ و گەلی موسڵمان و ئەو دۆستایەتی و دەستە بەرەیی و خاوەن کاریەیان بۆ نییە لەلایەن کۆمەڵی موسڵمانانی کۆچ کەرانەوە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿وَهَاجَرُواْ ﴾ کۆچیانکردو خاك و نیشتمان و جێ و شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە لەبەر خوا ﴿وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ تێکۆشان و فیداکاریان کردووە بەماڵ و بەگیانی خۆیان لەڕێی خوادا ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ ﴾ ئەوانەی کە کۆچکەرەکانیان گرتە خۆیان و دایانمەزراندن و نیشتەجێیان کردن لای خۆیان، یارمەتیاندان و کۆمەکیان کردن بەسەر دوژمناندا: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ﴾ ئەوانەی کەباسکران بەو سیفەت و نیشانانەوە دۆست و کۆمەك و لێپرسراوی یەکترن، میرات لەیەك بەرن وەك ڕیوایەتکراوە لە(ئیبن و عەباس و مجاهد سدی و حسن و قتادە) -خوا لێیان ڕازی بێ- لەکاتی پەیدابوونی گەلی موسڵمانەوە تا ڕۆژی بەدر، موسڵمانان خاوەن لێپرسراوی یەکتر بوون لە میراتدا، دەستەبەری یەکتر بوون لە خوێندانـدا، لە کۆمەك و لە برایەتیەکدا کە دانرابوو لە جێگەی برایەتی نەژادو خزمایەتی ئیسلام پێك هات و خوا سەری خست و دسەڵاتی پێدا لە ڕۆژی فورقاندا، لەوێدا میرات بردن دەستەبەرەیی لەخوێندانـدا ئیسلام گێڕایەوە بۆ خزمایەتی خوێن و نەژاد لەناو خۆی گەلی موسڵماندا کە پێکەوە بوون لەخاك و وڵاتی ئیسلامدا کە شەریعەتی حاکم بوو تێیدا. ئینجا چەند کەسانێ مابوونەوە لە مەککە و لە عەرەبە کۆچەرەکانی دەوروبەری مەدینە کە موسڵمان بووبوون، بەڵام تێکەڵی ئەو گەلە موسڵمانانە نەبوون لە مەدینەدا، نەهاتبوونە ژێر سایەی ئەو سەرکردایەتییە و ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە کە پێك هاتبوو، ئەوانە دانەنران بە ئەندام و دەوڵەتە ئیسلامی یەتا کۆچ نەکەن و تێکەڵی ئەو گەلە موسڵمانە نەبن و نەیەنە ژێر سایەی ئەو دەوڵەت و سەرکردایەتییە، ئەگەر داوای یارمەتی بکەن لە گەل و دەوڵەتی ئیسلام بەرامبەر ئەوانەی کە موسڵمان نەبوون و پەیمانیان بەستبوو لەگەڵ موسڵماناندا، نابێ گەل و دەوڵەتی ئیسلام کۆمەك و یارمەتیان بدات،

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾

---

وەك ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو ﴿وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟﴾ کۆچیان نەکردبوو بۆ وڵاتی ئیسلام ﴿مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ﴾ نییە بۆ ئێوە لەگەڵیان هیچ جۆرە خاوەنێتی و دۆستایەتی و میرات بەریی ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟﴾ هەتا کۆچ ئەکەن، کاتێ کۆچیانکرد بۆڵاتان دێنە ڕیزی ئێوەو هەرچی بۆ ئێوە هەیە لەنێوانتاندا بۆ ئەمانیش ئەبێ، واتە بانزیک تر بن لە خزمایەتیدا میرات لەیەکتر نابەن هەتا کۆچ نەکەن، ﴿وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ﴾ ئەگەر ئەوانە داوای کۆمەك و یارمەتی دانیانکرد لەئێوە لەڕێی ئایین و لەبەر ئایین ﴿فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ﴾ ئەوە لەسەرتانە کۆمەك و یارمەتی دانیان و زاڵکردنیان بەسەر دوژمنەکانیاندا ﴿إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ﴾ مەگەر بەسەر گەل و کۆمەڵێکدا کەلە نێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان هەبێ، نابێ کۆمەکیان پێبکەن بەسەر ئەماندا لەبەر پاراستنی پەیمانەکەتان ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خوا بینایە بەهەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن، کەواتە وریای خۆتان بن و پێچەوانەی فەرمان و بڕیاری ڕەفتار مەکەن تاخەشم و تۆڵەی نەدا بەسەرتاندا، ئینجا هەرچۆنێ گەل و کۆمەڵی موسڵمان گەل و کۆمەڵێکی کۆمەکی و بزوتنەوەو دەستە بەرەیی یەو کاروباریان بەپێی یاسا و ڕژێمە بەرستراون پێکەوە هەروەها گەل و کۆمەڵی بێبڕواش کارو فەرمانی بەو جۆرەیە وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾ ئەوانەی کە بێبڕوان و بڕوایان نەهێناوە هێندێکیان دۆست و خاوەن و کار بەدەستی هێندێکی تریانەو کۆمەك و یارمەتی ئەکەن، کەواتە گەل و کۆمەڵی موسڵمان ئەبێ هەموو یەك بگرن و ئەوپەڕی یەکێتی و برایەتیان هەبێ، تا بەو جۆرە بەرەنگار بوەستن و بەربەستی گەل و کۆمەڵی دوژمن بکەن لە هەموو دەست درێژی و ستەم و ئاژاوەو خراپەکاریەك لەوڵاتدا، ئەگەر بەو جۆرە

نەبن‌و بەو جۆرە نەکەن گەل‌و کۆمەڵی بەدو نەفام زاڵ ئەبێ‌و ئەو کاتە هەموو جۆرە ستەم‌و خراپەیەك پەیدا ئەبێت‌و وڵاتان داگیرئەکات، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَفۡعَلُوهُ﴾ ئەگەر ئەوە نەکەن کە باسکراو ڕێنموونی کران بۆی لەم دوو ئایەتە پێشووەدا، ئەگەر ئەوە نەکەن ﴿تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ﴾ پەیدا ئەبێت‌و بەدی دێت لەزەوی‌و لەولآتدا فیتنەیەکی گەورە کە بریتییە لە سزادان‌و چەوساندنەوەی موسڵمانان‌و ژێر پێ‌کردنیان‌و بەرگری کردنیان لە پەیڕەوی ئایینەکەیان، یان بریتییە لە ئاژاوەو دووبەرەکی موسڵمانان‌و لاوازی بڕواو بەهێزبوونی بێ‌بڕوایی، هەروەها پەیدائەبێ فەسادی گەورە کە بریتییە لە خوێن ڕێژی بەناهەق وەك حسن ئەفەرموێ: یان بریتییە لە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕو خوو ڕەوشتی بەدو خراپ، یان بریتییە لە زاڵبوون‌و پەیڕەوی کردنی ڕژێم‌و یاسای نەفامی دوورکەوتنەوە لە ڕژێم‌و یاسای ئاسمانی، یان هەر دووبارە کردنەوەیە بۆ وتەی پێشوو، لەسەر هەر بار ئەمە ترساندن‌و هەڕەشەیەکی گەورەیە لە موسڵمانان هەرکاتێ یەك نەگرن‌و کۆنەبنەوە لەژێر یەکە ئاڵا و یەك سەرکردایەتی دا کە خوا بۆی داناون‌و دیاری کردووە بۆیان، ئەم ئایەتە هەموو موسڵمانان بەرپرسیار ئەکات لەبەردەم دادگای خوادا لە ڕوودانی ئەو فیتنەو فەسادە کە ترساندنی پێی، تۆڵەی بەرگری نەکردنی ئەو فیتنەو فەسادە ئەخاتە سەر شانیان، ئینجا شێوەی بڕوای ڕاستەقینە دەرئەخات لەگەڵ مژدەدان بەخاوەنی ئەو بڕوایە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووەو تێکۆشان‌و فیداکریان بە ماڵ‌و بە گیانیان لەڕێی خوادا کردووە ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ﴾ ئەوانەی کە کۆچەرەکانیان گرتە خۆیان‌و نیشتەجێیان کردن لای خۆیان‌و یارمەتیاندان‌و کۆمەکیان کردن بە دژایەتی‌و دوژمن‌و بێ‌بڕواکان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ﴾ ئەوانەی کە باسکران لەو دوو دەستەو تاقمە هەر ئەوانەن بڕواداڕن بەڕاستی‌و ئەوانەن بڕوادارانی ڕاستەقینەن، ﴿لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لێبوردن‌و سڕینەوەی گوناهەکانیان‌و بۆیان هەیە ڕزق‌و ڕۆزیەکی بەڕێزو پیرۆز، ئەم ئایەتە دووبارە کردنەوە نییە بۆ ئایەتی پێشوو، بەڵك‌و جیاوازن لە هۆو مەبەست لە هێنانەکەیان بەم ڕەنگە هێنانی یەکەم جار بۆ ڕوون کردنەوەی ڕێگرو بڕیارانە بەمەی خاوەن و کار بەدەست‌و دەستەبەری یەکترن، هێنانی دووەم جار بۆ ڕوونکردنەوەو ڕێزو ڕادەی بەرزو پیرۆزیانە، ئینجا لە پاش باسی دەستەی یەکەم لەکۆچەران‌و یارمەتی دەران،

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ﴾

ئینجا دێتە سەر باسی دەستەی دووەمیان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ﴾ ئەوانەی کەبڕوایان هێنا لە پاشا، واتە لەپاش کۆچکردنی یەکەم کە ئەوانەن کۆچیانکرد بۆ مەدینە لە پاش پەیمانی حودەبییە، کۆچیانکردو تێکۆشان‌و فیداکاریانکرد لەگەڵ ئێوە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ﴾ ئەوانە لە ئێوەن ئەی دەستەی یەکەم، هەرچەند دەستەی یەکەم ڕادەو پلەیان بەرز ترەو یەکەمە، بەڵام خوا بە میهرەبانی خۆی ئەمانیش وەرئەگرێ‌و ئەیانخاتە کۆمەڵی یەکەم لە پەیوەندی‌و ئەندامێتی ئەو گەل‌و کۆمەڵە پیرۆزەدا، لە میهرەبانی خوا بەزیاد بێباوەڕەکانی کەپەست‌و نزم بەرز ئەکاتەوەو ئەیانخاتە ڕیزی بەرزان، نەك بەرزەکان بهێنێتە خوارەوەو بیانخاتە ڕیزی پەست‌و نزمەکان! کۆچکردن بەو ڕادەو پلەی بەرزی خۆیەوە مایەوە هەتا فەتحی مەککە، کە خاکی عەرەب ملکەچ بوو بۆ ئیسلام‌و سەرکردایەتی ئیسلام، ئەو خەڵکە هۆنرایەوە لە ڕوشتەو کۆمەڵی ئیسلامدا، ئیتر دوای فەتحی مەککە کۆچکردن بۆ مەدینە ئەو ڕادەو پلەیەی نەما، بەڵکو هەر تێکۆشان‌و فیداکاری‌و کردەوەی چاك مایەوە بۆ موسڵمانان کە موسڵمانان پێشبڕکێ‌و تێدا بکەن‌و بەپێی ئەوە هەر کەس بگات بەڕادەو پلەی تایبەتی خۆی، لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە:(لا هجرة بعد الفتح، ولكن جهاد وعمل)، بەڵام ـ وەك زانایان ئەفەرموون ـ مەبەست ئەوەیە کۆچکردن بۆ مەدینە نەما فەتحی مەککە، ئەگینا کۆچکردن لە هەر خاکێکەوە کە شەریعەتی خوا حاکم نەبێ تێیداو موسڵمان نەتوانن بە ئازادی‌و سەربەستی ئایینی خوا ڕابگەیەنن‌و بانگی خەڵکی بۆ بکەن، کۆچکردن لە هەر خاکێکی ئاوا بۆ هەر شوێنێ کو موسڵمانان ئازادو سەربەست بن تیایدا، هەر کۆچکردنە ڕادەو پلەی بەرزی هەیە وەك یەك‌و یەکەمجار بەئیزنی خوای میهرەبان، لەوخاك‌و وڵاتانەدا، ئیسلام دەست پێ ئەکاتەوە بەدامەزراندن‌و هۆنینەوەی خۆی وەك یەکەمجار، ئەو بڕیارە کاتی‌و قۆناغیانەی یەکەم جار بەکار ئەهێنێ‌و گوزەر ئەکات پیایاندا هەتا شوێن‌و وڵاتێك فەراهەم بێت کە سەرکردایەتی هەر بۆ ئیسلام بێت‌و هەر

شەریعەتی خوا حاکم بێت تێیدا، ئەو کاتە کۆچکردن بۆ ئەو خاكو وڵاتە دەست پێئەکاتەوە تا خەڵکی ئەو جارەش دێنەوە ژێر سێبەرو سایەی ئیسلام، بەئیزنی خوا، ئەو کاتە کرچکردن دوایی دێتو هەر تێکۆشانو کردەوەی چاك ئەمێنێتەوە، لەپاش کۆچکردن بۆ مەدینەی ئازیز موسڵمانان چوار دەستەو تاقمیان هەیە:

١- بڕوادارانی کۆچکەرانی تێکۆشەران بەماڵو گیان.

٢- بڕوادارنی یارمەتی دەری کۆچەران، واتە مەدینەییەکان.

١- بڕوادارانی نیشتەجێی مەککە کە کۆچیان نەکرد.

٢- ئەوانە کە بڕواهێنانو کۆچکردنو تێکۆشانیان دواکەوت لە کۆچکرنی یەکەم جار.

بۆ هەرکام لەمانە ڕادەو پلەی بڕیاری تایبەتی خۆی هەبوو، لەو ماوەی دروستکردنی بوونی ئیسلامدا پەیوەندی بڕوا و عەقیدە لەجێگەی پەیوەندی خوێنو خزمایەتیو نەسەبو نەژاددا دانرا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، کەیەکێ لەوانە میراتو دەستەبەریی بوو لە خوێنداو بژاردنی هەر قەرزو هەر زیانێك کە ڕووی بکردایەتە هەر کامیان، ئینجا کاتێ کەبوونو کیانی ئیسلام پێکهاتو دامەزرا بەهۆی سەرکەوتنی بەدرەوە، هێندێ لەو بڕیارەکاتی یانە کە لەیەکەمجاردا پێویست بوو، گۆڕرا، یەکێ لەونە میرات بەرییو دەستە بەرەیی لەخوێنداو ئەو شتانەی تر، گێڕانەوە بۆ خزمایەتی، بەڵام لە چوارچێوەی گەلی موسڵمان لەخاكو وڵاتی ئیسلامدا، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ﴾ خاوەنو خزمایەتیەکان هێندێکیان شایستە ترن بەهێندێکی تریانەوە، واتە ئەوان دەربارەی یەکتر شایستەترن لە میرات بەریدا بۆ یەکترو لەیەکتر تا کەسانێکی تر لە بڕواداران کە ئەو پەیوەندیەیان نەبێ، شایستەترن لە نامەی خوادا، بەڵێ لەپاش دامەزراندنو بەهێزبوونی کیانو بوونی ئیتر زۆر بەجێیە گەڕانەوە بۆ ئەو شتە سروشتییە کە گێڕانی خزمایەتییە بەهۆی میرات بەریو دەستە بەرەیی، چونکە ئیسلام هەمیشە چاودێریی هەستە سروشتیەکان ئەکات لە سنووری ڕێكو ڕاستی خۆیدا بەبێ زیادە ڕەویو کەمو کوڕی. خوای پەروەردگار لە هەموو کارو بڕیارەکانیداو لە هەموو بەرنامەو شەریعەتەکانیدا ناوەڕاستی گرتووەو بەهەر بارێکدا لابدرێو بگۆڕرێ لارو خێچ دەر ئەچێ، کەواتە هەرچی ئەو بیکات هەر ئەوە ڕاستو ڕەوایە،

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا بە هەموو شتێ زاناو ئاگایەو زانین و ئاگایی ئەوگشتی یەوهەموو شت ئەگرێتەوەو دەوری هەموو شتی داوە.

ئەو خوای میهرەبانی لێزانی کاردروستە کە ئوممەت و گەلی خۆی دائەڕێژێ لەسەر بنەڕەتی کۆڕو کۆمەڵێکی ئەندامی و بزوتنەوەیی، کە بە عەقیدە پەیوەستکرابن پێکەوە، ئەیەوێ پارێزگاری ئادەمێتی و مرۆڤایەتی بەندەکانی بکات و جێیان بکاتەوە لە گیان لەبەرەکانی تر، ئەیەوێ شتێ بکات بەهۆی یەك گرتن و پەیوەستیان، کە ئیرادەو خواهیش و هەڵبژاردنی خۆیان کار ئەکات تێیدا، کە ئەو مەیل و خواهیشە بنەڕەتی پیاوەتی و مەردایەتی و ئازادی و سەربەستییە تەنها لەم ئادەمییەدا هەیە، هۆی ئەك گرتن و پەیوەستی نەگێڕایەوە بە نەسەب و نەژادو زمان و خاك و ڕەنگ و تیرەو بنەماڵەو هەروەها شتەکانی تر کە تایبەتی نین بەمانەوەو گیانلەبەرەکانی تریش هاوبەشن تیایاندا، بە مەیل و خواهیش و هەڵبژاردنی ئەمان پەیدا نەبووە جا بەهۆی ئەوەوە گەل و کۆمەڵی موسڵمان شتێکی تاقانەی بەرزو بەڕێزەو پاك و خاوێنە لە هەموو لەکەیەك و چڵك و چەپەڵیەك، قاپی گەل و کۆمەڵی موسڵمان خراوەتە سەر پشت و کراوەتەوە بۆ هەموو جۆرەکانی ئادەمی بەبێ هیچ ڕێگرو بەرگری کەرێك، بەهۆی ئەوەوە گەل و کۆمەڵی ڕاستەقینەی ئیسلام خاوەنی هەموو لێهاتن و کارامەیی و زانین و زانیاری و پیشەسازیەکی ئەو هەموو گەل و تیرەو بەرەیانەیە ئەبێ کە کۆبوونەتەوە لە ژێر یەك ئاڵا و سەرکردایەتیدا، بێگومان بەناوبانگترین کوتلەو کۆمەڵ لە مێژووی کۆندا، کوتلەو کۆمەڵی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمان بوو، ئەو ئیمبراتۆریەتە پێك هاتبوو لە چەند تیرەی جیاوان، چەند نەتەوەو زمان، چەندین وڵات و ناوچە، بەڵام ئەوە هەمووی کۆنەبوو بووەوە لەسەر بنەڕەتێکی ئادەمیانەو پەیوەستیەکی ئادەمیانە، بەڵکو لەسەر بیروباوەڕی چینایەتی، ئەوەبوو پیاو ماقوڵ هەبوو لەگەڵ چینی بەندەو ژێر دەستە، لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە بە شێوەی گشتی ڕەگەزایەتی و ڕەگەز پەرستی هەبوو ئەوە بوو

تیرەو بەرەکانی تر لە جیهاندا بە نۆکەرو بەندەو ژێردەستە سەیر ئەکران، جا لەبەرئەوە هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو کوتلەو کۆمەڵە بەرز نەبوویەوەو نەگەیشتە پلەو ڕادەی بەرزی کوتلەو کۆمەڵی موسڵمان، بەرو بەرهەمی ئەوی دەستکەوت نەبوو، هەروەها لە مێژووی تازەدا چەند کوتلەو کۆمەڵی تر پەیدا بوون، کوتلەو کۆمەڵی ئیمبراتۆریەتی بەریتانیا، بەڵام ئەمیش وەك کوتلەی ڕۆمانی کە ئەم جێگری ئەو بوو، کوتلەو کۆمەڵێکی نەتەوایەتی داگیر کەربوو، بەرپا بوو لەسەر بنەڕەتی ڕەگەزایەتیو ئاغایەتی گەلو نەتەوەی بەریتانی، ژێر دەستە کردنو ماڵ خواردنی هەموو موستەعمەرەکان کە کۆبووبوونەوە لە ژێر ئاڵای بەریتانیدا، هەموو ئیمبراتۆریەتەکانی ئەوروپا هەموو بەو جۆرە بوون؛ ئیمبراتۆریەتی ئیسپانی یان بورتوغالی، ئیمبراتۆریەتی فەرەنسا، هەموو وەك ئیمبراتۆریەتی بەریتانی بوونو لەو ڕادەو پلە پەستەدا بوون! شیوعیەتی ویستی کۆمەڵ پێك بێنێ بەجۆرێکی تر، کە گوێی نەبێ لە تیرەو ڕەگەزو زمانو خاكو وڵات، بەڵام ئەمیش لەسەر بناغەو بنەڕەتێکی ئادەمیانە بەرپا نەبوو، بەڵکو ئەمیش لەسەر بنەڕەتی چینایەتیو دامەزراو بەرپا بوو، بەم ڕەنگە بوو بە بارو ڕوویەکی تر بۆ کوتلەی ڕۆمانی، ئەو لەسەر بنەڕەتی پیاو ماقوڵو بەرزەکان بەرپا بوو، ئەم لەسەر چینی لاتو بێنەوا بەرپا بوو(پرۆلیتاریا) کە هەمیشە پڕ بەسکی داخو قینو بێزاری بێت لە هەموو چینو کۆمەڵەکانی تر! بێجگە لەوەش ئەم کوتلەو کۆمەڵی ئەمە هەر لە یەکەمجارەوە بەرپا ئەبێ لەسەر بنەڕەتی خوو ڕەوشتی ئاژەڵو چواڕێو بەهێز کردنی ئەو هەستە لەمەی مەبەستو داخوازی مرۆڤ سێ شتە: خۆراكو جێی ئارامو نیشتەجێیو کاری نێرو مێیو پەڕینو لێچوون کە مەبەستو ئامانجی مرۆڤ هەر ئەو سیانەیە، مێژووی ئادەمی هەر بەدوا گەڕانی خۆراکە!! بەڵام بەرنامەکەی ئیسلام هات شتە تایبەتیەکانی ئادەمی دەرخستو گەشەی پێداو بەرزی کردەوە لەناو گەلو کوتلەکەی خۆیدا، بەجارێ دانی نا بە پێویستو داخوازی لەشو دەروونو ڕۆحدا، ڕەوایدا، بەڵکو پێویستی کرد بەجهێنانی ئەو پێویستو داخوازانە هەرکام لەڕادەو ڕێژەو سنووری خۆیدا، ئەو کەسانەی ئەیانەوێ لادەن لەو بەرنامە پیرۆزەو بڕۆن بۆ هەر بەرنامەیەکی تر کە بەرپاو

ڕاگیر ببێ لەسەر یاسایەکی تر، ئیتر نەتەوە یا تیرە یان زمان یا خاك‌و نیشتمان یا هەرشتێکی تر، بێ‌گومان ئەو کەسانە دوژمنی ئادەمی‌و ئادەمیێتین، نایانەوێ ئەم ئادەمییە بەرزو بەڕێزە لەسەر ڕەوشتە پاکەکەی خۆی بڕوا کە خوا جوێی کردووەتەوە بەو سروشتە پاکە لە هەموو گیانلەبەرو دروستکراوەکانی تر، نایانەوێ گەل‌و کۆمەڵی ئادەمی بگات بەپلەی هەرەبەرزی‌و سوود بەخش ببێ بەو بەخشایشە تایبەتیانەی کە خوا پێی داوەو جوێی کردووەتەوە لە هەموو دروستکراوەکانی تر، لە هەمان کاتدا ئەیانەوێ ڕادەی ئەم دروستکراوە تایبەتییە نزم‌و پەست بکەنەوەو بیهێننە ڕیزو ڕادەی چوار پێ‌و ئاژەڵ لەپاش ئەوەی خوا ڕادەو پلەی بەرز کردووەتەوە! لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە کە ئەو پەستکردنە ناو ئەبەن بەپێشکەوتن‌و ڕاپەڕین‌و بەرز بوونەوە!! بەڵام خوا زاڵە بەسەر کاروباری خۆیداو هیچکەس‌و هیچ شتێ لەڕێگەیدا ناوەستێ، ئەبێ هەر ئەوە ببێ کەئەیەوێ، ئەبێ ئەم ئادەمییە تێکۆشان بکات تا کوتلەو کۆمەڵەکەی بەرز بکاتەوەو بیگەیەنێ بە ئاسۆی هەرە بەرزی خۆی، وەك یەکەمجار پێی گەیشت لەناو هەموو جیهان‌و جیهانیاندا بەئیزنی خواو بەیارمەتی خوا.

وصلي الله وسلم علي سيدنا محمد واله وصحبه

## سوورەتی ﴿التوبه﴾
## مەدینەی یەو ئایەتەکانی(١٢٩) ئایەتە

ئەم سوورەتە لەبەر ئەوەی لەدوا دوایی سوورەتەکانی قورئاندا هاتووەتە خوارەوە بڕیارەکانی هەتا هەتایی و نەگۆڕاون. بۆ ئەم سوورەتە(بسم الله)ی نەنوسراوەو نەگوتراوە لەلایەن هاوەڵەکانەوە هەروەها لەپاش ئەوانیش، ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوە کە(بسم الله)ی لەگەڵدا نەهاتووەتە خوارەوە، ئینجا ئایا هۆی ئەوە چییە؟ بەڕاستی چاك وایە حەواڵەی خوا بکەین و هیچ نەڵێین، هەرچەند زانایانی ئوممەت دوو شتیان فەرمووده، نزیك تریان لە دڵدا ئەمەیە: سەرەتای ئەم سوورەتە ئەوپەڕی خەشم و نیازی تۆڵەو سزا نیشان ئەدات دەربارەی هاوبەش ڕەوادەرەکان، ئەو وتە پیرۆزەش بەزەیی و میهرەبانی نیشان ئەدات کە ئەو دوو شتە دژو نەگونجاون پێکەوە. ئەم سوورەتە بە چەند ناوێك ناوبراوەو بەناو بانگ تریان دووانە: ﴿براءة﴾ و ﴿التوبة﴾، ئەمەیان زۆرتر بەکارهێنراوە لەلایەن خوێنەوارانی قورئان و زانایانی تەفسیرەوە. بەڵگەو نیشانەی زۆر ڕوون هەیە لەسەر ئەوەی ئەم سوورەتە لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا هاتووەتە خوارەوەو بەیەك جاریش نەهاتووە، بەڵکو بەسێ جارو لەسێ قۆناغدا هاتووە:

یەکەم: پێش ڕۆشتن بۆ تەبووکلەمانگی ڕەجەبی ئەم ساڵەدا.

دووەم: لە کاتی ئامادەبوون بۆئەم غەزایەو لەناو بەناوی چوون و هاتنەوەدا.

سێیەم: لەپاش گەڕانەوە لەو سەفەرە.

سەرەتای سوورەتەکە تا ئایەتی(٢٩) واتە(٢٨) ئایەتی سەرەتاکەی هاتووەتە خوارەوە لە دوا دوای ئەو ساڵە پێش کاتی حەج، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە بۆ ئەو سەفەرە ئەبوبەکری صدیق –خوا لێی ڕازی بێ– کرا بەئەمیرو فەرماندە، لەپاش دەرچوونیان لە مەدینە ئەم(٢٨) ئایەتی سەرەتا هاتە خوارەوە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بەدوای عەلی کوڕی ئەبو تالیب دا –خوا لێی ڕازی بێ– فەرمانی پێدا کە بەدوای ئەواندا بچێت و لەکاتی

حەجدا ئەم(٢٨) ئایەتە ڕاگەیەنێ لەباتی پێغەمبەر(ﷺ)و فەرمووی: لەباتی منو لەلایەن منەوە ئەبێ هەرکەسێك ڕایان گەیەنێ کەلە من بێت. بێگومان شیاوتر لە عەلیو پەیوەست تر لە عەلی نەبووە لەو کاتەدا کە دەست بدات بۆئەو فەرمانە، ئەم سوورەتە ئەکرێ بە شەش بەشەوە

بەشی یەکەم: کە ئەم(٢٨) ئایەتیە کە دەست نیشانمان بۆ کرد. لەم بەشەدا دواترین بڕیار دیاریی ئەکات لەبارەی پەیوەندی لەشکرو کۆمەڵی موسڵمانان، لەگەڵ لەشکرو کۆمەڵی هەموو هاوبەش ڕەوادەرکانی نیوە دوورگە، هۆی ئەوەش دەرئەخاتو ڕوونی ئەکاتەوە بەو جۆرو ئوسلوبە قورئانیەی خۆی وەك بۆمان دەرئەکەوێ لەکاتی تەفسیری ئەو ئایەتانەدا.

بەشی دووەم: دواترین بڕیار دەرئەکات سەبارەت بە پەیوەندی موسڵمانان لەگەڵ نامەدارەکان، واتە جوولەکەو گاور، لەگەڵ ئەو دیاریی کردنەدا هۆکەشی باس ئەکات، باسی لادانی ئەو نامە دارانەش ئەکات، کەبەجۆرێ لایاندا لەو ئایینە بۆیان هات بەلای ئیسلامەوە ئایینەکە یان کە بۆیان هەڵبژارد بەئایینی خوا نەما.

بەشی سێیەم: باسی ئەوانە ئەکاتو لەکەداریان ئەکات کە بانگ کەران بۆ تێکۆشانو جیهادوجەنگ کەچی سستیو قنگ گرانیانکردو ڕانەپەڕین بەدەم بانگو بانگەوازی خواوە

بەشی چوارەم: کە درێژترینی بەشەکانە زیاد لە نیوەی سوورەتەکەی داگیرکردووە، لە ناپاکەکان ئەدوێونیازوکردەوەبەدەکانیان دەرئەخات،بەتایبەتی لەوسەفەروغەزای تەبوکەدا.

بەشی پێنجەم: باسی چەند دەستەو تاقمێك ئەکات کەلەو کاتەدا هەبوون لەناو گەلو ئوممەتی ئیسلامدا، بێجگە لە کۆچکەرانو یارمەتی دەران -خوا لێیان ڕازی بێ- کە بناغەو بنەڕەتو بڕبڕەی گەلی موسڵمان بوون.

بەشی شەشەم: باسی پەیمانی موسڵمانان ئەکات کە بەستیان لەگەڵ خوای خۆیان، باسی هەڵوێستو پێویستی سەر شانی مەدینەییەکانو عەرەبەکانی دەوروبەریان، پێویستی جیابوونەوەی موسڵمانەکانو بچڕینی پەیوەندیان لەگەڵ هاوبەش ڕەوادانو ناپاکان، لە

سوورەتی ﴿الأنفال﴾دا کورتە باس و پاڵفتەیەکمان هێنا لە(زاد المعاد)ەوە سەبارەت بەڕەوشت و کرداری پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەگەڵ بێبڕواو ناپاکەکاندا، یاد کردنی ئەو کورتەو پاڵفتەیە زۆر سوود بەخشە بۆ حاڵی بوون و تێگەیشتن لەدەقی ئایەتەکانی ئەوێ و ئەم سوورەتە، هۆی ڕوون بوونەوەی ڕاست و ڕەوایی ئەم بڕیارانەیە کە هاتن لەم سوورەتەدا کە دواترین بڕیارو حوکم هەتاین، لەو پاڵفتەیەدا باسی ئەوە کرا کەلە پاش فەرماندان بە جەنگ و کوشتار بێبڕواکان بوو بوون بەسێ بەش: ئاشتی خوازو ئەهلی سوڵح، جەنگ کەر ئەهلی جەنگ، ئەهلی زیمەو پەیمان، ئینجا کاتی سوورەتی بەرائەت هاتە خوارەوە فەرمان درا بەجەنگ کردن لەگەڵ بێبڕواکان و تێکۆشان لەگەڵ ناپاکان بە باس و بەڵگەو ڕوون کردنەوە، فەرماندرا بەهەڵوە شاندنەوەو بەری بوون لە پەیمانی بت پەرستەکان، خاوەن پەیمانکرا بەسێ بەشەوە: جەنگکردن لەگەڵ ئەوانەیان کە پەیمانی کاتیان بەستبوو پاشگەز نەبوو بوونەوە ماوە نەدان و وەستان لەوانەی کە پەیمانیان نەدابوو جەنگیشیان نەکردبوو، یان پەیمانیان بەستبوو بەبێ دیاریی کردنی کات و ماوە، بۆ ئەم دوو جۆرو تاقمە فەرماندرا بە ماوەدان و وەستان لێیان ماوەی چوار مانگ لەپاش تێپەڕکردنی ئەو چوار مانگە ئەگەر موسڵمان نەبوون و جەنگیان لەگەڵ بکرێ، کەواتە بێبڕوایان لەپاش هاتنی سوورەتی(بەرائەت) بوون بە سێ بەشەوە: جەنگ کەر، پەیمان درا، ئەهلی زیمە، ئینجا پەیمان دراو ئاشتی خوازبوون بەدوو بەشەوە لەگەڵ موسڵمانان: جەنگ کەرو ئەهلی زیمە، کەواتە هەموو خەڵك بوون بەسێ بەش: موسڵمان، ئاشتی خوازو بێباك، جەنگ کەر، دەربارەی ناپاکان فەرماندرا کە ڕواڵەتە ئیسلامیەکەیان لێ وەرگیرێ و نیازو دڵیان حەواڵەی خوا بکرێ. تێکۆشان لەگەڵ بکرێ بە بەڵگەو ڕابەرو باس و بەیان، توندو تیژو قسەی بەهێزیان ئاراستە بکرێ، نوێژ لەسەر مردوویان نەکرێ. هەواڵدرا ئەگەر داوای لێبووردنیان بۆبکات خوالێیان نابوورێ، ئەوە بوو بەکورتی ڕەوشت و کرداری پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دوژمنەکانی لە بێبڕواو ناپاکان، دواترین بڕیار کە سوورەتی بەرائەت هێنای بەو جۆرە بوو ئیتر بڕیارە کاتی و قۆناغیەکان کۆتایی پێهێنرا، بەڵام وەنەبێ ئەوانە بە تەواوی و

هەتا هەتایی سڕرا بووبنەوە بەجۆرێ کە ڕەفتاریان پێنەکرێ لەهیچکات و چەرخێکدا، بەڵکو لەکات و چەرخ و شوێنی تایبەتی خۆیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا لەبیر نەکرێ کەبڕیارە دوایی و هەتا هەتاییەکان هەر ئەوانەن کە سوورەتی بەرائەت هێنانی، لە هەر کاتێکدا کە ئوممەت و دەوڵەتی ئیسلامی بۆی بکرێ و بگونجێ بەجێیهێنانیان، وەک ئەو کاتەی کە سوورەتی ﴿التوبة﴾ هێنانی، کاتەکانی تری دوایی لە چەرخەکانی دەوڵەتەکانی ئیسلامدا کە دەسەڵاتیان هەبوو، جەنگیان ئەکرد بەپێی ئەم دواترین بڕیارانە لەگەڵ بت پەرستان و نامەداران. ئەو کەسانەی کە دەستەپاچەو پەک کەوتوون، بەهۆی بێکارەیی و لادانی بەناو موسڵمانان کە هەر بەناو دەفتەر نفوس موسڵمانن، بەهۆی ئەو هەموو فڕو فێڵ و سەر تێک دانەی کە دوژمنانی ئایین فەراهەمیان هێنا بۆ سست و لاواز کردنی هێزی تێکۆشان و فیداکاری لەڕێی ئیسلامدا، ئەو دەستەپاچەو پەک کەوتووانە کە پێیان سەلمێنراوە وڵاتی ئیسلام هەر بریتییە لەو ئەندازەیە کە ناوبزاوە بەخاکی ئیسلام و سنوورێکی دیاریی هەیە، کەواتە ئابێ لەو ئەندازەیە تێپەڕبکات، ئەوانە هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن بۆ ئەوەی یاسا و بڕیارەکانی جەنگ و تێکۆشان بڕن هەر بەسەر ئەو یاسا و بڕیارە کاتی و قۆناغیانەدا، کەواتە ئەبێ ئیسلام بوەستێ لە چوار چێوەی ئەو ئەندازە خاک و وڵاتەو جەنگ هەر لەگەڵ ئەو کەسانە ئکات کە دەست درێژی ئەکەنە سەر ئەو ئەندازە خاک و وڵاتە، کەواتە ئەبێ هەقی ئەبێ بەسەر وڵاتانی ترو دانیشتوانەکانیان لە جیهاندا کە بێگومان ئەوە بۆچوونێکی ناڕاست و ناڕەوایەو دژی ئیسلامە کە هاتووە بۆ هەموو جیهان و جیهانیان. هاتووە بۆ ئازاد کردنی هەموو ئادەمی لە هەموو بەندەیی و پەرستنێک بێجگە لەبەندەیی و پەرستنی خوا، هاتووە بۆ ئەوە هەموو جیهان و جیهانیان ملکەچ بن بۆ هەر یاسا و بڕیاری خوا، هەر یاسا و بڕیارو بەرنامەی خوا حاکم و کاربەدەست بێت، کاشکێ ئەو دەستەپاچەو شکاوانە خۆیان خەتابار بکردایەو شکان و دەستەپاچەییەکەیان نەدایەتە پاڵ ئیسلام و لە ئیسلامیان نەناسیایە، وایان نیشان نەدایە کە ئیسلام بۆ هەموو کات و وڵاتێک دەست نادات، یاسا و بڕیارەکاتی وقۆناغیەکانی ئیسلامیان نەگێڕایە بەیاسا و بڕیارێکی هەمیشەیی و هەتا هەتایی!

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

بَرَاءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ

ئینجا بابێینه سەر ئایەتەکانو لەژێر سایەیاندا بژینو دڵو گوێیان بدەینێ. ئەفەرموێ: ﴿بَرَاءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەمە بەری بوونێکی گەورەو گرنگ لەلایەن خواو فروستادەکەیەوە بۆ ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستن هاوبەش ڕەوا دەرەکان، واتە ئەو پەیمانە هەڵئەوەشێنینەوەو ڕەفتاری پێناکەینو بەرین لێی. هەرچەند چەند ڕایەکی جیاوازو جۆر بەجۆر هەیە لە مەبەست بەم سەرەتاو ئایەتەکانی تر کە دێن بەدوای ئەم سەرەتادا، هەرچەند ئەو ڕایانە هەن، بەڵام ڕای بەهێزو جێگیر لە دڵدا ئەمەیە کە شوێنی ڕووکەشو ڕواڵەتی دەقی ئایەتەکان بکەوینو بەو پێیە مەبەستەکە وەرگرین، ئەو ڕووکەشو ڕوواڵەتەش هەر ئەمەیە کە ئەم ئایەتە کۆتایی هێنا بە هەموو پەیمانەکانی لەوەو بەر کە هەبوو لەنێوان موسڵمانانو هاوبەش ڕەوادەرەکان تا ئەو کاتە، ئیتر ئەو کۆتایی پێهێنانە لەپاش تێپەڕ کردنی چوار مانگ بێت بۆ ئەوانەی کە کاتو ماوە داریی نەکرابێ بۆ پەیمانەکەیان یان دیاریی کرابێو بەڵام ئەوان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندبێتەوە، پەیمانی حودەیبیە کە ماوەی دە ساڵ بوو بەڵام قورەیش هەڵیان وەشاندەوەو پاشگەزبوونەوە لێیو ناپاکیان بەکارهێنا یان پەیمانەکەیان ماوەو کاتی بۆ دیاریی کرابێو کاتەکەی دوایی هاتبێ، لەو ماوەیەدا ناپاکیان نەکردبێ، بەکورتی: کۆتایی هێنان بەو هەموو پەیمانانە لەگەڵ هاوبەش ڕەوا دەرانی نیوە دورگە، کۆتایی هێنان بەبیروباوەڕی پەیمان بەستن لەگەڵیان بە بەری بوونی تەواو لێی، بە بێزاری دەربڕین لەڕەوادانی هیچ پەیمانێك بۆ ئەوان لای خواو فروستادەکەی. یەکێکی تر لە ڕووکەشو ڕواڵەتی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە بەهیچ جۆر ڕێ نەدرێو چاوپۆشی نەکرێ لە هیچکام لەو بێبڕوایانە بە تەواف کردنو ئاوەدان کردنەوەی ئەو ماڵی خوا لەپاش هاتنی ئەم ئایەتانە، بە پێچەوانەی ئەو پەیمانە گشتیو بێ چەندو چوونەی کەلەوەو پێش هەبوو: بەوەی بێباك بن لە یەکتر لەو ماڵە بەڕێزەو لەمانگە بەڕێزەکاندا، ئەو کەسەی کە بیربکاتەوەو چاوبکاتەوەو چاو بگێڕێ بە ڕووداوو

بەسەرهاتەکانی ڕەوشت و کرداری پێغەمبەردا(ﷺ) بۆی دەرئەکەوێ بەڕوونی کە ئەو هەنگاوەی کە نرا لەبارەی پەیوەندی نێوان موسڵمانەکان و بێبڕواکاندا لە نیوە دوورگەو شوێنەکانی تردا، هەروەها لەنێوان موسڵمانەکان و ئامەدارەکاندا، کە ئەم سوورەتە هێنانی، ئەو هەنگاوانە لەکات و شوێنی خۆیاندا هاتن، وڵات و بەسەرهات ئامادەبوو بۆی. هەنگاوێکی سروشتی بوو لە کاتێکی بەرێزدا، بەڕاستی ڕوون بوویەوە لەو ڕووداو کردەوە قۆناغ لەپاش قۆناغ، چەند تاقیکردنەوە بەراورد کرا، کە ناگونجێ ئاشتی و ژیان لەنێوان دوو بەرنامەی ژیاندا کە دژایەتیەکی بنەڕەتی و دوورو درێژ هەبێ لەنێوان هەموو بەش و پارچەیەکیان لە بۆچوون و بیروباوەڕدا، لە ڕەوشت و کردەوەیاندا، لەڕژێم و هۆنینەوەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری و مرۆڤایەتیاندا، دوو بەرنامەی ژیان کە یەکێکیان بەرپا بووبێ لەسەر بەندەیی بەندەیان بۆ خوا بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، ئەوتریان ڕاگیرو بەرپا بێ لەسەر بەندەیی بەندە یان بۆ بەندەیەکی وەك خۆیان، هەرگیز ناگونجێ ژیانی ئەم دوو بەرنامەیە پێکەوە بەبێ بەگژا چوون و جەنگ و ئاژاوە، بەڵکو ئەبێ هەمیشە لە جەنگ و ئاژاوەدابن.
وەنەبێ ئەو دژی و دوژمنایەتی قوڕەیشە هەروا شتێکی ڕێکەوت و هەڵکەوت بووبێ، هەروەها دژایەتی جوولەکە و یەك کەوتنیان لەگەڵ بت پەرستەکان هەر لە یەکەمجارەوە بۆ ئەم ئیسلامە، هەروەها جەنگ و دوژمنایەتی گاور بۆی لە هەموو لایەکەوە، هەروەها دژایەتی و دوژمنایەتی و جەنگ و کوشتاری ئەو هەموو بیروباوەڕو بەرنامانەی تر کە لەگەڵ ئەم ئیسلامەدا بە درێژایی مێژووی ئیسلام، ئەو هەموو دژی و دوژمنایەتی و جەنگ و ئاژاوەیە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە پێویست بوو ئەم دواترین هەنگاوە کە ئەم سوورەتە پێی هەڵسا دەربارەی ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانە کەبە هیچ ڕەنگ نە ئەگونجا ژیان و ئاشتی ئیسلام لەگەڵیان لەسەر ئەو بارو شێوەی کەلەسەری بوون، هەرگیز ناشگونجێ مەگەر بەناچاری لە چەند ماوەیەکدا کە بێگومان ئەبێ دوایی بێت و هەر دواترین هەنگاو بنرێ و بەکار بهێنرێ.
بەکورتی و پاڵفتەی باسەکە ئەمەیە: ئەوانەی کە پەیمانی کاتیان بووبێ و هیچ لاریەکیان نەکردبێ و بەپێی پەیمانەکە ڕەفتاریان کردبێ، ئەوانە ماوەکەیان تەواو ئەکرێ و پەیمانەکەیان ئەپارێزرێ تا کاتی دیاریی کراو، ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ نەکرابێ، یان پەیمانیان تێك دابێ و لارییان کردبێ، یان پەیمانیان لەگەڵ بەسترابێ بەبێ دیاریی کردنی

کات و ماوە، ئەم سێ تاقمە چوار مانگ مۆڵەت ئەدرێن، لە پاش ئەو چوار مانگە ئیتر ماوەی هیچ هاوبەش ڕەوادەرێك لەخاكی نیوە دوورگەدا، بەڵكو ئەبێ یان موسڵمان بن یان جەنگیان لەگەڵ ئەكرێ، لە هەر شوێنێ دەستكەون، بەو شێوە ڕەفتاریان لەگەڵكرا، لەو كاتەدا كاتی ئەوەبوو كە نیوە دوورگە پاك بكرێتەوە لە هاوبەش ڕەوادەران، بگێڕدرێ بە جێگەی ئارامی و ئاسایش بۆ ئیسلام، چونكە دوژمنی ئیسلام لەسنووردا هەستی كرد بوو بەو خەتەرە گەورەی كە ڕووی تێكردبوو لەبەرئەوە لە كەمیندا بوون بۆ پەلامار دان، وەك دەركەوت لەو ڕووداوی(مۆتەو تەبوك)ەوە هەروەها لەلایەك كەوتنی ڕۆم و سوێند خواریان لەگەڵ فارس لەیەمەن و لای خواروی نیوە دوورگەوە بۆ هاندان و هەڵمەت بردن بۆسەر ئەم ئایینە تازەیە كە بووە بە هۆی بیم و بێئارامیان. لەبەر ئەوە بەم جۆرو شێوەیە سەرەتای ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە بەو توندو بەتینییەو ئەو چارە سامناكەیداو هەڵوێستی هەموو موسڵمانێكی دیاریی كرد لەگەڵ هاوبەش ڕەوادەراندا، ئینجا لەپاش ئەو جاڕو ڕاگەیاندنە ئەم باس و بەیان و ڕوون كردنەوەی هێنا بەدوایدا، لەیەكەمجارەوە ئەو مۆڵەت دانەو ماوەكەی دیاریی كرد دەربارەی ئەوانەی كە گوترا ماوە ئەدرێن، ئەفەرموێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ﴾ ئینجا بێبڕواكان بڕۆن بە ئارامی و ئاشتی و بێباكی گەردش بكەن و بگەڕێن لەخاك و وڵاتدا بەبێ ئەوەی پەلاماری بدرێن و دەستیان بۆ ببرێ، ئەو چوار مانگە مۆڵەتە لە ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی نۆی كۆچییەوە دەست پێئەكات تا ڕۆژی دەی مانگی مەولود لەساڵی دەی كۆچی. ئەو مۆڵەت دانەش لەپاش ئەوە بوو كە ئەو پەیماندارانە پەیمانەكەیان شكاندو لە چەرخ و كاتێكدا بوو خەڵكی بێئاگابوون لە یاسا و قانوون، هەركەس بكرایە دەستی خۆی ئەوەشاند هەرچۆن بۆی ڕێك بكەوتایە، بەڵام ئیسلام هەر ئیسلامە لە هەر چەرخ و كات و شوێندا، ئەوەش بەهۆی ئەوەیە كە بەرنامەی خوایەو پەیوەندی تیبەتی نییە بەكات و شوێن و وڵاتێكەوە، كەواتە چەرخ و شوێن و وڵات نایگۆڕێ و گەشەو پەرەی پێنادات، بەڵكو ئەو مەردوم پەرەی پێئەدات و گۆڕانی بەسەردا ئەهێنێ لە چوار چێوەی خۆیدا، ئینجا لەگەڵ ئەو مۆڵەتدانەدا دڵیان ئەهێنێتە لەرزەو بێداریان ئەكاتەوە بەمەی كەوان لە ژێر چنگی قودرەتداو بەهیچ ڕەنگ لە دەستی دەرناچن،

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٢ وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ﴾ بزانن کە ئێوە دەستەپاچەکەری خوا نین و لەدەستی قوتار نابن، لەو دوا ڕۆژو چارەنووسەی کە بۆی دناون کە بریتییە لەسەر شۆڕکردن و ڕیسوایی و بێئابڕوویی وەك ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بزانن کە خوا ئابڕووبەرو ڕیسوا کەری بێبڕواکانە، واتە ئێوەی هاوبەش ڕەوا دەر کە ئەم ئایەتەتان ئاڕاستە کرا، یان ئێوەی بێبڕوا بەگشتی کەئێوە هاوبەش ڕەوا دەر لێرەدا یەکەم و سەردەستەن، ئابڕووبەرو ڕیسواکەرتانە لە هەردوو جیهاندا، بەڵێ ئەبێ ئەوانە بۆ کوێ بڕۆن و چۆن لە دسەتی قودرەتی خوا دەرچن لە کاتێکدا کە خۆیان بەئەرزو ئاسمان و هەموو شتێك لە ژێر چەپۆکەو قودرەتی دایە؟!! ئینجا ئەو کات و شوێنە دیاریی ئەکات کە ئەو جاڕی خوای تێدا ئەدرێ. ئەفەرموێ: ﴿وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ﴾ ئەمە ڕاگەیاندن و جاڕدانێکی گەورەو سامناکە لەلایەن خواو فروستادەکەیەوە لە ڕۆژی حەجی گەورەدا بۆلای خەڵکی بەگشتی ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ﴾ بەمەی کە خواو فروستادەکەی بەرین لە هاوبەش ڕەوادان، واتە لە بەڵێن و پەیمانەکانیان، یان دۆستایەتی و هاوکاریی و پەیوەندیەکی تری دۆستایەتی. کە پەیمانەکەیان هێندێکیەتی، چەند ڕایەکی تریش هەیە لە مەبەست بە ڕۆژی حەجی هەرە گەورەدا، هەرکام هەر باشەو لە ڕیوایەتدا هاتووە، کەواتە بەهەرکام بگیرێ دروستە، هەروەها لەناوبردنی ئەو ڕۆژە بەو ناوەوە چەند ڕایەك هەیەو هەرکام دەست ئەدات و چاکە، لەسەر هەر بارو بە هەرحاڵ ئەو ڕاگەیاندن و جاڕدانە بەدی هات لەو ماوەو ڕۆژانەدا، ئەو بەری بوونە ڕاگەیەنرا دەربارەی هەموو هاوبەش ڕەوادەران بە شێوەی گشتی، بێجگە لەوانەی لێی دەرکران، کرا بە بیرو باوەڕێکی بنەڕەتی و سەرەکی، ئەوەش شتێکی زۆر ڕێك و پێکە لەگەڵ سروشتی پەیوەندی نێوان موسڵمانان و ئەوان کە هەرگیز ئەو دوو کۆمەڵە یەك کەوتن و ژیانیشیان ناگونجێ پێکەوە، وەك بە درێژی ڕوونکرایەوە، هەروەها جیاکردنەوەی ئەو پەیماندارانەی کە باسیان دێت، شتێکی ڕێك و ڕەوایە بەپێی دادو دادپەروەریی ئیسلام. ئینجا لەگەڵ ئەو جاڕدانی بەری بوونە، بەپێی بەرنامەکەی خۆی کە هەمیشە ڕێنموونی ئەکات و هانی بەندەیان ئەدات لەسەر ڕێنموونی و ترساندن لە گومڕایی،

فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُوا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾

---

بەو پێیە ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تُبْتُمْ﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە تۆبە ئەکەن لە بێبڕوایی و بێباوەڕەکانی پەیمانی ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوە چاکە بۆتان، بێگومان ئەوە چاکە بۆمان لە هەردوو جیاندا، ﴿وَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ ئەگەر ڕوو وەرئەگێڕن لە تۆبەو پەشیمان بوونەوەو بەردەوام ئەبن لەسەر حاڵو باری بەدی خۆیان ﴿فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ﴾ بێبڕواکان ئەوا بزانن کە ئێوە دەستە پاچەکەری خوا نین و لەدەستی قودرەتی دەرناچن ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُوا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر موژدە بدە بەوانەی بڕوایان نەهێناوەو لەزانینی خوادا بڕوا نەهێنانیان تێپەڕی کردووە، موژدەیان بدەرێ بەسزایەکی سەختی ئێش و ئازار بەر. بەرنامە بێ گەردەکەی خوا لەپێش هەموو شتێکدا بەرنامەی ڕێنموونییە، ئەوەتا مۆڵەتی ئەو بێبڕوایانە ئەدات لەو ماوەیەدا، مۆڵەتدانەکەش. نەك هەر لەبەرئەوە کە لە ناکاودا نەدا بەسەریاندا کە ئەوە شتێکی لارو نارێکە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ئەوانە بیرو هۆشێك بکەنەوەو ڕێگەی ڕاست بدەنەبەر، ئینجا هانیدان لەسەر تۆبەو گەڕانەوەو ترساندنی لەسەر پێچیو نافەرمانی، نائومێدی کردن لەسوودو بەرهەمی ئەو سەرپێچیو نافەرمانییە کە بەتەمای بن، هەڕەشەشی لێکردن بەسزای ڕۆژی دوایی. لەپاش سەر شۆڕیو ڕیسوایی ئەم جیهانە، ئەو ترس و لەرزەی خستە دڵیان تا ڕایانچڵەکێنێ. بەڵکو ئەو تۆزو دوکەڵ و هەورەی کەوا بەسەر سەرو پشتیانەوە لاچێ و نەمێنێ و بەهۆی ئەوەوە گوێڕایەڵی بکەن. ئینجا لەپاش ئەوانە با ئارامی بکەوێتە ناو ڕیزو دڵی موسڵمانەکان و بیم و ترسیان نەمێنێ و بزانن کە چارەنووسی بەدی ئەو بێبڕوایانە دیاریی کراوە لە بڕیاری خوادا! لە پاش جاڕدانی ئەو بڕیارە شامناکە، ئینجا بەشێوەی کاتی ئەم خاوەن کاتی ئەم خاوەن پەیمانانە دەرئەکات لەو بڕیارە گشتییە تا لەپاش دوا هاتنی ماوەکەیان بەپێی بڕیارە گشتییەکە ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ، ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ بێجگە کە پەیمانتان لەگەڵ بەستن لەهاوبەش ڕەوادەرەکان

﴿ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا﴾ ئینجا ئەوانە کەم و کوڕییان نەکرد لێتان لەهیچ شتێك لەمەرج و بەندی پەیمانەکەیان لەگەڵتان ﴿وَلَمْ يُظَـٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا﴾ کۆمەکی هیچ کەسێکیان نەکرد بەدژی ئێوە ﴿فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ﴾ ئەوانە پەیمانەکەیان بۆ تەواو بکەن تا ماوەکەی خۆیان واتە بەو دوو مەرجە پەیمانەکەیان بېەنەسەر بەبێ کەم و کوڕی تا ماوەکەیان دوایی دێت، هەرچەند مەرجی یەکەم دووەمیش بگرێتەوە بەڵام لەبەر گرنگی بەتایبەتی باسی کرد، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان خوا خۆپارێزەرانی خۆش ئەوێ، واتە پەیمان ڕاگیر کردن و پاراستنی فەرز پێویستە، کەواتە ئەو پەیمانەی کە بەستووتانە بیپارێزن، چونکە خوا خۆپارێزەرانی خۆش ئەوێ. کەواتە هەڵسان بەو تەواو کردنە عیبادەت و خواپەرستی بوو کە هەر لە ئیسلام دێت شتی واو بەو ڕادەیە بە گرنگ گرتن، ڕای بەهێز و ڕێك و ڕاست لەگەڵ ڕیوایەتە صەحیحەکان دا ئەمەیە بەم پەیمانە پەیمانەکەی حودەیبییە کە بەسترا لەگەڵ قوڕەیش و سوێند خوارەکانی، ئەوانەی کە فەرماندرا پاراستنی پەیمانەکەیان دوو دەستە بوون لەبەنی کنانە کە پەیمانەکەی خۆیان بردە سەرو بەشداریان نەکرد لەو دەست درێژییەی کە کرایە سەر خوزاعە کە سوێند خواربوون لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا، لەو دەست درێژیی کردنەدا قوڕەیش یارمەتی دەست دێژیی کەرانیاندا بەهۆی ئەوەوە پەیمانی حودەیبییە هەڵوەشایەوە کە ماوەکەی دەساڵ بوو، ئەو تاقم و دەستەیە کە(کنانة) کە دوو خێڵبوون لەسەر پەیمانەکە مانەوە هەرچەندە بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەر بوون، بەڵام پەیمانیان پاراست، لەبەر ئەوە فەرماندرا بە پارێزگاری پەیمانەکەیان تا ماوەکەی دوایی دێت، بەکورتی ئەوانەی کە پارێزگاری پەیمانەکەیانکرد فەرماندرا بەتەواو کردنی پەیمانەکەیان تا ماوەکەی خۆی، بێجگە لەوان چوار مانگ ماوە دران. ئەوەی کە شایانی باسە ئەمەیە کە تاقمی یەکەم پێش تەواو بوونی ماوەکەیان موسڵمان بوون، ئەوانەش کە چوار مانگ ماوە دران بگەڕێن بە وڵاتدا، نەگەڕان و ئیسلامیان هەڵبژارد بۆ خۆیان، والحمد لله رب العالمین. لەپاش ئەوەی فەرمانیدا بەتەواو کردنی ماوەی پەیمانی ئەوانەی کە بەرێکی پارێزگاری پەیمانی خۆیان ترد، فەرمانیدا بەمۆڵەت دانی چوار مانگ سەبارەت بەهەموو جۆرە هاوبەش ڕەوادەرانی تر،

﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾

ئینجا باسی حوکم‌و بڕیاری ئەمانە ئەکات لە پاش تێپەڕ کردنی چوار مانگەکە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ﴾ ئینجا دوایی هات ئەو چوار مانگە مۆڵەتە کە قەدەغە کرا جەنگ کردن لەگەڵیان تیایاندا، کە ئەو چوار مانگەش دەست پێ‌ئەکەن لە ڕۆژی جەژنی قوربانەوەو دوایی دێن لە دەی مانگی ڕەبیعی دووەمدا، ﴿فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾ ئەو کاتە ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانە کە مۆڵەتەکەیان تەواو بوو بیان کوژن لە هەر شوێنێ دەستتان کەوتن ﴿وَخُذُوهُمْ﴾ بەدیل بیانگرن ﴿وَٱحْصُرُوهُمْ﴾ بەرگریان بکەن لەدەرچوون کاتێ چوونە قەڵاو پەناگاه ﴿وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ دانیشن بۆیان لە هەموو کەمین‌و جێگای چاوەڕوانیدا، واتە ڕەوایە بۆتان هەرکام لەم چوار کردەوە کە بەسەریان بێنن، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست بەو مانگانە ئەو چوار مانگە بەناو بانگەیە کە ڕەجەب‌و مانگی دوای شەشەڵانەو مانگی قوربانەو موحەڕەم، بەڕاستی ڕای یەکەم لە دڵدا بەهێزو جێگیر ترە، بەڵکو هەر ئەوە ڕاستە. ئەوانە مۆڵەت دران ماوەیەك کە بەسە بۆ ئەوەی بیرێك لە خۆیان بکەنەوە، کەواتە بەغەدرو لەناکاودا ناکوژرێن‌و ناگیرێن، ئاگادار کراون نەمانی پەیمانەکەیان، کەواتە هیچ بڕو بیانوویەکیان نییە، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێگەی ڕزگارییان بۆ دانراوەو مەبەست ئەوە نییە لەناو ببرێن وەك ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە تۆبە بکەن‌و نوێژ بەڕێکی بەجێ‌بێنن‌و زەکات بدەن ئەوا لێیان گەڕێن‌و ڕێیان بەرەڵاکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە، واتە لەبەر ئەو لێبوردەیی‌و میهرەبانییە خوا بەو تۆبەو گەڕانەوە وازیان لێ ئەهێنێ، بەڵێ بەڕاستی ئەگەر خوا لێبوردەیی‌و میهرەبانی نەخاتە کار ئەوانە هەروا بە ئاسانی قوتار نابن، ئایا چۆن قوتار ئەبوون کە ماوەی(٢٢) ساڵ سزاو ئەشکەنجەی موسڵمانەکانیاندا بەهەر جۆر کە پێیان کراو لە دەستیان هات، جەنگیان لەگەڵ کردن‌و هانی خەڵکیاندا لێیان، چۆن بەو جۆرە فەرمانی ئەدا بەواز هێنان‌و چاوپۆشی لەو هەموو سزاو تاوانە کە بەبێ سوچ‌و گوناه دەربارەی ئەو موسڵمانانە کرا؟!!

وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ

---

ئینجا لەگەڵ ئەوەی کە بڕیاری جەنگ ئەدا لەپاش ئەو چوار مانگە، هێشتا لەگەڵ ئەوەدا هەر چاوپۆشی بەکار ئەهێنێ بەمەی هەرکەس لەهاوبەش ڕەوادەران داوای هاوسێتی و مانەوەی کرد بەبێ ترس و بیم ئەبێ ڕێگەی بدرێ و بەهیچ شێوەیەك دەستی بۆ نەبرێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ﴾ ئەگەر هەرکەسێك داوای هاوسێیەتی و پەنادانی کرد ﴿فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ پەنای بدە هەتا یان لەبەر ئەوەی کە وتەی خوا ببیستێ ﴿ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە بیگەیە ئارامگای خۆی و ئەو شوێنەی کو شوێنی ئارامی و بێباکییە بۆی ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾ ئەو فەرمان دانە بە پەنادان بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە دەستەو کۆمەڵێکن نازانن، نازانن ئیسلام چییەو ئەو ئایینە چییە کە بانگ ئەکرێن بۆلای، کەواتە بابێت لە وڵاتی ئیسلامدا بژی و تێ بگات لە ئیسلام لەبەر ڕێك و پێکی و هیچ برو بانوویەکی نەمێنێ بۆ بڕوانەهێنان، بەتایبەتی لەو کاتی پەنادانەدا بۆیان دەرئەکەوێ کە بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەڕاست دەرچوو بەڵێنی سەرکەوتنی موسڵمانان و ژێر کەوتنی بێبڕوایان، ئینجا ئایا ئەو ماوەی پەنادانە چوار مانگە وەك هێندێ لەزانایان ئەفەرموون، یان هەواڵەی ڕای پێشەوای موسڵمانان ئەکرێ، هەر کام ئەگونجێ و بەرگری کەرێك نییە بۆی؟ هەروەها ئایا ئەو داوای پەنادانە لەلایەن بێبڕواکەوە ئەبێ هەر لەبەر نیازی ئەو بیستنە بێت، یان لەبەر هەر نیازێ تریش بێت هەر پەنای بدرێ؟ ئەمەش شتێکە دووبەرەکی زانایانی تێدایە، ڕای بەهێز لە دڵدا ئەمەیە ئەگەر بەنیازی تریشەوە هەر ڕێگەی ئەدرێ، کۆمەڵێك لە زانایانی تەفسیر لە(ئیبن و عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە پیاوێك لەبت پەرستەکان گوتی بەعەلی -خوا لێی ڕازی بێ-: ئەگەر یەکێ لە ئێمە ویستی بێت بۆلای محمد لەپاش تەواو بوونی ئەو ماوەیە بۆ بیستنی فەرموودەی خوا

یان لەبەر پێویستییەك هەر ئەكوژرێ؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: نەخێر لەبەر ئەوەی خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، جا ئەگەر ئەم ڕیوایەتە تەصحیح بێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ڕای دووەمو بەڕاستی دەرئەكات، بابیر بكرێتەوە لەم ئایینە پیرۆزەی ئێمە كە نەزان زانا ئەكاتو پەنای پەنا خواز ئەدات، تەنانەت با دوژمنیش بێت كە سەركێشو جەنگ كەرە لەگەڵی، بە هەموو جۆرێك هەوڵو تێكۆشان ئەكات بەدڵسۆزیو ئاشتی بۆ ڕێنموونیو خستنە سەر ڕێی ڕاست، زۆرو چەك بەكار ناهێنێ مەگەر بۆ بەرگری كردنو نەهێشتنی ڕێگرو بەرگری كەرانی ڕێگەو ئایینی خوا، ڕێگرو بەرگری كەرن لەبیستنو وەرگرتنی فەرموودەی پەروەردگار، بەهۆی ئەوەوە ڕێگرن لە ڕێنموونیو كەوتنە سەر ڕێی ڕاست، ڕێگرن لە ئازادیو سەربەستی بەندەیانی خوا، ڕێگرن لە پەرستنی پەروەردگاری بەندەیانی خواو بانگ كەرو ناچار كەرن بۆ پەرستنی بەندەیانو دروستكراوانی خوا، هەركاتێ ئەو ڕێگرانە نەبوون یان نەهێڵرانو ژێر دەستكران، ئەو كاتە مەردوم ئازادەو لەژێر سایەی ئیسلامو چاودێریی ئیسلامدا ئازادە لەسەر بیروباوەڕی خۆی، خەڵكی فێر ئەكات تا ئەیگەیەنێتەوە جێو شوێنی خۆی، ئەوەشی لەگەڵ ئەكات لە كاتێكدا كە ئەو خەڵكە بێزارو ناڕازی یە بەو بەرنامەی خوا!! ئینجا شتێكی ئاشكرایە ئەمڕۆ لەجیهاندا ئەو هەموو بەرنامەو یاساو ڕژێمە زەمینییانە هەن، هەركەس دژو پێچەوانەیان بێت بێباكو ئەمین نی یە نەلە گیانیو نەلە ماڵیو نەلەناموسی! ئەمە شتێكی ئاشكرایە بە پێش چاوی هەموو جیهانەوە، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا ئەبینرێ كە هێندێ كەس داماوو دەستە پاچەن لەبەردەم فاكو فیكی بێگانەداو ئەیانەوێ بەهەر جۆر بووە ئیسلام لەبەرنامە ڕاستەكەی خۆی لادەنو پینەو پەرۆ بكەن بۆئەوەی كە ئیسلام چەك بەكار ئەهێنێ بەرامبەر دوژمن، دەمە پێچەیانەو ناتوانن بەرپەرچی بێگانە بدەنەوەو بەبێ‌پێچو پەنا ڕاستو ڕەوایی ئەو بەكار هێنانی چەكە بخەنە ڕووو دەری خەن!!

بێگومان بە چەند ئایەتو حەدیس دەركەوتووە كە پەیمان بەستن لەگەڵ بێبڕوایاندا شتێكی ڕاستو ڕەوایە، پارێكاریو نەشكاندنی فەرزو پێویستە، لەگەڵ ئەوەدا لەم ئایەتانی بەرائەتەوە دەركەوت كە هەموو پەیمانەكان كە بەستراون لەگەڵ بت پەرستەكاندا ئەبێ

بشكێنرێن بێجگە لە یەکێکیان کە ئەویش دوایی پێئەهێنرێ لەپاش تەواو بوونی ماوەکەی، کەواتە سەرەنجام و دوا ڕۆژی ئەو هەموو پەیمان دەرانە ئەمەیە کە ئەبێ یان موسڵمان ببێ یان جەنگ و کوشتارو ڕێ لێگرتن و بەدیل گرتن بەشیان بێت، دەی بە دیمەن و ڕواڵەت ئەبێ دژایەتی پەیدا ببێ لەنێوان ئوە دوو شتەدا: بە گرنگ گرتنی پەیمان، گوێ پێ نەدان و شکاندنی، جا لەبەر ئەوە هێندێ لەزانایان ئەم ئایەتەی داناوە بەسڕینەوەی ئەو ئایەتانەی کە فەرمان ئەدەن بە پارێزگاریپەیمان، هێندێکی تر لەسەر ئەوەن کە ئەو بە گرنگ گرتن و پارێزگاری پەیمانە تایبەتییە بەکات و قۆناغێکی تایبەتییەوە کە تێپەڕیانکردووەو بەسەر چوون، ئەم ئایەتانەی بەرانەتە بۆ کات و قۆناغێکی ترە، جا لەبەر نەهێشتنی گومانی ئەو دژایەتییە، بۆ دەم بەستنی نەفام و ناپاکان لە چەنەبازی و تانەو تەشەر دان لە ئیسلام، لەبەرئەوە ئەوا لەم ئایەتانی داهاتووەدا دەست نیشان ئەکات بەمەی کە ئەم ئایەتانی ئێرە هیچ دژایەتی نییە لەگەڵ ئایەتەکانی تردا کە فەرمان ئەدەن بە پەیمان و ڕاگیر کردنی پەیمان، بەم ڕەنگە بڕیاری ئەم ئایەتانەی ئێرە بریتییە لە ڕەوا دانی کردەوەو فەرماندان لە کردەوە لەگەڵ دوژمندا بەوێنەی کردەوەی خۆی لەگەڵ موسڵماناندا یان کەمتر، لەبەر ئەوە بە سەرسام کردنەوە ئەم شێوە پرسیارە ئاڕاستەی بڕواداران ئەکات تا هیچ خەتەرەو خەیاڵێک نەبێ لەدڵ و دەروونداو دڵئارامی پەیدا ببێ. ئەفەرموێ: ﴿كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ﴾ ئایا چۆن ئەبێ و بە چ جۆرو شێوەیەك هیچ پەیمانێك ئەبێ بۆ هاوبەش ڕەوادەرەکان، لای خواو لای فروستادەکەی؟! واتە شتی وا نابێ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ﴾ بێجگە لەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستن لای مزگەوتی بەڕێزدا، واتە بێجگە لەوانەی کە پەیمانی حودەیبییەتان لەگەڵ بەستن و ئینجا بەڕێکی پەیمانەکەیان ڕاگیر کردووە وەك دەست نیشانیان بۆ کرا لەئایەتی چوارەمداو لە تەفسیرەکەیدا ڕوونمان کردنەوە، ﴿فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ﴾ کەواتە تا ئەوان ڕێك و ڕاست و دامەزراو بن بۆتان و پەیمانەکەیان ڕاگیر کرد، ئێوەش ڕێك و ڕاست و دامەزراو بن بۆیان و پەیمانەکەیان ببەنە سەرو ڕگیری کەن،

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ بەڕاستی خوا خۆپارێزەرانی خۆش ئەوێ کەیەکێ لەو شتانەی پێویستە پاراستنی ئەو پەیمانەیە، ئەمانەی کەلەم ئایەتەدا دەست نیشانی بۆ کردن هەر ئەوانەن ـ وەك گوتمان ـ کەلە ئایەتی چوارەمدا تێپەڕیان کرد، لەئایەتی پێشوودا باسی تا ئەو گشتێتی و ئەو بەری بوونی خواو پێغەمبەرە(ﷺ) نەیانگرێتەوە، لێرەدا دووبارەی کردنەوە تا بەری ئەو بێزاری دەربڕینە نەکەون کە ئەم ئایەتی ئێرە نیشانی ئەدات دەربارەی پەیمان بەستن لەگەڵ هاوبەش ڕەوادەرەکان، کەواتە ئەم دەستەیە نەبەری بوون هەیە لە پەیمانەکەیان، وە نەبێزاری دەربڕین هەیە دەربارەی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵیان بەسترا، ئەگەر ئەم دووبارە کردنەوە نەبووایە وا گومان ئەبرا کە ئەم ئایەتی ئێرە بڕیاری ئایەتی پێشووی سڕیوەتەوە، ئینجا لەبارێکی ترەوە پێویست بوو ئەم دووبارە کردنەوە، چونکە ئەبێ بەتەواو کەری پێشوو بەم ڕەنگە ئایەتی پێشوو ڕێك و ڕاستی و دامەزراوی ئەگەیەنێ بۆ ڕابوردوویان، ئەم ئایەتی ئێرە ئەو ڕێکی و دامەزراوییە ئەکات بە مەرج بۆ داهاتوویان، بەڕاستی ئەم جۆرە وردەکاری و دەستەواژە شیرینە هەر لە دەست قورئان دێت، جل جلال ربنا و کتابة العزیز. بێگومان ئەو بێزاری دەربڕینە لە پەیمان بەستن لەگەڵ ئەو هاوبەش ڕەوادەرانەدا زۆر ڕاست و بەجێیە لە بناغە و بنەڕەتدا، چونکە ئەو هاوبەش ڕەوادەرانە نە ئایین و بەرنامەی خوایان گرتووەتە گەردن، وە نەمل کەچ ئەکەن بۆ فەرمانەکانی، بڕوایان نییە بە فروستادەکەی ئەوانە بەربەرەکانیان نەکردووە لەگەڵ بەندەیەکی وەکو خۆیان بەربەرەکانی لەگەڵ پەروەردگاریان و نامەکەی و فروستادەکەی، کەواتە چۆن ئەبێ پەیمانێ بۆ ئەوانە لای خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، ئینجا ئایا بێجگە لەو شتە سەرەکی و لەو تاوانە زۆر گەورەیە چەند هۆیەکی تر هەیە بۆ ئەو بێزاری دەربڕینە وەك لەم ئایەتی داهاتووەدا دەست نیشانیان بۆ ئەکات؟ بەڵێ چەند هۆیەکی تر هەیە بۆ بێزاری دەربڕین لە پەیمان بەستن لەگەڵ ئەو هاوبەش ڕەوادەرانە بێجگە لەو هۆی سەرەکییە کە باسمانکرد. ئینجا

لەوانەیە ئینجا لەوانەیە کەسێك پرسیارێك بکات کە ئایا چۆن ئەم ئایەتە بێزاری دەرئەبڕی لە ئەسڵی پەیمان بەستن لەگەڵ بێبڕوایان لە کاتێکدا کە لە چەند ئایەتی تردا پەیمان بەستنی ڕەواداو فەرمانی داوە پێی، هەرچەند ڕەوایشی داوە هەڵوەشاندنەوەی لەکاتی مەترسی کردن لەناپاکی وەك بەدرێژیی باسکرا، بەڵام کە بیر بکرێتەوەی تێ ئەگەین کە ئەو پەیمانانە بە پێی داخوازی قۆناغی و کاتی تایبەتی بووە لە ڕێگای بزووتنەوەو بانگەوازەکەی ئیسلامدا کەهەر لەیەکەمجاری هاتنییەوەو مەبەستو ئامانجی خۆی دەربڕیوە بەبێ پێچو پەنا، کە بۆ ئەوە هاتووە ملکەچیو گوێ ڕایەڵی ئەبێ هەربۆ خوا بێت بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، بۆ ئەوە هاتووە کە هەر شەریعەتو بەرنامەی خوا حاکمو کاربەدەست بێت، هەر لەیەکەم ڕۆژی هاتنی ئەو مەبەستو ئامانجەی دەربڕیوە بەبێ فێڵو هەڵخەڵەتاندنی هیچ کەسێك تەنهاو وتەی ﴿لا إلـه إلا الله﴾ بەسە بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستو ئامانجە، ئەگەر ڕۆژو زورف داخواز بووبێ بۆ ئەوە مەبەستو ئامانجەکەی بوەستێنێو بەجێی نەهێنێ، بێگومان هیچ کاتێك بێئاگا نەبووەو لەبیری نەچووە کە ئەبێ نەوەستێو تێکۆشان بکات تا هەموو جیهانو جیهانیان ملکەچ ئەکەن بۆ حاکمێتیو بەرنامەو بڕیاری خوا، تا هیچکەس نەمێنێ سەرپێچیو سەرکێشی بکات لە بەرنامەو ئایینی خواو ئەبێ سەر شۆڕبکات لەبەردەم ئایینو شەریعەتی خوادا، ئیتر بابڕوای پێی نەبێو نەیکرێتە کەردن، هەرچۆنێ هەمیشە زانیویەتیو لە بیری بووە کە بێبڕواکان کۆتایی هێنانیان نییە لە هێنانیان نییە لە دوژمنایەتیو هەوڵدانو بۆ نەهێشتنی ئیسلام، ئەگەر لەدەستیان بێتو بۆیان بکرێ، ئەگەر ئاشتیو وازهێنانیان بەکار هێنابێ، ئەوە ڕۆژو زروفیان تەواو نەبووە! لەپاش ئەوەی بێزاری دەربڕی لەبوونی پەیمان لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە(ﷺ) سەبارەت بەهاوبەش ڕەوادەران لەبەر دژو دژایەتیانو سەرکێشییان بۆ ئایینو بەرنامەی خواو نامەی خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەپاش ئەوە ئینجا دووبارە بێزاری دەرئەبڕێ لەبوونی ئەو پەیمانە لەبەر ئەو دژایەتیو لەبەر چەند هۆیەکی تر کە دەست نیشانیان بۆ ئەکات لەم ئایەتانی داهاتوودا،

﴿كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ ٨ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩ لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ﴾

ئەفەرموێ: ﴿كَيۡفَ﴾ چۆن هیچ پەیمانێك ئەبێ ئەو هاوبەش ڕەوانەرانە لای خواو فروستادەکەی لەکاتێکدا ﴿وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەگەر ئەوانە زاڵ ببن بەسەرتانداو زەفەرتان پێ ببەن ﴿لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ﴾ سەرنج نادەنو چاودێری هیچ سوێندو پەیمانو خزمایەتیو گرتنە گەردنێك ناکەن لەئێوەداو سەبارەت بە ئێوە، واتە سەرناکەنەوە لەهەر کارو کردەوەیەکی بەدو خراپ کە بۆیان بکرێو لە دەستیان بێت بەسەرتانی ئەهێنن یان بەبێ سەرکردنەوەو گوێدان بەهیچ گوناهو مەنعو لۆمەیەك کە ڕوویان تێبکات بەهۆی ئەو کردەوە بەدانەی کە بەسەرتان بێنن، لەهیچ سونرێکدا ناوەستن لەو کردەوە خراپانەی کە بۆیان بکرێ، هیچ شتێك بەرگریان لێناکات مەگەر دەستەپاچەییو بێدەسەلاتی، لەکاتی دەسەلاتو زاڵبووندا بەو جۆرەن، لەکاتی بێدەسەلاتیو زاڵ نەبووندا بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ بەدەمیانو بە وتەی نەرمو شیرینو لاف پەیمان پاراستن ڕازیتان ئەکەن، واتە ئەوەی کە پێتان ئەڵێن بەوتەی دەمی ڕووتە ﴿وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ﴾ دڵەکانیان دژو بێزارن لە وتەکانیان، دژی ڕاگیر کردنی پەیمانەکەیانەو پڕن لە کینەو خەشم دەربارەتان ﴿وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾ زۆربەی ئەوان تێپەڕکەرن لە سنووری پەیمانو لەگوێڕایەڵیو ڕاستی، نەعەقیدەو بیروباوەڕێکیان هەیە جڵەوگیریان بێت، نەپیاوەتیو مەردایەتییەکەیان هەیە بیانگێڕێتەوە لە خراپەو نامەردیو دەرچوون لە ڕێنموونی خواو بەرنامەی خوا، هەر ئەو دەرچوونو تێپەڕ کردنەش هۆی ئەو هەموو کردەوە بەدانەی ئەوانەو هۆی ئەو خەشمو قینەیە کەلە دڵیان دایە دەربارەی ئێوەی موسڵمان، هۆی ئەو ناڕاستیو بێ پەیمانییەیە، بەهۆی ئەوەیشە کە ژیانی ئەم جیهانە کەمو کورو بێنرخە باو ئەدەن بەسەر بەرنامەو ئایەتەکانی خوادا، کە مەترسی ئەکەن ئەو ئایەتو بەرنامەیە ببێتە هۆی لەدەست چوونی ئەم ژیانە کەمو بێنرخە وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا﴾ کڕییان بەئایەتەکانی خوا دەست کەوتو بریتیو شتێکی کەم لەژیانی ئەم جیهانە

که هەموو ئەم بوونەوەرو جیهانە شتێکی زۆر کەمو بێباوەڕەکانی نرخە لە چاو ئەو نازو نیعمەتو خۆشییەی کە دوانە هاتووەو نەبڕاوەیەو خوا بەڵێنی پێداوە بۆ بڕواداران لە ڕۆژی دواییدا، بەڵێ بەڕاستی هەموو ژیرێك ئەزانێ کە ئەم جیهانە بێنرخەو چاو نادا لەچاو ئەو جیهانە نەبڕاوە کە ئەو بێبڕوایانە بەشێکی کەمیان هەڵبژاردو باویاندا بەسەر ئایەتو بەرنامەکەی خوادا، ئەو شتە کەمەیان باو داو گۆڕیانەوە ﴿فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦٓ﴾ بەهۆی ئەوەوە ڕوویان وەرگێڕا لە ڕێگەی خواو پشتیان تێکرد، بەرگری خۆیشیانو کەسانی تریشیان کرد لەو ڕێگەڕاستە، ﴿إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بەڕاستی زۆر بەدو خراپ بوو ئەوەی کە کردیانو بەردەوام بوو لەسەری، ئەوانە خەشمو قینیان تەنها لەو موسڵمانانە نییە کە بەریەرەکانێو جەنگو ئاژاوەیان بووە لەگەڵیانو پیلانو بەد کرداریان هەر هەر بۆ ئەوانە نییە، بەڵکو دەربارەی هەموو موسڵمانو بڕواداریك هەر بەو جۆرەن وەکو ئەفەرموێ: ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ﴾ چاودێری ناکەنو گوێیان نییە لە هیچ سوێندو پەیمانو خزمایەتیو ناسراوییەك دەربارەی هیچ بڕوا دارێك، واتە هەر خەشمو قینێ کە هەیانە لەبەر ئاینو بڕواکەیانە، کەواتە هەرکەس خاوەنی ئەو ئاینو بڕوا نەبێت بوو ئەوانە یەکسانەو ئەو خەشمو دوژمنایەتییەیان چوون یەکە، ئەوە شتێکە بەدرێژایی مێژوو هەروا هاتووە وەك قورئان ڕوونی ئەکاتەوە لە چەند جێگاو شوێنێکدا، ئەوەتا جادوبازەکانی فیرعەون کە بڕوایان هێناو فیرعەون هەڕەشەی لێکردن بەسزا سەختەکەی قورئان باسی ئەکات، ئەو جادوبازانە گوتیان بە فیرعەون: ﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ﴾ تۆقینی هیچ شتێکت لەدڵدا نییە ئەمە نەبێت کە ئێمە بڕوامان هێناوە بە ئایەتەکانی پەروەردگارمان کاتێ هاتن بۆمان، هەروەها خوا فەرمانیدا بە پێغەمبەرمان(ﷺ) کە بفەرموێ: بەنامەدارەکان: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ ئەی نامەدارەکان ئایا ئێوە ڕقو قینی هیچ شتێکتان هەیە لەئێمەو لەلایەن ئێمەوە بێجگە لەوەی کە ئێمە بڕوامان هێناوە بەخوا؟ هەروەها سەبارەت بە ﴿أَصْحَـٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴾ ئەفەرموێ: ﴿وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ ئەو خاوەن لەغمە ئاگرانە قینی هیچ شتێکیان لە دڵدا نەبوو، بۆ ئەو بڕوادارانە بێجگە لەوەی کە ئەوانە بڕوا ئەهێننو بڕوایان هەیە بە خوای زاڵی توانای سوپاسکراو، جالەبەرئەوە ئەو بێبڕوایانە چاودێری هیچ پەیمانو خزمایەتییان نییە سەبارەت بەهیچ بڕوادارێك، ئەوانە دەربارەی هەر بڕوادارێك بەو جۆرەن،

وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْأٓيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾

---

﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ﴾ هەر ئەوانە دەست درێژیی کەرن و لەسنووری سوێندو پەیمان دەرئەچن لەلا بڕوادارەکان، ئەوانە لەیەکەمجارەوە ئاگری جەنگیان هەڵگیرساند، هۆی ئەوەش ئەوەیە کە بێزارن لە بڕواو بڕواداران، ئینجا بڕیارو حوکمی خوا دەربارەی ئەو دوژمنە دەست درێژی کەرانە ئەمەیە لەداهاتوودا: ئەگەر بەڕێکی هاتنە ڕیزی موسڵمانەکان، ئەوە ئەبن بەبرایان لە ئاییندا، ئەگەر لەپاش پەیماندان سوێندو پەیمانەکەیان شکاندو تانەو تەشەریاندا لە ئایینەکەیان ئەوا ئەوانە پێشەواو سەرۆکی بێ بڕوایین و ئەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە بڕوا بێنن بەڕێکی و نوێژ بەجێبێنن و زەکات بدەن، ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِۗ﴾ ئەوا ئەوانە براتانن لەئاییندا ئەی بڕوادارەکان، مەبەست بە مەرجی سێیەم ئەوەیە ئەگەر ئیسلام زەکاتی لەسەر پێویست کرد. ئەگەر پێویستی نەکرد بەم ڕەنگەماڵی نەبوو یان هەیبوو بەڵامساڵی بەسەردا نەهاتبووەوەو پێویستیش بوو تێپەڕکردنی ساڵ ئەوا نەبوونی ئەم سێیەمە زیانی نییە بۆ ئەو برایەتییە. ﴿وَنُفَصِّلُ ٱلْأٓيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بەڕوونی ئێمە ئایەتەکانی خۆمان باس ئەکەین بۆ کەل و کۆمەڵێك کە ئەزانن و بیرئەکەنەوە لێیان و تێ ئەگەن لەڕاست و دروستییەکەیان کە ئەوانەیش بریتین لە بڕوادارانی ڕاستەقینە باس ئەکەین بۆیان ئەو ئایەتانەمان کە هەموو هەق و ناهەقێك ڕوون ئەکەنەوەو دەری ئەخەن، یان باس ئەکەین ئایەتەکانمان بۆ زاناو ئەوانەی کە زانینیان هەیە. خوای میهرەبان ئایەتەکانی خۆی باسکردووە بۆ هەموو کەس، بەڵام لەبەر ئەوەی هەر زانا سوودیان لێ وەر ئەگرێ وەك هەر بۆ ئەوان باسکرابێ وایە، مەبەست بە ئایەتەکان ئەو ئایەتانەن کە هاتنە خوارەوە دەربارەی هاوبەش ڕەوانەرەکان کە تێپەڕیان کرد، یان بەشێوەی گشتی هەموو ئایەتەکان مەبەستە کە ئەم ئایەتانەی ئێرە یەکەم و سەردەستەن لێرەدا، ئەم ڕستەیە بەتێ هەڵکێش فەرمووی: بۆ هاندان لەسەر بیرکردنەوەو تێفکران لەو ئایەتانەدا کە خوای میهرەبان ناردنییە خوارەوە بۆ ڕێنموونی بەندەکانی، ئەوانە ئەگەر دێنە ڕیزی موسڵمانەکان و هاوبەشییان ئەکەن لە کردەوە چاکەکانیاندا ئەوا ئەبن بەبرای ئایینییان،

وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾

---

﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ ﴾، ئەگەر لە پاش پەیمان دانیان و سوێندەکانیان هەڵئەوەشێننەوەو پاشگەز ئەبنەوە لەوەی پەیماندرا لەسەری ﴿وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾ تەشەرو تانە بدەن لە ئایینەکەتان و ڕەخنەو عەیبی لێ بگرن و لاقرتی پێبکەن ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ﴾ ئەوا جەنگ بکەن لەگەڵ پێشەواکانی بێبڕواییدا، واتە ئەگەر بەو جۆرەیانکرد ئەوانە ئەبن بەسەرۆک و پێشەواو هەڵگری ئاڵای بێبڕوایی، دەی کەواتە جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ﴾ بەڕاستی ئەوانە لەڕاستیدا هیچ جۆرە پەیمانێکیان نییەو شایستەی ئەوەن جەنگیان لەگەڵ بکەن، جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ﴾ بەڵکو بەهیوای ئەوە کۆتایی بێنن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا.

ئەم ئایەتانە هەرچەند هاتنە خوارەوە دەربارەی ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانەی ئەو چەرخە، بەلام لەڕاستیدا ئەو دوژمنایەتی و بارو حاڵە بەدەی کە ئەوانە بوویان دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، بەدرێژایی مێژوو هەر بووەو هەر لەلایەن هەموو چینەکانی پاش ئەوان، ئەگەر سەرنجێکی لاپەڕەکانی مێژوو بدەین ئەبینین لە هەموو کات و چەرخێکدا بێبڕواو هاوبەش ڕەوادەرەکان لە جیهاندا هەرگیز دەستیان نەگێڕاوەتەوە لە هەر کارو کردەوەیەکی بەدو ناپەسەند دەربارەی موسڵمانان، گوێیان نەداوە بەهیچ سوێندو پەیمانێک، هەرکاتێک دەسەلاتیان بووبێ دەستیان نە گێڕاوەتەوە لە موسڵمانان، بۆ نموونە بەجوانی ئەزانم لەو بارەیەوە هێندێ بەڕووداوە دڵتەزێنەکانی مێژوو بهێنم کە بێبڕواکان پێی هەڵسان دەربارەی موسڵمانان ئیتر لەلایەن بت پەرستەکانەوەو چ لەلایەن نامەدارەکانەوە، لەیەکەمجارەوە باسی هێندێ لەکرداری بت پەرستەکان ئەکەم و نامەدارەکان دوا ئەخەم بۆ کاتی تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە دەربارەی ئەوان هاتوونەتە خوارەوە، بێگومان قورئان لەگەڵێک لەسوورەتەکاندا زۆر لە هەڵوێست و کردەوە بەدەکانی بت پەرستەکانی باسکردووە لەگەڵ ئوممەتە ڕابوردووەکاندا کە چیانکرد لەگەڵ نوح و هودو چالح و ئیبراهیم شوعەیب و موساو عیسا و

شوێن کەوتووەکانیان لەچەرخ و زەمانی خۆیاندا، هەڵوێست و کردەوەی بەدی بت پەرستان دەربارەی پێغەمبەرو بڕواداران ئەوەی لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتووە پێویست نییە بەباسکردن، ئەوەی کە پێویستە بەباس ئەو ڕووداوو کردارانەیە کە بت پەرستان پێی هەڵسان لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) و یارانی، خاوەنی کتێبی:(البداية والنهاية) ئەفەرموێ: کاتێ کە تەتاری بت پەرست زاڵبوون بەسەر موسڵماناندا لە بەغدا ساڵی(٦٥٦)ی کۆچی هەرچی کەوتە بەر دەستیان لەپیاوو ئافرەت و پیرو جوان و منداڵ، بەوێنەی کارو بەرخ سەریان بڕین، ئەوەی بەردەستیان نەکەوت خۆیان شاردەوە لەناو بیرو زەلکاوو شوێنە چەپەڵەکاندا، وا ئەبوو چەند کەسانێ ئەچوونە ناو خان و دوکان و قاپیان لەسەر خۆیان دائەخست، ئینجا تەتارەکان بە شکاندن یان بە سوتاندن قاپیەکانیان ئەکردەوەو خەڵکەکەش ڕایان ئەکردو ئەوانیش ئەکەوتنە شوێنیان لەسەربانەکان ئەیان کوشتن هەتا پلوسکی بانەکان پڕئەبوون و خوێن ئەهاتە خوارەوە بۆناو کوچەو کۆڵانەکان، هەروەها ئەگەڕان بەناو مزگەوت و دانیشگاو خوێندنگاو تەکیەو میوانخانەکانیانداو هەرکەسیان بەردەست ئەکەوت ئەیان کوشت، هیچ کەسیان لە دەست دەرنەئەچوو، بێجگە لەجوولەکەو گاورەکانی ئەهلی زیمەو کەسێك کە پەنای ببردایە بەوان، یان بچوونایە بۆ ماڵی وەزیر ئیبن و العلقمی، چەند کەسانێ لەدەوڵەمەندو بازرگانەکان کەبەماڵ و سامانێکی زۆر خۆیان ڕزگار ئەکرد، بەغداد کە ئاوەدانترینی هەموو شارەکان بوو گەڕا بەوێرانەیەکی چۆڵ و هۆڵ و مەگەر تاك و تەراو کەمێك کە ئەوانەش هەمیشە لە ترس و لەرزەدا ئەژیان(لا حول ولا قوة إلا بالله) ژمارەی کوژراوەکان گەیشتە هەشت سەد هەزارو ملیۆن و دوو ملیۆن بەپێی جیاوازی هەواڵەکان، خەلیفە بەخۆی و کوڕو کچ و خێزانەوە کوژران یان بەدیل گیران، هەروەها زاناو پیاو ماقوڵەکانی دەوڵەت بە خۆیان و ماڵ و خێزانیانەوە یان کوژران یان بەدیل گیران! ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾ تا ماوەی چل شەو بەو جۆرە کوشتن و بڕین و بەیل گرتن درێژەی کێشا تا بەغداد وێران بوو، لەپاش ئەو چل شەوە جاڕدرا کە ئیتر کۆتایی هێنراو دەست لە کەس ناوەشێنرێ، لەوێدا ئەوانەی کە خۆیان داشاردبوو لەناو زەمین و زێراب و کارێزدا ئەهاتنە دەرەوەو وەك مردووی گۆڕیتان، بە جۆرێکی وا گۆڕا بوون باوك و کوڕو کەس و کار یەکتریان نەئەناسییەوە! ئەوە وێنەیەك بوو لەوەی کە هاوبەش ڕەوادەرانی تەتار هێنای بەسەر

موسڵمانەکاندا، بەبێ ئەوەی هیچ بەزەیی و سەرکردنەوە لەو هەموو تاوان و ستەمە!!
بێگومان ئەو کارو کردەوە سەختانەی نەبڕایەوە لەپاش تەتار بەڵکو جێنشینەکانی تەتار بەوێنەی ئەوان لە هەرکاتێکدا دەستیان ڕۆیشتبێ دەستیان نەگێڕاوەتەوە بەبێ بەزەیی و سەر لێکردنەوە، ئایەتی ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾ وەك تازە هاتبێتە خوارەوە دەربارەیان: ئەوەی کە گاپەرستەکانی هیندی هێنایان بەسەر موسڵمانان لەکاتێکدا کە پاکستان جوێ بوویەوە، هیچ لەکردەوە بەدەکانی تەتار کەمترو بۆگەن تر نەبوو هەشت ملیۆن لە کۆچەرانی پاکستانی کە ناچار کران بەدرچوون لەو وڵاتە، تەنها سێ ملیۆنیان گەیشتنە دەوروبەری پاکستان، ئەو پێنج ملیۆنەکەیان چەتەو لەشکری گا پەرستیان لێ بۆدەرچوو دەوریان دان تا وەك کارو بەرخ سەریان بڕین، لەشەکانیان کەوتن لەو ناوەدا بۆ داڵ و دڕندە، ڕووداوی سەخت تری دڵتەزێن ئەوە بوو کەلە ناوچەکانی هیندەوە پەنجا هەزار موچە خۆری موسڵمان کۆبوونەوەو لە دەوڵەتی هیندەوە کۆچ بکەن بۆ پاکستان، ئەوەش بەپێی یەك کەوتن و پەیمانێك کە بەسترا کە هەرکەس حەز ئەکات لەهیندەوە کۆچ بکات بۆ پاکستان بابیکات، ئەو پەنجا هەزار کەسە لەهیندەوە بەڕێ کەوتن بەسواری شەمەندەفەر تا گەیشتنە تونەلێك، لەوێدا ڕێگایان لێ گرتن و وازیان لێ نەهێنان هەتا ئەوانە پارە پارە بوون!
بەڵێ خوا ڕاستی فەرموو لە قورئانەکەیدا فەرمووی: ﴿ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾ تا ئێستاش ئەو کوشتن و بڕینە هەر بەردەوامە لەهەر کاتێکا کە بۆیان ڕێك بکەوێت! ئینجا لایەك ئەکەینەوە بۆلای جێ نیشینەکانی تەتار لەچین و ڕوسیای شیوعیدا کەچیانکرد دەبارەی موسڵمانان؟ لەماوەی چارەکە چەرخێکدا(٢٩) ملیۆن موسڵمان لەناو برا، تائێستاش ئەو کوشتن و لەناو بردنە هەر بەردەوامە، بێجگە لەو هەموو سزاو ئازارە دۆزەخییانەی کە بەکار ئەهێنرێ و دڵ ئەهێنێتە لەرزە، یەکێ لەو ڕووداوە دڵتەزێنانە ئەوە بوو کە یەکێ لە سەرۆکەکانی موسڵمانان لە ترکستان هێنراو چاڵێکی بۆ هەڵکەندرا لەسەر ڕێگەی گشتیدا، خرایە ناو ئەو چاڵەو بە زۆرو سزادان زۆر هێنرا بەخەڵکی پیسی خۆیان کۆبکەنەوەو بیکەن بەسەر ئەو سەرۆکە موسڵمانەدا، تا ماوەی سێ ڕۆژ ئەو کردەوە درێژەی پێدرا هەتا بەو جۆرو شێوە لەناو براو کوژرا!!! هەروەها لە یوغوسلافیای شیوعیدا بەهەموو جۆرو شێوەیەك کوشتن و بڕین و سزادان بەکار ئەهێنرێ دەربارەی موسڵمانان کە بەدترین و

پیس ترینیان ئەوە بوو موسڵمانەکان بەپیاوو ئافرەتەوە ئەهێنران و ئەدران لە مەکینەو لەو سەرەوە دەرئەچوون و ئەکران بەهەویر، ئەوەی کە ئەکرا لە یوغوسلافیادا لە هەموو دەوڵەتە شیوعیەکانی تریش بەکار ئەهێنرێ، ئەم ئایەتی بەرائەتە: ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾ وەك ئێستا هاتبێتە خوارەوە دەربارەی ئەم ستەمکارو تاوانبارانەی ئەم کاتو چەرخە!

کەواتە ئەو بەسەر هاتو ڕووداوانە شتێکی کاتی نین و تایبەتی نین بە وڵاتێکەوە، بەڵکو لە هەر کاتو لە هەر شوێنێ بڕواداری ڕاستەقینە بووبێ و ببێ کە بیانەوێ بەندەیی هەر بۆ خوا ببێ، لەگەڵ ئەوانەدا بێبڕواو بێ ئاین ببێ ئەبێ لە کاتی دەسەڵاتیاندا هەر بەو جۆرە بووەو ئەبێ کە چەند نموونەیەکی باسکرا!

لەپێشەوە بێزاری دەربڕی لەوەی کە سوێندو پەیمان ببێ بۆ ئەو بێبڕوایانە، فەرمانیدا بەوەی ئەوانە نایەنە ڕیزی موسڵمانان جەنگیان لەگەڵ بکرێ بێجگە لەوانەی بێن و پەنا بێنن وەك بە درێژیی باسکرا، ئینجا هۆی ئەو جەنگکردنەشی باسکرد کە ئەوانە لە بارەی جەنگ لەگەڵ بڕوادار سەرلێکردنەوەیان نیەو هەر جۆر بۆیان ڕێك بکەوێ دەستیان لی ناگێڕنەوەو گوێیان نیە لە پەیمان و خزمایەتی و هیچ شتێ، ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا چارەسەری هێندێ لە خەتەرەو خەیاڵ ئەکات کە ڕوو ئەکەنە دڵی مەردومو بەرگری ئەکەن لە هەڵسان بەو جەنگو کوشتارەی کە پێویست کرا لە سەریان، بۆ بەرگری و چارەسەر کردنی ئەو خەتەرەو خەیاڵانە چەند کردارێکی بەدی ئەوانە ئەخاتە بەرچاو تا بەهۆی ئەوەوە بەبێ گومان و دوودڵی پەلامار بدەنە ئەو بەدانەو جەنگیان لەگەڵ بکەن، سێ ستی سەرەکی ئەکات بەهۆی ئەو جەنگو کوشتارە، هەرکام بەیەکە یەکە ئەبێ بەهۆی ئەو جەنگو کوشتارە، ع جای هەرسێکی پێکەوە:

١- بێپەیمانی ئەوانە.

١- نیازی دەرکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەخاكو نیشتمانی خۆی.

٣- ئەوان لە یەکەمجارەوە دەست درێژیان کردە سەر موسڵمانەکان.

أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ

---

ئەفەرموێ: ﴿أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا﴾ ئایا ئێوە جەنگ ناکەن لەگەڵ دەستەو کۆمەڵێکدا کە ﴿نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ﴾ پەیمانەکەیان شکاندو هەڵوەشاندەوە، ئەوە بوو پەیمانی حودەیبییە کە بەسترا لەنێوان ئەوان و پێغەمبەردا(ﷺ) پەیمانێکی زۆر سەخت و دڵتەزێن بوو بۆ موسڵمانەکان و لەبەر ڕەزامەندیی و فەرمانی پێغەمبەر نەبوایە(ﷺ) هەرگیز ڕازی نەئەبوون و بە ڕیسوایی و سەر شۆڕییان دائەنا، ئەو بێبڕوایانە هێشتا ڕازی نەبوون و ئەو پەیمانەیان شکاند بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین ﴿وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ﴾ نیازی دەرکردنی پێغەمبەریان کرد لە مەککە کەجێ و شوێنی باوك و باپیری بووە، ئەوە بوو کۆبوونەوە لە(دار الندوة)دا بڕیاریاندا لەسەر یەکێ لەسێ شت: بەندکردن، کوشتن، دەرکردن لە وڵات، لەدواییدا بڕیاری کوشتنیان پەسەند کردو ویستیان بەدی بێنن، جا لێرەدا کە هەر باسی نیازی دەرکردنە کە ئەکات، چونکە ئەوەی ڕوویداو بەدی هات دەرچوونەکەی پێغەمبەر بوو(ﷺ) کە بەرهەم و سەرەنجامی ئەو تەگبیرو کۆبوونەوەی ئەوانەبوو، بەکورتی لەنێوان ئەو سێ شتەدا باسی ئەوەیانی کەبووبە هۆی ئەو دەرچوونە کە خوا ویستی و بەدی هێنا و کردی بەهۆی سەرکەوتن و زاڵبوونی پێغەمبەر(ﷺ) و ئایینە پیرۆزەکەی، ﴿وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئەوان لە یەکەمجارەوە دەستیانکرد بەجەنگکردن ل ئێوە، ئەوە بوو لە ڕووداوی بەدرداو لەپاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە کاروانەکەیان قوتار بووەو هیچ بیانوویەکیان نەما بۆ جەنگکردن، کەچی ئەبو جەهل هەر ڕازی نەهێناو گوتی: ناگەڕێینەوە هەتا محمدو هاوەڵەکانی لەناو نەبەین و لە ڕیشەیان نەهێنین، زۆربە ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە کە ئەوان لەیەکەمجارەوە دەستیانکرد بەجەنگکردن لەگەڵ خوزاعە کە سوێند خواری پێغەمبەر بوون(ﷺ)، ئینجا غیرەتیان ئەهێنێتە جۆش بەمەی ئەگەر جەنگ نەکەن ئەبێ لەو بێ بڕوایانە بترسن، لە کاتێکدا ئەبێ لە خوا بترسن، ئەفەرموێ: ﴿أَتَخۡشَوۡنَهُمۡ﴾ ئایا ئێوە لەوانە ئەترسن کە جەنگ ناکەن؟ واتە ئەگەر ترس و بیم بەرگریتان ئەکات ﴿فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ﴾ ئەی خوا شایستە ترە لەوەی کە لێی بترسن،

إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ

---

﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕوادارن، واتە ئەگەرترس لەئارادایە ئەبێ ئێوەی بڕوادارلەخوا بترسن، چونکەبڕوادارئەزانێ کە هەموو شت هەربەدەست خوایەوهیچ کەس ناتوانێ هیچ زیانێك بەگەیەنێ بەئیرادەومەیلی خوانەبێ، ئینجا هانیان ئەدا لەسەر جەنگکردن و بەڵێن و موژدەیان پێ ئەدات لەسەر جەنگکردن و بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قَٰتِلُوهُمْ﴾ جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ﴾ با خوا سزایان بدات بەدەستی ئێوە بەکوشتن ﴿وَيُخْزِهِمْ﴾ زەبوون و ڕیسوایان بکات بەدیل گرتن ﴿وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ ئێوە سەربخات و زاڵتان بکات بەسەریاندا ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ خوا ساڕێژ بکات داخی دڵی دەستەیەکی بڕوادار کە لەلایەن ئەوانەوە ئێش و ئازاریان پێگەیشتووە. داخیان ساڕێژ بکات بە زاڵبوونی ئیسلام، ئیتر ئەوانە خوزاعە بن وەك(عیکرەمە) و کەسانی تر ئەفەرموون، یان مەبەست چەند کەسانێ بێت لە یەمەن و سەبە کە هاتن و موسڵمان بوون و ئینجا لەلایەن بت پەرستەکانەوە سزای زۆردران و ئەوانیش ناردیانە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، دادیان لاکرد و ئەویش فەرمووی: موژدە بێت نزیکە خوا دەرووتان لێ بکاتەوە،(ئیبن و عەباس) لەسەر ئەمەیە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەوان فەرمانبەریانکردو ﴿وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ﴾ لابەرێ خوا ڕق و خەشمی دڵیان بەڕیسوا کردنی ستەمکارەکانیان، لە میهرەبانی خوایش بەزیاد بێت بەڵێن و موژدەکانی بەدی هێنا بۆیان، ئەو جەنگکردنە بەرهەمی تریشی ئەمە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ خوا تۆبەو پەشیمان بوونەوە وەرئەگرێ لەوەی کە خوا بیەوێ مەیلی لەسەر بێ و تەوفیق و ڕێنموونی بکات بۆ ئیسلام، بەم ڕەنگە زاڵ بوونی موسڵمانەکان ببێتە هۆی چاو کردنەوەی دڵیان و بڕوا هێنانیان، ئەو کاتەش موسڵمانە تێکۆشەرەکان ئەجرو پاداشتی ڕێنموونی کردنی ئەو گومڕایانە وەرئەگرن، ئیسلامیش هێزێکی تازەی دەستکەوت بێ بەهۆی ئەو ڕێنموونی کراوانە،

وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾

---

﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا زانای لێزانی کاردروستە، زانایە بەدوا ڕۆژو سەرەنجامەکان و سەرەتا شاراوەکان، لێزان و کار دروستەو بە پێی ئەوە هەموو شتێ بڕیار ئەدات و دیاریی ئەکات، خوای پەروەردگار کە موسڵمانانی پێگەیاندو پەروەردەی کردن بە بەرنامە تاقانەکەی قورئان، هەر لە یەکەمجارەوە کە ئەوان کەم و بێدەسەلات و چەوساوە بوون بەڵێنی زاڵبوون و سەرکەوتنی پێ نەدان، بەڵێنی تەنها بەهەشتی پێدان، فەرمانی هەر ئارام و خۆگریی پێدان، ئینجا کاتێ ئەوانیش گوێڕایەڵبوون و هەر داوای بەهەشتیانکردو خۆیان گرت، خوا سەری خستن و زاڵکردن و هانیدان لەسەر هەوڵدان بۆ زاڵبوون و سەرکەوتن، چونکە زاڵبوون و سەرکەوتنەکەیان ئەو کاتە هەر لەبەر خوایەو بەرز کردنەوەی وشەو بەرنامەی خوا. ئینجا پێویستەو هیچ چارە نییە ئەو موسڵمانانە جیهادو تێکۆشان بکەن لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەدا کە ڕێگرن لەبەرنامەو ئایینی خوا، ئەبێ بەیەک ڕیز ڕاوەستن بەرامبەریان، تا دەرکەوێ کێ نیازو مەبەستی هەر فەرمانبەریی خوایەو هیچ نیازو مەبەستێکی تری نییە، کێ ڕاست و ڕێکەو هیچ ژێر بەژێریەکی نییەو بە تەواوی لێ بڕاوە بۆ خوا، هەرچەند خوا هەموو شت ئەزانێ و ئاگایە بە هەموو شت، بەڵام باوی خوا ئەوە نەبووەو ئەوە نییە کە بەپێی ئەو زانینە ڕەفتار بکات لەگەڵ بەندەکانی، بەڵکو ویستی ئەوەی کە ئەو ئەیزانێ بەندەکانی بە کردەوەی خۆیان دەری خەن و بەدی بێنن، لەبەرئەوە بە شێوەی بێزاری دەربڕین و سەرزەنشت ئەم فەرموودەی ئاڕاستەی ئەوانە کرد کە نیگەرانی و بێزاریی لە دڵیاندا هەبوو بەرامبەر فەرماندان و پێویست کردنی تێکۆشان و جەنگ و کوشتار فەرمووی: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟﴾[1] ئایا ئێوە گومانتان وا بردووەو لاتان وایە کە وازتان لێ

---

[1] وتەی(أم) لێرەدا پێی ئەگوترێ مونقەتیعە، بەپێی باوی عەرەب هاتووە بۆ واز هێنان لەو مەبەستەی کەلە پێشەوە گوتراوەو گواستنەوە لەوەوە بۆ مەبەستێکی تر، واتە وازی هێنالە فەرماندان بەجەنگ، لەوەوە گواستی یەوە بۆ سەرزەنشت لەسەر ئەو گومانەی کەباسی ئەکات.

ئەمێنرێ لەسەر ئەو بارو حاڵەی کە وان لەسەری و فەرمانتان پێ نادرێ بە جەنگ و جیهادو تاقی ناکرێنەوە ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ﴾ لەکاتێکدا کە هێشتا خوا زاناو ئاگا نەبووە بەو کەسانەتان کە جیهادو تێکۆشانی کردبێ ﴿وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗ﴾ هێشتا نەیانگێڕابێ بۆ خۆیان هیچ ژێر بەژێری و هیچ دۆستێکی گیانی بەگیانی نەبەرامبەر بە خواو نەبەرامبەر بە فروستادەکەی و نە بەرامبەر بە بڕواداران، واتە بە تەمابوونی بەهەشت دوو شتی ئەوێ:

یەکەم: جیهادو فیداکاری.

دووەم: ئەو تێکۆشان و فیداکارییە تەنها لەبەر خوا بێ بە پاک و خاوێنی و بەبێ بەکارهێنانی دۆستایەتی و ژێر بە ژێریی لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەرو بڕوادارانداو بەوێنەی ناپاکان و دڵنەخۆشان کەئەوە کارو پیشەیانە، بێگومان خوا ئاگای لە هەموو شتەو هەموو کارو کردەوەو نیازو مەبەستێکی زانیوەو بێ سەرەتا ئەیزانێ بە بێ دوا هاتن،وەک دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ خوا ئاگاو بەخەبەرە بەهەرچی کە ئێوە ئەیکەن، بەڵام باوی خوا وا هات کە پرسیارو تۆڵەو پاداشتی بەست بەکردەوەی بەندەکانییەوەو پرسیارو تۆڵەو پاداشتی لەسەر کردەوەکانیانەو ئەبێ ئەوەی خوا زانیویەتی دەرکەوێ، کورتەی ئایەتەکە ئەمەیە: وازتان لێ نامێنرێ تا جیهادو تێکۆشان نەکەن و جیهادو تێکۆشانەکەشتان تەنها لەبەر خوا بێت بەڕێک و ڕاستی و پاک و خاوێنی و بەبێ لایەنگیری و ژێر بەژێریی لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەرو بڕواداران، بێگومان بەرژەوەندی گەل و کۆمەڵی موسڵمان لەوەدایە کە پاک و ڕاست جوێ ببێتەوە لە ناپاک و ڕاست. بێگومان ئەو بت پەرستانە بەری بوونی خواو پێغەمبەریان لێدرا لەوەو بەر هاتوچۆو تەواف و خزمەتی ماڵی خوایان ئەکردو ئاوەدانیان ئەکردەوەو خزمەت و سەرپەرشتیان ئەکرد، هەروەها هەڵئەسان بە خزمەتی ئەوانەی کە ئەهاتن بۆ تەواف ئەو ماڵە پیرۆزەو ئاوایان پێ ئەدان، لەگەڵ ئەوەدا ئەو جارەیان لێدراو هیچ نرخێک نەدرا بەو کردەوانەیان، جا لەوانەیە هێندێ کەس سەری سوڕمابێ لەو جاڕدان و نرخ پێنەدانە، لەبەر ئەوە ئەوا بەم ئایەتانەی داهاتووە بێ نرخی ئەو کردەوانەیان ڕوون ئەکاتەوەو لەگەڵ ئەوەی کە ئەوانە هیچ مافێکیان نییە لەو مزگەوتە پیرۆزەداو تەنها موسڵمانان خاوەن مافن،

مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ

---

ئەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ ﴾ شیاو شایستە نەبووە بۆ هاوبەش ڕەوادەران و ماڵ ئەوەیان نەبووە و نییە، ﴿أَن يَعْمُرُوا مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ ﴾ کە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە و هات و چۆی بکەن و سەرپەرشتی بکەن، واتە هەموو مزگەوتەکان کە ئەو مزگەوتە بەفەڕە سەر دەستەیە و یەکەم مەبەستە لێرەدا، یان مەبەست هەر ئەو مزگەوتەیە وەك خوێندنەوەی بەتاك قۆڵگیرە بۆی، خوێندنەوەی بە کۆ وەك ئێستا باوە لەبەر ئەوەیە ئەو مزگەوتە ڕووگە و پێشەوای هەموو مزگەوتەکانە، کەواتە بە تەنیا وەك هەموو مزگەوتەکان وایە، یان گوتنی بەکۆ بەپێی هەموو بەش و پارچەکانییەتی کە هەرکام جێگەی سوژدەیە و مزگەوتە، شایستە نییە بۆ ئەوانە سەرپەرشتی و هاتو چۆی بکەن لە کاتێکدا ﴿شَـٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ﴾ کە شایەتن لەسەر خۆیان بەبێ بڕوایی و هەر بە خۆیان ڕوون ئەبێتەوە کە بێبڕوان، دەی ئەوەش زۆر دژو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو هات و چۆو ئاوەدان کردنەوەدا، چونکە ماڵی خوا ئەبێ پاك و خاوێن و تایبەتی بێت بە خواوە و ناوی هیچ کەسێکی تر تیا نەبرێ و بێجگە لە خوا هیچ کەسی تری تێدا نەپەرسترێ، دەی چۆن کەسێك ئاوەدانی بکاتەوە و هات و چۆی بکات کە بت و هاوبەش ڕەوا بدا بۆ خواو هەر خۆی شایەت بێت لەسەر ئەو بت پەرستن و بێبڕوایی یە بە خوا؟! ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ ﴾ ئەو هاوبەش دەرو بێبڕوایانە کردەوە چاکەکانیان کە شانازیان پێکردوون زایە بوون و بە بۆش و بێسەرو شوێن دەرچوون و دەرئەچن ﴿وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴾ لەناو ئاگردا نیشتە جێن و هەمیشەیین، بەهۆی ئەو بێبڕوایی و هاوبەش بڕوادانەیان، بێگومان پەرستن و عیبادەت بەرهەم و نموونەیە بۆ عەقیدە و بیرو باوەڕ، دەی کاتێ کە عەقیدە و بیروباوەڕەکە نەبوو ئەبێ بەرهەم و نموونەکەشی نەبێ و بێسەروشوێن بێت، ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ﴾ مزگەوتەکانی خوا هەرکەسێك ئاوەدانیان ئەکاتەوە و سەرپەرشتیان ئەکات، واتە شیاوو شایستەیە بۆ ئەوە کە ﴿ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾

بڕوای هێنابێ بە خواو ڕۆژی دوایی ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەڕێك و پێکی نوێژی بەجێهێنابێ ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکاتی دابێ ﴿وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ نەترسابێت لە هیچکەس و لەهیچ شتێ بێجگە لە خوا، باسی بڕوا بە پێغەمبەری نەکرد لەگەڵ ئەوەدا ئەوەش مەرجێکە، یان لەبەر ئەوەیە کە بڕوا بە خوا بەدی نایەت بەبێ بڕوا بە فروستادەکەی بەجۆرێ وەك یەك شت وان، کەواتە گرتنەکەی ئەو یەکێتییە نیشان ئەدات، یان لەبەر ئەوەیە کە نوێژ بڕوا بە پێغەمبەری تێدایە(ﷺ)، یان لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم و سەر دەستەیە لەناو ئەوانەدا کە خاوەنی ئەو پێنج سیفەت و مەرجەن، یان لەبەر ئەوەیە ئەو کەسەی کە ئەو ئایەتە ڕائەگەیەنێ پێغەمبەرە(ﷺ)، کەواتە بڕوا هێنان بەو ئەبێ لە پێشەوە بێ، یان لەبەر هەر هۆیەکی تریش لەو هۆیانەی کە زانایان فەرموویانە. ئینجا مەبەست بە نەترسان لە غەیری خوا ترس و بیمی سروشتی نییە کە دەسەڵاتی بەندەی تێدا نییە، بەڵکو مەبەست نەترسانی ئایینییە، بەم ڕەنگە هەمیشە باوی فەرمان و ڕەزامەندی خوا بدات بەسەر هەموو فەرمان و ڕەزامەندیەکی تردا، لە پێناوی فەرمان و ڕەزامەندی خوادا گوێی نەبێ لە هیچ شتێکی ترو هەموو شتێ ژێر پێ بکات لەو بارەیەوە، بێجگە لەوەش لەڕاستیدا ئەبێ بڕواداری ڕاستەقینە بگاتە ئەو ڕادەیە ترسی لە هیچ شتێك نەبێ بێجگە لە خوا، هەروەها ئەبێ چاوەڕوانی ئومێدیشی هەر بە خوا بێت، چونکە ئەبێ بزانێ کە هەموو شتێ هەر بە دەست خوایە و لەلایەن خواوە ئەبێ، کەواتە ئەگەر مەترسی ڕووی تێکرد ئەبێ لەوە بترسێ کە نەوەك خوا بڕیاری ئەو مەترسی لێکراوەی دابێ، ئەگەر ئومێدو چاوەڕوانی ڕووی تێ بکات ئەبێ لەم ڕووەوە بێت کە ئومێدی وابێ خوا ئەوەی بۆ ئەکات، ئەگەر بەو جۆرە و لەسەر ئەو شێوە نەبێ ئەبێ جۆرێك لە هاوبەش ڕەوادانی نهێنی ڕووی کردبێتە دڵی و پێویستە هەوڵ بدا بۆ نەهێشتنی، ئەو جۆرە هەستانە هەر چەندە ناگەنە ڕادەی هاوبەش ڕەوادانی گەورە کە مەردومی پێ دەرئەچێ لە ئیسلام، بەڵام نەخۆشیەکی بەدن ئەجرو پاداشت ناهێڵن یان کەمی ئەکەنەوە بە وێنەی ڕیا و ڕووپامایی لەکردەوەدا کە ئەجرو پاداشت زایە ئەکەن ئیتر با لە بڕوا خەڵکی دەرنەکەن، جا بەڕاستی هەر ئەو کەسە پاك و خاوێنانە شایستەن بۆ ئەوەی مزگەوتەکانی خوا سەرپەرشتی بکەن و ئاوەدانی بکەنەوە.

فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٨﴾ ۞ أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ لَا يَسۡتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَرِضۡوَٰنٖ

---

**شایستەن بۆ ئەم بەڵێن و مـوژدە گەورەیـە کـە ئەفـەرموێ: ﴿فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ ئینجا ئەوانەی کە خاوەنی ئەو پێنج سیفەت و نیشانەن، ئەوانە لەو کەسانەن کە ڕێنموونی وەرگرن و ڕێی بەهەشتیان داوەتە بەر، ڕێی ئەو ناز و نیعمەتەی کە خوا ئامادەی کردووە بۆ بەندە ڕاستەکانی خۆی، وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ -خوا لێیان ڕازی بێ- بێگومان وشەی(عسى، لعل) لـەزمانی عەرەبدا بـۆ نزیکی و ئومێد و چاوەڕوانین، کەواتـە گومان و دوو دڵی ئەگەیەنن، نەك شتێکی قەتعی، بێگومان لەڕاستیدا هیچ گومانیش لەئارادا نییە دەربارەی ئەوانە کە ڕێنموونیان وەرگرتووە و ڕێی بەهەشتیان داوەتـە بـەر، کەواتـە ئـەبێ یەکێ لەم سێ ڕایە بگرین بەدەستەوە کە زانایان فەرموویانە:**

**١- ئەو دوو وتە و وشەیە لەلایەن خواوە قەتعییە و بۆ شتی قەتعی بەکار ئەهێنرێ وەك بـەو شێوەیە تەفسیریانکردەوە و هیچ گومان و دوو دڵیمان تێنەخست، ئەوە باوە و بـەکار هێنانیان لەلایەن پادشاکانی جیهانەوە بۆ جای پادشا و هەموو بوونەوەر.**

**٢- ئومێد و چاوەڕوانی و دوو دڵییەکە ڕوو ناکاتە خوا، بەڵکو ڕوو ئەکاتە بەندەکانی خوا و بۆ تـەمێ و ئامۆژگاری ئەوانە کە ئـەبێ هەرچەند هەڵسن بە هـەموو جـۆرە بەندەیی و پەرستن و عیبادەتێك، ئەبێ هەر بە ئومێد و چاوەڕوانییەوە پێی هەڵسن، چونکە بەچی ئەزانن کە کردەوەکانیان پاك و خاوێن و بێ لەکەیە، یان بەچی ئەزانن کە بەردەوام ئـەبن لەسەر ڕێگە و ئەو بارە ڕاستە و لانادەن و خۆیان بەش بڕاو ناکەن.**

٣- ئەو وشەو وتەیە بۆ دوورخستنەوەی هاوبەش ڕەوادەرانەو بڕینی هەموو چاوەڕوانیو ئومێدێ کە هەیانە بەو کردەوانەی کە ئەیکەنو بەچاکی ئەزانن، واتە لە جێیە ئەمانەی کەقورئان باسیان ئەکات بەوجۆرە بن ئەبێ ئەوهاوبەش ڕەوا دەرو بێبڕوایانە چۆن بن!

ئەوەبوو پاسای شایستەیی ئەو کەسانەی کە مزگەوتی خوا سەرپەرشتی ئەکەنو ئاوەدانی ئەکەنەوە، کەواتە نابێ هیچ کەسێکی تر بکرێ بە هاوتایانو یەکسان بکرێ لەگەڵیان، نابێ هیچ کردەوەیەکی تر بکرێ بە هاوتای ئەوە کردەوانەی کەباسکرا لە ئایەتەکەدا، نابێ ئەو بڕوادارانەی کە باسکران، وەك دەست نیشان ئەکات بەم پرسیارەی کە بەبێزارییەوە ئاڕاستەی بێبڕواکانی ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئایا ئەوانەی کە ئاوو شتی خوراوەیان دەرخواردی حاجیان داوەو مزگەوتی بەڕێزیان سەرپەرشتیو ئاوەدان کردووەتەوە، ئایا ئەوانەتان گێڕاوە، ﴿كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ بە وێنەی کەسێك کە بڕوای هێنابێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ تێکۆشانی کردبێ لە ڕێی خوادا؟ یان ئایا شتی خواراوە دەرخوارد دانی حاجیو سەرپەرشتیو خزمەتکردنو ئاوەدان کردنەوەی ماڵی بەڕێزی خوا، ئایا ئەو کردەوانە ئەگێڕن بە وێنەی بڕوا هێنانو تێکۆشان لەڕێی خوادا؟ ئایا ئەو دوو جۆرە کردەوە یەکسان ئەکەنو وەك یەك سەیریان ئەکەن؟ واتە نابێ ئەو یەکسانییە بکەن وەك ڕوونی ئەکاتەوە بەم ڕستە سەربەخۆیە: ﴿لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ﴾ ئەو دوو دەستەیە یەکسانو چوون یەك نین بەلای خواوە، شتێکی ئاشکرایە ئەوەی لای خوا هەیەو ڕاستە هەر ئەوە هەقەو نرخدارە، سەنگو ترازوو هەر سەنگو ترازووی خوایە، بێگومان ئایەتەکە هەر ئەوە ئەگەیەنێ کە یەکسان نین، ئیتر ئەوە ناگەیەنێ کەکام لەو دووانە چاکترە بەلای خواوە لەبەرئەوە ئەوا دەست نیشان ئەکات بۆ چاکترەکەیان کە ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ خوا ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات بەم ڕەنگە بتانخاتە سەر بارو ڕێگەی ڕاست، مەبەست بەو ستەمکارانە هاوبەش ڕەوادەرانە کە ئەو ستەمە زۆر گەورەیە ئەکەن، یان مەبەست ئەوانەیە کەکارو کردەوەی ناڕاستو بێ جێ ئەکەن بە شێوەی گشتی کە ئەو یەکسان کردنە بەشێکە لەو کارانە. بەهەر حاڵو لەسەر هەر بار ئەو دوو تاقمە نە خۆیان چوون یەکن، نەکردەوە

کانیشیان، بەڵکو تاقمی دووەم بە خۆیان و کردەوەیانەوە بەرزو پیرۆزن و باویان هەیە بەسەر تاقمی یەکەمدا بە خۆیان و کردەوەکەیانەوە، دەستەواژەکە هەر ئەوە ئەگەیەنێ بە تایبەتی ئەگەر بە شێوەیەکی لێبکەن کەلە یاسای ڕەوانبێژییدا پێی ئەگوترێ:(احتباك) واتە لابردنی وشەیەك لە پێشەوە بە نیشانەی دواوە وەك بردن لە پاشەوە بەنیشانەی پێشەوە، واتە لەپێشەوە هەر باسی کردەوەکانی کردو خاوەن کردەوەکانی باس نەکرد بە نیشانەی:(من امن)، لە پاشەوە هەر باسی خاوەن کردەوەی کردو کردەوەکەی باس نەکرد بەنیشانەی(سقاية وعمارة). هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە ڕووی فەرموودەکەی بۆ بڕوادارانەو بەرپەرچی بۆچوون و گومانی ئەوان ئەداتەوە کە ئەو دوو جۆرە کردەوانەیان یەکسان کرد، بەڵگەیان چەند ڕیوایەتێکە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی لەدڵدا جێگیرو بەهێزەو ڕای زۆربەی لێزانەکانە کە ئەفەرموون: ڕووی فەرموودەکە بۆ هاوبەش ڕەوادەرانەو ئەم کوتی ئەوانی پێکراوە کە کەشخەو شانازیان ئەکرد بەو خۆراك دان و خزمەت کردنی ماڵی خوا کەلە سەردەمی نەفامیاندا ئەیانکرد. بەڵگەشیان چەند حەدیسێکەو لە هۆنینەوەی ئایەتەکانیش هەر ئەوە وەرئەگیرێ، بەتایبەتی لەبارەی دەستەی دووەمەوە باسی بڕوا ئەکات کە ئەوە وا نیشان ئەدات دەستەی یەکەم بێبڕوا بوون، لەبەر ئەوە تەفسیرەکەم لەسەر ڕای ئەو زانایانە کردەوە. بە هەر حاڵ و لەسەر هەر بار باسەکە دوایی ئەهێنێ بە بڕیارو ڕوونکردنەوەی پادەو پلەی بەرزی بڕوادارە کۆچەرو تێکۆشەرەکان و ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کۆچیانکردووەو تێکۆشاون فیداکاریانکردووە لە ماڵیان و بەگیانیان لەڕێی خوادا ئەوانە ﴿أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ زۆر گەورەن لەڕووی پادەو پلەوە و پادەو پلەیان زۆر گەورەیە لای خوا ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾ ئەوانەی کەباسکران هەر ئەوانە گەیشتوون بە ئاوات و ئامانج، نەك ئەوانەی کە خاوەنی ئەو سیفەتانە نین، ئایا چ ئاوات و ئامانجێك ئەگاتە پادەیە کە بەم دوو ئایەتە ڕوونی ئەکاتەوە: ﴿يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم﴾ پەروەردگاریان موژدەیان ئەداتێ لەم جیهانەدا ﴿بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَرِضۡوَٰنٖ﴾ بە میهرەبانیەکی گەورەو فراوان، بە ڕەزامەندیەکی گەورە

وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا

---

﴿وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾ بە باخ و بەھەشتانێکی بەرزو بڵند کە ھەیە بۆیان لەو بەھەشتانەدا نازو نیعمەتێکی جێگیرو دامەزراو کە ھەمیشەییە و لێیان جویێ نابێتەوە، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە ئەمێننەوە لەو بەھەشتانەدا بە ئێجگاری و ھەتا ھەتایە بەبێ برانەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا ھەر لای ئەوە ئەجرو پاداشتی گەورە، بەڕاستی زمان و قەڵەمی ئێمە دەستە پاچەن بەرامبەر ئەو ھەموو میھرەبانی و چاکەو بەھرەو نازو ڕێزە کە پەروەردگار ئەیبەخشێ بەو بەندەیانەی کە ھیچ پێویستی نییە نە بە خۆیان و نەبە کردەوەو پەرستنەکەیان، خۆشی خستوونیەتە سەر ئەو ڕێگە ڕاستە کە کردوویەتی بەھۆی بەخشینی ئەو ئەجرو پاداشتە بێ ھاوتایە، کەواتە پێویستە لەسەر ئەو بەندەیانە کە خۆیان یەکبار بکەنەوەو خۆیان ڕووت بکەن و بە تەواوی لێ ببڕێن بۆ ئەو پەروەردگارە میھرەبانەو لە پێناوی ڕەزامەندی ئەودا دەست ھەڵگرن لە ھەموو شتێ و ئەوەی لەم جیھانەدا دڵ پەیوەندی ھەیە پێیەوە بەختی بکەن لە ڕێی ئەودا، وەك بە ئاڕاستە کردنی ئەم دوو ئایەتە ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەوەی کە باسمانکرد کە یەکەم ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان ھێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ باوکە کانتان و براکانتان دامەنێن و وەریان مەگرن بەدۆست و خۆشەویست و کۆمەك کراو و کاربەدەستی خۆتان ﴿إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِۚ﴾ ئەگەر ئەوان بێبڕواییان خۆش ویست و ھەڵیان بژارد بەسەر بڕوادا، واتە ئەگەر دەرکەوت بۆتان کە ئەوانە ھەر سوورن لەسەر ئەوەو ناگەڕێنەوە بۆ ڕێی ڕاست، ئینجا جڵەوگیرییەکە بە تەواوی بەھێز ئەکات و ڕوونی ئەکاتەوە کە خۆش ویستنی ئەوانە قەدەغەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ﴾

هەركەس لە ئێوە ئەی بڕواداران ئەوانە بكات بە خۆشەویستو دۆستو یارمەتی دراو، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئەوا هەر ئەو كەسانی ئێوە ستەمكارن، واتە ئەوەندە چوونەتە خوارەوە لە ستەمداو دامەزراون وەك هەر ئەوان ستەمكار بن، واتە بێبڕواو هاوبەش ڕەوا دەرن بە وێنەی ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانەی كە ئەیانكەن بە دۆستو كاربەدەستو یارمەتی دراو، چونكە ڕازی بوون بە هاوبەش ڕەوادانو بێبڕوایی لە ڕاستیدا هاوبەش ڕەوادانو بێبڕواییە، ئەو بە ناو بڕوادارانە ماڧ خۆیانەو بە جێی خۆیەتی كە لە ڕیزی بێبڕواو هاوبەش ڕەوادارانـدا دابنرێنو سەیر بكرێن، چونكە لە باتی ئەو بەری بوونەی كە خوا بڕیاری داوە ئەمان ئەوانە ئەگرن بە گیانەوەو كۆمەكییان ئەكەن، لە جێگای ئەو خەشمو قینەی كە پێویستە ببێ لە دوژمنانی خوا ئەو بە ناو بڕوادارانە دۆستایەتیو خۆشەویستی بە كار دەهێنن لەگەڵیان، پەیوەندی خزمایەتیو بەرژەوەندی باو ئەدەن بەسەر پەیوەندی بڕواو عەقیدەدا كە ئەبێ لە هەموو پەیوەندییەكی تر بەهێزتر بێباوەڕەكانی ئەمان ژێر پێ ئەكەن لە پێناوی ئەم پەیوەندییانەی تری ئەم جیهانەدا، كەواتە وەك هەر ئەمانە ستەمكار بن، هەر ئەو بە ناو بڕوادارانە ستەمكارن ئەوانەی كە هیچ خزمایەتیو دۆستایەتیو هیچ بەرژەوەنییەكی ئەم جیهانە كاریان لێناكاتو باوی تەنها ڕەزامەندی خوا ئەدەن بەسەر هەر شتێكی تردا بەسەر هەر شتێكی تر لەم جیهانەدا كە دڵگیرو دڵڕفێنە، ئەمانە ستەمكارن لە خۆیانو لە گەلو كۆمەڵی بڕواداران، ئەمانە ستەمكارو ناهەق خوازن كە شت لە شوێنی خۆیدا ئەترازێنن بۆ شوێنێكی تر لە ناڕاستو ناهەق، ئەوانە دەست درێژیی ئەكەنو لە سنووری خوا تێپەڕ ئەكەن، كەواتە زۆر بەجێیە وا نیشان بدرێن كە ستەمكار هەر خۆیانن. ئینجا هەڕەشەیەكی سەختو سامناك ئاراستە ئەكات دەربارەی ئەوانەی كە باوی هەر شتێكی تری ئەم جیهانە بدەنو خۆش ویستنی هەر شتێكی تر باو بدەن بەسەر خۆش ویستنی خواو پێغەمبەرو تێكۆشان لە ڕێی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ﴾ ئەگەر باوكەكانتان ﴿وَأَبْنَآؤُكُمْ﴾ وە كوڕەكانتان ﴿وَإِخْوَٰنُكُمْ﴾ وە براكانتان ﴿وَأَزْوَٰجُكُمْ﴾ وە هاوسەرەكانتان ﴿وَعَشِيرَتُكُمْ﴾ وە خزمو عەشیرەتەكەتان ﴿وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا﴾ وە ماڵو دارایییەك كە بە ئەركو زەحمەت پەیداتان كردووە

وَتِجَٰرَةٌ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ

---

﴿وَتِجَٰرَةٌ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا﴾ وە تیجارەتو بازرگانییەك كە مەترسی ئەكەن لە وەستانی ﴿وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ﴾ جێو شوێنو نیشتمانانێ كە پێی خۆشنوودو ڕازیو دڵئارامن، ئەگەر هەموو ئەوانە ﴿أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ﴾ خۆشەویست ترە لاتان لە خواو فروستادەكەیو تێكۆشان لە ڕێی خوادا، ﴿فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦ﴾ ئەوا ڕاوەستن چاوەڕوانی بكەن هەتا خوا كاری خۆی ئەهێنێتە بەرەوە واتە تۆڵەو سزای خۆی ئەهێنێ بە سەرتان، ئیتر ئێستاو لەم جیهانەدا یان لە ڕۆژی دواییدا، وەك(حسن) ئەفەرموێ. یان فەتحی مەككە وەك لە(ئیبن و عەباسو مجاهدو مقاتل)ەوە هاتووە كە فەتحی مەككە بوو بە هۆی شكانی بێبڕوایی و سەركەوتنی ئیسلام، بەڵام بە ڕاستی ڕای یەكەم لە دڵدا بە هێزو جێگیر ترە، ئینجا هەڕەشەكە توندتر ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ خوا ڕێنموونی كەلو كۆمەڵێك ناكات كە لە كوێڕایەڵی خوا دەرئەچن بۆ گوناهو سەركێشی، واتە ئەگەر باوی خۆش ویستنی ڕەزامەندی خوا نەدەن بەسەر هەر شتێكی تردا، یاخیێو لە كوێڕایەڵی دەرئەچنو خوایش ڕێنموونی ئەوانە ناكات كە بەو جۆرەنو بێگومان هەركەسیش خوا ڕێنموونی نەكات بێبەشو بەش بڕاو ئەبێ لە هەموو خێرو خۆشییەكو نیشتەجێ ئەبێ لە دۆزەخدا، بەڕاستی ئەم ئایەتە ئێجگار سەختو سامناكەو كەم كەس بێ تەواوی لە داوی دەرئەچێ، هەر ئەو كەسانە دەرئەچن كە خوا ڕێنموونی كردبێو میهرەبانی لەگەڵ كردبێ، شتێكی ئاشكرایشە كە بڕواداری ڕاست ئەبێ بەم ترازووە بكێشرێو بەراورد بكرێ، بەم سەنگە هەڵسەنگێنرێو تاقی بكرێتەوە، بەم ڕەنگە هەركەس بتوانێ دەست هەڵگرێ لەو هەموو خۆشەویستانە لە پێناوی خوادا ئەوە ڕاستەو بڕواداری ڕاستەقینەیە، هەركەس بەو جۆرە نەبێ ناڕاستە لەگەڵ خواداو بڕواداری ڕاستەقینە نیە، بەڵكو یان هەر بڕوادار نیە، یان بڕوادارێك نیە كە سوودو نرخێكی چەندان ببێ بۆ بڕواكەی، مەبەست بەم

ئایەتە ئەوە نیە کە بەندە دەست هەڵگرێ لە هەموو شتێ لە هیچ خۆشیو خۆشەویستانی ئەم جیهانەی نەوێو واز لە دنیا بێنێ، بەڵکو بڕواو عەقیدە ئەبێ زاڵ بێت بەسەر هەموو شتێکی تردا و نەتوانێ ململانێی لەگەڵ بکاتو بەرەنگاری بوەستێ، لەپاش ئەوە کە بڕواو عەقیدە لەو ڕادەو پلەیەدا جێگر بوو ئیتر بڕوادار بۆی هەیە بەکارهێنانی هەر شتێکی حەڵاڵ کە خۆشیو شادمانی ئەم جیهانەی تێدابێ لای خوارو یەکەم پلەی بڕوای ڕاستەقینە ئەوەیە کە ڕەزامەندی خوا زاڵو سەرکەوتوو بێت، وەك باسکرا، ئیتر با سۆزو خۆش ویستنی شتی تریش لە ئارادا هەبێ، بەڵام پلەو ڕادەی هەرە بەرزی بڕوا ئەوەیە کە بەندە هەموو سۆزو خۆشەویستیەکانی شوێن کەوتووی ڕەزامەندیو خۆش ویستنی خوا بێتو بەدەوری ئەودا بخولێتەوە وەك ئەوانەی کە بەڕاستی شوێن کەوتووی پێغەمبەر بوون(ﷺ)، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو بەهرەو بەخشینە گەورەدا -آمین-.

ئینجا دەست کاریەکی دڵو دەروونی ئەو بڕوادارانە ئەکات بەمەی دەست نیشان ئەکات بەهێندێ لە میهرەبانیو یارمەتیدانی لە زۆر کاتی سەختو تەنگانەدا، کە خۆیان لە بیریانە، بەتایبەتی باسی ڕووداوی حونەین ئەخاتە بەرچاویان کە ڕووداوو بەسەرهاتێکی زۆر سەختو گرنگ بووە، ئەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ﴾ سوێند بە خوا ئەی بڕواداران خوا یارمەتی ئێوەی داو سەری خستن لە زۆر جێگاو سوێنەکانی جەنگو بەرپا بوونو هەڵوێستەکانی جەنگدا، جەنگی بەدری گەورەو ڕووداوی(بني قريظة)و(بني نظير)و(حديبية)و شوێنەکانی تر کە هێندێ لە زانایان ئەیانگەیەننە هەشتا شوێن ﴿وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ﴾ یارمەتیدانو سەری خستن لە ڕۆژی حونەیندا ﴿إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ﴾ لەو کاتەدا زۆریتان سەرسامی کردنو هەوڵی خەڵەتاندن، کە لەو ڕۆژەدا موسڵمانەکان دوازدە هەزار بوونو دوژمن چوار هەزار بوون ﴿فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا﴾ کەچی ئەو زۆریتانە سوودی هیچ شتێکی پێنەکەیاندن لە بارەی دوژمنەکانتانەوە ﴿وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ﴾ زەویتان لەسەر تنگو تەسك بوویەوەو بەو فراوانییە کە هەیەتی، بەجۆرێك نەتان ئەزانی چی بکەنو بۆ کوێ بڕۆنو دەرچن؟! ﴿ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ﴾ لەپاش ئەوە ڕووتان لێ وەرگێڕان بەجۆرێ پشتتان تێکردن لە ڕاکردن،

﴿ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٦﴾ ﴿٢٧﴾

---

﴿ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو خوا ئارامیو دامەزراوی دڵی لەلایەن خۆیەوە هێنایە خوارەوەو باراندی بەسەر فروستادەکەیو بەسەر بڕواداراندا، ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ چەند لەشکرو سەربازێکی لە ئاسمانەوە هێنایە خوارەوە کە ئێوە نەتان ئەبینین، ﴿وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ سزای بێبڕواکانیدا بەکوشتنو زامدارکردنو زاڵکردنو بەدیل گرتن ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ ئەوەی کە بەسەری هێناونو باسکرا تۆڵەی بێبڕواکانە ﴿ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ بەپاش ئەوە ئینجا خوا تۆبە وەرئەگرێ لە هەرکەسێك لەوانە کە خوا ویستیو ئەیەوێ بەم ڕەنگە گێڕانی بە بڕوادارو خستنییە سەر ڕێگەی ئیسلام، هەمیشە قاپی تۆبە لەسەر پشتە بۆ ئەوانەی کە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا پێش ئەوە بگەنە کاتی نائومێدی لە ژیان ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوا لێبووردە میهرەبانە، چاوپۆشی ئەکات لە هەرکەسێك کە شیاوو شایستە بێت بۆ لێبووردنو چاوپۆشی، ئەجرو پاداشت ئەداتەوە لەسەر کردەوەی بەندەکانی بە چەند قاتو بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە پێویستیەکی هەبێت نە بە خۆیانو نەبە کردەوەکانیان،(ئیمامی بوخار) لە(مسوەری کوڕی مەخزەم)ەوە ئەگێڕێتەوە کە کەسانێك لەوانە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانیان پێدا لەسەر ئیسلامو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ چاکترینی هەموو ئادەمیتو خاوەن چاکەیت لە هەموو کەس، ماڵو خێزانو منداڵمان گیراون، شەش هەزار کەسیان لێ گیرا بوو، لەگەڵ حوشترو مەڕو بزنیان کە ژمارە نەئەکرا لەبەر زۆری، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: باشترین قسە قسەی ڕاستە پێتان ئەڵێم: ئێوە یان ژنو منداڵەکانتان پێئەدرێتەوە یان ماڵو سامانەکانتان، کام لەو دووانە بۆ خۆتان هەڵئەبژێرن؟ ئەوانیش گوتیان: هیچ شتێك ناگۆڕینەوە بە ژنو منداڵەکانمانو هیچ شتێك هاوتای ئەوان نییە بەلامانەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو قسە

موسڵمانەکان: ئەمانە هاتوون بۆلامان و موسڵمان بوون و ئێمە ئەوەمان پێ‌گوتن و ئەوانیش ئەوەیان گوت کە باسکرا، ئینجا هەرکەسێك هەرشتێکی لاریە لەو ماڵ و سامانە ئەگەر بەدڵ پێی خۆشە بیداتەوە ئەوا چاکە، هەرکەس پێی خۆش نییە ئەوا بە قەرز بمانداتێ هەتا دەستکەوتمان ئەبێ و ئەیدەینەوە، ئەوانیش بەجارێ گوتیان ئەوا ڕازین و ئەیاندەینەوە، ئینجا فەرمووی پێیان: ئێمە نازانین ڕەنگە لەناوتاندا کەسێك ببێ کە بەدڵ ڕازی نەبێ کەواتە بڕۆن و بڵێن بە سەرۆك و دەستەکانتان ئەوان ئەوەمان بۆ باس بکەن، ئینجا ئەوانیش ڕاستی و دڵی خۆیان باسکرد بۆ ئەو سەرۆکانە کە بەدڵ ڕازین و ئەوانیش هەواڵەکەیاندابە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی ئەوەبوو نەوەك لە ڕوو دامان لە خزمەت خۆیدا(ﷺ). ئینجا باش وایە ئەو ڕووداوە بهێنین و لە ڕاسترین ڕێگەو ڕیوایەتەوە،(ئین و کەسیر) لە تەفسیرەکەیدا بەدرێژیی ئەیهێنێ و کورتەو پاڵفتەکەی ئەمەیکە ئەم ڕووداوە لەپاش فەتحی مەککە بوو لەمانگی شەوالی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، لەپاش ئەو فەتحەو دامەزراندنی کارو بارو موسڵمان بوونی زۆربەی دانیشتوانی مەککەو بەرەڵا کردن و ئازادکردنیان، لەپاش ئەوە هەواڵ هات کە(هەوازین) کۆڕو کۆمەڵیان کۆ کردووەتەوە بۆ جەنگکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)و مالیکی کوڕی عەوف سەرۆك و فەرماندەیان(سقیف)و چەند تیرەو تائیفەیەکی لەگەڵدایە بەجارێ ڕوویانکرد و هاتن بەژن و منداڵ و هەموو حوشترو مەڕو ماڵاتیانەوە، ئینجا پێغەمبەریش بۆیان دەرچوو بەو لەشکرەوە کە هاتن لەگەڵی بۆ فەتحی مەککە کە دەهەزار کەس بوون لە کۆچکەران و یارمەتی دەران و چەند تیرەیەك لە عەرەب و دووهەزار کەس لەوانەی کە موسڵمان بوون لە مەککەییەکان، بەوانەوە ڕۆشتن و پێیان گەیشتن لە شیوێکدا کە ناو ئەبرا بە حونەین و لەوێدا ئەو جەنگە ڕوویدا لەبەیانیدا، لەناکاودا ئەوانە بە یەکجار پەلاماریان دایە موسڵمانەکان و تیر بارانیانکردن، شمشێریان لێ دەرکێشان بە جارێ بەپێی فەرمانی پادشاکەیان، ئینجا لەوێدا موسڵمانەکان ڕایانکرد وەك ئایەتەکە ئەفەرموێ. پێغەمبەر(ﷺ) پەلاماری دوژمنی ئەدا بەسواری حوشترەکەیەوە بە هەموو دامەزراوی و دڵ ئارامیەکەوە، عەباسی مامی جڵەوی حوشترەکەی گرتبوو لای ڕاستەوە، ئەبو سوفیانی کوڕی حاریس کە ئامۆزای بوو لای چەپەوە جڵەوی گرتبوو بە هەر

دووکیانەوە حوشترەکەیان ئەگێڕایەوە لە پەلاماردان، پێغەمبەر بانگی موسڵمانانی ئەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ لای خۆی و ئەیفەرموو:(انا النبي لاكذب، انا ابن عبدالمطلب) لەهاوەڵەکانی سەد یان هەشتا کەس مانەوە لەگەڵی کە لەوانە ئەبوبەکرو عمرو علی و عەباس و فەزلی کوڕی و ئەبو سوفیانی ئامۆزای و ئوسامەی کوڕی زەیدو ئەیمەنی کوڕی ئوم ئەیمەن و کەسانی تر – خوا لێیان ڕازی بێ – ئینجا پێغەمبەر فەرمانیدا بە عەباسی مامی گەورە بوو بە بەرزترین دەنگی بانگ بکاتە ئەوانەی کە ڕایانکردبوو، بۆ گەڕانەوە، بانگی ئەکردن(یا اصحاب السمرة، یا اصحاب سورة البقرة)، ئینجا بەجارێ ئەوانیش بەلبیك لبیك گەڕانەوە بەجۆرێ پیاوی وا هەبوو ئەگەر حوشترەکەی سستی بکردایەو نەهاتایە بەدەستییەوە، حوشترەکەی بەرەڵائەکردو بە پیادە ئەگەڕایەوە ئینجا کە کۆمەڵێك کۆبوویەوە فەرمانی پێدان کە بەڕاستی هەڵمەتیان بدەنێ، کە پەلاماریاندا ئەوان شکان و موسڵمانەکان کەوتنە شوێنیان بە کوشتن و بەدیل گرتنیان، پێش ئەوەی هەموو موسڵمانەکان بگەڕێنەوەو دیلەکان بەدستە بەستە لەبەر دەستی پێغەمبەردا ئامادەکران، ئەمە ئەو جەنگە بوو کە بۆ یەکەم جار لەشکرێکی دوازدە هەزار کەس موسڵمانی تێدا کۆبوویەوە بەهۆی ئەوەوە موسڵمانان کەشخەو شانازیانکرد بەو زۆریە، بێئاگا بوون و لە یەکەم هۆی زاڵ بوون و سەرکەوتن، ئینجا خوا گێڕانییەوە لەو هەڵەیەو لەیەکەمجارەوە بەو زۆریە دووچاری شکانی کردن، ئینجا لەپاشان بە ژمارەیەکی کەم کە دامەزراو خۆگر بوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو جەنگەی بەو شێوەیە باس فەرموو تا موسڵمانان بۆیان دەرکەوێ سەرەنجامی بەدی بێئاگابوون لە خواو پشت بەستن بە هەر هێزو هەرشتێکی تر بێجگە لە خواو هێزی بێسنووری خواو یارمەتی خوا، زۆری ژمارە بەتەنیا هیچ نییەو ئەوەی کە پێویستە بێت پەیوەندی دڵە بە خواوەو پشت بەستنە بە خوا، بەڵکو هێندێ جار زۆری ئەبێتە هۆی شکست و شکان، چونکە لەناو ئەو کۆمەڵە زۆرەدا چەندەها کەس ئەبن کەبێ ئاگا و بێهۆشن و ئەبن بە هۆی بێ هۆشی و بێئاگایی کەسانی تر.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ۝٢٨﴾

**له پێشهوه باكرا كه پێغهمبهر(ﷺ) ئهبوبهكری كرد به فهرماندهی حهجی ساڵی نۆو پێی فهرموو كه رایئهگهیهنێ، ئیتر لهپاش ئهو ساڵه هیچ هاوبهش ڕهوا دهرێك حهج ناكات، ئینجا لهپاش ڕۆشتنیان فهرمانیدا كه عهلی بهدوایاندا بڕواو لهباتی پێغهمبهر سهرهتای سوورهتی بهرائهت بخوێنێتهوه بهسهر خهڵكیداو ئهو جاڕبدا، ئینجا ئهوا لێرهدا ئهوه بیر ئهخاتهوهو دواترین بڕیار دهرئهكات تا ڕۆژی دوایی، ئهفهرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ئهی ئهوانهی بڕواتان هێناوه: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ هاوبهش ڕهوادهران ههر پیسن و باری پاكیان نییه: ﴿فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا ۚ﴾ كهواته با نزیكی مزگهوتی بهرێز نهكهونهوه لهپاش ئهم ساڵهیان، واته نهچنه ناوی و تهواف تێدا نهكهن و وهك لهوهو بهر باویان بووه، بێگومان ئهو جڵهوگیرییه له حهج كردنی به ڕواڵهت زیانێكی گهوره ئهدا له بازرگانی و ئابووری مهككهو دانیشتوانی، لهبهر ئهوه ئهوا بهڵێن ئهدا بهچارهسهر كردنی ئهوه ئهفهرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ﴾ ئهگهر مهترسی ئهكهن له نهبوونی و بێنهوایی ئهوا غهمی ئهوهتان نهبێ چونكه خوا لهمهو پاش بێباوهڕهكانی پێویستتان ئهكات بهوهی كه لای خۆیهتی و له بهخشین و بههرهی خۆی، ههموو شتێ بهدهستی خۆیهتی، خۆی ئهتوانێ ههركارێ بسازێنێ كهبیهوێ، خۆی ئهتوانێ دهرێ بگرێ و چهند دهرێ بكاتهوه ﴿ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بهڕاستی خوا زانای كاردروسته، ههر كارێ بكات لهزانین و كاردروستییهوه دێت، لێرهدا چهند قسهو باسێك ههیه به جوانی ئهزانم بیانهێنم:**

**١- ئایا مهبهست به هاوبهش ڕهوادهران ههموو جۆرهكانی بێبڕوایانه كهواته ئهوانیش قهدهغه ئهكرێن لهو شوێنه پیرۆزه، یان بهتایبهتی ئهوان مهبهستن؟ زۆربه لهسهر ڕای**

یەکەمن بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە، کۆمەڵێك بەسەر ڕای دووەمن و ئیمامی ڕازی ئەمەی بەلاوە ڕاست ترەو چەند ڕابەرو بەڵگەیەکی لەسەر ئەهێنێتەوە.

٢- ئایا هاوبەش ڕەوادەران هەرچۆنێ ئایین و بیروباوەڕیان پیسە، هەروەها لاشەو بەدەنیشیان پیسە بەوێنەی سەگ و بەراز، لە(حسن)ەوە هاتووە کە هەرکەسێ دەست بخاتە دەستیان ئەبێ دەست نوێژ بگرێ، هێندێ لە ئیمامانی زەیدی لەسەر ئەمەن بەڵام زانایانی فیقە هەموو لەسەر ئەوەن کە لاشەو جەستەیان پاکە، هەردوو دەستەکە لێکۆڵینەوەی زۆریانکردووە لە مەسەلەکەداو بە پێویستی نازانم ئەو درێژە پێدانە بکەم هەرکەس ئەیەوێ با سەرنجی کتێبی مەزهەبەکان بدات.

٣- ئایا چوونی ئەوانە هەر بۆ ئەو مزگەوتە قەدەغەیان مەبەست هەموو خاکی پیرۆزی حەرەمەکە لەوێ دیارییکراوو ناسراوە؟ ڕای دووەم بە نزیك ترو بەهێز تر دانراوەو بەڵگەی ڕوون هەیە لەسەری.

٤- ئایا هەموو مزگەوتەکانی تریش وەك ئەو مزگەوتە پیرۆزە وان و قەدەغەیە چونی ئەوانە بۆ ناویان، یان ئەو قەدەغەیە تەنها بۆئەو مزگەوتەیە؟(ئیمامی مالیك) لەسەر ڕای یەکەمو شافیعی لەسەر ڕای دووەمە. ئینجا ئەو هەواڵ و بەڵێنە غەیبییە کە خوای میهرەبان دانی بەدەوڵەمەند کردن و بێباوەڕەکانی پێویستکردنی دانیشتوانی حەرەم بەدی هات و لەپاش ئەوە بێنەوایی ڕووی تێنەکرن، بەتایبەتی لەم چەرخەدا هەموو جیهان چاوەڕوانی پیت و فەڕی ئەو خاکە پیرۆزەیە، بەس بەداخەوە ئەو هەموو سامانە فراوانە زیاتر بێگانە بەهرەمەندە پێی!! داواکارین خوا کارێکی وا بکات کە ئەو هەموو خێرو بەرەکەتە بەخت بکرێ لە ڕێی خواو لە بەرژەوەندی ئیسلام و لە خۆشبەختکردنی موسڵماناندا، بۆ خوا ئەوە هیچی تێ ناچێ.

لە ئایەتەکانی ڕابردوودا دواترین بڕیاری هەتا هەتایی دەرکرد دەربارەی بت پەرستەکانی نیوە دوورگە، لەم ئایەتانی داهاتووەدا دواترین بڕیاری هەتا هەتایی دەرئەکات سەبارەت بە نامەدارەکان لە هەموو جیهاندا. ئەم بڕیارە هەتا هەتاییانەی بریتییە لە چەند دەستکاری کردن و ڕێك و پێك کردنێك لەو پەیوەندیانەی کە لە پێشەوە هەموو لەنێوان گەلی

موسڵمان‌و ئامەدارەکاندا ـ باتایبەتی گاور ـ چەند ﷺ ئەم کاتە موسڵمانان لەگەڵ ئەمان هیچ جەنگ‌و دوژمنایەتیەکی ئاشکرا ڕووی نەدا بوو لە نێوانیاندا، ئەو بڕیارە تازەی کە هات دەربارەی ئامەدار ئەمەیە فەرماندرا بە جەنگ لەگەڵیان هەتا سەرانە ئەدەن بە ملکەچییەوە، کەواتە پەیمانی ئاشتی‌و واز هێنان لێیان نابێ بەم مەرجە نەبێ، لەم کاتەدا ئەبن بە ئەهلی زیممەو مافیان پارێزگاری ئەکرێ‌و ئاشتی ڕاست‌و تەواو پەیدا ئەبێ لەگەڵیان‌و زۆریان پێ‌ناهێنرێ لەسەر موسڵمان بوون، بەڵکو سەربەستی لە هەڵسانیان بە کارو باری ئایینی خۆیان لەناو خۆیاندا، جا لەبەر ئەوەی هەقیقەت‌و سروشتی پەیوەندی موسڵمانان لەگەڵ ئامەداران‌و ڕوون‌و دیاریی بکات، باری ڕاستەقینەیان دیاریی ئەکات لەبارەی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیان، بە ڕوونی دەری بڕی کە بیرو باوەڕەکەیان هاوبەش ڕەوا دان‌و بێ‌بڕواییەو ناڕاست‌و بەتاڵە، چەند بیروباوەڕو شت‌و کردەوەیان ئەخاتە بەرچاو کە بناغەو بنەڕەتن بۆ ئەم بڕیارە تازەی کە هات دەربارەیان:

١- بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نییە، واتە بەو جۆرو شێوەی کە خوا ئەیەوێ‌و هەر ئەوەش بڕوایەو بێجگە لەوە بڕوا نییە.

٢- ئەوانە ئەو شتانەی کە خواو پێغەمبەر حەرامی کردوون، ئەوان بە حەرامی دانانێن‌و بەحەرامی نازانن.

٣- ئەوانە ئایینی ڕاستەقینەیان نەگرتووەتە گەردن.

٤- ئەوانە کوڕ بۆ خوا دائێن‌و ڕەوای ئەدەن.

٥- ئەوانە زانا‌و عابیدەکانیان گێڕاوە بە خوای خۆیان.

٦- ئەوانە جەنگ ئەکەن لەگەڵ ئایینی خواداو ئەیانەوێ ڕووناکی ئایینی خوا بکوژێنەوە.

٧- زۆرلەزاناوعابیدەکانیان بەناهەق ماڵ‌وسامانی خەڵکی ئەخۆن‌و ڕێ ئەگرن لەئاینی خوا.

قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ

---

**ئینجا با گوێ بگرین بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزانە، ئەفەرموێ: ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ﴾ جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە: ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ بڕوا ناهێنن بڕوایان نییە نە بە خواو نە بە ڕۆژی دوایی ﴿وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ حەرام ناکەن ئەوەی کە خواو پێغەمبەر حەرامی کردووە، ﴿وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ﴾ ملکەچ ناکەن بۆ ئایینی ڕاستو نایگرنە گەردن، واتە ئایینی ئیسلام کە جێگرو جێنشینی هەموو ئایینو شەریعەتەکانی خوایەو دامەزراوو هەتا هەتایی یە جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانە، ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ ئەوانەن نامەیان پێ بەخشراوە، واتە تەوراتو ئینجیل بەلای هەمووانەوە، هەروەها نامەکانی تریش بەلای هێندێ لە زانایانەوە، ئەو نامانەش وەك سوحوفی ئیبراهیمو شیتو زەبوری ئادەمو ئیدریس، ئەمانە جەنگیان لەگەڵ بکەن ﴿حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ﴾ هەتا بڕیاری جیزیە ئەدەن، واتە ئەوەی کە بڕیار ئەدرێ لەسەریانو پەیمانی ئاشتی لەسەر ئەبەسترێ لەگەڵیانو لەزمانی کوردیدا ناو ئەبرێ بەسەرانە، ئەوەش کەئەیدەن ﴿عَن يَدٖ﴾ بە دەستێکی گوێڕایەڵو ملکەچ یان هەتا بە دەستی خۆیان ئەیدەن نەك بەناردنو دەستی یەکێکی تر لە دوورەوە، یان هەتا ئەیدەن بەبوونو بەدەسەڵاتەوە وەك بە نەبوونیو بێنەوایی یان بە هۆی دەستە پاچەییو ژێر دەستەییەوە، یان بیدەن بەوەی چاکەی لەگەڵ ئەکرێ کە واز ئەهێنرێ لە جەنگو کوشتار لەگەڵیان، یان ئەیدەن بە نەقدو حازری دەستێکەوە بۆ دەستێکی تر نەك بە قەرز، بەو جۆرانە تەفسیر**

کراوەتەوەو هەموویش هەر چاکن‌و هەڵئەگرن، بە هەر حاڵ‌و لەسەر هەربار ئەیدەن ﴿وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوان زەلیل‌و زەبوون‌و ڕیسوان، واتە بەڕیسوایی‌و زەبوونی بیدەن.

ئەم سەرانە ئەسەنرێ بەلای(ئیمامی حەنەفی)یەوە لەنامەدار لە هەر گەل‌و تیرەیەك بن، بت پەرست‌و هاوبەش ڕەوادەرانی غەیری عەرەب، بەلای(ئەبو یوسف)ەوە لە عەرەب وەرناگیرێ نامەدار بێیان بت پەرست‌و لە غەیری عەرەب وەرئەگیرێ نامەدار بێ یان هاوبەش ڕەوادەر، بەلای(شافیعی)یەوە وەرئەگیرێ لە نامەدار، عەرەب بێت یان غەیرە عەرەب، لەبت پەرستان وەرناگیرێ عەرەب یان غەیرە عەرەب، لە هەموو بێبڕوایەك وەرئەگیرێ بەلای مالیك‌و ئەوزاعییەوە بەبێ دووبەرەکی‌و بە لای هەموانەوە لە مەجووس وەرئەگیرێ، ئەندازەکەی لەسەر بێنەوایی ئیش دوازدە درهەمی ئەو کاتەیە! لەسەر میانە، نە بێنەواو نە دەوڵەمەند بیست‌و چوار درهەم، لەسەر دەوڵەمەند چل‌و هەشتە، فەقیری دەستەپاچە لەکارو پیری پەك کەوتەو منداڵ‌و ئافرەت‌و شلە پەتە ئازادن‌و هیچیان لێ ناسێنرێ، ئەوەی کەلێیان ئەسێنرێ لەباتی هەڵسانی ئیسلامە بە پارێزگاریان‌و نیشانەی ملکەچیانە بۆ دەوڵەتی ئیسلام.

ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر بێبڕوایی‌و بێئاینیان‌و دان نەنانیان بە حەڵاڵ‌و حەرام، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ﴾ جوولەکە وتیان بەڵێ: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکان ئەڵێن: مەسیح واتە عیسا کوڕی خوایە، هەرچەندە ئەوە قسەی جوولەکەو گاور وا نەبن، بەڵام باوە لە جیهاندا کە کارو کردەوەی بەدی هێندێ لە هەر گەل‌و کۆمەڵێکدا بەهێنی هەموانەوە ئەگێڕێتەوە، ﴿ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ﴾ ئەو وتە بەدانەی کە باسکران، وتەی بەدەمی خۆیان، واتە بەدەمیانەوە هەڵنەبەستراوە یان وتەیەکی ناڕاست‌و بێباوەڕەکانی بنج‌و بنەوانەو قسەی پووتەو بە دەمیاندا دێت،

﴿يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ﴾ واته ئەم وتەی ئەمانە وێنەی وتەی ئەوانەیە کە لە پێش ئەماندا بڕوایان نەهێنا، یان ئەمانە لە وتەکەیاندا وەك بێبڕواکانی پێش خۆیان وان لە وتە بەدەکەیانداو ئەمان شوێنی ئەوان کەوتوون و لاسایی ئەوان ئەکەنەوە، یان ئەمانە لەوتەکەیاندا وێنەی وتەی پێشووەکان بەکار ئەهێنن و شتێ ئەڵێن وێنەی وتراوی ئەوانەی پێشووە، هەرسێ بارەکە لە مەبەستدا هەر یەك شت ئەگرێتەوە، بەلای زانایانی تەفسیرەوە مەبەست بەبێ بڕوایانی پێشوو بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەرانە کە ئەیانگوت: مەلائیکە کچی خوایە، واتە ئەمانە کە کوڕ بۆ خوا ڕەوا ئەدەن و دای ئەنێن وەك ئەوانە وان کە کچ بۆ خوا دائەنێن، بەڵام هیچ پێویست نییە ئایەتەکە ببڕێت هەر بەسەر ئەوەدا بە تایبەتی تەنانەت پاش دۆزینەوەی بیرو باوەڕی بت پەرست و هاوبەش ڕەوادەرانی کۆن لە میسرو هیندو ئیغریقیەکان و ئاشووریەکان ئەو بیرو باوەڕە پڕو پووچە بووە وەك بە درێژیی لە مێژوودا هەیە و خاوەنی(منار) خوا پاداشتی بداتەوە بە ڕوونی هێناویەتی، لە هەموو ئەو بیرو باوەڕانەدا بڕیار دراوە کە خوا کوڕی هەیە، کەواتە تەفسیری ئایەتەکە بەم جۆرە بەهێزترە لە دڵدا، چونکە وێنەی یەکەم بەم جۆرە تێرو تەواو ترە. بێجگە لەوەش بەم جۆرە دەست نیشانە بە هەواڵێکی غەیبی کە لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەداو لەو چەرخ و وڵاتەدا بە دڵی کەسدا گوزەری نەکردووە تا ئەم دواییە پاش دۆزینەوەی ئەو بیرو باوەڕانە کە ئەوەش بەشێکە لە موعجیزەکانی قورئان و ڕابەرو بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووە. ئینجا قورئان بەرامبەر ئەوانە کە ئەو وتە بەدەیان بووە ئەفەرموێ: ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۚ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ خوا جەنگ ئاوەریان بێباوەڕەکانی، واتە خوا لەناویان بەرێ، یان نەفرینیان لێ ٠٤ف٥ بکات. چۆن ئەوانە لادراون لە هەق و ڕاستیەوە بۆ ناهەق بەتاڵ؟! بەڵێ خوا لەناویان بەرێ و نەفرینیان لیبێ چۆن ئەوانە لە بیرو باوەڕی تاك و تەنیایی خوا کە شتێکی ڕوون و ڕەوان و ڕێکە، چۆن لەوە لادراون بۆ ئەو بیرو باوەڕی پڕو پووچی لارە کە وان لەسەری؟! واتە ئەمانە شایستەی ئەوەن کە خەڵکی سەری سووڕ بمێنێ لێیان، ئەو ڕستەیە بەکار ئەهێنرێ بۆ دوو مەبەست:

١- نزای شەڕ.

٢- سەرسووڕمان.

أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾

---

دیاره كه له‌لایه‌ن خواوه بوو ئه‌بێ بڵێین سه‌ر سووڕمێنان، جا لێره‌دا باری دووه‌م به هێزتره‌ بەهۆی ڕسته‌ی دووه‌م: ﴿أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ كه پرسیارێكه بۆ سه‌رسوڕهێنانه.

ئینجا لاپه‌ڕه‌یه‌كی تر ئه‌خاته به‌رچاو له‌لاپه‌ڕه‌كانی ئه‌و لادانانه‌ی كه ئه‌و نامه‌دارانه كردیان، ئه‌م ترازان و لادانه‌یان له ئایینی خوا به وته‌و بیروباوه‌ڕ نه‌بێ، به‌ڵكو هه‌روه‌ها به‌دیان هێنا له‌واقیعی ژیاندا، ئه‌م ترازان و لادانه‌شیان به‌ڵگه‌یه‌كی تره له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وانه له ئایینی خوا ده‌رچوون و بێباوه‌ڕه‌كانی ئایینن كه‌واته كه‌س ڕێگه‌ی نییه به‌ئایین داریان دابنێ، ئه‌وانه بـڕوادار نـین بـه خـوا، ئه‌فـه‌رموێ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ زاناكان و عابیده‌كانی خۆیانیان گێڕاو دایاننان به چه‌ند خوایه‌ك بێجگه له خوایه‌ك كه ناوی ﴿ٱللَّهِ﴾یه‌و په‌روه‌ردگاری هـه‌موو جیهانـه، ئه‌وانـه‌یان ئه‌گێڕا بـه خـوای خۆیـان لـه‌م ڕووه‌وه هه‌رچیان بۆ حه‌رام بكردنایه ئه‌وه‌یان به‌حه‌رام دائه‌نا، نه‌ك ئه‌وانه‌یان به خوای په‌روه‌ردگار دانابێ، وه‌ك له ده‌قی ئه‌و حه‌دیسه‌دا هاتووه كه ترزمی و به‌یهه‌قی و ئیمامی ئه‌حمه‌د و ئیبن و جه‌ریرو چه‌ند كه‌سانی تر ڕیوایه‌تیان كردووه‌و هێناویانه له(عه‌دی كوڕی حاته‌م)ه‌وه –خوا لێیان ڕازی بێ– كه ئه‌فه‌رموێ: چوومه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌كاتێكدا كه صلیبێكی زیوم لـه ملـدا ئـه‌بێ، كاتـێ كـه‌منی دی ئـه‌م ئایه‌تـه‌ی خوێنـده‌وه: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾(عه‌دی) ئـه‌ڵێ: منیش گـوتم: ئه‌وانـه ئه‌مانـه‌یان نه‌په‌رستووه، ئـه‌ویش فه‌رمووی: به‌ڵێ! ئه‌ونه شتێكیان بۆ حه‌ڵاڵ بكردنایه به حه‌ڵاڵیان دائه‌نا، شتێكیان له‌سه‌ر حه‌رام بكردنایه به حه‌رامیان دائه‌نا و شوێنیان ئه‌كه‌وتن، ئه‌وه بوو په‌رستنه‌كه‌یان بۆیـان،

بەڵام پەرستنیان بۆ عیسا(علیه السلام) هەر پەرستنی تێرو تەواوی ڕاستەقینەبوو وەك لە دەقی چەند ئایەتێکدا هاتووە، ئینجا وا دەرئەکەوێ جوولەکە عوزەیریان بە خوا دانەنابێ بەڵکو هەر بە کوڕی خوایان دانابێ، نەك وەك نەسرایەکان کە عیسایان لەلایەکەوە بە کوڕی خوا دائەنا و لەلایەکی ترەوە بە خواو لە لایەکی ترەوە بە یەکێ لە سێ خوا، جالەبەر ئەوە لێرەدا بێدەنگ بوون لەوان و دەست نیشان ئەکات بە پەرستنی نەسرانیەکان بۆ عیسا و ئەفەرموێ: ﴿وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾ مەسیحی کوڕی مەریەم ـ واتە عیسا یان گێڕا بە خواو پەرستیان... ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا﴾ لە کاتێکدا فەرمانیان پێ نەدراوە بەمە نەبێ کە هەر یەك خوا بپەرستن ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ کەهیچ خواو پەرستراوی ڕاستەقینە نییە بێجگە لەو تاکە خوایە ﴿سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پاکەو بێگەردی بۆ ئەو تاکە خوایەو پاکە لەوەی کە ئەوانە ئەکەین بە هاوبەش بۆی ئیتر هاوبەش لە پەرستندا یان لە گوێڕایەڵی و شوێن کەوتن لەبەرنامەو شەریعەتدا. بەکورتی وەرگرتنی بەرنامەو شەریعەت لە هەرکەسێکی تر بێجگە لە خوا لەلایەن خواوە گێڕانی ئەو کەسەیە بە هاوبەش بۆ خواو هیچ جیاوازی نییە لە سوژدە بردنەکەی بت پەرستەکان بۆ بتەکانیان، ئەوە شتێکە جێگای قسەو باس و گومان و دوو دڵی نییەو بە ئایەت و بە حەدیس و بە فەرموودەی زانایانی ئیسلام مەسەلەکە ڕوون کراوەتەوە، ئەوەی کەوا ئایین بریتی بێت تەنها لەبیرو باوەڕێکی دەروونی و بەجێهێنانی نوێژو ڕۆژو عیباداتێك کە ناو ئەبرێ بە(شعائر)، ئەوە بیرو باوەڕێکە لە جوولەکەو گاورەوە داهات کە ئەم ئایەتەی ئێرەی تێدا هاتە خوارەوەو ئەو خاوەن بیرو باوەڕانە لە ئیسلام دەرئەکات و ئەیانگێڕێ بە بێباوەڕەکانی ئایین و هاوبەش ڕەوادەر، بە ڕاستی ئەو بیرو باوەڕە دەردێکی کوشندە بوو کەوتە ناو جیهانی ئیسلامەوە، بەکارترین چەکی ژاراوی بوو کە دوژمن بەکاری هێنا بۆ دورخستنەوەی خەڵکی لە ئیسلام!!

يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾

---

ئینجا هەنگاوێکی تر ئەنێ بۆ هاندانی بڕواداران لەسەر جەنگ و کوشتار لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا کە ئەیانەوێ و نیازی کوژاندنەوەی ئیسلامیان هەیە، ئەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾ ئەوانە ئەیانەوێ نورو ڕووناکیەکەی خوا بکوژێننەوە بە دەمەکانی خۆیان، واتە بەدرۆ و دەلەسەو دەست هەڵبەست و سەر لێ شێواندن و تەشەر دان لە ئیسلام و هەموو پلارو وتە ناهەق و ناڕاستەکانیان ﴿وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ﴾ خوا نایەوێ بێجگە لەوەی کە نورەکەی خۆی تەواو بکات و بیگەیەنێ بە پایان ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە بێبڕوایان ئەوەیان پێناخۆش و خەشم و ناڕەزاییان هەیە لەوە، واتە خوا ئەو نورە ئەگەیەنێ بە پایان بەداخی دڵی ئەوانەو بەکوێرایی چاوی ئەوانە. هەرچەند ئەم ئایەتە لەو نامەدارانەدا هاتووەتە خوارەوە بەڵام مەبەست هەڕەشەیە لەوان و لەوێنەی ئەوان بەدرێژایی مێژوو. ئینجا ئەو هەڕەشەیە لەوان ئەکات و بەڵێن بە بڕواداران بەهێز تر ئەکات بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ﴾ خوا کەسێکە کە فروستادەکەی خۆی ڕەوانە کردووە بە ڕێنموونی و ئایینی ڕاست و ڕەواو دامەزراو ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ﴾ بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر ئاییندا هەموو بە گشتی و تێکڕایی هەرچەند هاوبەش ڕەوادەران بێزارбن و ئەوەیان پێناخۆش بووبێ و پێیان ناخۆش بێت. ئایین بریتییە لە ملکەچی، ئیتر بۆ هەر بەرنامەو ڕژێم و یاسایەك کە خەڵکی بیگرنە گەردن و شوێنی بکەون و گوێڕایەڵی بۆ بکەن و فەرمانبەری بن، ئایینی هەق و ڕاست بریتییە لە گەردن کەچی و گوێڕایەڵی لەبیروباوەڕو لەپەرستن و عیبادەت و لەڕژێم و یاسا بەرنامەدا، ئەم ئایینە ڕاستە هەموو ئایینەکان ئەگرێتەوە کە پێغەمبەرانی پێڕەوانە کراوە لەیەکەم

نێرراوو فروستادەوە تا دواترینی هەمووان، بێگومان ئەو ئایینە دەستکاری کراوو تێکەڵ کراو لە هەر شتێکی تر کە لەلایەن خواوە نەهاتبێ، بێگومان ئایینی ڕاست هیچ لەوانە ناگرێتەوەو بە ئایینی خوا دانانرێن، هەرچەند ناو ببرێن بە ئایین لای نەزان و نەفامان، جا خوای میهرەبان ئەم دواترین فروستادەی ڕەوانە کرد بەم ئایین و شەریعەتی ئیسلامەوە کە جێگرو جێنشینی هەموو ئایینە ئاشمانیەکانە، تێرو تەواوەو فراوانی هەیە بۆ هەموو کارو باری جیهان و جاهانیان، ئەم بەڵێنی زاڵکردن و سەرخستنە بەدی هات لەسەر دەستی پێغەمبەرو جێنشینە ڕاستەکانی و چەند کاربەدەستانێکی تری پاش ئەوان تا موسڵمانان ئەو ڕێگە ڕاستەیان دایە بەرو لێی کشانەوە هەنگاو بە هەنگاو بەهۆی تێکەڵ بوونی چەند شتێکی بێگانە، بەهۆی ئەو هەموو جەنگە جۆر بەجۆرەی کە لە هەموو لایەکەوە وژمنان هەڵیان گیرساند دەربارەی ئەم ئایینەو موسڵمانان، بەڵام وەنەبێ ئەو بەڵێنە بۆ جارو دووجار بێت و ئیتر بەسەر چووبێ، بەڵکو ئەو بەڵێنی خوا هەمیشە چاوەڕوانی گەل و کۆمەڵێک کە بەڕاستی ڕایەتەکەی خوا بەرزکەنەوەو ڕێگە ڕاستەکەی یەکەم جار بدەنە بەرو دەست پێ بکەن لە یەکەم خاڵەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێکردو لەیەکەم هەنگاوەکەی ئەوەوە هەنگاو بنێن، بەو جۆرە ئەڵێن ئەگەر ڕاناوی ﴿لِيُظْهِرَهُ﴾ بگەڕێتەوە بۆ ﴿رَسُولَهُ﴾ وەك لە(ئیبن و عەباس)ەوە ڕیوایەتکراوە -خوا لێی ڕازی بێ-، ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ(دین) ئەوا هیچ لێکۆڵینەوەی ناوێ و شتێکی ئاشکرایە کە ئەم ئایینە هەقە خوا بەرزی کردووەتەوە بەسەر هەموو ئایینەکاندا بە بەڵگەو ڕابەرو موعجیزەو هەر خۆی بەخۆی بەرزو زاڵەو چار نەکراوە قورئانەکەی بەئاسمانی ڕێنموونییەوە ئەدرەوشێتەوەو هەتا بێت باشتر ڕوون ئەبێتەوە گەورەیی و ڕاستی و بەکەڵك و بەکاری ئەك ئایینەو ناچاریی جیهان و جیهانیان پێی و شوێن کەوتنی بەرنامەکەی، ئەم هۆش کردنەوەو خەبەر بوونەوە گشتییەو جیهانییە ئەمڕۆ تەنانەت لەناو جەرگەی وڵاتە بێگانەکاندا باشترین ڕابەرو بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و زاڵی ئەم ئایینە پیرۆزە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پاشە ڕۆژ هەر بۆ ئەم ئایینەیەو ئەبێ جڵەوی ژین و جیهان هەر بکەوێتە دەست ئەم ئایینە پیرۆزە!!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ

---

**ئینجا دواترین ههنگاو ئهنێ لێرهدا لهبارهی لادانی نامهدارهکان له ئایینی خوا، ڕووی فهرموونه ئهکاته بڕواداران و ئهفهرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئهی ئهوانهی که بڕواتان هێناوه ﴿إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ﴾ بهڕاستی زۆر له زانا و عابیدهکانی نامهدار ﴿لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ﴾ ماڵ و سامانهکانی خهڵکی ئهخۆن به ناههق و به بهتاڵ ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ڕێ ئهگرن و بهرگری خهڵك ئهکهن لهڕێگهی خوا، واته له ئایینی ئیسلام. ئهو خواردنه به ناههق به چهند جۆرو شێوهیهك کردوویانهو ئهیکهن و یهکێ لهوانه ئهوهیه که وهری ئهگرن لهسهر فتوای ناههق بۆ بهرژهوهندی زۆرداران و دهوڵهمهندان و به ناههق حهرامیان بۆ حهڵاڵ ئهکهن. جۆرێکی تر ئهوهیه که قهشهو کاهینهکان وهریان ئهگرت و بهرامبهر ئهوه چهکی لێخۆش بوونیان بۆ ئهبڕین له گوناهو تاوانهکانیان، ئهوهش بهپێی بیروباوهڕی پووچی کهنیسه که ئهو مافهیان دابوو به زانا و عابیدهکانیان! پیسترین شت ئهوه بوو که سوودیان حهڵاڵ کردبوو بۆ سهرمایهدارهکان بهرامبهر بهوه پول و پارهیان لێ ئهسهندن، ههروهها له ههموو بارێکهوه ماڵ و سامانیان کۆ ئهکردهوهو کۆی ئهکهنهوه بۆ بهرگری ئیسلام و ههموو فهڕو فێڵ و هۆی لادان له ئیسلام بهکار ئههێنن. ئهو ههموو سامانهیان کۆکردهوه له ڕێگهی ئاڵای سههیۆنیێتی و سهلیبیێتیدا، فهرمووی: زۆر له زانا و عابیدهکانیان، چونکه بێگومان لهناو ئهوانهدا ئهبێ چهند کهسێك دهستکهوێ که پاك بن لهو کردهوه پیسانه. زۆر به داخهوه ئهو کردهوه پیسهی کهزانا و عابیدهکانی جوولهکهو گاور**

کردیان سەربازی کردو کەوتە ناو زۆر لە زناو عابیدەکانی ئەم ئوممەتەیش، چەند زانای ئایینی خۆی فرۆشت‌و فتوای ناهەقی دەرکرد، چەند عابید بەناوی ئایینەوە سامانی فراوانی نا بەیەکەوەو بەناهەقی و لە گوناهو ناهەقیدا بەکاری ئەهێنن، لەگەڵ ئەوەدا ئیسلام پێویستی کردووە کە ئەبێ ماڵ‌و سامان لەڕێگەیەکی پاك‌و حەڵاڵەوە کۆ بکرێتەوەو لەپاك‌و حەڵاڵدا بەخت بکرێ، ئەو کەسانەی کە هەموو مەبەستیان هەر کۆکردنەوەی ماڵ‌و سامانە لە هەر ڕێگەیەکەوە کە بەدەستەوەبێت، لە ڕێگەی خوایشدا بەختی ناکەن، ئەوانە سەرجەم بەری ئەم هەڕەشە سەخت‌و سامناکە ئەکەون مەگەر کەسانێك کە بەڕێکی بگەڕێنەوە بۆ لای خواو تۆبەی ڕاستەقینە بکەن بەری ئەك هەڕەشە سەخت‌و سامناکە ئەکەون کە گشتییەو لێرەدا هێنای بەبۆنەی ئەو زاناو عابیدانەی جوولەکەو گاور کە بەناهەق‌و حەرام ماڵ‌و سامان کۆ ئەکەنەوە وەك باسکرا. بەڕاستی هەڕەشەکە ئێجگار سامناکە ـ خوا پەنامان بدات لێی ـ، ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ﴾ ئەوانەی کە ئاڵتون‌و زیو کۆ ئەکەنەوە ﴿وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەختی ناکەن لە ڕێگەی خوادا، واتە هیچی لێ بەخت ناکەن لەڕێی خواداو ئەو مافەی کە خوا پێویستی کردووە لەسەریان بەجێی ناهێنن ﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ ئەی پێغەمبەر مژدە بدە بەوانەی بەسزایەکی سەخت‌و ئازار دەر ﴿يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ لە ڕۆژێکدا کە هەڵئەگیرسێنرێ‌و تاو ئەدرێ بەسەر ئەو ئاڵتوون‌و زیوەدا لە ئاگری دۆزەخدا، واتە ئەو ئاڵتوون‌و زیوانە بەئاگری دۆزەخ تاو ئەدرێن‌و سوور ئەکرێنەوە ﴿فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡ﴾ ئینجا بەو ئاڵتوون‌و زیوە تاو دراوانە داخ ئەکرێ تەوێڵ‌و ڕوویان‌و تەنیشتیان‌و پشتیان، بۆ سزادانی گیان‌و دەروونیان پێیان، ئەگوترێ بە تەشەرەوە: ﴿هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ﴾ ئەمە ئەوە بوو کە لەدنیادا کۆتانکردەوە بۆ خۆتان‌و بۆ خۆشی و کەشخەی خۆتان،

﴿فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ دەی بچەژن ئەوەی کە کۆتانکردەوە، بێگومان نە ئاگرە کە وەك ئاگری دنیایەو نە داخکردن و داخ پیا نانەکە وەك هینی دنیایە، ئەو داخانە بە هەر شوێنێکیاندا ئەنرێ بڵێسەی ئاگر لەو لایەوە دەرئەچێ! بەڕاستی بەبیر لێکردنەوەی ئەو سزایە هەق وایە تیکە لە گەرووا بوەستێ و بگیرێ، خەو شوم بێ لەبیر کەرەوەکە! خوا خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ - آمین -، پێویستە هێندێك بیربکەینەوە تا بۆمان دەرکەوێ کە ئەو نامەدارانە چیان بەسەر هات و چۆن لەو ئایینە پاکەی خوا لایاندا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە؟ بەڕاستی ناسینی ئەمان و بەراورد کردنی حاڵی ئەمان لەگەڵ ئایینی خوادا پێویست ترە لەبت پەرست و هاوبەش ڕەوادەران، نامەدارەکان لاف ئایین لێ ئەدەن و بەناوی ئایینەوە قسەئەکەن ئەگەر بەباشی دەرنەخرێن لەوانەیە زۆر کەسیان پێ هەڵخەڵەتێ و بەئایینداز سەیر بکرێن، هەرچەند لە چەند بارو ڕوویەکەوە ئەمانیش بت پەرست و هاوبەش ڕەوادەرن، بەڵام بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادەریەکەیان ئاشکرا نییە، وەك زۆر بەناو موسڵمانەکان کە لاف موسڵمانێتی لێ ئەدەن و بەناوی ئیسلامەوە کەچی لەڕاستیدا وەك ئەو نامەدارانە بە تەواوی لایانداوە و پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نەماوە! زۆر هەیە خۆی بە موسڵمان دائەنێ و کردەوەی موسڵمانانە بەجێ ئەهێنێ، بەڵام بیروباوەڕێکی تری گرتووەتە گەردن و ڕازییە بە ڕژێم و یاسا و بەرنامەکانی تر کە دوژمنانی خوا دایان هێناوە!! ئەگەر ئەو لادان و دوورکەوتنەوە و بێئاگاییە ڕووی نەکردایەتە موسڵمانان و ئەو سەر لێ شێوانەی نەبوایە موسڵمانان هەروا بێدەنگ دائەنیشتن تا بە پێش چاویانەوە ئیسلام لە ڕیشە بهێنرێ و لەگەڵ ئەوەدا هەست نەکات بەوەو هەروا بزانێ کە ئیسلام لە کاردایە، کاتی خۆی حوکمی عوسمانی بەناوی ئیسلامەوە هەبوو بەڵام هەر لەسەر دەستی بەناو موسڵمانەکاندا ئەو ڕژێمە ڕوخێنراو ڕژێمی ئەتاتورکی کافر هاتە شوێنی، لەبەر بێئاگایی خەڵکی هەستی نەکرد کە ئەوە بەدترین دەردو ڕووداو بوو ڕووی کردە جیهانی ئیسلام و بە تەواوی ئیسلامی لە ئارادا نەهێشت، بەڵکو چەند کەسانێ کەبە پیاوی ئایینیش دائەنران بە شێوەیەکی ئاشکرا لە(حزبی اتحاد وترقی) دا ئیشیان ئەکرد کە ئەو حیزبە لە ژێر باڵی فەرەسوودا بوو کە یەکێ بوو لە هەڵکەوتووەکانی سەهیۆنی، بەو حیزبە خەلافەتی عوسمانی ڕووخاند، بەڵام سوپاس بۆ خوا لەم چەرخی تازەدا موسڵمانان هۆشیان کردووەو تازە خەڵەتێن و ئیسلامیان ناسی بە ڕێکی و لەسەر بارە ڕاستەکەی خۆی.

﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٣٦﴾

**لە پاش ئەوەی فەرمان دەرچوو بە جەنگ و کوشتار لەگەڵ نامەدارەکان تا سەرانە دان ـ وەك بەدرێژیی باسکرا ـ بڕیار دراو جاڕ درا بە ئامادەبوون بۆ جەنگکردن لەگەڵ ڕۆم و نەسرانیەکانی عەرەب کەلەلای سەرووی نیوە دوورگەوە بوون، ئینجا هێندێ شتی پڕو پووچ بوو بوو بەڕێگر لەو جەنگ و دەچوون بۆ ئەو جەنگە ئەوەش ئەوە بوو بڕیارو جاڕدانەکە لە مانگێکدا بوو بە مانگی ڕەجەب، مانگی ڕەجەبیش نەبوو لەڕاستیدا، بەڵکو بە پێی باوێکی سەردەمی نەفامی ئەبوو بە ڕەجەب وەك لە ئایەتی دووەم دەست نیشانی بۆ ئەکەین، لەبەر ئەوە ئەوا لەم دوو ئایەتی داهاتووەدا ئەوەی کە بەڕێگر نیشاندرا ناڕاست دەرکراو باری ڕاستەقینەی ڕوونکرایەوەو فەرمووی: ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ژمارەی مانگەکان لە بڕیاری خواو بەلای خواوە دوازدە مانگە، کە ئەو دوازدە مانگە قەمەریەن و ناسراون لای هەمووان، دوانزەن لە زانینی خواو لە(لوح المحفوظ)دا ﴿يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ لە ڕۆژێکەوە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە کاری مانگەکان بەو جۆرە هاتووەو لەسەر ئەو بارە دامەزراوە کەواتە بە هیچ کلۆجێ نابێ دەستکاری و دواو بەری پێبکرێ، ﴿مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ﴾ لەو دوازدە مانگە چوار مانگیان گەورەو بەڕێزەو جەنگ و کوشتاریان تێدا حەرامکراوە ئەو چوار مانگەش:(ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، رجب) ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ﴾ ئەوەی کەباسکرا هەر ئەوەیە ئاییني ڕاست و ئاییني ئیبراهیم و ئیسماعیلی پێهاتووە ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ کەواتە ستەم مەکەن لەو چوار مانگەدا لە خۆتان بەڕێز نەگرتن و ڕێز شکاندنیان بەکردنی ئەوەی کە قەدەغە کراوە**

تیایاندا،(قتادە)و زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە مەبەست ئەو چوار مانگەیە لەبەر زیادە ڕێزیان و بەدڕی شکاندنی ڕێزیان هاتووەو ڕواڵەتی ئایەتەکەش هەروا نیشان ئەدات، ئەم جڵەوگیرییە لای کۆڕو جەماوەر سەپاوەتەوەو لەبارەی جەنگ و کوشتارەوەو ڕێزگرتنەکەیان و هاندان لەسەر خۆ پاراستن لەستەمکردن بۆ گوناهەکانی ترە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەمانگی شەوال دا چووە سەر تائیف و غەزای(هەوازین)ی کرد لە حونەیندا لەساڵی هەشتی کۆچیدا ﴿وَقَٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً﴾ جەنگ بکەن لەگەڵ هاوبەش ڕەوادەرەکاندا هەموو و بەتێکڕا، هەرچۆنێ ئەوان جەنگتان لەگەڵ ئەکەن بە هەموو و بەتێکڕا، ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ بزانن کە خوا لەگەڵ خۆپارێزەرو لە خوا ترسانە بە کۆمەکی و یارمەتیدان، ئاشکرایە فەرماندان بەم جەنگە بۆ ئەو چوار مانگە نییە مەگەر ئەوان ئەو ڕێزە بشکێنن و لەو چوار مانگەدا پەلامار بدەن، ئەو کاتە جەنگیان لەگەڵ بکرێ،(مجاهد) –خوا لێی ڕازی بێ– ئەفەرموێ: پیاوێك لەبەنی کنانە هەموو ساڵێ لەکاتی حەجدا ئەهات و ئەیگوت: ئەی خەڵکینە ئێمە مانگی محرممان قەدەغەکردو مانگی سەفەرمان دواخست. ئینجا ساڵی داهاتوو ئەهات و ئەیگوت: ئەوا مانگی سەفەرمان قەدەغەکردو محرم مان دواخست،(عبدالرحمن کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم) ئەفەرموێ: لەسەردەمی نەفامیدا لە مانگی بەڕێزدا دەستیان ئەگێڕایەوە لە جەنگ و تالان، بەجۆرێ ئەگەر یەکێك توشی باوك کوژی خۆی ببوایە لێی ئەگەڕاو دەستی درێژنە ئەکرد، ئینجا پاش ئەوە ئەیویست لە مانگی موحەڕەمدا جەنگ بکات و ئەیگوت: ئەم ساڵ محرم دوا ئەخەین بۆ ساڵی داهاتوو لەم ساڵەدا بوو مانگی سەفەر بڕیار ئەدەین و قەزای ئەکەینەوە بۆ ساڵی داهاتوو، ئینجا کاتێ ساڵی داهاتوو ئەهات ئەیگوت: جەنگ مەکەن لەسەفەردا وەك مانگی محەرەم دوو محرممان هەیە ئەم ساڵ، ئا بەو جۆرە بەئارەزووی خۆیان ئەجوولانەوەو دەستکاریان ئەکرد،

إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَـٰلِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ

---

لەسەر هەر بار كردەوەكەيان لادانە لە ئاين و شەريعەتی خواو حەڵاڵكردنی حەرامو حەرام كردنی حەڵاڵيان بەكار ئەهێناو بەرامبەر بەكردەوەكەی ئەوان قورئان فەرمووی: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ﴾ ئەو دواخستنی ڕێزو قەدەغەی ئەوانە لە مانگێكەوە بۆ مانگێكی تر، ئەوانە هەر زيادە ڕەوييەو زيادیانكرد لەسەر بێبڕواييەكەی خۆيان: بێبڕوايی دانا بە ياساو شەريعەت لەگەڵ بێبڕوايی عەقيدەو بيروباوەڕە پووچەكەيان، ئەو دواخستنی ئەوانە هەر زياد كردنە لە بێبڕواييدا، ﴿يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانەی پێ گومڕا ئەكرێ كە بڕوايان نەهێناوە واتە بەگومڕا كردنێكی تر زياد لە گومڕاييەكەی خۆيان ﴿يُحِلُّونَهُۥ عَامًا﴾ دواخستنەكە حەڵاڵ ئەكەن لە ساڵێكدا ﴿وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا﴾ حەرامو قەدەغەی ئەكەن لەساڵێكی تردا ﴿لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾ بۆ ئەوەی ڕێك بێن لەگەڵ ژمارەی ئەو چوار مانگەی كە خوا ڕێزداری كردوون و ڕێزی پێداون ﴿فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾ كەواتە ئەوەی كە خوا حەرامی كرد بۆ ئەوان حەڵاڵی ئەكەن. واتە ئەوانە پێچەوانەی بڕيارو فەرمانی خوا ڕەفتاريان ئەكرد لەدياريی كردنی ئەو چوار مانگە تايبەتيانەدا هەرچەند لە ژمارەدا پێچەوانە نەبوون، بەڵام كاتێ كەلە يەكەمدا پێچەوانە بوون ئەوا هەر حەرمی خوايان حەڵاڵ كردو زيادە بێبڕواييان بەكار هێنا ﴿زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَـٰلِهِمْ﴾ ئارايش و جوان و شيرين كراوە بۆيان و لەپێش چاويان بەدی كردەوەكانيان، هەركەس كردەوەی بەدی خۆی لەپێش چاو شيرين بكرێ ئەو كەسە بێبڕوايەو تێدا جێگيرو دامەزراو بووە ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ خوايش ڕێنموونی ئەوانە ناكات كە بێبڕوان، بە ڕێنموونيەك كە بيانخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، واتە ئەوانەی كە دڵی خۆيان دائەشارن لە ڕێنموونی خواو بەڵگەو نيشانەكانی ڕێنموونی و ڕێی

ڕاست دانە بەر، ئەوانە شایستەی ئەوەن کە وازیان لیٚ بهیٚنریٚ تا بەسەر گەردانی بمیٚنیٚتەوە لە تاریکی گومڕاییدا، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات ـ آمین ـ.

هەواڵ هات بۆ پیٚغەمبەری ئازیز(ﷺ) کە ڕۆم لە شکریٚکی گەورەی کۆ کردووەتەوە لەسەر سنووری نیوە دوورگە لەشامدا، هرقل ڕۆزی ئازووقەی ساڵیٚکی داوە پیٚیان،(لوخم و جوزام و عامیلە و غەسان) لە تیرەکانی عەرەب یەک کەوتوون لەگەڵیان، بەهۆی ئەوەوە پیٚغەمبەر(ﷺ)فەرمانی گشتی دەرکرد بۆ جەنگکردن لەگەڵ ڕۆمدا، باوی وابوو لە زۆربەی جەنگەکانیدا بە ئاشکرا بەرەو ئەو شویٚنە دەرنەئەچوو کە نیازی جەنگکردنی ئەکرد، بەڵام لەبەر دووری و سەختی کات و ڕیٚگەی ئەو غەزاو جەنگە بەڕوونی و بەبیٚ شاردنەوە باسی فەرموو. جا ڕای بە هیٚز لەسەر ئەوەیە کە ئەم چەند ئایەتی داهاتووە هاتە خوارەوە لە پاش فەرماندان بە پەلاماردان و ڕاپەڕینی گشتی بۆ ئەو غەزای تەبوکە، بەهۆی فاک و فیکی ناپاکەکان لەلایەکەوە و لەبەر سەختی و دووری سەفەرەکە لەلایەکی ترەوە چەند کەسیٚک دواکەوتن و دەرنەچوون بۆ ئەو سەفەرە، لەبەر ئەوە ئایەتەکان بەسەرزەنشت و گلەیی و هەڕەشە و تانە و تەشەرەوە هاتن، ئەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هیٚناوە ﴿مَا لَكُمْ﴾ چییە بۆ ئیٚوە و لەبەرچی؟ ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ کاتیٚ بگوتریٚ بەئیٚوە: دەرچن بۆ جەنگ و تیٚکۆشان لەڕیٚی خوادا، ئیٚوە قورسی بەکار ئەهیٚنن و بەسوکی و چەسپانی ڕاناپەڕن بۆ دەرچوون بە جۆریٚ مەیل و ئارەزووی خۆشی و ڕەحەتی دنیا ئەکەن، یان ئارەزووی مانەوە ئەکەن لە خاک و وڵاتەکەتاندا، بیٚگومان زۆر شت هەیە هۆی ئەو سستی و قورسییە بیٚت: ڕەحەتی و ڕابواردن، مەترسی لەتیاچوونی ماڵ و گیان و لەدەست دەرچوونی بەرژەوەندی جۆر بەجۆر، هەروەها چەند شتی ترکە پەیوەندی بەژیانی ئەم جیهانەوە هەیە، هەرچەند ئەم جۆرە شتانە زۆر گرنگ و بەهیٚزن، بەڵام بڕوادار ئەبیٚ دەست بنیٚ بە هەموو شتیٚکەوە لە پیٚناوی فەرمان و ڕەزامەندی خوادا و ئەبیٚ سەرزەنشت بکریٚ و هەڕەشەی لیٚ بکریٚ لەسەر باودانی هەر شتیٚک بەسەر فەرمان و ڕەزامەندی خوادا. چونکە هەموو جیهان و ژیانی جیهان و خۆشی و شادی ئەم جیهانە شتیٚکی کەمە و بەزوویی لەناو ئەچیٚ و بڕوادارێش ئەبیٚ هیچ شتیٚک نەگۆڕیٚتەوە بەخۆشی و شادی ڕۆژی دوایی،

﴿أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾

---

لەبەر ئەوە بە بێزارییەوە ئەفەرموێ بە بڕواداران: ﴿أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ ئایا ئێوە ڕازین بەم ژیانە نزیکە لە باتی ژیانی ڕۆژی دوایی و ئەم باو ئەدەن بەسەر ئەودا ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ دەی خۆشی و ئەم ژیانە نزیکە بەرامبەر خۆشی ڕۆژی دوایی و لەچاو ئەودا هیچ نییە بێجگە لەوەی شتێکی کەمە، بەڵێ هەموو دنیا و خۆشی دنیا شتێکی زۆر کەمە، چونکە هەرچەند درێژە بکێشێ نامێنێ و لەناو ئەچێ و شتێکی دوا بڕاو و دوا هاتووە، خۆشی و ژیانی ئەو دنیا نەبڕاوە و دوا نەهاتووە، کەواتە هەر بڕوادارێك سستی بکات و خۆی داشارێ لە تێکۆشان لەڕێی خوادا بێگومان ئەو بڕوادارە سستی و لاوازی لە بڕواکەیدا هەیە، لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەفەرموێ:(من مات و لم يغز ولم يحدث نفسه بغزو مات علي شعبة من شعب النفاق) هەرکەسێك بمرێ، غەزای نەکردبێ و لەدەروونی خۆیشیدا بڕیاری لەسەر نەدابێ، ئەو کەسە لەسەر بەشێك لە ناپاکی دەمرێ، واتە ناپاکی کە دەردێکە ڕوو ئەکاتە عەقیدە و بیرو باوەڕ بەرگری ئەکات لەساغی و سەلامەتی و تێرو تەواوی عەقیدەکەی، ئەوە پەکی ئەخات و دای ئەنیشێنێ لە تێکۆشان لە ڕێی خوادا لە ترسی نەمان و مردن کە مردن و ژیان هەر بەدەست خوایە، یان لەترسی نەبوونی کە هۆی ژیان هەر بەدەست خوایە، جا لەبەرئەوە بەم هەڕەشە سەختەوە ڕووی فەرموودە ئەکاتە ئەوانەی کە ڕاناپەڕن و سستی بەکار ئەهێنن و ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ﴾ ئەگەر ئێوە ڕانەپەڕن و دەرنەچن بۆ جەنگ و کوشتار لەڕێی خوادا ﴿يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾ سزاتان ئەدات بەسزایەکی سەختی ئازار دەر ئیتر بەزاڵ بوونی دوژمن و زەبوونیتان لە ژێر دەستیانداو لەناو بردنتان و داگیر کردنی ماف و ماڵ و وڵاتتان بێجگە لە سزای ڕۆژی دوایی، یان بە هەر جۆرێکی تر ﴿وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾ لەباتی ئێوە و لەجێی ئێوەدا گەل و کۆمەڵێکی تر ئەهێنێ جیاواز لە ئێوە کە گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بن،

وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ

---

﴿وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔاۗ﴾ ئێوە زیانی هیچ شتێك ناگەیەنن بە خوا، چونکە خوا بێ پێویستە لە هەموو شتێ، یان بە پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەیپارێزێ و بەڵێنی داوە بە یارمەتیدان و سەرخستنی ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ خوا توانایە بەسەر هەموو شتێکدا کە بیەوێ مەیلی بکات کە یەکێ لەو شتانە پێکهێنان و بەدی هێنانی ئەو هەڕەشەیە کە ئاڕاستەیکرد لێرەدا، ئینجا وێنەو نموونەیەك لە یارمەتیدانی ئەخاتە بەرچاویان کە بەبێ کۆمەك و یارمەتی هیچ کەس یارمەتی پێغەمبەرەکەیدا لەسەخت ترین کاتدا، ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ﴾ ئەگەر ئێوە یارمەتی پێغەمبەر نادەن ﴿فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾ ئەوە بێگومان خوا یارمەتیدا بەبێ کۆمەکی و یارمەتی هیچ کەسێك، واتە ئەگەر ئێوە یارمەتی نادەن ئەوا خوا یەکی ئەخات و یارمەتی ئەدات، وەك ئەو یارمەتی دانەی کەدای، ﴿إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ لەکاتەدا کە ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بوو دەریانکرد لە مەککەو بوون بەهۆی دەرچوونی ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ﴾ لەکاتێکدا یەکێك بوو لە دوو کەس ﴿إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ﴾ یارمەتیدا لەو کاتەدا کە ئەو دووانە لە ئەشکەوتەکەدا بوون، ﴿إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ﴾ یارمەتیدا لەو کاتەدا کە ئەڵێ بە هاوەڵەکەی، واتە گوتی بەڵام بەدەستەواژەی(یقول) ئەیخاتە بەرچاو، وەك باوە لە یاسای ڕەوان بێژییدا، گوتی بە هاوەڵەکەی: غەم مەخۆو غەمبار مەبە، بێگومان خوامان لەگەڵە بەکۆمەك و پاراستن لە زیانی ئەو دوژمنانەی کە مەترسی ئەکەیت لێی، ئەوە ئەو کاتە بوو کە قوڕەیش بە تەنگ هاتبوون بەدەست پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەك هێزە ستەمکارەکان بودرێژایی مێژوو کەبە تەنگ هاتن و دێن بەدەست وشەی هەقەوە بۆیان ناکرێ و خۆیان بۆ ناگیرێ، بەهۆی ئەوەوە پیلان بازی ئەکەن، جا بەهۆی ئەوەوە قوڕەیش

بڕیاریاندا خۆیانی لێ ڕزگار بکەن، ئینجا خوایش پێغەمبەری ئاگادار کرد بەسەر ئەوەدا(ﷺ)، فەرمانی پێدا بە دەرچوون لە مەککە، ئەویش بە تەنیا دەرچوو بەس بە هاوڕێیەتی هاوەڵی صدیقی -خوا لێی ڕازی بێ-، بەبێ لەشکرو بەبێ چەك، دوژمن بەو زۆری و داخ لەدڵییە، بەدوایاندا ئەگەڕان لە هەموو بارێکەوە یاری غار -خوا لێی ڕازی بێ- بێئارامی و غەم و پەژارە گرتی، نەك لەبەر خۆی، بەڵکو غەمی ئەوەی بوو کە پێی بزانن، لەو کاتە سەختەدا عەرزی خۆشەویستی خوای کرد: کە ئەگەر یەکێ لەوانە کە هاتبوونە سەر ئەشکەوتەکە ـ سەرنجی ژێر پێی خۆی بدات ئێمە ئەبینێ ـ ئەویش دڵنارامی کرد بەوەی غەمبار مەبە بەڕاستی خومان لەگەڵە، فەرمووی پێی: ئەبوبەکر گومانت چییە دەربارەی دووکەس خوا سێیەمیانە، ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ﴾ ئینجا خوا ئارام و ئاسایشی هێنایە خوارەوەو باراندی بەسەری پێغەمبەردا(ﷺ)، هێندێ ئەفەرموون: بەسەر ئەبوبەکردا ئەویش هەڵئەگرێ، هەرچەند ئەم ڕاناوەی ئەم ڕستەیە هەر بۆ خۆشەویست دەست ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا﴾ بەهێزی کردو یارمەتیدا بەلەشکرو چەند سەربازێك کە ئێوە نەتان ئەبینی، لەبەر ئەوە چاك تر ئەوەیە کە ڕاناوی پێشوش بگەڕێتەوە بۆ خۆشەویست(ﷺ)، بەدیمەن و ڕواڵەت ئەو هەموو هێزو دەسەڵاتە هەبوو هێزو بۆ دوژمن، پێغەمبەرو یاری غاریش ڕووت بوون لە هەموو هێزو دەسەڵاتێکی ئاشکرا، لەگەڵ ئەوەدا دوا ڕۆژەکە خوا بەم جۆرە هێنای کە ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ﴾ وتەو وشەی ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بە خوا گێڕای هەر بە پەست و ژێر کەوتوو، واتە بێبڕوایی و بیروباوەڕی پووچی هاوبەش ڕەوادان وەك(ئیبن و عەباس)ەوە هاتووە -خوا لێیان ڕازی بێ- زۆر لە زانایانی تەفسیری لەسەرە، یان ئەو بڕیارەی کە دایان لە(دار الندوة)دا کە خۆی و بانگەوازەکەی پەك بخەن، بە هەرکام خوا ئەوەی گێڕا هەر بە پەست و ژێر کەوتوو، ﴿وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ﴾ وتەو وشەی خوا هەر ئەو هەمیشە بەرزو بڵندە، واتە بیروباوەڕی خوا پەرستی بەتاك و تەنیا، یان بڕیاری یارمەتیدان و سەرخستن و زاڵکردنی ئاین و فروستادەکانی، یان بەڵێن دانی بە پەك خستن و لەکار خستنی پیلانی دوژمنەکانی پێغەمبەر(ﷺ)،

﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ خوا توانی زاڵی کار دروسته، کەواتە دۆستەکانی خۆی ڕیسواو زەبوون ناکاتو یارمەتیان ئەدات لەکاتی خۆیدا، بەڵام هەموو شتێ کاتی تایبەتی خۆی هەیە بەلای خواوە، ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ڕوونو ئێجگار بەهێزە لەسەر گەورەیی‌و پایە بەرزی یاری غار بە جۆرێ هەرکەس دان نەنێ بەوەدا هەر نەمە پێچەو گیرو گرفتێکی تێدا بکات ئابرووی خۆی ئەباتو خۆی ڕیسوا ئەکاتو هیچ پێویست نییە بە دەمە دەمێ و لێکۆڵینەوە لەگەڵی، ئەوەی کە ناحەزو نەفامان گوتویانەو ویستویانە ئەو گەورەیی‌و پایەو پلە بەرزەی پێ بشارنەوە، بە ڕاستی لە ورێنەی تادار بێ‌نرخ ترەو بە ڕاستی بۆ گێڕانەوە ناشێ، بە ڕاستی دڵم ڕێگەی نەدام هێندێ لەو ورێنەی ئەو نەفامانە باس بکەم، خوا پەنامان بدات لە گومڕایی‌و سەر لی تێکچوون ـ آمین ـ لە بارەی چۆنێتی دەرچوونی پێغەمبەر لەگەڵ یاری غاری لە مەککەو ڕۆیشتنیان بۆ ئەو ئەشکەوتەو مانەوەیانو دەرچوونیان لە پاش سێ ڕۆژو ئینجا کۆچکردنیان بەرەو مەدینەی منەوەرە و ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانەیان لەو ڕێگەیەدا تا گەیشتنە مەدینەو جێگیر بوون تیایدا، لەم بارانەوە کتێبەکانی سیرەت و زۆر لە تەفسیرەکان بە تێرو تەسەلی فەرموویانە. لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی لەم تەفسیرەدا ئەو باسانە بێنم، هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای ئەو کتێبانە بکات، با ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئایەتەکان، لە پاش هێنانی ئەم نموونەو وێنەیە لە یارمەتیدانی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و لەژێر تیشکو سێبەرو سەمەندی ئەو وێنەو نموونە بەکارو بەهێزەدا بانگی بڕواداران ئەکات بۆ دەرچوونو ڕاپەڕین بەگشتی بۆجیهادو فیداکاری بە ماڵو بە گیان لە ڕێی خوادا، بەبێ ئەوەی هیچ شتێ سستیان بکاتو بیان وەستێنێ، ئەگەر بە دوای خێرو خۆشی هەردوو جیهاندا ئەگەڕێن،

انفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ

---

**ئەفەرموێ: ﴿انفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا﴾ دەرچن بە سووكیو بە قورسیی لەكاتێكدا سووكو سۆڵ بن بە هۆی لەش ساغی یان دەست داریو دەوڵەمەندی یان كەم ئەركی ماڵو منداڵ یان گەنجیو هێزی لەش یان لەڕیو لەش سووكی لە كاتێكدا لەش قورس بن بە هۆی پێچەوانەی ئەو هۆیانە كە باسكران بۆ سووكو سۆڵی، بە كورتی: لەسەر هەموو بارو حاڵێكو بەبێ بڕوبیانوو هێنانەوە بە هیچ شتێك ﴿وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تێكۆشانو فیداكاری بكەن بە ماڵتانو بە گیانتان لە ڕێگەی خوادا ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوە چاكە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن‌و زانا بن ئەزانن كە ئەوە چاكە بۆتان، یان دەرچن‌و ڕاپەڕن‌و تێكۆشان‌و فیداكاری بكەن، بڕوادارە پاكو خاوێنەكان ئەوەیان زانی، بەهۆی ئەوەوە بێ گێرو گرفت ڕاپەڕین‌و دەرچوون! هەرچەند چەند بەرگرو ڕێگرێك لە ڕێیاندا هەبوو، هەرچەندعوزرو بیانوو بە دەستیانەوە نەبوو، بەهۆی ئەوەوە خوا دڵی كردنەوەو وڵاتانی بۆ گرتن‌و كەوتنە دەستیان، خوا وتەی خۆی زاڵ كرد بەوان، ئەوانی بەرزو بڵند كرد بە وتەكەی خۆی، لەسەر دەستیاندا كاری وای فەراهەم هێنا كە لە ڕاستیدا موعجیزەو كەس نەدیدە بوو، هەموو سوپاس‌و سەنای بێباوەڕەكانی پایان بۆی، ئەبو تەلحە -خوا لێی ڕازی بێ- سوورەتی بەرائەی ئەخوێندو گەیشتە سەر ئەم ئایەتەو فەرمووی: ئەبینم پەروەردگارمان داوای دەرچوونی لی كردووین بە پیرو گەنجەوە ڕۆڵەكانم ڕێكم خەن بۆ دەرچوون، ئەوانیش گوتیان: ڕەحمەتی خوات لێبێ لە خزمەت پێغەمبەردا غەزات كرد تا لە دنیا دەرچوو، لەگەڵ ئەبوبەكردا غەزات كرد تا لە دنیا دەرچوو، لەگەڵ عمر غەزات كرد تا لە دنیا دەرچوو، ئینجا ئێمە لەباتی تۆ غەزا دەكەین، ئەویش قسەكەی وەرنەگرت‌و سواری كەشتی بوو و دەرچوو بۆ غەزا، ئینجا لە دەریاكەدا مردو لە دنیا دەرچوو، ئینجا شوێنی وشكیان دەست نەكەوت كە بینێژن تا پاش نۆ ڕۆژ، هیچ نەگۆڕابوو لەو ماوەیەدا، ئینجا لەو جزیرەیەدا ناشتیان -خوا لێی ڕازی بێ- (ئیبن‌و جەریر)ئەگێڕێتەوە لە(حیانی كوڕی زەید)ەوە كە ئەڵێ**

لەگەڵ(سەفوانی کوڕی عەمر) دەرچووین بۆ غەزا کە والی بوو بەسەر(حومس)ەوە لەوێدا پیاوێکی پیری زۆر پیرمان بینی، هەردوو برۆی شۆڕ بووبووەوە بەسەر چاویدا، سواری ولاغێك بووەو دەرئەچێ بۆ غەزا، ئەڵێ: منیش چووم بۆ لای‌و پێم گوت: ئەی مامی خۆم تۆ خوا غەزای لەسەر هەڵگرتووی، ئەویش دەستی برد برۆکانی بەرز کردەوە لەسەر چاوی‌و گوتی: برازای خۆم خوا داوای دەرچوونی لێ کردووین بە سووك‌و سۆڵی‌و بە قورسی، واتە ئیتر چۆن دەرنەچم؟ تا بەو جۆرە ڕاستی‌و بە گرنگ گرتنە ئیسلام بڵاو بوویەوە لە وڵاتدا، خەڵکی ڕزگار کرد لە پەرستنی بەندەیانی خوا بۆ پەرستنی خوا بە تاك‌و تەنیا، بەو ڕاستی‌و لێبڕانە لەو ماوە کەمەدا ئەو ئازادی‌و سەربەستیە کەوتە جیهان.

بێگومان باوی بڕواداران وا بووە کە بە چەسپانی‌و بێباوەڕەکانی گیرو گرفت گوێ ڕایەڵی‌و فەرمانبەرییانکردووە بۆ هەر فەرمانێکی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام کاتێ فەرمانیدا بە دەرچوون بۆ تەبووك کە لەلایەن هێندێ لە موسڵمانانەوە قورسی‌و سستی بەکار هێنرا لەبەر ئەوەی سەفەرەکە زۆر دوورو درێژ بوو، لە کاتی گەرمای سەختی هاویندا بوو، بۆ جەنگ دەرئەچوون لەگەڵ ڕۆمدا کە گەورەترین دەوڵەتی بەهێزو دەسەڵاتدار بوو لەو چەرخەدا، جا لەم ئایەتانی داهاتووەدا دەست پێئەکات بە باسی ئەو دەستەو تاقمانەی کە بێهێزی‌و لاوازییان تێدا بووبە هۆی ئەوەوە کارەکە قورس بوو لەسەریان، بەتایبەتی دەستەی ناپاکان کە بەناوی ئیسلامەوە لە ڕیزی موسڵمانەکاندا بوون‌و بە ناچاری خۆیان بە موسڵمان نیشان ئەداو دڵیان پڕبوو لە قین‌و خەشم‌و پیلان دەربارەی ئیسلام‌و موسڵمانان وەك لەمەو پاش لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا ئەو شتانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر لە یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ﴾ئەگەر ئەوەی تۆ بانگی ئەوانەتکرد بۆی دەستکەوتێکی دنیایی بووایە کە بە سووك‌و ئاسان دەستکەوێ سەفەرێکی میانە بوایە نەك زۆر دوور، ئەگەر کار بەو جۆرە بوایە ئەوانە شوێنت ئەکەوتن‌و چەسپانییان ئەکرد بە دەرچوون، چونکە خۆش ویستنی ئارەزووات‌و دەستکەوتی دنیایی شتێکی سروشتیە بە تایبەتی کاتێ بە ئاسانی دەستکەوت ببێ، بە تایبەتی ترکە بڕوا بە ڕۆژی دوایی لاواز بێت یان هەر نەبێ، ئەگەر کار بەو جۆرە بوایە ئەوانە بەچەسپانی گوێ ڕایەڵیان ئەکرد،

وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ (٤٢) عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ (٤٣)

---

﴿وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ﴾ بەڵام دوور بوو لەسەریان بڕینی ئەو ناوچەو مەسافەو ڕێگەیە، لەبەرئەوە دەرنەچوون لەگەڵت، بەڵێ دڵ و دەروونە لاوازەکان خۆیان بۆ ناگیرێ لەکاتی زەحمەت و تەنگانەو مەترسیدا، بۆ ئاسۆی بەرز ناڕوانن کاتێ مەبەستی بێنرخی ئەم دنیایە بەرچاویان بگرێ، ئەو جۆرە کەسانە زۆرن و هەر بوون و هەر هەن بەدرێژایی مێژوو. خوای پەروەردگار لە چەند هەواڵێکیدا لەو دڵخۆش و لاوازانە کە جێ مابوون لەو غەزای تەبوکە هەرکام لەو هەواڵانە شتێکی غەیبی بوو کە ئەوەش لە موعجیزەکانی قورئانە یەکێ لەوانە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ﴾ لەپاش گەڕانەوەتان لە تەبووك سوێندتان بۆ ئەخۆن بەخوا کە ﴿لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ﴾ ئەگەر بمانتوانیایە بێگومان لەگەڵتان دەرئەچووین بۆ ئەو سەفەرە، ئەوانەی کە ئاوا ناپاك و دڵ نەخۆشن هەمیشە ئەوە پیشەیانە کە ئەیانەوێ بە سوێندو پاکانە خۆیان پاك بکەنەوە بەڵام ئەگەر خەڵکی تریان بۆ بخەڵەتێ خواو پێغەمبەریان بۆ ناخەڵەتێ، ئەوەتا خوا بەرامبەریان ئەفەرموێ: ﴿يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ﴾ ئەوانە خۆیان ئەکوژن و دووچاری ئەکەن بەو درۆو سوێندە کە ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ خوا ئەزانێ بێگومان ئەوانە درۆزنن لەو قسەو لافەی کە لێی ئەدەن.(مجاهد) ئەفەرموێ: دەستەیەك لەوانە گوتیان: بائیزن بخوازین و بیانوو بهێنینەوە بۆ دەرنەچوون، ئەگەر ئیزنیدا دانیشن، ئەگەر ئیزنیشی نەدا هەر دانیشن، پێغەمبەریش(ﷺ) ئیزنیدان بۆ دەرنەچوون، ئەو ئیزن دانەش هەرچەند گوناه نەبێت، بەڵام باشتر ئەوە بوو ئیزنی نەدانایەو بوەستایە بە دیار فەرمانی خواوە، بێگومان هەمیشە کارو کردەوەی باشتر شیاو و شایستەی پایەو پلەی

بەرزی ئەو بووە، بە جۆرێ هەڵنەسانی بەباشتر لێبووردنی ئەوێ، جا بەو پێیە قورئان لێبوردنی بەکار هێنا بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە شێوەیەك كە بۆن و هەناسەی لوتف و میهرەبانی لێ ئەبارێ، ئەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ﴾ خوا لێت ببورێت، لێبوردنەکە پێش ئەخات، ئەفەرموێ: ﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾ لەبەرچی ئیزنی ئەوانەت دا، واتە باشتر ئەوە بوو ئیزنت نەدانایە ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ هەتا دەرئەکەوێ بۆت ئەوانەی کە ڕاستیان کرد لە عوزرو بەهانەیەکیاندا، هەتا بناسیت و بزانی درۆزنەکان، واتە ئەو دوو دەستەیە جیا ببونایەتەوەو هەرکامیان بە پێی کارو کردەوەی خۆیان ڕەفتاریان لەگەڵ بکردنایە، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەرانیش - سەلامی خوایان لێ بێت - ئەفەرموێ: ئیجتهاد قسەیانکردووەو هەڵەشیان بووە، بەڵام خوا ئەوانی ئاگادار کردووەو نەیهێشتووە لەسەر هەڵەبمێننەوە، نەك وەك کەسانی تر، پێغەمبەران - سەلامی خوایان لێ بێت - کە(معصوم)ن و دەست نادەن بۆ هەڵە لەو شتانەدا کە ڕایان گەیاندووە لەلایەن خواوەو بەناوی خواوەو هەرچی لە خواوە فەرمویان، نەك بۆ ئەو شتانەی کە لەلایەن خریانەوەو بە پێی گومان و بۆچوونی خۆیان فەرمویانە، بەتایبەتی ئەو شتانە کە پەیوەندیان هەر بەم ژیانی دنیاوە هەیە، وەك لەدەقی ئەم حەدیسەدا هاتووە کە(ئیمامی موسلیم) ڕیوایەتی ئەکات لەحەدیسی(طلحة) وە کاتێ کە ئەوانەی دی وا خورمای نێرو مێ پێوەن ئەکەن، فەرمووی: من گومان نابەم ئەوە سوودی هیچ شتێکی ببێ، بەهۆی ئەوەوە خەڵکی وازیان هێنا لەو کارەو وایان زانی کە ئەوە پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە، لەپاشان ئەو ساڵە خورماکان بەریان نەگرت، ئینجا هەواڵەکەیاندا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: ئەی کە سوودی هەیە با بیکەین، چونکە من بەپێی گومان و بۆچوونی خۆم ئەوەم گوت کەواتە لێم مەگرن، بەڵام هەر شتێکم بەناوی خواوە باسکرد بۆتان باش وەری گرن، چونکە هەرگیز من درۆ بەدەم خواوە ناکەم، ئینجا یاسایەك دائەنێ کە هەڵە ناکات و بڕوادارو ناپاکی پێ جوێ ئەکاتەوە.

لَا يَسْتَـْذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَوْ أَرَادُواْ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ

---

ئەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَـْذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ پرس ناكاتو ئیزنت لێ ناخوازێ ئەوانەی كە بڕوایان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۗ﴾ لەمەدا كە تێكۆشانو فیداكاری بكەن بە ماڵیانو بەگیانیان لە ڕێی خوادا، واتە باوو پیشەی ئەوانەی كە پرس ناكەن بۆ شتی واو چاوەڕوانی ئیزن ناكەن، چونكە باوەڕی ڕێكو ڕاستیان هەیە بە ئەجرو پاداشتەكەی خوا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلْمُتَّقِينَ﴾ خوا ئاگاو زانایە بە خۆپارێزرانو لە خواترسان، ﴿إِنَّمَا يَسْتَـْذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ هەر ئەوانە پرس ئەكەنو ئیزنت لێ ئەخوازن كە بڕوایان نییە بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵەكانیان گومانو دوو دڵیان بووە لە ئایینەكەیانداو دڵئارام نەبوون پێی ﴿فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾ كەواتە ئەوانە لە گومانو دوو دڵیەكەیاندا سەرگەردانو هەر لەسەر بارێكن، خوا پەنامان بدات لە گومانو ناپاكی.

ئەو ناپاكانە توان بوون بەسەر دەرچوون بۆ ئەو غەزایە ﴿وَلَوْ أَرَادُواْ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً﴾ ئەگەر بیانویستایە دەرچوون بێگومان هۆو كەرەسەو پێویستیان ئامادە ئەكرد بۆی، هێندێ لەوانە:(عبدالله ی كوڕی ئوبەیو جیدی كوڕی قەیس) بوون كە سەرۆكو دەوڵەمەند بوون لە ناو تائیفەكەیاندا ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ بەلام خوا نەیویستو دەرنەچوونەكەی ئەوانی پێناخۆش بوو ﴿فَثَبَّطَهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا دڵی سستكردنو نیازی دەرچوونی تیا دروست نەكردن،

وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾

---

**﴿وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ﴾ گـوترا پێیـان: دانیـشن لەگـەڵ دانیـشتووەکاندا وەك منداڵو کەوتە کارو ئافرەتەکان، ئەم فەرموودەیە چیرۆکە بۆ دروست نەکردنی خوا لە دڵیاندا نیازو بڕیاری دەرچوون، یان چیرۆکە بۆ ئەو خەتـەرەو خـەیاڵو بیمو ترسەی کە شەیتان ئەیخستە دڵیان بۆ دەرنەچوون، وەك ئەگونجێ کە ئەوە وتـەی هێنـدێکیان بێت دەربارەی هێندێکی تریان، خوا خۆی باش ئەزانێو بە هەر حاڵو لەسەر هەر بار بەوە ڕیسوای کردنو تەشەری لێدان، بێگومان دەرنەچوونی ئەوانەو نـەکردنیان لـەو غەزایـەدا خێـری تێدا بوو بۆ ئیسلامو موسڵمانان، وەك دەرئەکەوێ بۆمـان نیشان ئەدا کە ئەفـەرموێ: ﴿لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾ ئەگەر ئەوانە دەرچوونایە لەناوتانداو بە تێکەڵی ئێوە هیچ شتێکیان بۆ زیاد نەئەکردنو هیچ بەرهـەمێکیان نەئـەبوو بۆتـان بێجگە لە تێك چوونو سەر لێ شێوانو شـەڕو دەستەپاچـەییو تـرسو پـیلان، ﴿وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ﴾ بەچـسپانی ئەکـەوتنـە نێوانتـان بـەدو زامـانیو هـاتو هـوتو بـەین تێکـدان لـە کاتێکـدا ﴿يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ﴾ نیـازو هـەوڵو مەبەستیان پێتان سەر تێکدانو لادانتان لـە ئاینو ڕێگە ڕاستەکەتان بە بەدگزمان کردنو سستکردنی بڕواتانو ساردکردنەوەو خاو کردنـەوەتان لـە جـەنگکردن لـەڕێی خواداو بیمو تـرس نانـە بـەرتان بـەزۆری دوژمـن ﴿وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ﴾ لەکاتێکـدا لـەناو ئێـوەدا هـەبوو کەسانێك کە زۆرو بەتین گوێبگرن لێیان لەو کاتەدا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا بە ئەوپەڕی**

ڕادەناگاو زانایە بە ستەمکارەکان واتە بەبێ بڕواو هاوبەش کە ئەم ناپاکانە بەشێکن لەوان،(مجاهد) ئەفەرموێ: بە(سماعون) کەسیانێك کە جاسوس بوون بۆ ئەو ناپاکانە، بەڵام بەڕاستی ئەم ڕایە ناچێتەدڵەوە بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لەناو موسڵمانەکاندا کەسانێك هەبوون لاواز لەبڕوایاندا لاواز لە ژێریدا کە ئەخەڵەتان بە قسەی ئەوناکاپانە ڕابوردوی ئەو ناپاکانە شایەتە لەسەر خراپیو نیازی بەدیان وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ﴾ سوێند بە خوا ئەو ناپاکانە هەوڵو نیازی سەر لێ شێوانو دووبەرەکیو شەڕو خراپەیانکرد لەمەوبەر لە یەکەمجاری هاتنت بۆ مەدینە ئەی پێغەمبەر ﴿وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ﴾ واتە ئەوە تەگبیری چەند فێڵو پیلانیانکرد بۆ بەربەستکردنو نەهێشتنی ئاینەکەت، یان چەند ڕاو بڕیارێکیان لە هەموو بارێکەوە بەکار هێناو ئاڵو گۆڕیانکرد تا بزانن کام بەکارە بۆ لەناوبردنی خۆتو ئاینەکەت ﴿حَتَّىٰ جَآءَ ٱلۡحَقُّ﴾ هەتا هەق هات ﴿وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ وتەو وشەی خوا زاڵ بوو کارو فەرمانی خوا ئاشکرا بووو ئاینی خوا زاڵبوو بەسەر ئاینەکانی تردا بە تۆڵەسەندن لە جوولەکەو زاڵبوون بەسەر هاوبەش ڕەوادەرانو هاتنی خەڵکی پۆل پۆل بۆسایەی ئیسلامو لەناو چوونی تەمو دووکەڵی هاوبەش ڕەوادان، ﴿وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەو ناپاکانە بێزارو دڵ ناخۆش بوونو بە کوێرایی چاوی ئەوان ئەوە پەیدابوو، واتە پێش زاڵبوونی ئیسلامو موسڵمانان ئەو ناپاکانە هەموو هەوڵو تەقەلای خۆیانیانداو هیچ سوودی نەبوو ئاینی خوا سەرکەوتو زاڵبوو، ئەوانە هیچ چاریان نەماو بەناچاری ملیان کەچکرد بۆ ئیسلام بە بێزاریو خەشمو پێناخۆشی دڵەوە هەمیشە هەر بەردەوامنو چاوەڕوانن بۆ هەر هەلو هەڵکەوتێك بۆ پیلانو خراپەکاری دەربارەی ئیسلامو موسڵمانان، بەڵام هیچ نرخیشیان نابێ وەك یەکەمجار.

وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟ وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾

---

ئینجا چەند نموونەو وێنەیەکی تر لەوانەو عوزرو بیانووەکانیان ئەخاتە بەرچاو، ئینجا ئەو نیازو نیەتە بەدەی کەلە دڵیاندایە دەریان ئەخات، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ﴾ هێندێ لەوانە کەسێکە کەئەڵێ: ئەی پێغەمبەر ئیزنم بدە بۆ نەهاتنم بۆ ئەم سەفەرە، دووچاری گوناهو خراپەم مەکە، بەم ڕەنگە فەرمانم پێبدەیت بە دەرچوون و منیش بۆم ناکرێ و کەواتە نا فەرمان دەرئەچم و گوناهبار ئەبم وەك لە(حسن و قتادەو جبائی)یەوە هاتووە یان بەم ڕەنگە دووچاری زینا و داوێن پیسی ببێ بەهۆی دیتنی ژنانی ڕۆم کە جوانن، وەك چەند کەسێك ئەگێڕنەوە لە(جدی کوڕی قەیس)ەوە کە یەکێ بوو لە ناپاکان و کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد بۆ ئەو غەزایە، لە وەڵامدا ووتی: گەل و کۆمەڵەکەم ئەزانن کەس بە ئەندازەی من حەز لە ئافرەت ناکات، ئەترسم کە ژنانی ڕۆم ببێنم خۆم پێنەگیرێ و دووچاربیم، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕاو فەرمووی: ئەوا ئیزنم دایت بە نەچوون، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە دووچاری زینا و ماڵ و وێرانیم مەکە بەمەی کەس نییە سەرپەرشتیان بکات لەپاش دەرچوونی خۆی، هێندێ تر ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە سزاو ئازارم مەدە بەدەرچوون لەکاتی ئەم گەرما سەختەدا، بەهەر حاڵ دەستەیەك لەناپاکان عوزرو بیانوویان هێنایەوە بۆ دەرنەچوون و خۆ قوتار کردن لەو غەزایە، لەسەر هەربار قورئان بەم شێوە سەخت و سامناکە بەرپەرچی دانەوەو ئەم هەڕەشە گەورەی ئاڕاستە کردن و فەرمووی: ﴿أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟﴾ بێدارو ئاگادار بن کە بەڕاستی ئەوانە هەر کەوتوونەتە ناو(فتنة) ئیتر لە هەر بارو مەبەستێك کە باسکرا بۆ ئەو وتەیە ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەڕاستی و بێگومان دۆزەخ دەوری بێبڕواکانی داوەو کۆکەرەوەیە بۆیان، واتە لە ڕۆژی دواییدا دەوریان ئەدات و کۆیان ئەکاتەوە، یان مەبەست ئەوەیە کە هەر لەم دنیایەشدا دەوری داون و کۆی کردوونەتەوە، چونکە هۆی ئەو دەوردانە ئێستا هەیە، کەواتە وەك هەر ئێستاش

دەوری دابن وایە، ئایا مەبەست بە بێبڕواکان لێرەدا ئەم ناپاکانەیە، بەم وتەیە تاوانباریان ئەکات بێبڕوایی ئەوە هۆو بناغەو بنەڕەتی هەموو تاوانو خراپەیەکەو جاڕی ئەمەشیان لێ ئەدات؟ ئایا هەر ناپاکان لێرەدا مەبەستن، یان مەبەست هەڕەشەیە لە بێبڕوایان بە شێوەی گشتیو ناپاکەکان لێرەدا یەکەمو سەر دەستەن؟ هەرکام ئەگونجێو هەڵئەگرێ. دەستەواژەکەی قورئان زۆر سەرنج ڕاکێشەو هەر بە قورئان ئەکەوێ قسە بکات: یەکەم وا نیشان ئەدات کە فیتنە چاڵو چرێکەو ئەوانە هەڵدێراونو کەوتوونەتە ناوییەوە، دووەم: ئەوانە ئومێدی ڕزگاربوونیان نییە، چونکە دۆزەخ دەوری داونو هەموو کونو کەلەبەرێکی لێ گرتوون، خوا پەنامان بدات. ئەو ناپاکانە نیازی هیچ خێرو خۆشیەکیان نییە نەبە پێغەمبەرو نەبە موسڵمانان، بەخێرو خۆشیان غەمبارو نارەحەت ئەبنو بەناخۆشیوناڕەحەتیان پێخۆشحاڵ ئەبنوخۆش نودودڵشادن بەوەی خۆیان قوتاربوون، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ﴾ ئەگەر خۆشیو بەهرەو چاکەت بەرکەوێ وەك زاڵ بوون بەسەر دوژمنداو دەستکەوت لە جەنگدا، ئەو خۆشیو چاکەیە ئەوانە نارەحەتو غەمبار ئەکاتو پێی تێك ئەچن، ﴿وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ﴾ ئەگەر موسیبەتو بەسەرهاتی ناخۆشت بۆ ببێو بەرت کەوێ وەك شکانی لەشکرو هەر زیانێکی تر ﴿يَقُولُواْ﴾ بەکەشخەوە ئەڵێن: ﴿قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ﴾ بەڕاستی ئێمە کاری خۆمان گرتە دەست پێش ئەو بەسەرهاتو ڕووداوانە، واتە چاك بوو ئێمە فریای خۆمان کەوتینو بەشداریمان نەکرد لە جەنگداو خۆمان نەخستە دووچار بوون، ﴿وَّيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ﴾ ئەگەڕێنەوە لەو شوێنەی کە ئەو قسەی تێدا ئەکەنو ئەو هەواڵی ناخۆشی ئێوەی تێدا ئەبیستن، ئەگەڕێنەوە بۆ ناو کەسو کاریان لەکاتێکدا شادمانو دڵخۆشن بەوەی خۆیان کردیانو بەوەی کە دووچاری تۆ بوو، یان ڕوو وەرئەگێڕن لە تۆو خۆشحاڵو شادمانو کەشخە ئەکەن بەو بەسەرهاتو ڕووداوانە، واتە ڕزگاو بوونی خۆیانو دووچاربوونی موسڵمانان، ئەوانە نەفامو نەگبەتن هەر تەماشای ڕواڵەت ئەکەنو لایان وایە کە بەڵاو ناخۆشی هەموو کاتێ خراپەو دووچار نەبوون هەمیشە چاکە، نازانن کە هەرچی خوا بڕیاری دابێ هەر ئەوە ئەبێ،هەرچی بڕیاری نەدابێ هەرگیز نابێ، نازانن کە دوا ڕۆژی سەرکەوتنو بەختەوەری هەر بۆ پێغەمبەرانو شوێن کەوتووانیانە، بڕواداران ئەبێ هەر پشت بە خوا ببەستن،

﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٥١ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾

وەك خوای پەروەردگار فەرمان ئەدات كە پێغەمبەرەكەی(ﷺ) بەم جۆرە دەم كوتی ئەو دوژمن‌و ناپاكانە بكات: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ هەرگیز هیچ شتێ تووشی ئێمە نابێ بێجگە لەوەی كە خوا نووسیویەتی بۆمان‌و تایبەتیكردووە بۆمان ﴿هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ﴾ ئەوا خوا كۆمەك‌و یارمەتی دەرو كاربەدەستی ئێمەیە، ئەو خوایە بڕیاری دوا ڕۆژی سەركەوتنی داوە‌و بەڵێنی پێداوە بۆ بەندە بڕوادارەكانی، كەواتە هەر ناخۆشی‌و بەسەرهاتێكی سەخت كە دووچاریان ببێ ئەوە هەمووی پاڵفتەی كردن‌و ئامادەكردنە بۆ ئەوەی بەڵێنی پێداوە، بەڵام ئەو سەركەوتن‌و یارمەتییەی كە بەڵێنی پێداوە نابێ هەروا بێ ئەرك‌و سوك‌و هەرزان، بەڵكو ئەبێ بە خۆگری‌و فیداكاری دەستكەوت بووبێ، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ بڕواداران با هەر پشت بە خوا ببەستن‌و هەموو كاروباریان حەواڵەی خوا بكەن‌و هەر لەوی بناسن، پشت بەستن بە خوا ئەمەیە لە هەموو بارو ڕوویەكەوە هەر فەرمانی خوا بەجێ بهێنرێ‌و ئەو شتانەی كەلەم جیهانەدا خوا كردوونی بە هۆی فەراهەم هاتنی مەبەستەكان، كەواتە ئەو كەسانەی كە بیانەوێ جەنگ بكەن لەڕێی خوادا ئەبێ هەموو چەك‌و هۆی سەركەوتن بەكاربێنن پشت بە خوا ئەو كاتە ڕاستە پشتیان بە خوا بەسووە، ئەوەتا خوا كە فەرمان ئەدات بە پشت بەستن بەو، فەرمان ئەدات بە ئامادەكردنی هەر هێزو چەك‌و كەرەسەیەك كە لە تواناندا هەیە، بڕوادار لەسەریەتی بەو جۆرە ڕەفتار بكات، ئیتر سەرەنجام‌و بەرهەم هەر بەدەست خوایە‌و داوا ناكرێ لەم، هەرچۆن ببێ كاری بڕوادار هەر خێرە، ئیتر سەركەوێ یان تێدا بچێ لە پێناوی ئایینەكەیدا، هەرچۆنێ بێ‌بڕوا هەموو كاری هەر بەدەو دووچاری سزا ئەبێ ئیتر هەر لەلایەن خواوە یان لەسەر دەستی بەندەی خوادا، وەك ڕێنموونیمان ئەكات بەوە كە ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُل﴾ بڵێ: ﴿هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾ ئایا ناپاكەكان ئێوە چاوەڕوانی ئەكەن‌و بەتەمای شتێ هەن لە ئێمەوە كە بۆمان ببێ‌و بەسەرمان بێت، بێجگە لە یەكێ لە دوو شتە زۆر چاكەكان: سەركەوتن‌و زاڵبوونێك كە وتەو ئایینی خوامان پێ بەرز ببێتەوە، یان تێداچوون شەهید بوون لەڕێی خوادا؟

وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلۡ أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡۖ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ

---

﴿وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ﴾ ئێمە چاوەڕوانی ئەکەین و بەتەمای ئەوەین لەلایەن ئێوەوە ﴿أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ﴾ کە خوا دووچارتان بکات بە سزایەك لەلایەن خۆیەوە کە دەخلی ئێمەی تێدا نەبێ، یان دەستی ئێمەو لەسەر دەستی ئێمەدا، ﴿فَتَرَبَّصُوٓاْ﴾ کەواتە ئێوە چاوەڕوانی بکەن ﴿إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ﴾ بێگومان ئێمە لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕوانین، چارەنووس و دواڕۆژیش ئاشکرایە و خوا هەواڵی پێداوە کە ئەو ڕۆژی بەختەوەرییە هەر بۆ خۆپارێزەرو لە خوا ترسانە.

هێندێ لەو ناپاکانە ئەیانەویست بە فێڵ خۆیان قوتار بکەن لە دەرچوون بۆ ئەو سەفەرە بەم ڕەنگە ماڵ و سامان بدەن و بەوە بەشداری بکەن نەك بەلەش، ئینجا خوایش بەپەرچی دانەوەو ناپاکیەکەی دەرخستن بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا﴾ ماڵ بەخت بکەن بە پێخۆش بوون و ئارەزووی خۆتان، بەم ڕەنگە بتانەوێ بەوە تەقێ بکەن و خۆتانی پێ بشارنەوە، یا بە بێزاری و پێناخۆشی بەم ڕەنگە لە ترسا بەختی بکەن و بیدەن لە ترسی تۆڵەسەندن لێتان یان ترسی ئەوەی ناپاکیەکەتان دەرکەوێ و لەترس و ناچاریدا بیدەن و زۆرتان پێهاتبێ، لەسەر هەربار ﴿لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡۖ﴾ هەرگیز لێتان وەرگیرێ، هۆی وەرنەگرتنەکەشی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمًا فَٰسِقِينَ﴾ بەڕاستی ئێوە کۆمەڵ و دەستەیەکن کە لە سنووری بڕوا دەرچووین و سەکێشن، خوایش هەر لە خۆپارێزەران و لە خواترسانکردەوە وەرئەگرێ. ئینجا ئەو دەرچوون لە سنووری بڕواو سەرکێشییە ڕوون ئەکاتەوە لەگەڵ نەخشە کێشانی وێنەو شێوەی بەدی ناپاکەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ﴾ هیچ شتێ بەرگری ئەوانەی نەکردووە لەوەی کە ماڵ بەختکردن و خێرو خێراتیان وەرگیرێ،

﴿إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ٥٤﴾

---

﴿إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ﴾ بێجگە لەوەی ئەوانە بڕوایان نەهێناوە بە خواو بە فروستادەکەی ﴿وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ﴾ نوێژ ناکەن مەگەر لەکاتێکدا کە ئەوانە سست‌و تەمەڵن، واتە هەر بە سستی‌و تەمەڵی نوێژ ئەکەن، چونکە بڕوایان پێی نییەو بە ئەرکێکی قورسی ئەزانن. ئەو کارو کردەوە ڕواڵەتیانە کەلە بڕواو دڵەوە هەڵنەقوڵێ خوا نایەوێ‌و وەری ناگرێ ﴿وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ ماڵ بەخت ناکەن مەگەر لەکاتێکدا کە ئەوانە بێزارن‌و پێیان ناخۆشە، چونکە لەبەر خوا نایکەن‌و بە تەمای ئەجرو پاداشتی لای خوا نین، کەواتە بەباج‌و جەریمەیەکی دائەنێن کە بەناچاری ئەیدەن، ئینجا لێرەدا دوو پرسیار هەیە:

١- لە ئایەتەی پێشوودا وای نیشاندا کە ئەو ناپاکانە دوو بەش بووبن: بەشێکیان ماڵیان دابێ بە ئارەزووو خۆشحاڵی، بەشێ تریان بە پێ‌ناخۆشی، کەچی لەم ئایەتەدا دەق ئەڵێ بەسەر ئەوەدا کە هەر بە بێزاری‌و ناخۆشی ماڵیاندابێ؟ لەوەڵامدا ئەڵێن:

أ- ئەوانە بە تێکڕایی لەدڵەوە پێیان ناخۆش بووە ماڵ‌و سامان بدەن، بەڵام هێندێکیان لەبارێکەوە بە ئارەزووی خۆیان داویانە بەبێ داوا لێکردن لەبەر ڕووپامایی‌و کەشخە کردنیان لەبەر تەقێ‌و خۆنیشاندان بە موسڵمانێکی پاک‌و خاوێن یان لەبەر ئەوەی ئەوەیان بەلاوە باشترو ئاسان تر بووە لە بەشداری کردن لەوە غەزاو سەفەرە سەختەدا، بەشێ تریان لەترساو بە ناچاری داویانە وەك لەکاتی تەفسیری ئایەتەکە دەست نیشانمان بۆ کرد.

ب- مەبەست بە وشەی ﴿طَوۡعًا﴾ پێ‌خۆشحاڵی نییە بەڵکو مەبەست ئەوەیە بەبێ زۆر پێ هێنان نە لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) و نەلەلایەن سەرۆکەکانیانەوە مەبەست بە وتەی ﴿كَرۡهًا﴾ زۆر پێهێنان‌و ناچار کردنە وەك بەوە تەفسیر کراوەتەوە لەلایەن هێندێ لە زانایانەوە

مەبەست بە وتەی: ﴿أَنفِقُوا﴾ هەواڵدان نییە بە بەختكردنی ماڵو سمان بەڵكو مەبەست دڵنیا كردنە لەسەر وەرنەگرتنی خوا لێیان، واتە یەكسانە لەسەرتان و لەسەر هەربارو حاڵێ خوا لێتان وەرناگرێ، چونكە ئێوە بێبڕوان و مەرجی وەرگرتنی چاكە لای خوا بڕوایە ئەم یەكسان كردنە بە وێنەی یەكسانكردنە لەسەر دۆزەخیەكان كە ئەفەرموێ: ﴿اصبروا تصبروا سواء عليكم﴾ خۆتان بگرن یان خۆتان نەگرن یەكسانە لەسەرتان و سزاتان لەسەر لانابرێ. بەڕاستی ئەم وەڵامە لەدڵدا زۆر بەهێزو چەسپاوەو خوا خۆی باش ئەزانێ.

٢- لە ئایەتی پێشوودا یەك شتی كرد بەهۆی وەرنەگرتنی كردەوەكانیان، لەم ئایەتەدا سێ شت؟ لە وەڵامدا ئەڵێین:

أ- ئەو یەك شتە ئەم سیانی ئێرە ئەگرێتەوە، چونكە هەر چەند لە قورئاندا وتەی زوڵم و فیسق زۆر تر بۆ بێبڕوایی بەكار ئەهێنرێ، بەڵام لە ڕاستیدا وتەی(فسق)بریتییە لە یاخی بوون و دەرچوون لە فەرمان، ئەوەش هەموو گوناهێك ئەگرێتەوە كە بێبڕوایی یەكەمو سەر دەستەیەو بەدترینە، كەواتە سیانەكەی ئایەتی دووەم وەك ڕاڤەو ڕوون كردنەوەیە بۆ یەكەكەی ئایەتی پێشوو، وەك لەسەرەتای تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەست نیشان هەیە بۆ ئەوە.

ب- ئەگونجێ بۆ شتێ چەند نیشانەو هۆیەك ببێ لەهێندێ كاتدا باسی هەموو نیشانەو هۆكان بكرێ و لە هێندێ كاتدا هەر باسی بەهێزترین بكرێ، بەم ڕەنگە دڵت بۆیان بڕوات و بەباشیان دابنێی، واتە لێرەدا نیشانەو هۆی وەرنەگرتنی كردە بەبێ بێبڕواییەو سستی و تەمەڵی لەنوێژو بێزاری و پێ ناخۆشی خێرو چاكە، لەئایەتی پێشوودا هەر باسی یەك شتی كردووە، ئەگەر بڵێین: مەبەست بە فیسق بێبڕواییە.

ئەو ناپاكانە كە ماڵیان ئەدا خاوەن سامان و ماڵ و ئەولادو خاوەن ڕێزبوون لەناو گەل و كۆمەڵەكەیاندا، بەڵام هەموو ئەوشتانە هیچ نین و بێ نرخن لای خوا، كەواتە ئەبێ لای پێغەمبەریش هەر بێنرخ بن(ﷺ) بێگومان بڕوادارانی ڕاستەقینەش هەر ئەبێ بەو چاوە سەرنجی ئەو شتانە بدەن، كەواتە ئەو شتانە چاكەو بەهرەیەك نین كە خوا ڕشتبێ بەسەر ئەو بێبڕوا ناپاكانەدا بۆ ئەوەی نۆشی گیانیان بێت و بەخۆشی بژین پێی، بەڵكو خوا ئەیدا بەوانە بۆ تاقیكردنەوە و بۆ سزادانیان،

فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا أَوۡ مَغَٰرَٰتٍ أَوۡ مُدَّخَلٗا لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ ﴿٥٧﴾

---

وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ﴾ کەواتە با نەماڵو سامانیانو نە ئەولادیان سەرنجت ڕانەکێشێو سەرت سوڕ نەمێنێ بۆ وێنە: هەرکام لەخۆرو ئاگرو کارەباو بزووتنەوە نیشانەو هۆی گەرمییەو ئەگونجێ باسی هەر یەکێکیان بکرێ وەك ئەگونجێ باسی هەموویان بکرێ، هەڵسن بە سوپاسو مافی ئەو چاکەو بەهرەیە بەو جۆرو شێوەی کە پەروەردگار ئەیەوێ، ئەو کاتە ئەوان دڵشادو بە ئارامن بەو بەهرەو بەخشینە، ئەزانن دواڕۆژو چارەنووسی ئەو چاکەو بەهرەیە چاکە، دڵشادو مژدە بەخشن بەوەی کە ئەیەن لە ڕێی خوادا چونکە بە تەمای ئومێدی ئەجرو پاداشتەکەن لای خوا، هەروەها خۆگرو دڵئارامن کاتێ کە زیانبار بنو ئەو ماڵو ئەولادەیان لە دەست بچێ، چونکە ئەزانن ئەوانە زایە نابنو لە ڕۆژی دواییدا ئەجرو پاداشتیان هەیە، ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ بەڵام هەر ئەو ماڵو ئەولادە کە خوا ئەیدات بۆ هێندێکی تر ئەبن بە مایەی زیانو سزاو ئازار هەر لەم دنیایەدا وەك بە چاو ئەبینرێ، ئەوانە هەرگیز تێر خواردنیان بۆ نیەو هەتا زۆرتریان هەبێ هەوڵو هەڵپەیان بەتین تر ئەبێ، بە هەر زیانێکی سەرو ماڵیی دنیایان لێ دێتە یەك، ئیتر با بوەستێ سزای ڕۆژی دوایی کە دووچاریان ئەبێ لەسەر ئەو ماڵو ئەولادەیان کە بەکاریان هێنان لە تاوانو خراپەکاریدا، ئەو بەندە خراپانە خوا ئەیانناسێو ئەزانێ کە بە ئارەزووو خواهیشی خۆیان هەمیشەییو بەردەوام ئەبن لەسەر ئەو بەدییو گومڕاییەی کە وان لەسەرێ، کەواتە ماڵو ئەولادەکەیان سوور ترو بەتین تریان

ئەكات لەسەر ئەو بارو ڕێگە چەوتەی کە داویانەتە بەر تا لەسەر ئەو بارە ئەمرن و بەرەو دۆزەخ ئەڕۆن، خوا پەنامان بدات.

ئەو ناپاکانە بە ڕواڵەت ئەچوونە ڕیزی موسڵمانان، بەڵام نەك بە بڕواو عەقیدەوە، بەڵکو لەبەر ترس و تەقێ، لەبەر ئەوەی بەشدار بن لە هەر بەخشین و دەستکەوتێك کە بۆ موسڵمانەکان ئەبوو، ئینجا سوێندیان ئەخوارد کە بە ڕاستی موسڵمانن، جا خوا لەم سوورەتەدا بێئابڕووی کردن و دەری خستن بۆ هەمووان و فەرمووی: ﴿وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ﴾ سوێند ئەخۆن بە خوا کە بێگومان ئەوان لە ئێوەن و موسڵمانن لە کاتێکدا ﴿وَمَا هُم مِّنكُمۡ﴾ کە ئەوان لە ئێوە نین، ﴿وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە دەستەو کۆمەڵێکن ئەترسن، واتە لە ترس و ناچاریدا دێن و تێکەڵیتان ئەکەن، ئەوانە بە جۆرێکن ﴿لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا أَوۡ مَغَٰرَٰتٍ أَوۡ مُدَّخَلٗا﴾ ئەو قسەو سوێندانە ئەخۆن ئەگەر قەڵاو پەناگایەکیان دەستکەوێ، یان غارو ئەشکەوتانێ، یان کون و نەفەقێك لە زەویدا، ئەگەر هەرکام لەوانەیان دەستکەوێ ﴿لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ﴾ ئەچن بۆی و ڕووی تێ ئەکەن لە کاتێکدا ﴿وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ﴾ ئەوانە چەسپانی ئەکەن و هیچ شتێ نایانگێڕێتەوە وەك وڵاخی یاخی و سەرکێش، واتە ئەو ناپاکانە لەبەر ئەوەی زۆر بێزارن لە جەنگکردن و ژیان و تێکەڵی ئێوە، لەبەرئەوەی زۆر مەترسی ئەکەن لە دەرکەوتنی ناپاکیەکەیان، ئاواتەخوازن بۆ ئەوەی جێگاو شوێنێکیان دەستکەوێ بچن بۆی بە چەسپانی و ڕائەکەن بۆی با ئەو جێگەیە تەنگ و تاریك و ناخۆشی بێت، بە ڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ نەخشەی شت بکێشێ، ئەم دەستەواژەیە شێوەیەك نیشان ئەدات ئێجگار بەهێزو بەتینەو سەرسووڕهێنەرە بۆ شێوەی بیم و ترس و ڕووپامایی و ناپاکیی ئەو ناپاکانە، خوا پەنامان بدات، ئامین.

وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾

ئينجا هەروەها ئەڕوات لەسەریانو نیازو وشەو وتەی بەدیان ئەخات، کە خۆیان ئەیانویست دەرنەکەون، بەڵام نەیان توانی چونکە خوا هەواڵی لێدان، هێندێ لەو وتە بۆگەنو بەدەیان ئەوەبوو کە ڕەخنەو تەشەریان ئەدا لە دابەشکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەو خێرو صەدەقەیانەی کە ئەکەوێتە ژێر دەستی، کە گوایا دادی بەکار نەهێناوە لە کاتێکدا کە دادو داد پەروەریو ڕەوشتی پاکو شیرین هەر لای ئەو بووە بە تێرو تەسەلی، یەکێکی تر لە وتە بەدەکانیان ئەمە بوو: پێغەمبەر(ﷺ): گوێ لە مشتەو گوێ لە هەموو قسەیەک ئەگرێو هەرچی بگوترێ پێی باوەڕی پێ ئەکات، لەکاتێکدا کە ئەو پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم ژیرو ڕۆشن بیرو لێزانو کاردروست بووە لای دوژمنیش و جای دۆست، هێندێ لەو ناپاکانە قسەی بەدو بۆگەنی بەدەم دەهاتو بیشارێتەوە ئینجا کاتێ کە دەرکەوت بە سوێندو پاکانەی درۆ خۆیان لێ بەری ئەکرد، هێندێ وایان بوو دەمی خۆی ئەگرێتەوە لەوەی کەلە دڵیدا هەبوو، ئەترسا لەوەی قورئان بێتە خوارەوە ناپاکیەکەیان ئاشکرا بکات، وەک لەم ئایەتانەی داهاتوودا ئەو شتانەمان بۆ دەرئەخات وئەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ هێندێ لەو ناپاکانە کەسێکە کە ڕەخنەت لێ ئەگرێو لەکەدارت ئەکات لەدابەشکردنی خێرو صەدەقەکاندا، پڕوپاگەندە ئەکات بەمەی تۆ فەرقو چون ئەکەیتو لایەنگری ئەکەیت لە دابەشکردنەکەدا، ئەوانە مەبەستیان ڕاستی نییەو ئاین هاوار ناکەن، بەڵکو ئەوانە بۆ خۆیان هاوار ئەکەنو ئەگەر خۆیان بەشدار بکرێن ئیتر گوێیان لە هیچکەس نییە وەک ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە لەو خێرو صەدەقەیان پێ بدرێ بەشدار بکرێن ڕازی ئەبنو گوێیان لە هیچو لە هیچ کەسێکی تر نییە ﴿وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ﴾ ئەگەر پێیان نەدرێو بەشدار نەکرێن لەو خێرو صەدەقانەدا ﴿إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾ ئیتر دەست بەجێ خەشمناکو ناڕازی ئەبن، چەند ڕیوایەتێک هاتووە لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا:(بوخاریو نەسائی) لە(ئەبو سەعیدی خودری)یەوە ئەگێڕنەوە–خوا لێی ڕازی بێ–کە ئەفەرموێ: جارێک پێغەمبەر(ﷺ) خەریکی دابەشکردنێک بوو لەو کاتەدا کابرایەکی

تەمیمی بەناوی(ذوالخویصر) هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا داد بەکار بێنە، ئەویش فەرمووی: هاوار بۆتۆ، مردن بۆ تۆ، ئەگەر من داد بەکار نەهێنم ئەی کێ بەکاری بێنێ؟ ئینجا عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: ئیزنم بدە با بدەم لە گەردنی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: لێی گەڕێ، ئەمە چەند هاوەڵێکی هەیە هەرکام لەئێوە نوێژەکەی خۆی بەکەم و کوڕ دائەنێ لەچاو نوێژەکەی ئەواندا، ڕۆژووەکەی بەکەم دائەنێ لەچاو ڕۆژووەکەی ئەواندا، لە ئایین دەرئەچن تیر لە کەوان دەرئەچێ، ئەبو سەعید ئەفەرموێ: ئەم ئایەتانە لەوانەدا هاتە خوارەوە، لە(ئیبن و مسعود)ەوە ڕیوایەتکراوە کە ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتەکانی حونەینی دابەشکرد گوێم لە پیاوێك بوو گوتی: ئەمە دابەشکردنێکە لەبەر خوا نەکراوە و نیازی ڕەزامەندی خوای لێ نەکراوە، ئینجا منیش هاتمە خزمەتی و ئەو قسەم بۆ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە موسا بەڕاستی ئازار دراوە بە زۆر تر لەوەو ئەویش خۆی گرتووە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە،(ئیبن و جەریر) لە(داودی کوڕی ئەبو عاسم)ەوە ئەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: خێرو صەدەقەیەکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دابەشی کرد بەم لاو ئەولادا تەواو بوو، پیاوێك لە ئەنساری ئەوەی دی و ئینجا گوتی: ئەمە داد نییە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.(قتادە) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا باس ئەکات کە پیاوێکی کۆچەر هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتێکدا کە خەریکە بوو ئەندازێك ئاڵتوون و زیوی دابەش ئەکرد، ئەو پیاوە گوتی: ئەی محمد خوا فەرمانی پێداوی داد بەکار بێنی تۆ دادت بەکار نەهێنا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: مردن و تیاچوون بۆ تۆ ئایا کێ داد بەکار ئەهێنێ بەسەر تۆوە لەپاش من ئەگەر داد بەکار نەهێنم؟ بەهەر حاڵ و لەسەر هەر بار ئەوا قورئان بەڕوونی ئەفەرموێ: ئەو وتە کە وتەی هێندێکە لە ناپاکان و هاواریان بۆ داد نەکردووە، بەڵکو داخ و خەشمەکەیان لەسەر خۆیان بووە و بۆ بەشی خۆیان هاواریان لێ هەڵساوە، ئەو وتە بەدەیان نیشانە و بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ناپاکیەکەیان، چونکە هەرکەس بڕوای بووبێ بەم ئایینە بەهیچ ڕەنگ گومانی نەبووە لە خوو ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بووە کە هەر لە گەنجییەوە ناسراوو بەناوبانگ بووە بەوەی کە ڕاست و پاك بووە، ج جای پاش ئەوەی کە خوا کردی بە پێغەمبەرو خاوەن پەیامی گشتی بۆ هەموو جیهانیان، داد بەشێك بووە لە سیفەت و نیشانەی بڕواداران چ جای پێغەمبەرەکەیان(ﷺ).

﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ

ئینجا بە بۆنەی باسی وتارو کرداری ئەو ناپاکانەوە نەخشەی ڕێگەی ڕاست ئەکێشێ بۆ بڕواداران کە هەر ئەوە شیاوو شایستەیە بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ ئەگەر ئەوانە ڕازی بوونایە بەوەی خواو فروستادەکەی پێی دابن، ﴿وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ﴾ بیانگوتایە: خوامان بەسە بۆ هەموو کات و بەسەرهاتمان، ﴿سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ﴾ لەمەو پاش خوا پێمان ئەبەخشێ لە فەزڵو بەخشایشو میهرەبانی خۆی، فروستادەکەشی پێمان ئەبەخشێ لەو دەستکەوتو خێرو سەدەقانەی کە دێتە بەر دەستی ﴿ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴾ بە ڕاستی ئێمە هەر بۆلای خوا مەیلو سۆزو پەرۆشمان هەیە، ئەگەر ئەوانە بەو جۆرە بوونایە، ئەگەر ئەوانە ڕازی بوونایە بە بەشو بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی، قسەو گفتوگۆو ئومێدو چاوەڕوانییان بەو جۆرە بووایە کە گوترا بە ڕاستی هەر ئەوە باش بوو بۆیانو ئەوە مایەی بەختەوەریو شادومانییان ئەبوو، بەه بەه لەو ئەدەبە شیرینە: ئەدەبی دڵو دەروونو ئەدەبی گوتنو زمانو ئەدەبی هەستو بڕوا، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو هەستو ئەدەبە پیرۆزەدا لەگەڵ خواو پێغەمبەری ئازیزدا(ﷺ) لەپاش ئەوەی ڕێنموونی کرد بۆ ئەو ئەدەبەی کە شایانو شایستەیە بۆ خواو فروستادەکەی(ﷺ) کە بەکاری بێنن بە خۆشیو ڕەزامەندیو ئەوپەڕی ملکەچییەوە ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە کارو بڕیارەکە لە دابەشکردنو هەر شتێکی تردا لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) نیە، بەڵکو کارو فەرمانی خوایە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانبەرو بەجێهێنەری فەرمانو بڕیاری خوایە، ئەو سەدەقە واتە زەکات بە فەرمانی خواو بڕیاری خوا وەرئەگیرێ لە سامانداو ئەگێڕرێتەوە بۆ سەر بێنەواو بێدەسەڵاتەکان، ئەدرێ بە چەند دەستەو تاقمێکی دیاری کراو لەلایەن خواوە نەخراوەتە دەستی هیچ کەسێکی تر تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ)، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ﴾ سەدەقەکان واتە زەکات بە هەموو جۆرەکانیەوە: ئاڵتونو زیو، بازرگانی، وڵاخو مەڕو ماڵات، کشتوکاڵ، کانو مەعدەن، غەزنەی کۆنو شوشی ئاڵتونو زیو کە هێندێ جار ئەدۆزرێتەوە لە

ناو زەوی داو کەس نازانێ لە کێ بەجێ ماوە، ئەو هەموو جۆرە زەکاتە هەر بۆ ئەمانەن کە باس ئەکرێن:

١- ﴿لِلْفُقَرَآءِ﴾ بۆ بێنەواکان.

٢- ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ بۆ هەژارەکان.

هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم دوو دەستەیە هەر یەکن و جیاوازییان لە سیفەت و حاڵەتدا هەیە: بەم ڕەنگە یەکەم بێنەوایە کە سواڵ ئەکات و بێنەواییەکەی دەرئەخات، دووەم بە پێچەوانەی ئەوەوە، بەڵام کۆڕو کۆمەڵی زانایان لەسەر ئەوەن کە هەرکام دەستەیەکی جیاوازە، بێگومان بەڵگەو ڕابەری ئەمان زۆرو بەهێزە، کەواتە هەر ئەم ڕایە شایانە بە وەرگرتن، ئینجا لەسەر ڕای دووەم دووبەرەکی هەیە: ئایا کامیان بێنەوا ترە؟(ئیمامی حەنەفی) دووەمی بە لاوە بێنەوا ترە،(ئیمامی شافیعی)شێوە یەکەمی بە بێنەوا تر داناوە، لە هەردوو لاوە بەڵگەو نیشانە ئەهێننەوە، بەڵام بە ڕاستی ڕای ئیمامی شافیعی بەهێز ترە.

١- ﴿وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا﴾ ئەوانەی کە لەلایەن دەوڵەتەوە دیاریی کراون بەکار بەدەست و فەرماندار بەسەر زەکاتەکانەوە بۆ کۆکردنەوەو پارێزگاری و بەخێو کردنیان، کەواتە شوان و پاسەوان و کاتب و نووسەرانیش هەر لەم دەستەن و یەك لەسەر هەشتی زەکاتەکە بۆ ئەوانە ئەبێ هەرچەند داراو دەوڵەمەندین، بە مەرجێ موسڵمان بن، بەڵام ئەگەر بێنەوابن چاکترە وەك لە کتێبەکانی فیقهدا بەدرێژیی ئەو شتانە باسکراون.

٢- ﴿وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ ئەوانەی کە دڵیاندا ئەهێنرێ بۆ خۆش ویستنی ئیسلام و جێگیر بوونی ئیسلام لەدڵیان بۆ بەرژەوەندی ئیسلام لە هەر ڕوویەکەوە، زانایان ئەفەرموون: ئەوانە شەش بەشن:

أ- کەسانێ کە سەرۆك بن لەناو موسڵمانانداو وێنەو هاوسەریان هەبێ لەناو بێبڕوایاندا، کە ئەگەر ئەمانەی موسڵمانن بەشیان بدرێ لەوانەیەو ئومێدی وا بێ کە بێبڕواکان موسڵمان ببن.

أ- ئەوانەی کە تازە موسڵمان بن یان لاواز بن لەبڕواداو بەڵام فەرمانڕەوان لەناو گەلەکەیاندا، چاوەڕوانی بکرێ کە بەو بەشدار کردنە بڕوایان بەهێزبێ و ببن بەدڵسۆزی ئیسلام و تێکۆشەر بۆی.

ت- ئەوانەی کەوان بەسەر سنووری وڵاتەوە بەشدار ئەکرێن تا بەهێز ترو سوور ترین لە پاسەوانەی و بەرگری بۆ وڵات، یان ئەوانە کە دەوڵەتە بێبڕواکان هەوڵیان لەگەڵ ئەدەن و شتیان پێئەدەن بۆ ئەوەی ڕایانکێشن بۆلای خۆیان، ئەمانە بەشدار ئەکرێن تا ئەو دوژمنانە نەتوانن کاریان تێبکەن.

ب- ئەوانەی لە موسڵمانان کە دەسەڵاتدارو قسە ڕەوان و ئەتوانن بەبێ جەنگ و کوشتار سەر شۆڕ بکەن بەوانەی کە سەرپێچی ئەکەن لە زەکاتدان، ئەمانەش بەشدار ئەکرێن لەبەر ئەو بەرژەوەندییە.

ت- ئەوانەی لەبێبڕواکان کە ئومێدی موسڵمان بوونیان بکرێ بەهۆی ئەو بەشدار کردنەوە.

پ- ئەوانەی لە بێبڕوایان کە مەترسی ئەکرێ لەشەڕو خراپەیان و ئومێد وابێ بەو بەشدار کردنە بەرگریی بکرێن، بۆ ئەمانەی کە باسکران وێنەو نموونە هەیە کە کراون بە بەڵگەو بە پێویستم نەزانی زیاد لەمە درێژە پێدان، بەس ئەوە هەیە ئایا بەشی ئەم دەستەیە دوایی هات بەسەرکەوتن و هێزی موسڵمانان وەك زۆربە لەسەر ئەوەن یان هەر ماوە تا ڕۆژی دوایی وەك هێندێ ئەفەرموون. بەڕاستی ئەم ڕای دووەمە لەدڵدا بەهێز ترو جێگیر ترە، خوا خۆی ئەزانێ.

٣- ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾ بۆ بەختکردن و خەرج کردن لەئازاد کردنی بەندەو کۆیلەکاندا، ئیتر بۆ کۆمەك کردنی ئەو بەندەیانەی کە لەگەڵ خاوەنەکانیاندا یەك ئەکەون بۆ کڕینی خۆیان لێیان بە چەند ماڵ و پولێك وەك زۆربەی زانایان ئەفەرموون یان کڕینیان لە خاوەنەکانیان و ئینجا کردنیان وەك دەستەیەکی تر ئەفەرموون. یان بۆ هەردوو جۆرەکە وەك هێندێ ئەفەرموون و بەڕاستی ڕووکەش و ڕواڵەتی ئایەتەکەش وا نیشان ئەدات، بێگومان ئەمەش بۆ کاتێك بووە کە ڕژێمی بەندەیی و کۆیلەیی لە جیهاندا هەبوو، کەلەو کاتەدا پێویستە ئیسلام بەناچاری ئەو ڕژێمە بەکار بێنێ بۆ کردەوە بە وێنەی کردەوەی دوژمن(المعاملة بالمثل) کە ئەوەش شتێکی زۆر ڕێك و ڕەوایە، ئیسلام

یەك لەسەر هەشتی زەكاتی تەرخانكرد بۆ بەرگری ئەو ڕژێمە بۆگەنەی كە زۆر لە كۆنەوە كەوتە ناو ئادەمی لە هەموو چەرخ و سەردەمە نەفامیەكاندا، لە هەموو جیهاندا بوو بەشتێكی ڕاست و ڕەوا بەبێ سەر لێكردنەوە، ئیسلام هات قاپی كردەوە و چەند ڕێگەیەكی دامێنا بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە، یەكێ لەو ڕێگەیانە تەرخان كردنی ئەم یەك لەسەر هەشتەبوو كە تەنیا ئەمە بەس بوو، چونكە ئەو ئەندازەیە ئەوەندە زۆر بوو بەندەی پێ ئازاد ئەكرا بە هەر قیمەت و نرخێكی بوایە!!

لە چەند سورەتێك لەم تەفسیرەدا كەلەپێش ئەم سوورەتەدا تەفسیرم كردبوو، وەك سوورەتی(المؤمنون، نور، محمد) و چەند شوێنێكی تر، لەو سوورەت و شوێنانەدا ئەندازێك بە درێژیی ڕاو بڕیاری ئیسلامم باس سەبارەت بەو ڕژێمە بەدە، لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی لێرەدا ئەو درێژەیە بدەم بەباسەكە. دیارە نەمانی ئەو ڕژێمە ئەم بەشە بگەڕێتەوە بۆ نادارایی گشتی دەوڵەتی ئیسلام و كاربەدەستی موسڵمانان ئەزانن لە چیدا بەكاری ئەهێنن، لەڕاستیدا لەهەر شتێكدا بەكاری بێنن هەر ئەگەڕێنەوە بۆ ئازاد كردن، چونكە ئیسلام هاتووە بۆ ئازاد كردنی بەندەیانی خوا لە هەر جۆرە بەندەیی یەك بێجگە لە بەندەیی خوا!

٦- ﴿وَٱلۡغَٰرِمِينَ﴾ زەكات و صەدەقەكان بۆ قەرزارو تێك شكاوە كانیشە، بەمەرجێك قەرزو تێك شكانەكەیان لە ڕێگای گوناهەوە نەبووبێ و لەڕێگەی ئیسراف و زیادە ڕەوی و نەفامییەوە نەبووبێ، مەگەر زانرابێ كە گوناهكارە كە گەڕاوەتەوە و كۆتایی هێناوە نەفامەكە وازی هێناوە لە ئیسراف و زیادە ڕەوی، ئەم دوو جۆرە قەرزارو تێك شكاوەش بەشدار ئەكرێن لەم یەك لەسەر هەشتەدا وەك زنایان ئەفەرموون، ئینجا ئەو قەرزدارەی كەلە ڕێگای یەك خشتنی موسڵمانان و كوژاندنەوەی ئاژاوەیاندا قەرزار بووبێ، ئەم قەرزدارە بەشدار ئەكرێ با دارا و دەوڵەمەندیش بێت.

ئیسلام بەوجۆرەدەستی قەرزاروشكاوان ئەگرێ وچارەسەری دەردەكەیان ئەكات،نەك وەك شارستانێتی نەفامێتی-بەتایبەتی نەفامێتی تازەی ئێستا-كەهیچ گوێی نییەلەوجۆرە چاكانەوبەدەم هیچ قەرزاروتێك شكاوێكەوە،یان ئەوپەڕی چارەسەرەكەی ئەوەیەجاڕی نابووتی قەرزارە كە ئەدات كەس شكاتی لێنەكات وئەویش بەسەركزی وڕسوایی لەماڵی خۆیدا بكەوێ!

٤- ﴿وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ زەکاتەکان بەخت ئەکرێن بە ڕێی خوادا، لەبەر ئەوەی زۆرتر لە قورئاندا جەنگو تێکۆشان بەستراوەو هاوسەر کراوە بە وتەی: ﴿وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ەوە لە ڕاستیدا ئیسلام بە جەنگو فیداکاریو ڕاگیرو بەدی دێت لە ژیانو جیهاندا، لەبەر ئەوە زاناکانی مەزهەبەکان لەسەر ئەوەن کە مەبەست بەم دەستەو تاقمە جەنگ کەرانو فیداکارانە کەگیانی خۆیانیان خستووەتە سەر دەستو هەمیشە ئامادەن بۆ گیان بەختکردن لە ڕێگەی خوادا، هەرچەند ڕووکەشو ڕواڵەتی وتەی ﴿وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ گشتییە بۆ هەر شتێ کە بەرژەوەندی ئیسلامی تێدا بێت وەك دەستەیەك لەزانایان لەسەر ئەم شێوە گشتییەن، کەواتە فەراهەم هێنانی چاپخانەو نوسینگە ئیسلامییەکانو ئامادەکردنو دیاریی کردن بە پێی ویست بۆ مامۆستاو فێر کەرانو نوسەرانی ئیسلامو هەروەها ئەم بەشی حەوتەمە پێك ئەهێنرێن، لەسەر هەر بار بێگومان جەنگ کەرانو فیداکارانی ئیسلام یەکەمو سەر دەستەن کە ئەوان بێنو وەستا بن ئەبێ بەشە لەواندا بەخت بکرێ، ئەم مەسەلەیە بەدرێژیی لە کتێبەکانی فیقهو تەفسیردا باسکراوەو هەرکەس ئەیەوێ با سەرنجی ئەو کتێبانە بدات.

٥- ﴿وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ ئەو زەکاتانە ئەدرێن بە کەسێکی ڕێبوارو سەفەری کەدەستی بڕابێ لەماڵو وڵاتی خۆیان نیازی سەفەری ببێو دەسەڵاتی نەێ بۆ چوونی ئەو سەفەرە، ئەم کەسە بەشدار ئەکرێ بە پێی پێویست کە ئەگاتەوە شوێنی خۆیان دەستی ئەگاتە ماڵو سامانی خۆی، ئەم کەسە بەشدارە هەرچەند لە وڵاتو شوێنی خۆیدا سامانداروو دەوڵەمەند بێ هەر بەشدار ئەکرێ، بەڵام مەرجی سەفەرەکەی هیچ نەبێ گوناه نەبێ، بەڵام ئەگەر بۆ خۆشیو ڕابواردن بێت ئەوە بەشدار ناکرێ بەلای هێندێ لەزانایانەوە بەڕاستیش ئەم ڕایە بەهێزە لە دڵدا، چونکە لە ئیسلامدا ڕێگە نییە بۆ بەختکردنی ماڵو بەفیڕۆ دانی بەبێ هودە، لێرەدا با بوەستین بەملکەچیو سوپاسەوە لەبەر دەم عەزیزماندا کە چۆن چارەسەری هەموو دەردێکی هێناوەو لە ئیسلامدا هیچ داماو پەك کەوتوو نابێ، بابیر بکەینەوە کە چۆن یەك لەسەر هەشتی زەکاتی تەرخان کردووە بۆ

ئەم مەبەستەو ئەبێ دەوڵەتی ئیسلام ئەم بەشە ئامادەو پارێزگاری بکات تا لە هیچ وڵاتێکدا داماوو دەستەپاچە نەبن و بە ئاسانی فریایان کەون، بەتایبەتی لەم چەرخەدا کە بە ئاسانی بە بروسکەیەك ئەوەی پێویستە ئەخرێتە دەستی ئەو داماوە!! خۆشتر لە هەموو شتێ ئەوەیە کە ئەم هەموو سامانە دیاریی کراوە بۆ ئەو چارەسەرانەی کە باسکران، بەبێ ئەوەی هیچ منەت و لارە ملێیەکی تێدا بێت، بەڵکو بە هەموو ئازادیی و سەربەستیەکەوە، ئەوانەی کە دیاریی کراون بەش و مافی خۆیان وەرئەگرن بە ماڵ و ماڵی خۆیان و خوا پێی داون وەك خۆیان بە ئارەقی ناوچاو پەیدایان کردبێ، ئەوەتا لە پاش دیاریی کردنی ماف و خاوەن مافەکان ئەفەرموێ: ﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾ واتە ئەو زەکاتانە بۆ ئەوانەیە کەباسکران لەکاتێکدا کە فەرزو پێویست کراون لەلایەن خواوە، یان خوا ئەو زەکاتانەی فەرزو پێویستی کردووە بە فەرزو پێویست کردن لەلایەن خۆیەوە کەناوی( اللە)یە. کەواتە بەدەست کەسێکی تر نییە تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) بۆ هیچکەس نییە هیچ ڕاو بڕیارێکی تێدا بدات، بەم وتە پیرۆزە دەمی ناپاك و نەفامەکانی ئەو چەرخەی بەست و دەم کوتی کردن لەوەی ڕەخنەو تەشەر بدەن لە دابەش کردنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هەرچۆنێ دەم کوتی نەفام و نەزانەکانی ئەم چەرخەی کرد لەوەی لەبەر خۆیانەوە، وەك کەسانێکی تادار وڕێنە ئەکەن و ڕەخنەئەگرن و تەشەر بەمەی ڕژێمێکی سواڵ کردن و دەست پان کردنەوەیە. نەخێر ئەی نەفامەکان ڕژێمێکی بەرزو بڵندەو پێویست کراوە کە بەندەکانی خوا عیبادەت و خوا پەرستی پێبکەن، پێویستی کردووە تا دڵ و دەروونی پێ پاك بکاتەوە لە چرووکی و چاوبرسێتی، بۆئەوەی ببێ بە هۆی پەیوەندی بەزەیی و میهرەبانی و دەستە بەرەیی ئەندامانی ئوممەت، کە ژیان و مەردایەتی و مرۆڤایەتی پێ برازێنێتەوە، تیماری زامەکانی کۆمەڵایەتی پێبکات، یەکێتی و دەستە بەرەیی پێ بەهێزو دامەزراو بکات، لە هەمان کاتدا نیشانەو دروشمی خواپەرستییەکە دڵی بەندە ئەبەستێتەوەو پەیوەستی ئەکات بە پەروەردگاریەوە هەرچۆنێ هۆی پەیوەستیەکی بەهێزە لەنێوان ئەندامانی گەلدا،

﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا ئەوپەڕی ڕادە زانای کاردروستەو هەموو بڕیارو کارو فەرمانی بەپێی ئەو زانین و لێزانی و کاردروستییە هاتووە، زۆر جێگەی سەر سەڕمانە کە ئەو نافامانە ئەم هەموو خەرج و باجە ئەبینن کە ڕژێمەکانی نەفامی پێویستیانکردووەو ئەیکەن، لە چەند بارو ڕوویەکەوە، زۆر تر هەژارو بێنەیانی تێدا زیانیار ئەبێ، ئەوە ئەبینن و هیچ ڕەخنە ناگرن، بەڵام زەکات بە ڕادەو ڕێژەی یەك لەسەر دە یان یەك لەسەر بیست یان یەك لەسەر ژل وەرئەگیرێ لە داراو دەوڵەمەندان و ئەدرێتەوە بە هەژارو بێنەواکان. ئەو نەفامانە سەر لەشتی وا پیرۆز ئەکەنەوەو دەمبازی تێدا ئەکەن، نازانن لەباتی ئەو هەموو باج و ستەمە دەوڵەتی ئیسلام زەکات ئەسێنێ و پیت و فەڕەکەش هەر بۆ هەژارو بێ دەسەڵاتانە، ئەبێ هەرکەس چاوی دڵی کوێر نەبێ و بێبەش نەبێ لە هەموو فام و ژیریی یەك چۆن سەر بکاتەوە لەشتی واو چەنە بازی تێدا بکات؟!! ئەبێ چۆن سەر بکاتەوە لەوەو بەڕژێمی سواڵکەری و دەست پان کردنەوە دابنێ؟! ئەو نەفامانە نازانن کە دەوڵەت ئەیسێنێ و هەر ئەوانەی سەرپێچی لێ بکەن دەوڵەت بەزۆر لێیان ئەسێنێ و جەنگیان لەگەڵ ئەکات. بێگومان ژیان لە ڕژێمی ئیسلامدا لەسەر کارو کردەوە ڕاگیرە، پێویستە لەسەر دەوڵەتی ئیسلام کار فەراهەم بێنێ بۆ هەرکەس کە توانا بێت، ئەوەی پێویستە بۆ پێکهێنانی کارو کردەوەکان ئامادەی بکات بۆ کارگەران، بۆ توانا نییە بەشدار بێت لە زەکاتدا، چونکە زەکات زەریبەو مافێکە دانراوە لەسەر تواناکان بۆ دەستەپاچەو پەك کەوتووەکان، دەوڵەتی ئیسلام ڕێك و پێکی ئەکات و ئەیگرێتە ژێر دەست لە کۆکردنەوەو دابەش کردندا بە پێی بڕیارو فەرمانی خوا،(ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمزی) حەدیسێك ئەهێنن لە(ئیبن و عومەر)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: زەکات حەڵاڵ نییە بۆ دەوڵەمەندو بۆ کەسێك کە ژیرو لەش ساغ و ڕێك و پێك بێت، هەروەها حەدیسێك ئەهێنن لە(عبدالله ی کوڕی عەدی)یەوەکە دوو پیاو چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) داوای زەکاتیان لێکرد، ئەویش چاوی بۆ گێڕان و لێیان ورد بوویەوەو دیتی دوو پیاوی ساغ و لێهاتوون، ئینجا پێی

فەرموون: ئەگەر ئەتانەوێ پێتان ئەدەم. دەوڵەمەندو توانای کارگەر ماف نییە لە زەکاتدا، زەکاتو بەش پەلێکە لە ڕژێمی دەستەبەرەیی(تکافل)ی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا، کە ئەو ڕژێمە پانو فراوانترە لە زەکاتو زەکات بەشو پەلێکەیەتی، زەکات دەر نابێ خۆی بە خاوەنی ئەو بەشە زەکاتە بزانێ، بەڵکو ئەبێ خۆی بە هاوبەش دابنێو خۆی بپارێزێ لە خواردنو بەکارهێنانی ئەو بەشە زەکاتە، تا ئەو ڕادەی ئەگەر بمرێ نابێ کفنو دفن بکرێ لەو ماڵەی کە زەکاتی تێکەڵە، پێش ئەوەی بەشە زەکاتەکەی لێ جوێ بکرێتەوە!

ئینجا دێتە سەر باسی هێندێك لە وتارو کرداری بەدی ئەو ناپاکانە، ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ ﴾ لەو ناپاکانەدایە کەسانێ کە ئازاری دڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئەدەن ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ﴾ ئەڵێن: ئەو گوێ لە مشتەو گوێ بۆ هەموو قسەیەك ئەگرێو هەر قسەیەکی بۆ بکرێ وەری ئەگرێ، ئەم وتە بەدەی ئەوانە دووبارە هەڵئەگرێ، وەك ڕیوایەتیش هاتووە بۆ هەر دوو بارەکە:

١- مەبەستیان ئەوەبوو: مەترسن لەوەی کە بەهۆی وتارو کرداری بەدمانەوە ئێمە دەرخات بۆ خەڵکیو ئابڕوومان بەرێ، چونکە ئەچین بۆلایو سوێندو پاکانە ئەکەین کە ئێمە دڵسۆزو پاکینو ئەویش بڕوامان پێئەکاتو قسەکەمان وەرئەگرێ.

١- مەبەستیان ئەوە بووە تەشەری لێ بدەن بەمەی کە گوێگرو گوێ لەگەڵ مشتە بۆ بڕوادارەکان، بڕوا ئەکات بەهەر قسەیەك کە بۆی بگێڕنەوە لە بارەی ئێمەوە لە(سدی)یەوە ڕیوایەتکراوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی دەستەیەك لە ناپاکان هاتووەتە خوارەوە یەکێ لەوانە(حلاسی کوڕی سوەید)ە کە ئەوانە وتەی بەدو ناشایستەیان گوت، ئینجا یەکێکیان گوتی: مەکەن چونکە مەترسی ئەکەین کە ئەم وتانە بگات بە محمد(ﷺ) ئەویش تۆڵەمان لێ بسێنێ، ئینجا(حلاس) گوتی: نەخێر چی ئارەزوو بکەین ئەیڵێینو ئینجا ئەچین بۆلای چی بڵێین بڕوامان پێ ئەکات، چونکە محمد گوێ مشتەو هەرچی پێبگوترێ بڕوای پێئەکات،

﴿قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡۚ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٦١﴾

---

هەروەها چەند ڕیوایەتێکی تریش هاتووە لەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ئەو مەبەستانەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوەو قورئانو بەدەکەی ئەوانی گێڕایەوەو بەرپەرچیان ئەداتەوە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بەرامبەر ئەو وتەی ئەوانە بڵێ: ﴿أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ﴾ گوێگرو گوێ لەمشتی خێرو چاکەیە بۆتان، زۆر گوێگرە لەسروشو وەحی خوا کە بۆی دێتو ئینجا ڕای ئەگەیەنێ بە ئێوە کە خێرو چاکەی تێدایە بۆ هەمووانو مایەی چاکیو خۆش بەختی هەردوو دنیاتانە ئەگەر گوێڕایەڵی بەکەن، گوێگری خێرە بۆتانو گوێتان لێ ئەگرێو ئەزانێ ئێوە بە ناپاکو فڕو فێڵ بازو درۆزنو ڕووپامایی کەرنو نایدا لە ڕووتانو ئابرووتان نابات و بە پێی بەدی خۆتان ڕەفتارتان لەگەڵ ناکات ﴿بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ﴾ باوەڕی هەیە بە خوا، کەواتە هەر هەواڵێکی بداتێ لەبارەی ئێوەو هەرکەسێكو هەر شتێکی ترەوە بەڕاستی ئەزانێ، ﴿وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بڕوای هەیەو مەیلو ئارامی دڵی هەیە بۆ لای بڕواداران و بەڕاستیان ئەزانێ لەبەر ئەوە هەواڵو قسەیان وەرئەگرێ، بێگومان ئەمە پلاری تێدایە دەربارەی ناپاکان کە جێگەی بڕواو ئارمی دڵنین. کەواتە نابێ هەواڵو قسەیان وەرگیرێ، ﴿وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡۚ﴾ ڕەحمەتو میهرەبانییە بۆ ئەوانەتان کە بڕوای هێناوە بەمەی ڕێنموونییان ئەکاتو دەستیان ئەگرێ بۆلای خێرو چاکە ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەوانەی کە ئازاری فروستادەکەی خوا ئەدەن بۆ یان هەیە سزایەکی سەختی ئازار دەر، بەم هەڕەشە سامناکە لە ئازار دەران کۆتایی باسی ئەم دەستەیەی هێنا، بێگومان ئازاردانی دڵی بەفەڕی پێغەمبەر ئازیز(ﷺ) لەبارەی ئاینو پەیامەکەیەوە هۆی بێبڕواییەو لەگەڵ بڕوادا کۆنابێتەوە، هەروەها هەر ئازاردانێکی تریش ئەگەر بەدەست قەست بوو بێتو مەبەست دژایەتیو ئازار دانی دڵی بەفەڕی ئەو بووبێ، لەکاتی ژیان ئەم جیهانەدا، لەپاش کۆچکردنی بۆ ئەو دنیا، بەڵام ئازاردانی تر بێجگە لەو دوو جۆرە، وەك ئازارو پێناخۆش بوونییە هێندێ کارو کردەوەوە کە کراوە بەپێی باوی خەڵکی لە هەستانو دانیشتنو قسەو

باسدا، ئەم جۆرانە گوناهو حەرام بوون و نەبوونەتە هۆی بێبڕوایی و دەرچوون لە ئیسلام بۆ وێنە: لە کاتی ژیانی دنیادا مانەوەو درێژەدان بە دانیشتن لەپاش نان خواردن لەمێندێ لەماڵەکانیدا، یان وەك دەنگ بەرزکردنەوە بەمل دەنگی ئەودا، یان لەدوورەوە بانگ کردنی بەدەنگی بەرز بەبێ شەرمانە، ئەمانەو وێنەیان هەر حەرام و گوناه بوون و تەمێ کراون لەسەریان. هەروەها ئەم جۆرە کردەوانە هەر حەرام و قەدەغەن لەپاش لەدنیا دەرچوونی بەلای هێندێ لەزانایانەوە بەڵگەیەك لەسەر ئەمە ئەوە بوو کە دووپیاو لە چەرخی(عمری فاروق)دا -خوا لێی ڕازی بێ- بەدەنگی بەرز قسەیان ئەکرد لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەویش بانگی کردن و پرسیاری کرد: ئێوە خەڵکی کوێن؟ ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کە خەڵکی دوورن و لادێین، ئەویش فەرمووی: ئەگەر خەڵکی شارو نزیك بوونایە لێدانی باشم ئەکردن، واتە دووری و نەشارەزاییەکەتان ئەکەم بە عوزرو بیانوو بۆتان، ئینجا ماوەتەوە ئازار دانی دڵی ئال و نەوەی لەپاش خۆی بەهۆی ئاژاوەو بەین تێك چوونێك کە پەیدا ئەبێت بەپێی باوی خەڵکی لەسەر ئەو شتانەی کە مایەی ئاژاوەو بەین تێك چوونن، ئازاردانی ئەمانە هەرچی هەق و ڕەوا بێت بە پێی شەریعەتی خوا ئەوە ڕاست و ڕەوایەو هیچ مەترسییەکی تێدا نییە، چونکە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵی شەریعەتی خوا لە هەموو شتێ پێش ترو بەنرخ ترە، کەواتە ئەبوبەکری صدیق -خوا لێی ڕازی بێ- پێویست بوو لەسەری پەیڕەوی و فەرمانبەریی ئەو فەرموودەیە بکات کە خۆی بە گوێی خۆی لە دەمی پێغەمبەران وەری گرتبوو کە میراتی و کەلەپوورمان لێ وەرناگیرێ و ئەوەی بەجێمان هێشتبێ لەپاش خۆمان صەدەقەیە. ئەو پەیڕەوی و فەرمانبەرییە ڕاست ڕەوا بوو، هیچ مەترسی یەك نەبوو لەوەی حەزرەتی فاطمة -خوا لێی ڕازی بێ- خەشمناك و دڵئازار بێ لەوەی کە ئەبوبەکر بەشداری نەکرد لە(فدك)و ئەوەی بەجێما لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هەرچۆنێ ناکرێ لەوەی حەزرەتی فاطمة نا فەرمانی جێنشینەکەی باوکی کردو ناڕەزایی دەبڕی لە بڕیارەکەی، چونکە بە پێی ڕووکەش و ڕواڵەتی ئایەتی میرات بڕیارەکەی بە لاوە ڕاست و شەرعی نەبوو، هەر بڕیارێك دژو نەگونجاوی ئایەت بێت گوێی بۆ ناگیرێ، ئەو ناپاکانە کاتێ هەستیانکرد بەوەی بەدو ناپاکیان دەرکەوتووەو بێ ئابڕوو بوون لای بڕواداران،

يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ

---

کاتێ کە هەستیان بەوە کرد کەوتنە سوێندو پاکانەو خۆپاك کردنەوە لەو وتارو کردارەی کە هەستان پێیان و گوێیان نەبوو لە خەشمی خوا لێیان وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ﴾ سوێند ئەخۆن بە خوا بۆتان بۆ ئەوەی ڕازیتان بکەن، ئەوەش بە پێی باوی ناپاکان لە هەموو چەرخ و زەمانێکدا، کەلە پاشە ملی کردارو وتاری بەدو ناپەسەند ئەکەن و ئەیڵێن، ئینجا لەڕوودا ئەکەونە سوێندو پاکانەو مەرامی کردن، بەڵام نەفامن نازانن ڕازی کردن و ڕەزامەندی خەڵکی هیچی تێدا بەسەر نییە، ئەوانە هەوڵی ڕەزامەندی خەڵکی ئەدەن لە کاتێکدا ﴿وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ﴾ خوا و فروستادەکەی خوا شایستە ترە بەوەی ڕازی بکەن ﴿إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوادار بووین و بڕوایان هەیە، واتە ئەگەر ئەوانە کەلاف بڕوا لێ ئەدەن و سوێند ئەخۆن لەسەری، بەڕاستی بڕوادارن دەی با خواو پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بکەن لە خۆیان، چونکە ڕەزامەندی ئەوان و ڕازی کردنیان سوود و نرخی هەیەو ڕازی خەڵکی بە تەنیا هیچ نرخێکی نییە، چونکە خەڵکی هیچ نییەو هیچی بەدەست نییە، بەڵام ئەوەی کە بڕوای نییە نەفامە، گوێی نییە لە ڕەزامەندی خواو هەر خەریکی ئەوەیە خەڵکی ڕازی بکات، بە تایبەتی ئەو ناپاك و بێبڕوایانە هەمیشە خەریکن بە زۆردارو کاربەدەستەکانەوەو بەدەورو بەریاندا دێن و مەرامیان بۆ ئەکەن. بەڕووکەش و ڕواڵەت نەبوایە لەباتی(ان يرضوه)(ان يرضوهما) بوایە، واتە خواو پێغەمبەرەکەی شایستە ترن بەوەی ڕازیان بکەن، بەڵام دەستەواژەکەی قورئان بەرزو بڵندە، چونکە وانیشان ئەدات کە ڕازی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی کردنی خوایە، کە ئەوەش مەبەستێکی گرنگەو پێویستە گەیاندن و نیشاندانی، ئەگەر بە پێی ڕووکەشەکە بوایە ئەو مەبەستە گرنگەی نیشان نەئەدا، ئینجا شێوە پرسیارێك ئاڕاستە ئەکات بۆ سەرزەنیشتی ئەو ناپاکانەو ترساندنیان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ئایائەوانەنەیانزانیوەکەهەرکەس دژایەتی وبەربەرەکانێی خواوفروستادەکەی بکات،

فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَاۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْيُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْۚ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟

﴿فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَاۚ﴾ بێگومان بۆ ئەو کەسە هەیە ئاگری دۆزەخ بەجۆرێك هەمیشەیی ئەبێ تیایدا﴿ذَٰلِكَ ٱلْخِزْيُ ٱلْعَظِيمُ﴾ هەرئەوەبەرپسوایی و زەبوونی زۆر گەورە.

ئەو نەفامانە ئەترسان لە بەندەیانی خوا بەهۆی ئەوەوە سوێندو پاکانەیان بۆ ئەکردن، تا ڕازیان بکەن و ئەو گومانەی پێیان ئەبرا نەمێنێ، ئەی چۆن نەئەترسان لە پەروەردگاری ئەو بەندەیانەو بوونەوەر، لە کاتێکدا ئازاری دڵی پێغەمبەرەکەیان ئەدا(ﷺ)، جەنگیان ئەکرد لەگەڵ ئایینەکەی، هیچکەس ڕایەکی ناکەوێ جەنگی خوا بکات، بەڵام جەنگ لەگەڵ ئایین و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) وەك جەنگ لەگەڵ خۆی وایەو لەبەر ئەوەی ئەو پەڕی بەدی و سەختی کردەوەکەیان نیشان بدات ئەو کردەوەبەدانەیانی دانا بە جەنگکردن لەگەڵ خوادا، ئەو ناپاکانە لەبەر ترسنۆکیان ئەتوانی ئەوەی لەدڵیان دایە دەری بڕن، ئەترسان لەوەی قورئان ڕاستیان لێ بڵێ و نیازو نیەتەبەدەکەیان دەرخات وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْۚ﴾ ناپاکەکان مەترسی ئەکەن لەوەی سوورەتێك بهێنرێتە خوارەوە بۆ سەریان و لەبارەیانەوەو هەواڵیان پێبدا بەوەی کە لە دڵیاندایە، واتە ئەوەی کەلەدڵیاندایەو ئەیشارنەوە، ئەو سوورەتە دەری بخات و بڵاو بێتەوە لەناو خەڵکداو ئەمانیش لەدەمی خەڵکی ببیسن، ئەو سوورەتە هەواڵەکەیان بداتێ، ئەو ناپاکانە هەرچەند بێبڕوا بوون، بەڵام لەهەمان کاتدا دوو دڵ بوون لەبارەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هێندێکیان گومان و دوو دڵیەکەیان بەهێز بوو، جا لەبەرئەوە لەو بارەیەوە مەترسیەکەیان هەبوو، بەکورتی ئەو مەترسیە دژی ناپاکی و بێبڕواییەکەیان نییەو کۆئەبنەوە لە دڵیاندا، هیچ گرێیەك نییە لەوەدا، ئینجا لەگەڵ ئەوە گومان و دوو دڵیەیان هەڵئەگرێ دەربڕینی مەترسیەکەیان بە شێوەی لاقرتی بوو بێباوەڕەکانی وەك هێندێ ئەفەرموون وەك هەڵئەگرێ دەربڕینی مەترسیەکەیان هەر بە شێوەیەکی ڕاستی بێت وەك زۆربەو جەماوەر لەسەر ئەوەن و ڕووکەشی ئایەتەکەس وا نیشان ئەدات، جا لەسەر بارو ڕای یەکەم ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ﴿ٱسْتَهْزِءُوٓا۟﴾ لاقرتی بکەن،

إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾

---

﴿إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ﴾ بەڕاستی خوا دەرخەرو ئاشکرا کاری ئەوەیە کە مەترسی لێ ئەکەن و خۆتانی لێ ئەپارێزن، لەسەر ئەم باری یەکەمە ئەم فەرموودەیە بۆ بەرپەرچ دانەوە هەڕەشەیە لەوانەو هەواڵدەرە بەوەی کە خوا ئەوەی لەدڵیاندایە دەری ئەخات و بێئابڕوویان ئەکات، لەسەر بارو ڕای دووەم ئەبێ بڵێین: مەبەست ئەوەیە: ئەی پێغەمبەر بەهەڕەشەوە بڵێ بەوانە: ﴿ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ﴾ ناپاکی بەکار بێنن، چونکە ناپاکان لەڕاستیدا ئەیانەوێ لاقرتی بکەن و پیشەو کردەوەکەیان هەر فڕو فێڵ و لاقرتییە، هێندێ ئەفەرموون: ڕاناوی(هم) لە(علیهم) و(تنبئهم)دا ئەگەڕێتەوەو بۆ بڕواداران، واتە ناپاکەکان مەترسی ئەکەن لەوەی سوورەتێك بهێنرێتە خوارەوە بۆ سەر بڕواداران کە هەواڵیان پێدات بەوەی کە لەدڵی ناپاکەکاندا هەیە، بەم جۆرەش هەر ڕێکەو ئەگونجێ، لەسەر هەر بار مەبەست بە وتەی ﴿ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ﴾ هەڕەشە کردنە لەو ناپاکانە، ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار بکەیت و لەو ناپاکانە لەبارەی ئەو قسەو وتانەی کە گوتویانە ﴿لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُ﴾ لە وەڵامدا ئەڵێن: ئێمە هەر دەمەتەقەو گەمەو گاڵتەمان کردووەو ڕابواردن بەقسەی پڕو پووچ بۆ بڕینی ڕێگەکە نەك بە شێوەی ڕاستی ئەو قسانەمان کردبێ، ﴿قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ بڵێ پێیان: ئایا ئێوە بە خواو بە ئایەتەکانی و بە فرۆستادەو نێرراوەکەی لاقرتیتان کردووەو ئەیکەن؟ چەند ڕیوایەتێك هاتووە لەبارەی چەند ڕووداوێکی تایبەتیەوە لەمۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەدا کە خەریکن پێیانەوەو ئەژین لە ژێر سایەیاندا.(ئەبو معشری مەدینی) لە چەند کەسێکەوە ئەگێڕێتەوە: کە یەکێ لەناپاکان ئەڵێ: من قورئان خوێنەکان هەر بەوە ئەبینم کە چڵێسترو سك برسی ترو درۆزنترو ترسنۆك ترمانن، ئەوقسەیە ئەگەیەنرێ بەپێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا ئەو ناپاکە دێت بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)

لەکاتێکدا ڕێکەوتووەو وا بەسەر حوشترەکەیەوە ئینجا ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هەر دەمەتەقەو قسەی پڕوپووچ و گاڵتەمان کردووە بە شێوەی ڕاستی ئەو قسانەمان نەکردووە ئینجا پێغەمبەریش(ﷺ) ئەم ئایەتانەی فەرموو:(قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ )(محمدی کوڕی ئیسحاق) ئەڵێ: دەستەیەك لە ناپاکان لەو سەفەرەدا بوون بۆ تەبوك، هێندێکیان ئەیانگوت بەوانی تر: ئایا ئێوە وا ئەزانن جەنگ و تێهەڵچوون لەگەڵ ڕۆمدا وەك جەنگی ناو عەرەب وایە؟ سوێند بەخوا وەك بە بەرچاومەوە بێت سبەینێ ئەتان بینم بە چەڵە کراوی و باڵی بەستە، مەبەست ئەوە بوو بیم و ترس بخاتە ناو بڕواداران، ئینجا(محتسی کوڕی حەمید) گوتی: سوێند بە خوا من پێم خۆشە و ڕازیم بەوەی هەرکام لە ئێمە سەد جەڵدەی لێ بدرێ و نەك قورئان بێتە خوارەوە لەسەر ئەم قسانەی کە ئەیکەین. لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ بە عمار: بگە بەو تاقمەو پرسیاریان لێ بکە لەو قسانەی کە کردیان، ئەگەر نەچوونە ژێر بڵێ: ئەوەتان گوت و ئەوەتان گوت، ئینجا عمار ڕۆیشت بۆلایان، ئەوەی پێ گوتن، ئینجا ئەوانە هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەستیان کرد بە عوزرو بەهانە هێنانەوەو گوتیان ئێمە هەر گەمەمان کردووە. لە(قتادە)وە ڕیوایەت هاتووە کە ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەڕۆیشت بۆ تەبوك هێندێ لەناپاکەکان کەلە دەوروبەری بوون گوتیان: ئایا ئەم پیاوە بە تەمایە قەسرو قەلاکانی شام بگرێ؟ زۆر دوورە شتی وا، ئینجا خوا پێغەمبەری ئاگادار کرد بەوە. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیداو فەرمووی: ئەوانەم بۆ بوەستێنن، ئینجا هات بۆ لایان و فەرمووی پێیان: ئەوەتان گوت و ئەوەتان گوت. ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هەر مەبەستمان گەمەو گاڵتەبووە، ئینجا دەربارەی ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە. دیارە ئەو قسانەی ئەوانە لەگەڵ بڕواو بیروباوەڕی ئیسلامدا ناگونجێ و هەرکەس ئەو قسانە بکات لە ئیسلام دەرئەچێ لەبەر ئەوە فەرمانیدا کە ئەو شێوە پرسیارەیان ئاراستە بکات بۆ بێزاری دەربڕین و سەرزەنشت و سەر سوڕهێنان،

لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ

---

ئینجا فەرمووی: ﴿ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ﴾ عوزرو بەهانە مەهێننەوەو خەریك مەبن پێیەوە ﴿قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ﴾ بەڕاستی ئێوە بێبڕوابوون‌و بێبڕواتان بەکارهێنا لەپاش بڕواهێنانتان، واتە بێبڕواییەکەتان دەربڕی‌و ئاشکراتانکرد لەپاش ئەوەی کە لەمەو بەر بڕواتان دەرئەبڕی‌و خۆتان بە بڕوادار نیشان ئەدا، ئەبێ بەو جۆرە مەبەست بێت، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە ناپاك بێبڕوایەو بەبڕوادار دانانرێ لە ڕاستیدا، پاڵفتەی مەسەلەکە ئەوەیە: ئەوانە لەوەو بەر بە بڕوادار دانراون تا ئەو قسەو باسەیان لێ دەرکەوت، ئیتر پاش ئەوە بوون بە بێبڕواو لە ڕیزی بڕواداران دەرچوون بە ڕووکەش‌و ڕواڵەتیش، هەرچۆنێ لە ڕاستیدا هەر بڕوادار نەبوون، ﴿إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴾ ئەگەر ئێمە ببورین‌و خۆش ببین لە دەستەو تاقمێك لە ئێوە بەهۆی گەڕانەوەتان، سزای دەستەو تاقمێکی ترتان ئەدەین بەهۆی ئەوەوە ئەمانە هەر تاوانبار بوون‌و هەمیشەیین لەسەر تاوان‌و ناپاکی واتە ئەگەر ئێمە ببورین لە هەرکەسێك لەو ناپاکانە بەهۆی تۆبەو گەڕانەوەی لە ناپاکی‌و قسەی بەد، نابێ بەوە کەسێکی تریان هەڵخەڵەتێ، چونکە بێگومان سزای ئەوانە ئەدەین کە ناگەڕێنەوەو بەردەوام ئەبن لەسەر تاوانی خۆیان.

لەپاش نیشاندانی چەند نموونەیەك لە وتارو کرداری بەدی ئەو ناپاکانە ئینجا بە شێوەی گشتی بارو سیفەتی سەرەکی ناپاکەکان ڕوون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ﴾ پیاوە ناپاکەکان‌و ئافرەتە ناپاکەکان هێندێکیان لە هێندێکیانن‌و لە یەکترن، واتە یەك سروشتیان هەیەو یەك شێوەیان هەیە تا ڕادەیەك وەك هەر کام بەش‌و پارچەیەك بن لەویتر، بەڵێ بەڕاستی ناپاکەکان لە هەموو چەرخ‌و وڵاتێکدا لەسەر یەکبارو سروشتن هەرچەند جیاوازبن لە هێندێ وتارو کرداردا، هەموو بەد نیازو بەد گومان‌و بەد مەبەستن، هەموو دڵ پیس‌و دوو ڕوون، بێهێزو لاوازو ترسنۆکن لە بەرەنگاری ڕووبەڕوو، لەوەی نیازو مەبەستی خۆیان دەربڕن بێ پێچ‌و پەنا، پیلان بازو تانەو تەشەر دەرن لە خەڵکی،

يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا هِىَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ كَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ

---

**نیشانەو بەڵگەی ئاشکرایە لەسەر ئەمانەی کە باسکران و ئەوەیە کە ئەفەرموێ:**

**﴿يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ﴾ فەرمان ئەدەن بەکارو کردەوەی ناهەق و بێ شەرعی کە بێزارو نەویستەیە، بەد ترینی بریتییە لە بێبڕوایی و دژایەتی ئایینی پاکی ئیسلام، ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ﴾ جڵەوگیریی ئەکەن لەکارو کردەوەی هەق و شەرعی کە ناسراوو وەرگیراوو پەسەند کراوەو سەر دەستەو پۆپەی بریتییە لە بڕواو پەیڕەوی ئایین و شەریعەتی خوا ﴿وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ﴾ دەستەکانیان ئەقوچێنن لە بەخشن و بەختکردنی ماڵ لەڕێی خوادا، چرووکی بەکار دێنن مەگەر بۆ ڕییاو ڕووپامایی، ئەوانە ﴿نَسُوا۟ ٱللَّهَ﴾ خوایان لەبیرچووەو وازیان لێهێناوەو گوێیان لێی نییە ﴿فَنَسِيَهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوایش وازی لەوان هێناوە بەم ڕەنگە هیچ نرخێکی بۆ دانەناون، نەلە دنیاو نەلە ڕۆژی دواییدا، بێبەشی کردوون لەیادی خۆی و بەندەیی و خۆ نزیك خستنەوە لێی بە فەرمانبەریی و گوێ ڕایەڵی بۆی بەهۆی ئەوەوە بەش بڕوان لە ئەجرو پاداشت لە ڕۆژی دواییدا، ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ بەڕاستی ناپاکەکان هەر ئەوانن گەیشتوون بە پایان و ڕۆژوونە خوارەوە لەلادان لە ئایین و ڕێگەی خوا، لەگوێ ڕایەڵی و فەرمانبەریی خوا. لەپاش باسی بارو حاڵیان، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە ئامادەی کردووە بۆیان لەگەڵ هەموو برا بێبڕواکانیان،**

ئەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ﴾ خوا بەڵێنی داوەو بەڵێن ئەدا بە پیاوە ناپاکەکانو بە ئافرەتە ناپاکەکانو بێبڕواکان بەتێکڕاییو هەموو ﴿نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ بەئاگری دۆزەخ کە بچنە ناویو سزا بدرێن پێی لەکاتێکدا ئەمێننەوەو تیایدا بەدوورو درێژییو هەتا هەتایە، ﴿هِىَ حَسْبُهُمْۚ﴾ ئاگری دۆزەخ بەسە بۆیانو ئەو پەڕە لە تۆڵەدا ﴿وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ خوا نەفرینی لێکردوونو دووری خستوونەتەوە لەبەزەییو میهرەبانی خۆی ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی نیشتەجێی دامەزراوی هەمیشەیی بە بێبڕانەوە، واتە جۆرێکی تر لە سزا بێجگە لەسزای ئاگر، یان مەبەست دووبارە کردنەوەیە بۆ سزای ئاگرەکە کەباسکرا. ئەو سروشتە بەدە گومڕا کەباسکرا بۆ ئەو ناپاکانە شتێکی تازەی نەو زهور نەبوو، بەڵکو لە مێژووی ئادەمیدا وێنەو نموونەی ئەوانە بووەو تێپەڕی کردووە، ئەو وێنەو نموونانەش دووچاری دەردی خۆیان بوون، لەپاش ئەوەی کە ماوەیەك ڕایان بواردووەو ئەو بەشەی کە خوا بڕیاری دابوو بۆیان دەست کەوتیان بوو، ئەوانەی پێشوو بەتین ترو بەهێز تربوون لەمان، ماڵو ئەولادو سامانیان زۆر تر بوو کەچی هیچ سوودیان وەرنەگرت، جا قورئان ئەمانی ئێستا ئەترسێنێ بە بەسەر هاتو ڕووداوی ئەو وێنەیانە، بەڵکو کۆتایی ببێننو ڕێی ڕاست بدەنە بەر، ئەفەرموێ: ﴿كَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ واتە ئەی ناپاکەکان ئێوە بە وێنەی ئەوانەن کە هاتنو تێپەڕیانکرد لە پێش ئێوەدا ﴿كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً﴾ ئەوانە بەتین تر بوون لە ئێوە لەبارەی هێزو توناوە ﴿وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا﴾ زۆر ترن لەبارەی ماڵو سامانو ئەولادەوە ﴿فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ﴾ ئینجا ئەوانە شادمان بوونو ڕایان بوارد بە بەشی خۆیان لە خۆشیو لەزەتێ کە خوا بۆی بڕیار دابوون،

فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾

---

﴿فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ﴾ ئینجا ئێوەش ڕاتان بواردو شادمان بوون بە بەشەکەی خۆتان ﴿كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ﴾ هەرچۆنێ ئەوانەی کەلە پێش ئێوەوە بوون ڕایان بوارد بە بەشەکەی خۆیان ﴿وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟﴾ ڕۆچوونە خوارەوە لەشتی بڕوپووچ و بێنرخ و بەتاڵدا بەوێنەی ئەو دەستەو تاقمەی کە ڕۆژوونە خوارەوە، یان بەوێنەی ڕۆچوونە خوارێ کە ئەوان ڕۆچوون تیایدا ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئەوانەی کەباسکران کردەوە کانیان ڕۆیشتن بەبێ سوود، ئەو کردەوانەیان کە چاك بوون و ئەگەر لەسەر بڕوابوونایەو لەبەر خوا بوونایە هۆی ئەجرو پاداش ئەبوون لای خوا، ئەو کردەوانە هەموو بەبێ سوودو بەرهەم ڕوشتن و هیچ نیشانەو دروشمیشیان نەما لای خواوە هیچ سوودو نرخیان نەبوو نەلەدنیا لە ڕۆژی دواییدا، لە ڕۆژی دواییدا ئاشکرایە، چونکە هەر کردەوەیەك لەسەر بڕوا دانەمەزرابێ و لەبەر خوا نەبێ هیچ ئەجرو پاداشتی نییە، لەم دنیایەشدا بەهۆی دەرکەوتنی ناپاکیەکەیان و ئابڕوو چوونیان، هەروەها بەهۆی بەسەر هاتی خراپ و مردن و نەگەیشتنیان بە ئاوات و ئامانجیان، بێجگە لە هەموو ئەوانە ئەو کردەوە چاکانەیان وەك لە ڕۆژی دواییدا هیچ نرخیان نییە، هەروەها لەدنیایشدا نایانگێڕێتەوە لە خراپەکاری و خوو ڕەوشتیان ناگۆڕێ، کەواتە هیچ بەرو بەرهەمێکی نابێ بۆیان، ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ هەر ئەوانەن ڕەنجەڕۆو زیانباری ڕاستەقینەن و گەیشتوون بە پایان لەزیانباریدا، چونکە بە جارێ دنیا و ڕۆژی دواییان لەدەست دەرچووە، ئەوانە خۆیان ماندوو کرد لەدژایەتی و بەربەرەکانی ئایین و پێغەمبەرانی خوادا کەچی هیچیان دەست نەکەوت بێجگە لەبەش براوی هەردوو دنیا، خوا پەنامان بدات، ئینجا ئەیانترسێنێ و سەرزە نشتیان ئەکات بەباس و بیرخستنەوەی چەند گەل و کۆمەڵێکی بەناو بانگ کە هەواڵ و دەنگ و باسیان گەیشتبوو بەو ناپاکانە، ئەو گەل و کۆمەڵانەیان بیر ئەخاتەوە کە بەهۆی گومرایی و لادانیان لە ئایین و بەرنامەی خوا، بەری قارو خەشمی خوا کەوتن تالەڕیشەی هێنان و بەڕیسوایی وبەش براوی بەرەو سزای ڕۆژی دوایی بەڕێی کردن،

أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ ئایا نەهاتووە بۆیان و پێیان نەگەیشتووە هەواڵ و داستانی گرنگی ئەوانەی کەلە پێش ئەمانەوە هاتن و بوون لەم جیهانەدا، ئایا نەهاتووە بۆیان هەواڵ و داستانی گرنگی ﴿قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ﴾ گەلەکەی نوح و عادو سەمودو گەلەکەی ئیبراهیم و خاوەن دانیشتوانی مەدیەن و شارەکانی ژێروژەبەر کراو، واتە شارەکانی گەلەکەی لوت. ﴿أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ ئەو گەل و ئوممەتانە فروستادەو پێغەمبەرەکانیان هاتن بۆلایان بە موعجیزەو بەڵگە ڕوونەکانەوە، ئینجا وەك لە چەند شوێنێکدا قورئان باسی فەرموو، ئەوانە بڕوایان نەهێناو سەرکێشیان کرد بەهۆی ئەوەوە خوایش لەناوی بردن هەرکام بەسزاو تۆڵەیەك کەلە قورئاندا باسکراوە، ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴾ ئینجا نەبووەو باوی خوا ئەوە نەبووە کە ستەمیان لێ بکات، واتە دادو کاردروستی خوا داخوازی ئەوە نەبوو کە بەبێ تاوان تۆڵەیان لێ بسێنێ و بەو جۆرە لەناویان بەرێ، ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکو ئەوان ستەمیان لە خۆیانکرد بەمەی سەکێشیان بەکار هێناو گوێیان نەدا بە فەرمان و فروستادەکانی خوا. مەبەست لە هێنانی ئەو نموونەو وێنەیانە ئەوەیە کە بێبڕوایانی ئەم ئوممەتە بە هەموو جۆرەکانییەوە بزانن کە باوو ڕەوشتی خوا دەربارەی بەندەکانی لەسەر یەك بارەو گۆڕانی نییە، کەواتە با فریای خۆیان بکەون پێش ئەوەی کاریان لەکارەگا بترازێ، فریاکەون و گوێڕایەڵ و ملکەچ بن بۆ فەرمانەکانی خواو فروستادەکەی خوا تا بەری خەشم و تۆڵەی خوا نەکەون، وەك ئەو گەل و ئوممەتانی ترە.

ئینجا بەرامبەر ناپاك‌و بێبڕواكان، نیشان ئەدات كەلە كارو ڕەوشت‌و هەست‌و هۆشدا دژو پێچەوانەی ناپاك‌و بێبڕواكانن، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾ پیاوە بڕوادارەكان‌و ئافرەتە بڕوادارەكان هێندێكیان دۆست‌و خۆشەویست‌و كۆمەك‌و یارمەتی دەری هێندێكی تریانن، واتە دۆست‌و یارمەتی دەرو كۆمەكی یەكترن. دەستەواژەكەی قورئان زۆر وردەو بایەری لێ بكرێتەوە، دەربارەی ئەوان فەرموو لەیكترن، واتە لەسەر یەك بارو یەك سروشتن، ئیتر نەیفەرموو: كۆمەك‌و یارمەتی دەری یەكترن، چونكە ناپاكەكان بێهێزو لاوازو ترسنۆكن ناتوانن یارمەتی دەرو كۆمەك بن تەنانەت لەناو خۆیشیاندا، هەرچەند بێبڕواكانی تر بەتایبەت نامەدارەكان لەناو خۆیاندا ئەبن بە كۆمەك‌و یارمەتی دەری یەكتر وەك لە چەند ئایەتێكدا ئەوە نیشان ئەدات، كەواتە لێرەدا كە كراون بە هاوسەرو هاوڕێی ناپاكەكان ئەبێ ئەو سیفەتی كۆمەك‌و یارمەتیەیان بۆ باس نەكات، بێگومان بڕواداران كاتێ كە بڕواداری ڕاستەقینەی قورئانی بن، ئەبێ یەك پارچەبن‌و یەكێتی‌و برایەتی‌و دەستە بەرەیی ڕەوشت‌و پیشەیان بێت. بەدوای خێرو چاكەدا بگەڕێن بۆ یەكترو بەرگری شەڕو خراپە بكەن لە خۆیان‌و لە یەكتر وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ فەرمان ئەدەن بە چاكەو جڵەوگیریی ئەكەن لەخراپە، جالەبەرئەوە بەیەك ڕیزو یەك كۆمەڵ ئەوەستن‌و هیچ هۆی ناڕێكی‌و دووبەرەكی نییە لە نێوانیاندا، لەهەر كاتێكدا ناكۆكی‌و دووبەرەكی بوو، ئەوە بێگومان لایانداوە لەڕاستە شەقامەكەی خۆیان. ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەڕێك‌و ڕاستی نوێژ بەجێ ئەهێنن، كە هۆی پەیوەستیانە بەخواوە ﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەكات ئەدەن، كە پەیوەستی ئەخاتە نێوان گەل‌و كۆمەڵی موسڵمان، شێوەیەكی ڕاستەقینە بۆ خۆشەویستی‌و كۆمەك‌و دەستەبەرەیی ناو گەل‌و كۆمەڵ ﴿وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ﴾ فەرمانبەری‌و گوێڕایەڵی خواو فروستادەكەی ئەكەن‌و هەمیشەیی‌و بەردەوامن لەسەری، كەواتە هەوەس‌و ئارەزوویان هەر فەرمانی خواو پێغەمبەرە(ﷺ) دەستوورو یاسایان هەر شەریعەتی خوایە، سەرناكەنەوە لە هیچ بڕیارێكیان، بەهۆی ئەوەوە یەك ڕێگە ئەدەنە بەرو یەك مەبەست‌و ئامانجیان هەیە، كەواتە لانادەن لە تاقانە ڕێگەی خۆیان كە هەر ئەوە ڕاست‌و گەیەنەرە بە كامەرانی هەردوو جیهان،

أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٧١﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٧٢﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ﴾ ئەوانە بێگومان خوا میهرەبانیان پێئەکات و ئەیانخاتە بەر بەزەیی خۆی، ئەو بەزەیی و میهرەبانییە تەنها بۆ ڕۆژی دوایی نییە، بەڵکو یەکەمجار لەم جیهانەدایە، بەئارامدان بە دڵ و پەیوەستی بە خواوە، لە چاودێریی خواو پاراستنی لە ڕووداو و بەسەرهاتی بەدو خراپ، ئەم چوار سیفەت و کردەوە گرنگەی ئەم خوا پێداوانە بەرامبەرە لەگەڵ ئەو چوار کردەوەو سیفەتە بەدانەی ناپاکەکان، فەرمان بە خراپەو جڵەوگیریی لە چاکەو لە بیر چوونی خواو چروکی و چنگ قوچراوی، بەزەیی و میهرەبانیەکەی خوا بۆ ئەو بڕوادارانە بەرامبەرە بۆ نەفرینەکەی خوا لە ناپاک و هەموو بێبڕواکان، ئەو چوار سیفەت و کردەوەی بڕوادارانە هۆی سەرکەوتن و زاڵبوون و کار بەدەستییە لە وڵاتدا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ بە ڕاستی خوا زاڵی توانای کاردروستە، ئەتوانێ ئەو بڕوادانە کە دۆست و یارمەتی دەری یەکترن زاڵیان بکات و ئایین و شەریعەتی خوایان پێ سەربخات، خوا لێزان و کار دروستە کە بڕیاری زاڵبوون و سەرکەوتنی داوە بۆیان، تا وڵات چاك بکەن، ئایین و وتەی خوا بپارێزن،

ئینجا بەرامبەر سزاو نەفرینی خوا لە ناپاك و بێبڕواکان، ئەم بەڵێنە گەورەیە ئەدا بە بڕواداران: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ﴾ خوا بەڵێنی داوەو بەڵێن ئەدات بە پیاوە بڕوادارەکان و بە ئافرەتە بڕوادارەکان، بەڵێنی بەهەشتانێك کە: ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ڕووبارەکانی دێن و ئەچن لەژێری ئەو بەهەشتانەدا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بە جۆرێ ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە نێجگاری و هەتاهەتایە، ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖ﴾ بەڵێنی داوە پێیان بە چەند کۆشك و جێ و شوێن و ماوایەکی پاك و خاوێن کە دڵ ئەحەوێتەوەو شادمانە تیایاندا، لە باخات و بەهەشتانێك نیشتەجێ بوون و مانەوەی نێجگاری، یان مەبەست بەهەشتانێکی تایبەتین کە خوا ئەزانێ چۆنن و ئەو فریشتەو کەسانی کە خوا ئاشنای کردوون پێیان، سەرباقی ئەو هەموو نازو ڕێزە لە هەموو شت گەورە تریان پێئەدات وەك ئەفەرموێ:

﴿وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾ بەشێکی کەم لە ڕەزامەندی لەلایەن خواوە کە ئەی بەخشێ بەوان گەورەترە لە هەموو شتێك، چونکە سەرچاوەو کانی هەموو خێرو خۆشیو شادمانیەکە، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە: ڕەزامەندی لەلایەن خواوە کە بەرزو بڵندەو خوا ئەی بەخشێ بەوانە گەورەترە لە هەموو ئەو بەڵێنانەی کە خوا داوێتی بەوانە، ئیتر مەبەست بەم ڕەزامەندیە بینینی خوا بێت وەك هێندێ زانایان فەرموویانە یان هەر مەبەست ڕووکەشو ڕواڵەتەکەی بێت وەك زۆربەرە ئەفەرموونو ئەم حەدیسەش هەروا نیشان ئەدات کە(بوخاریو موسلیم) هێناویانە لە(ئەبو سەعیدی خودریەوە) کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوا ئەفەرموێ: بەبەهەشتیەکان ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئایا چی هەیە بۆ ئێمە کەڕازی نەبین لەکاتێکدا ئەوەی کە بەخشیوتە بە ئێمە بەهیچ کەست نەبەخشیوە لە دروستکراوەکانت؟ ئەویش ئەفەرموێ: بزانن چاکتر لەوەتان پێ ئەبەخشم، ئەوانیش ئەڵێن ئایا چی لەوە چاکترە کە پێت بەخشیوین ئەی خوایە؟ ئەویش فەرمووی: ڕەزامەندی خۆم ئەدەم بەسەرتاندا ئیتر هەرگیز لێتان ناڕازی نابم، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەوەدا ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەوەی کە باسکرا، یان هەر ڕەزامەندییەکە، هەر ئەوەیە گەیشتن بەئامانجی گەورە، سەبارەت بە بەهەشتو نازو ڕێزەکانی ڕیوایەتی زۆرو زەبەندە هاتووەو هێندێکیان بەهێزو هێندێ لاواز، هەرچەند بەهێزەکان دیاریی کراونو جوێ کراونەتەوە، بەڵام ئەوەی کەلە قورئاندا هاتووە بەسەو ئیتر پێویست نییە بەو ڕیوایەتانە، هەر ڕیوایەتێك بەهێزو صەحیح بێت هەر ڕاڤەو ڕوونکردنەوەیەبۆئەوەی لەقورئانداهاتووە، خوابەمیهرەبانی خۆی بێباوەڕەکانی بەشمان نەکات.

لەپاش باسی سیفەتی بڕوادارانی ڕاستەقینەو سیفەتی ناپاکەکان کە لاف بڕوا لێ ئەدەنو لە دڵەوە بڕواداران نین، ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە تێکۆشانو بەربەرەکانی بکات لەگەڵ بێبڕواکاندا بە تێکڕایی، چ بێبڕوای ئاشکراو چ بێبڕوای نهێنی کە ناپاکەکانە، قورئان ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەو ناپاکانە لەپاش موسڵمان بوونیان لە ئیسلام دەرچوونو بێبڕوا بوون، نیازی کارێکی بەدیانکرد کە پێی نەگەیشتن، سەر سوڕئەمێنێ لە خەشمو قینیان لە پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتێکدا کە ناردنو ڕەوانە کردنی هەر خێرو فەڕو بەرەکەت بوو بۆیان، ئینجا هانیان ئەدات بۆ گەڕانەوەو تۆبە، ئەیانترسێنێ لە نەگەڕانەوەو بەردەوامیان لەسەر ئەو بارو ڕێگەی کە داویانەتە بەر،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٧٣﴾

ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ تێکۆشانو بەربەرەکانی بکە لەگەڵ بێبڕواکانو ناپاکەکان ﴿وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ ڕەقی توندو تیژی بەکاربێنەو نەرمو نیان مەبە لەگەڵیان، ئەی پێغەمبەر تۆ لە دنیادا بەو جۆرە بە لەگەڵیان لە ڕۆژی دوایشدا ئەوانە بەم جۆرە ئەبن کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ﴾ جێو شوێنی ئەوانە دۆزەخە، کەواتە هیچ شوێنێك نییە کە بگەڕێنەوە بۆلای و پەنای پێبەرن بێجگە لە دۆزەخ کە ئەوەی تێی چوو نە ئەژیو نە ئەمرێ، ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ دۆزەخ دواڕۆژو چارەنووسێکی بەدە بۆیان. بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) نەرمو نیانی زۆر بەکارهێنا لەگەڵیان بەتایبەتی لەگەڵ ناپاکەکان وە چاوپۆشی زۆری کرد، لە زۆر شتیان بوردو گوێی پێنەدا، تا گەیشتە ئەوپەڕی ڕادەو پلە، لەوێدا خوا فەرمانیدا کە بارو ڕێگەیەکی تر بداتە بەر لەگەڵیان، چونکە هەرشتێ ئەندازەو ڕادەی خۆی هەیە لەو ئەندازەیە ترازا ناڕاست دەرئەچێ، نەرمی کاتو شوێنی خۆی هەیە، کاتێ کە کاتو شوێنەکەی نەما ئەبێ ڕەقیو توندی بەکاربهێنرێ وەك ئەو بارەکەیش، ئینجا ئایا بەربەرەکانێو توندو تیژی لەگەڵ ناپاکەکانیش بە چەكو جەنگو کوشتار بکرێن وەك لە(ئیمامی عەلی)یەوە ڕیوایەت کراوە -خوا لێی ڕازی بێ- و(ئیبنو جەریر)یش ئەوەی هەڵبژاردووە یان بۆ ئەمان لە کردەوەو توندو تیژ لە قسەو گفتوگۆو دەرخستنی نیازی بەدیان لەگەڵ لەناو خەڵکدا وەك لە(ئیبنو عەباس)ەوە ڕیوایەتکراوە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەوەی کە ڕوویدابێ ـ وەك لەمەو پاش دەرئەکەوێ ـ ئەمەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) هیچ ناپاکێکی نەکوشتووە، کەواتە ئەوەی لە(ئیبنو عەباس)ەوە ڕیوایەتکراوە -خوا لێیان ڕازی بێ- بەهێزترەو ئەبێ ڕەفتاری پێبکرێ ئینجا هۆی شایستەیی ناپاکەکان بۆ تێکۆشانو بەربەرەکانی بەوێنەی بێبڕواکان باس ئەکات،

﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ﴾

ئەفەرموێ: ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ ﴾ سوێند ئەخۆن بە خوا کەئەوەی بەدەمیانەوە گوتراوە، ئەمان نەیانگوتووە ﴿وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ﴾ سوێند بە خوا وتەو وشەیەکیان گوت کە پێی بێبڕوا بن و لە ئیسلام دەرچن ﴿وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ﴾ بێبڕوا بوون لە پاش موسڵمان بوونیان، واتە ئەو بێبڕواییەی کە لە دڵیاندا بوو دەریان نەئەبڕی، دەریان بڕی و ئاشکرایانکرد لەپاش ئەوەی کە ملکەچی و موسڵمانێتییان نیشان ئەدا لە پێشەوە ﴿ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ ﴾لە دەروونی خۆیاندا نیازو بڕیاری شتێکیاندا کە پێی نەگەیشتن و دەستکەوتیان نەبوو، کە بریتی بوو لە نیازی لەناوبردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەو سەفەری تەبوکەدا، وەك ئەمانە ڕوون ئەکەینەوە بە پێی ئەو ڕیوایەتانەی کە هاتوون لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا:(قتادە) ئەفەرموێ: ئەم ئایاتانە هاتنە خوارەوە دەربارەی(عبداللە ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)، ئەوەش ئەوە بوو دوو پیاو شەڕو ئاژاوەیان بوو، جوهەنی و ئەنسارییەك، ئینجا جوهەنییەکە زاڵ بوو بەسەر ئەنسارییەکەدا، ئینجا عبداللە ی ناپاك گوتی بە مەدینەییەکان: ئایا یارمەتی و کۆمەکی براکەتان ناکەن؟ سوێند بە خوا چیرۆکی ئێمەو محمد هەروەك ئەوەیە کە گوتراوە: سەگەکەت قەڵەو بکە با بتخوا، سوێند بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەبێ کێ زاڵ و بە دەسەڵات بێ دەسەڵات دەربکات لە مەدینە، ئینجا پیاوێك لە موسڵمانان ئەو قسەو باسە ئەگەیەنێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ئەنێرێ بە دوای ئەو ناپاکەداو پرسیاری ئەوەی لێ ئەکات، ئەویش دەست ئەکات بە سوێندو پاکانە کە ئەوەی نەگوتووە، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی دێنێتە خوارەوە،(ئیبن و جەریر) لە(ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دائەنیشێ لە ژێر دارێکداو ئەفەرموێ: یەکێك دێت بۆ لاتان بە چاوی شەیتان سەرنجی ئێوە ئەدات، کاتێ هات قسەی لەگەڵ نەکەن، ئینجا ئەوەندەی

پێناچێ پیاوێکی چاوشین دێتو سەرهەڵئەدات، پێغەمبەر بانگی ئەکاتو پێی ئەفەرموێ: لەسەرچی تۆو هاوەڵەکانت جوێنم پێئەدەن؟ ئینجا ئەویش ئەڕوات هاوەڵەکانی بانگ ئەکات، دەست ئەکەن بە سوێند خواردن کە ئەوەیان نەگرتووە، هەتا پێغەمبەر لێیان ئەبورێ، ئینجا ئەم ئایەتە دێتە خوارەوە،(عوروەی کوڕی زوبەیر)و چەند کەسێکی تر ئەفەرموون: هاتووەتە خوارەوە دەربارەی(حەللاسی کوڕی سوەید)ەوە کە گوتی بە(عومەیری کوڕی سەعد) ئەگەر کە محمد هێناویەتی ڕاست بێت، ئەبێ ئێمە خراپتر بین لەم گوێ درێژانەی کە واین بەسەرپەرشتییانەوە ئینجا عومەیر ئەڵێ سوێند بە خوا حەللاس، تۆ خۆشەویسترینو چاکترین کەسی بەلامەوە لە هەموو کەس زیاتر پێم ناخۆشە دووچاری ناخۆشی ببی، بەڕاستی قسەیەکت کرد ئەگەر باسی بەکەم ئابڕوم ئەبات، ئەگەر ئەیلێمو دەری ئەخەم تێدا ئەچم، چونکە ناپاکییە، بە ڕاستی ئابڕوو چوونەکەم بەلاوە ئاسانترە بەهۆی ئەوەوە ئەو هەواڵە ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا حەللاسیش سوێند ئەخوات بە خوا کە نەیگوتووە، ئینجا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە، ئینجا ئەڵێ بەڕاستی گوتوومە، خوا ڕێی تۆبەو پەشیمان بوونەوەی دامو تۆبە ئەکەمە لای خوا، ئینجا لێی وەرگیرا، بەڵام ئەم ڕیوایەتانە پەیوەندیان نییە بە ﴿وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ﴾ بەڵکو ئەوەی کە ڕێك بکەوێ لەگەڵی چەند ڕیوایەتێکە کە ئەمە ئەڵێن: ئەوەیە کە دەستەیەك لە ناپاکەکان نیازی لەناو بردنی پێغەمبەریانکرد(ﷺ) لەو سەرەوە کە ئەگەڕایەوە لە تەبوك، جا یەکێ لەو ڕیوایەتانە ئەمەیە کە(ئیمامی ئەحمەد) ئەیهێنێ لە(ابو الطفيل)ەوە کە ئەفەرموێ: کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە لە تەبوك فەرمانیدا جاڕ بدرێ کە پێغەمبەر(ﷺ) لەپلەو بەرزایییەکەوە ئەگەڕێتەوەو با هیچکەس لەوێوە ئەگەڕێتەوە، ئینجا بەکورتی ئەو دەستە ناپاکە خۆیان ئەگۆڕنو چەتفە ئەکەن تا کەس نەیان ناسێو لەو ڕێگەیەوە دێن بە نیازی ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدێرن بەسەر وڵاغەکەیەوە ئینجا قورئان بەرامبەر کردەوەی ئەوانە شتێك ئەفەرموێ: کە زۆر جێگەی سەر سوڕمانە،

وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٧٤﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ﴾ ئەو ناپاكانە بەرامبەر ئیسلامو ڕەوانەكردنی پێغەمبەر(ﷺ) هیچ ڕەخنەو هۆی بێزاری یەكیان نەبوو ئەمە نەبێ پێویستو دەوڵەتمەندی كردن، هەروەها فروستادەكەیشی لە فەزڵو بەهرەی خوا، واتە بێجگە لە خێرو چاكە هیچ شتێكی تریان نەبینی لە ئیسلامو لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوە بوو لە پێش هاتنی ئیسلامو پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) لاتو تەنگ گوزەران بوونو بەهاتنی ئەوان كەوتنە خۆشیو دەوڵەمەند بوون، بێجگە لەوەی ئاژاوەو خراپەكاری نەما مەگەر بەدەگمەن، كەواتە چۆن ئەبێ دژی ئیسلامو ڕەوانەكراوەكەی خوا بن؟! ئەم فەرموودەیە سەرزەنشتو لاقرتی پێ كردنێكی دڵتەزێنی تێدایە بۆ ئەو ناپاكە سپڵەیانە سەر سووڕ ئەهێنێ لەبەر بەدییو خراپیان!! بەپێی باوی ڕەوانبێژیی پێی ئەگوترێ:(تأكيد الذم بما يشبه المدح) بەهێزكردنی ڕەخنە بە شێوەو لە پۆشاكی ڕەسفو سەنادا، لەگەڵ ئەو هەموو بەدییو ناپاكی ئەوانە خوای میهرەبان قاپی تۆبەیان لێ داناخات، بەڵكو هانیان ئەدات لەسەر تۆبەو گەڕانەوەو ئەیانترسێنێو هەڕەشەیان لێ ئەكات لەسەر نەگەڕانەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانە تۆبە بكەنو بگەڕێنەوە لەناپاكییەكەیان، ئەوا ئەوە چاكە بۆیان ﴿وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ ئەگەر ڕوو وەرگێڕنو هەر بەردەوام بن لەسەر ناپاكیو بەدییەكەیان، ئەوا خوا سزایەكی ئازار دەرو سەختیان ئەدات لەدنیاو ڕۆژی دواییدا، لەدنیادا بەبێ ئارامیو ناوبانگی بەدو هەر جۆرە بەسەر هاتێكی بەدی ئەم جیهانە، لە ڕۆژی دواییشدا كە ئەیانخاتە تەبەقەی هەرە ژێری ئاگر خوا پەنامان بدات لە خەشمو سزای خۆی، ﴿وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ نییە بۆیان لە هەموو زەویو وڵاتدا هیچ جۆرە دۆستو كار بەدەستێك كە غەمێكیان بخوات، نییە بۆیان هیچ كۆمەكو یارمەتی دەرێك كە ڕزگاریان بكاتو بەرگرییان لێ بكات، جا ئیتر هەركەس لەو دووبارە هەڵنەبژێریو دووچاری هەر سزاو خراپەیەك ببێ خۆی لۆمەكراوو ڕەخنە لێ گیراوە.

﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾

**ئینجا هەروەها لەسەر ئەو ناپاكانە ئەڕوات لە نیشاندانو خستنە بەرچاوی چەند نموونەیەك لەو ناپاكانەو لەوتارو كرداری بەدیان، لەپێش ئەو سەفەرەو لە ناو بەناوی ئەو سەفەرەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ﴾ لەو ناپاكانەیە كەسێك كە پەیمانیدا بە خواو گوتی: ﴿لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر لەفەزڵو بەخشینی خۆی ماڵو سامانێكمان پێ ببەخشێ ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ بێگومان خێروصەدەقەی لێئەدەین، بێگومان لەڕیزی چاكان ئەبین، كە هەڵئەسن بە مافی خواو مافی بەندەیانی خوا، واتە ئەوماڵو سامانە بەكار ئەهێنین لەكارو كردەوەی چاكدا، بێجگە لەصەدەقەكردن ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ كەچی كاتێ پێی بەخشین لەفەزڵو چاكەو بەهرەی خۆی ﴿بَخِلُوا۟ بِهِۦ﴾ ئەوەندەی پێنەچوو چرووكیانكرد بەو ماڵو سامانەو بەپێی سوێندو پەیمانەكەیان ڕەفتاریان نەكرد، ﴿وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ لایاندا لەوەی پەیمانیان لەسەر دا، لەكاتێكدا كە ئەوانە بە هەموو هێز ڕوویان وەرگێڕاو سوور بوون لەسەر ئەو لادانو ڕوو وەرگێڕانە، واتە وەنەبێ شتێك خەریكی كردبنو بە نەمانی ئەو شتە بگەڕێنەوە، بەڵكو بە ویستو ئارەزووی خۆیان ئەو لادانو ڕوو وەرگێڕانەیان دایە بەر، ﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ﴾ ئینجا خوایش بەرهەمو دوا ڕۆژی ئەوانی گێڕا بە ناپاكییەكی دامەزراو لە دڵەكانیاندا تا ڕۆژێ ئەگەن بە حوزوری خوا لە ڕۆژی دواییدا، ﴿بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی ئەو بەڵێنانەی كە دابویان بە خوا نەیان بردەسەرو دژو پێچەوانەی ڕەفتاریانكرد، بەهۆی ئەوەی ئەوانە درۆیانكردو بەردەوام بوون لەسەر ئەو درۆیە بەبێ گەڕانەوە، دوو سیفەتی بۆ باسكردن كەهەر دوو تایبەتی ترینی سیفەتی ناپاكانن. ئاشكراترین نیشانەو بە ڵگەن لەسەریان، وەك لە چەند حەدیسی صەحیحدا هاتووە، جا لێرەدا خراپتر ئەوەیە كە ئەو دوو سیفەتانەلەگەڵ خوادابەكارهێناوە! ئەوانەكاتی تەنگیونەبوونی وداماویدا ئەو پەیمانەیاندا، كەچی كاتێ كەخوادەرووی لێكردنەوەوداواوئاواتەكەی بەجێهێنان هەڵگەڕانەوە لە پەیمانەكەیانو چرووكی گرتنیو دەستیانگرت بەسەر ماڵو سامانەكەیاندا و درۆیانكرد لەگەڵ خوای خۆیان،تادووچاری دەردی بێ دەرمانی خۆیان بوون.**

ئادەمی هەر بە سروشت چرووك و چنگ قوچراوەو ماڵ خۆشەویستە، مەگەر ئەوانەی کە خوا پاراستوونی، پاك نابنەوە لەوە مەگەر بڕوای ڕێك و ڕاست کە بەرزیان بکاتەوە لەچڵ و چێوەی ئەم زەوییە، بۆ ئاسۆی هەرە بەرزو چاویان بڕێتە هەر ڕەزامەندی خواو ئەوەی لای خوایە، ئەو کاتە دڵئارام ئەبن و ناترسن لە نەبوونی، بەسۆزو پەرۆشەوە ماڵ بەخت ئەکەن لە ڕێی ڕەزامەندی خوادا، بەڵام کاتێ کە دڵ ئەو بڕوا ڕاستەی تێدا نەبوو، ئەو چیرۆکی و ڕژدییە سروشتییە زاڵ ئەبێ و بەربەستی ئەکات لەصەدەقەو خێرو خێرات، چاو برسی ئەکات و هەمیشە مەترسی ئەکات لەنەبوونی و هەرگیز بەر چاو تێر نابێ، ئەگەر پەیمانی دابێ لەسەر بەختکردنی ماڵ و صەدەقە، نایباتە سەرو پەیمانەکەی ئەشکێنێ، ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ ﴾ ئایا ئەوانە نەیانزانیوە کە خوا زاناو ئاگایە بە نهێنییەکەیان، بەچپەو قسەی نێوان خۆیان، کە بەکاری ئەهێنن لە گوناهو تاوان و دوژمنایەتی موسڵمانان و تانەو تەشەردان لە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)؟ ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴾ نەیانزانیوە کەبە ڕاستی خوا بە ئەوپەڕی ڕادە ئاگاو زانایە بە هەموو غەیب و نادیارییەکان؟ چەند ڕیوایەتێك هاتووە لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سێ ئایەتەدا، یەکێ لەوانە ڕیوایەتی(ئیبن و جەریرو ئیبن و ئەبی حاتم)ە کە ئەیهێنن لە(ئیبن و ئومامەی باهیلی)یەوە کە(سەعلەبەی کوڕی حاتبی ئەنصاری) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوا بکە لە خوا کە ماڵێکم پێ بدا ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: هاوار بۆ تۆ ئەی سەعلەبە، کەمێك هەڵسی بە سوپاسی چاکترە لە زۆرێك کە نەتوانی ئەفەرموێ: ئایا ڕازی نابی وەك پێغەمبەری خوا بێ سوێند بە کەسێ گیانی منی بەدەستە ئەگەر بم ویستایە چاکیان بکەڕانایەن لەگەڵم بە ئاڵتوون و زیوی ئەگەڕان، ئەویش ئەڵێ: سوێند بەو کەسەی کە بەڕاستی ڕەوانەی کردووی ئەگەر داوا بکەی لە خوا ماڵێکم بداتێ هەموو خاوەن مافێك ماق خۆی ئەدەمێ، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوایە ماڵێك ببەخشە بە سەعلەبە، ئینجا هێندێ ماڵات ڕاگیر ئەکات، زۆر ئەبن و پەرە ئەسێنن وەك کرم، بە جۆرێ مەدینە هەڵی ناگرێ و کەنار ئەگرێ و ئەچێت بۆ شیوو دۆڵێك لە شیوو دۆڵەکانی دەرەوەی مەدینە، هەتا هەر نوێژی نیوەڕۆو عەسری پێ ئەکرێ بە جەماعەت و فەرزەکانی تری پێ ناکرێ بە جەماعەت، ئینجا ئەوەندە زۆر ئەبن هیچ نوێژێکی

پێناکرێ به جه‌ماعه‌ت بێجگه له نوێژی جومعه، ڕان و ماڵاته‌که‌ی هه‌ر له‌به‌ره‌وه زیاد ئه‌کات وه‌ك کرم هه‌تا واز له جومعه‌ش ئه‌هێنێ، هه‌تا وای لێ دێ له ڕۆژی جومعه‌کاندا ئه‌گه‌ڕێ تا بکات به‌خه‌ڵکی و هه‌واڵ و ده‌نگ و باسیان لێ بپرسێ، ئینجا پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) هه‌واڵی ئه‌پرسێ و ئه‌فه‌رموێ: ئایا سه‌عله‌به چی کرد؟ خه‌ڵکیش عه‌رزی ئه‌که‌ن که مه‌ڕ و ماڵاتی ڕاگیرکردو تاوای لێ به‌سه‌ر هات، ئه‌ویش سێ جار فه‌رمووی: ئای هاوار بۆ سه‌علبه! ئینجا ئایه‌تی زه‌کات دێته خواره‌وه و پێغه‌مبه‌ریش(ﷺ) دووکه‌س ئه‌نێرێ به فه‌رمانده به‌سه‌ر زه‌کاته‌وه، ئه‌نووسێ بۆیان که چوون صه‌ده‌قه و زه‌کات وه‌رگرن له موسڵمانان، ئه‌فه‌رموێ: بڕۆن بۆلای سه‌علبه‌و پیاوێکی تر له به‌نی سه‌لیم و صه‌ده‌قه‌یان وه‌رگرن، ئه‌وانیش ئه‌چن بۆلای سه‌عه‌له‌به‌و داوای صه‌ده‌قه‌که‌ی لێ ئه‌که‌ن، نامه‌ی پێغه‌مبه‌ری(ﷺ) بۆ ئه‌خوێننه‌وه، ئه‌ویش ئه‌ڵێ: ئه‌مه هه‌ر سه‌رانه‌یه، نازانم ئه‌مه چییه؟ بڕۆن هه‌تا ده‌ستتان خاڵی ئه‌بێت و لێ ئه‌بنه‌وه ئینجا بێنه‌وه بۆلام. به‌ڵام پیاوه‌که‌ی تر گوێی به قسه‌که‌یانه‌وه ئه‌بێ، ئه‌گه‌ڕێ به‌ناو حوشتره‌کانیدا باشترینیان دیاریی ئه‌کات بۆ زه‌کات و ئه‌یبا به پیریانه‌وه، ئینجا پێی ئه‌ڵێن: تۆ ئه‌مه‌ت له‌سه‌ر نییه، ئێمه نامانه‌وێ ئه‌مه‌ت لێ وه‌رگرین، ئه‌ویش ئه‌ڵێ: نه‌خێر ئه‌مه وه‌رگرن و خۆم ئه‌مه‌م پێخۆشه، هه‌ر ئه‌مه بۆ ئه‌وه چاکه، ئه‌وانیش لێی وه‌رئه‌گرن و ئه‌گه‌ڕێن به‌ناو صه‌ده‌قه‌کانیان وه‌رئه‌گرن، ئینجا ئه‌گه‌ڕێنه‌وه بۆلای سه‌علبه ئه‌ویش ئه‌ڵێ: نامه‌که‌تانم نیشان بده‌ن، ئینجا کاتێ ئه‌یخوێنێته‌وه هه‌مان قسه‌ی پێشوو ئه‌کاته‌وه: ئه‌مه هه‌ر سه‌رانه‌یه‌و بڕۆن هه‌تا ڕای خۆم ئه‌بینم، ئینجا ئه‌وانیش ئه‌ڕۆن هه‌تا دێنه‌وه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئینجا کاتێ که بینینی پێش ئه‌وه‌ی قسه‌یان له‌گه‌ڵ بکات فه‌رمووی: ئه‌ی هاوار بۆ سه‌علبه، نزای فه‌ڕ و به‌ره‌که‌تی کرد بۆ موسڵمانه‌که‌ی تر، ئینجا ئه‌وانیش هه‌واڵیان پێدا به کرده‌وه‌ی سه‌علبه‌و ئه‌و موسڵمانه‌که‌ی تر، ئینجا ئه‌م ئایه‌ته هاته خواره‌وه:(منهم من عاهد الله...هتد) له‌و کاته‌دا پیاوێك له‌خزم و خوێشی سه‌علبه له‌وێدا ئه‌بێت و گوێ به‌وه‌وه ئه‌بێ، هه‌ڵئه‌سێ و دێت بۆلای سه‌علبه‌و پێی ئه‌ڵێ: ده‌رباره‌ت ئه‌و ئایه‌ته هاتووه، ئه‌ویش هه‌ڵئه‌سێت و دێت بۆ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) داوای لێ ئه‌کات که زه‌کاته‌که‌ی لێ وه‌رگرێ، ئه‌ویش ئه‌فه‌رموێ: خوا جڵه‌و گیریی لێکردووم که زه‌کاته‌که‌ت لێ وه‌رگرم، ئه‌ویش خۆڵ ئه‌کات به‌سه‌ری خۆیدا، پێغه‌مبه‌ریش(ﷺ) پێی ئه‌فه‌رموێ: ئه‌مه کرده‌وه‌که‌ی خۆته، من فه‌رمانم پێدایت و تۆیش به گوێت نه‌کردم، ئینجا که زه‌کاته‌که‌ی لێ وه‌رناگرێ سه‌علبه ئه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ماڵه‌که‌ی خۆی، ئینجا پاش ئه‌وه هه‌ر لێی وه‌رناگرێ، ئینجا دێته خزمه‌ت ئه‌بوبه‌کر -خوا لێی ڕازی بێ- پێی

ئەڵێ: بێگومان تۆ ئەزانی ڕادەو پلەی من لای پێغەمبەرو جێو شوێنم لەناو ئەنصاردا، کەواتە زەکاتەکەم لێ وەرگرە، ئەویش ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) لێی وەرنەگرتووی، لێی وەرناگرێ، ئینجا هەر لێی وەرناگرێ تا لەدنیا دەرئەچێ، ئینجا کە عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- ئەکرێ بە کار بەدەست دێت بۆلای و ئەڵێ: ئەی فەرماندەی بڕواداران زەکاتەکەم لێ وەرگرە، ئەویش ئەفەرموێ: نە پێغەمبەر(ﷺ) لێی وەرگرتووی و نەئەبوبەکر، من لێت وەرگرم؟ ئینجا ئەویش هەر لێی وەرناگرێ تا لەدنیا دەرئەچێ، ئینجا کاتێ کە عوسمان -خوا لێی ڕازی بێ- ئەکرێ بە کاربەدەست دێتە خزکەتی و ئەڵێ زەکاتەکەم وەرگرە، ئەویش ئەفەرموێ: نە پێغەمبەر(ﷺ) لێ وەرگرتووی و نە ئەبوبەکرو نەعومەر، ئایا من لێت وەرگرم؟ ئەویش لێی وەرناگرێ، ئینجا لەسەردەمی جێنشینیەتی ئەودا ئەمرێ، ئینجا ئایا ئەم ڕووداوە بووبێ لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا یا ڕووداوێکی تر، دەقی ئایەتەکە گشتییەو نەخشەی حاڵێکی گشتی ئەکێشێ، نموونەیەك نیشان ئەدات کە بڕوا لە دەروونیدا جێگیر نەبووبێ، بە هەر حاڵ و لەسەر هەر بار ئەبێ بڵێین: ئەم ڕووداوە شتێکی تایبەتییەو وەرنەگرتنی زەکات لە سەعلەبە، هەروەها تۆبەو گەڕانەوەکەی کە بەڕواڵەت دەری بڕیوەو بووە لەسەری، ئەو وەرنەگرتنی زەکات و تۆبەیە بە هۆی ئەوە بوو کە خوا پێغەمبەری(ﷺ) ئاگادار کردووە بەو ناپاکییەی کە دڵی سەعلەبەی داگیر کردووەو ڕزگار بوونی نابێ لێی، بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و ئەو درۆی کە کردی لەگەڵ خوای خۆی، ئەبێ بڵێین: ئەوە شتێکی تایبەتی بووە بە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو وەرنەگرتنی زەکات و تۆبەیە تەمێ و ئەدەب دادانە، ئەگینا بە کەسێك دابنرایە کەلە ئیسلام پاشگەز بووبێتەوە ئەبو ڕەفتاری لەگەڵ بکرایە بەو جۆرە واتە خوێن و ماڵی حەڵاڵ ئەکرا، ئەگەر بە موسڵمان دابنرایە ئەبو زەکات و تۆبەی لێ وەرگیرایە، هەروەها ئەگەر بەناپاکیش دابنرێ، چونکە ناپاك بە پێی ڕووکەش و ڕواڵەت بە موسڵمان دائەنرێ وەك موسڵمان ڕەفتاری لەگەڵ ئەکرێ و زەکاتی لێ وەرئەگیرێ، بەکورتی ئەم ڕوداوەو وێنەی نەبووە لە ئیسلامدا، هیچ ڕووداوو هیچ کەسێکی تر نابڕێتە ڕیزی ئەم ڕووداوەو ئەم کەسە کە باسکرا.

ئەو ناپاکانە هەر بەوەوە نەوەستان کە چرووکی و گیرو گرفت بەکار بێنن بۆ زەکات نەدان، بەڵکو تانەو تەشەریان ئەدا لە بڕواداران لە زەکات داندا، ئیتر چ بێنەواکانیان کەلەبەر بێ دەسەڵاتی شتی کەمیان ئەدا، چ دەسەڵات و سامان دارەکانیان کە بەلێشاو ئەیاندا،

ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾

**ئینجا ئەوا قورئان بەرگری ئەکات لەبڕواداران و ئەوان بێئابڕوو ئەکات و ئەم هەڕەشە سامناکەیان ئاڕاستە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾ ئەو کەسانەی کە تانەو تەشەر ئەدەن لەبڕواداران لەخێرو صەدەقەکاندا، ئەو بڕوادارانەی کەبە خۆشی و ئارەزووی خۆیان زیاد لە فەرز خێرو صەدەقە ئەبەخشن، ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ﴾ هەروەها تانەو تەشەر ئەدەن لەوانەی کە نیانەو دەستیان ناکەوێ مەگەر ئەندازێکی کەم کە هەر ئەوەیان لە توانادایە ﴿فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ﴾ ئینجا لاقرتی و دەم درێژیان پێئەکەن ﴿سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ﴾ خوا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ بەوێنەی کردەوەکەی خۆیان، بەم ڕەنگە ئەیانکات بە جێگەی لاقرتی بڕواداران و خەڵکی و بێباوەڕەکانی ئابڕوویان ئەکات بە دەرخستنی نیازو نیەتی بەدو وتارو کرداری ئابڕوبەریان، ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی سەختی ئێش و ئازار دەر. بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست لە ئایەتەکە چاك وایە هۆی هاتنە خوارەوەکەی بهێنین: (ئیبن و جەریر) لە(قتادە) و(ئیبن و ئەبی حاتەم) لە(عیکریمە) وە ڕیوایەت ئەکەن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان ئەدات و هانی موسڵمانان ئەدات لەسەر کۆمەك و صەدەقە بۆ غەزای تەبوك، ئینجا(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) چوار هەزار دینار ئەهێنێ و ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ماڵی من بریتییە لە هەشت هەزار دینار، نیوەم هێناوە بۆ تۆو نیوەم هێشتووە بۆ خۆم. ئەویش ئەفەرموێ: خوا پیت و فەڕت بداتێ لەوەی هێشتووەو لەوەی بەخشیوەتە، ئەبو عەقیل ساعێ خورما ئەهێنێ و ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا دوو ساع**

خورمام بووه، ساعێکیان ئەدەم بە قەرز بە پەروەردگارم، ساعێك بۆ ماڵ و منداڵم، ئینجا ناپاکەکان تەشەر ئەدەن لەهەردوو، ئەڵێن: ئایا خواو پێغەمبەر بێ پێویست نەبوون لەساعی ئەمە؟ لە ریوایەتێکدا ئەڵێن: ئەم خاوەن ساعە ئەیەوێ ناوی خۆی بخاتە ناو ناوان، ئا بەو جۆرە تەشەر ئەدەن و دەم درێژیی ئەکەن لەوەی زۆری بەخشی و لەوەی کەمی بەخشی، ئینجا خوایش بەو جۆرە بێئابرووی کردن و ئەو هەڕەشە سەختەی لێکردن. ئای هاوار بۆ کەسێك خوا بێئابرووی بکات و بیخاتە بەر لاقرتی خەڵکی! ئای هاوار بۆ ئەو عاقیبەت شەڕیی و بەد بەختییە بێجگە لە سزای ئاگری دۆزەخ، خوا پەنامان بدات ـ آمین ـ. لەچەند ریوایەتێکدا هاتووە کە ئەو ناپاکانە داوایانکردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) کە داوای لێبووردنیان لێ بکات لە خوا، ئینجا ئایەت هاتە خوارەوە چارەنووسی دیاریی کردن و هەواڵیدا کە هیچ سوود وەرناگرن و خوا لێیان نابوورێ، ئەفەرموێ: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ داوای لێبووردن بکە بۆ ئەوانە ﴿أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ یان داوای لێبووردن مەکە بۆیان، واتە هەردوو بارەکە یەکسانە بۆیان ﴿إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ﴾ ئەگەر حەفتا جار داوای لێبووردنیان بۆ بکەیت ﴿فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ﴾ هەرگیز خوا لێیان نابوورێ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەش ﴿بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ﴾ بەهۆی ئەوەیە ئەوانە بڕوایان نەهێناوە بە خواو بەنێراوەکەی خوا ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ خوا ڕێنموونی ئەوانە ناکات کە دەرچوون لە ئایین و گوێڕایەڵی خوا، واتە باوی خوا وا هاتووە کە ئەوانەی دامەزراو سوورن لەسەر سەرپێچی و لادان لە ئایینی خوا، خوا نایانخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆی. وتەی حەفتا بەکارئەهێنرێ بۆ زۆری و مەبەست ئەو ژمارە تایبەتییە نییە، کەواتە مەبەست ئەوەیە کە بەهیچ کلۆجێك ئومێدی لێبووردن نییە بۆ ئەوانە، چونکە بەهیچ ڕەنگ ناگەڕێنەوە بۆلای خوا، دڵی ئادەمی و خەڵکی کاتێ کە گەیشتە ئەوپەڕی ڕادە لە خراپی و تێکچووندا، تازە چاك نابێ و دەست نادات بۆ چاك بوون، گومڕایی کاتێ گەیشت بەڕادەی خۆی تازە چاوەڕوانی ناکەین بگۆڕێ بەرەو ڕێنموونی، خوا خۆی دڵەکان ئەناسێ.

﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾

---

ئینجا جارێکی تریش ئەگەڕێتەوە بۆ قسەو باس لەبارەی ئەوانەی کە بەجێ مان لە مەدینەداو بەشداریان نەکرد لە دەرچوون بۆ ئەو سەفەری تەبوکە لەگەڵ ئەو لەشکرەی کە ناوبرا بە(جیش العسرە) لەشکری تەنگیو سەختی. ئەفەرموێ: ﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ ئەو ناپاکانەی کە بەجێهێڵران لە مەدینەدا وازیان لێ هێنرا وەك شتێکی بێنرخی تووڕدراو، ئەو ناپاکانە کەیف خۆشو شادمان بوون بەدانیشتنو مانەوەیان لە مەدینەدا لەپاش فروستادەکەی خوا یان بەدژایەتیو پێچەوانەی فروستادەکەی خوا ﴿وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾پێیان ناخۆش بوو تێکۆشان بکەن بە ماڵیانو بە گیانیان لەڕێی خوادا، ﴿وَقَالُوا۟﴾ ئەیان گووت بە هاوڕێو هاوسەرەکانیان بۆ هاندانو سوور کردنیان لەسەر دەرنەچوون، یان ئەیان گووت بە بڕواداران بۆ سستکردنو خاوکردنەوەیان لەسەر دەرچوون، لەسەر هەر بار ئەوە پیشەی ناپاکانە کە فەرمان بدەن بە خراپەو بەرگری بکەن لە چاکە، ئەوانە ئەیان گووت: ﴿لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ﴾ دەرمەچن لەم گەرمایەدا، واتە کاتەکە سەختەو لە تواناداا نییەو بۆ خۆتان دانیشن. ئینجا قورئان بەرپەرچیان ئەداتەوە بە جۆرێ بە هەڕەشەیەکی سامناك بە لاقرتێیەوە کە زۆر تونو تاڵەو لە ڕاستیدا دوا ڕۆژو چارەنووسیانە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بلێ پێیان: ﴿نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا﴾ ئاگری دۆزەخ بەتین ترە لەبارەی گەرمیەوە، واتە ئەگەر ئەوانە لە گەرما ئەترسنو بەهۆی گەرماوە دەرناچن ئەی چۆن ناترسن لەئاگری دۆزەخ کە دواڕۆژو چارەنووسیان ئەبێ بەهۆی ئەو ناپاکیو سەرپێچییەی کە ئەیکەن لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ﴿لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە تێبگەنو ژیربوونایەو بیانزانیایە دۆزەخ بەو جۆرەیەو دواڕۆژی ئەوان بۆ دۆزەخە خۆشیو ڕەحەتی کەمیان هەڵئەبژارد بۆ خۆیانو دانەئەنیشتنو کەیف خۆش نەئەبوون بەو نەڕۆیشتنو جێمانە. ﴿فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا﴾ دەی با کەمێك پێبکەنن، واتە لەم ماوە کەمەداو لەم

جیهانه بڕاوەدا، بازۆر بگرین واته له ڕۆژە درێژەکانی ڕۆژی دواییدا که ڕۆژێکی ... هەزار ساڵی ئەم جیهانەیە! یان مەبەست ئەوەیە: کەواته شایسته تر بۆ ئەوانه بەڵکو پێویسته لەسەریان ئەمەیە کەم پێبکەنن‌و زۆر بگرین، بەهۆی ئەو هەموو سزاو ئازارو بەد بەختیەی که بۆی ئەچن، یان مەبەست هەواڵدانه به پێکەنینی کەم بەم جیهانەدا بەسەری ئەبەن، بەگریانی زۆر دوورو درێژ کەلە ڕۆژی دوایدا دووچاریان ئەبێ، بەم سێ جۆرە تەفسیرکراوەتەوەو لەسەر هەر بار ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ لەبەر تۆڵەو پاشه ڕۆژیان که دووچاریان

************ تاتەواوە ************

وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَـٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ

---

فەرمووی: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴾ نوێژ مەکە واتە ـ نوێژی مردوو ـ لەسەر هیچ کەسێك لەوانە کە مردبێ، لە ئێستا بەدواوە تا تۆ ماوی، مەوەستە بەلاسەری گۆڕەکەیەوە لەکاتی خستنە گۆڕو شاردەنەوەیدا بۆ نزاکردن بۆی کە دامەزراو بێت لە کاتی پرسیاری فریشتەی پرسیارو وەڵامدانەوەی بەوێنەی بڕواداران کە بەو جۆرەیان لەگەڵ ئەکەیت، وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە ئەبو داودو حاکمو بەزار ئەیهێنن لە عوسمانەوە ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ کە ئەفەرموێ: باوی پێغەمبەر(ﷺ) وابوو کاتێ مردوو ئەخرایە گۆڕو دائەشاردرا، ئەوەستا بەلای سەری گۆڕەکەیەوەو ئەیفەرموو: داوای لێبووردن بکەن بۆ براکەتان، داوای دامەزراوەی بۆ بکەن کە خوا دامەزراوی بکات، چونکە ئێستا پرسیاری لێ ئەکرێ، زانایانی تەفسیر چەند ڕووداوێکی تایبەتیان باسکردووە لەبارەی ئەم ئایەتەوە بەڵام بێگومان ئەوەی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ و نیشانی ئەدات گشتی ترە. وەك دەست نیشانمان بۆ کرد، ئەوەش ئەوەیە کە نابێ چاوپۆشی بکرێ لەوانەو هیچ شێوەی ڕێزیان نیشان بدرێ. دەقی ئایەتەکە هۆیەکی تایبەتی باس ئەکات بۆ نوێژنەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر هەر ناپاکێکی مردوو، نەوەستن بەلای سەری گۆڕەکەیەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ بێگومان ئەوانە بڕوایان نەهێناوە بە خواو بە نێرراوەکەی، ئەوان مردوون لەکاتێکدا کە ئەوانە دەرچوون لە ئایینی خواو سەرپێچیانکردووە لە فەرمانی خواو فروستادەکەی، واتە بەردەوام بوون لەسەر بێبڕواییەکەیان تا مردن، هەرچەند ئەم هۆیە بە ڕواڵەت تایبەتییە بەو نوێژ نەکردن و نەوەستانەوە کەباسکران، بەڵام یاسایەکی گشتی لێ وەرئەگیرێ کە نابێ ڕێزو بایەخ بدرێ بەوانە لەلایەن کۆمەڵی موسڵمانانەوە بۆ ئەوەی نرخ بۆ

ئەوانە نەمێنێتەوە لەناو گەل و کۆمەڵداو نرخ و بایەخ دان هەر بۆ ئەوانە بێت کە خۆگرو دامەزراون بەسەر تێکۆشان و فیداکاری لەڕێی خوادا، لە چەند ڕێگەیەکەوە هاتووە کە ئەم ئایەتە دەربارەی عەبداللە ی کوڕی ئوبەی هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی نوێژی لەسەر بکات و پاشان عومەری فاروق -خوا لێی ڕازی بێ- عەرزی کرد کە چۆن نوێژی لەسەر ئەکەیت کە ئەوە ئەوەی کردو ئەوەی کرد؟ لەپاشان نوێژی لەسەر کردو ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە، بەڵام ئەم ڕیوایەتەو چەند وێنەیەکی تری هەموو جێگەی قسەو باسێکی دوور درێژن لەلایەن زانایانەوە، زۆربە لەسەر ئەوەن کە ئەو ڕیوایەتانە صەحیح نین، لەبەرئەوە چاك وایە ئەم ئایەتە نەبیستن بە هیچ ڕووداوێکی تیبەتییەوەو لە دەقەکە لای نەدەین، خوا خۆی باش ئەزانێ، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَأَوۡلَٰدُهُمۡۚ ﴾ با سەرت سوڕ نەهێنێ ماڵ و سامان و ئەولادی ئەوانە بەم ڕەنگە بەشێکی بە نرخ و شیرینیان سەبر بکەیت، چونکە: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾ خوا هەر ئەوەی ئەوێ کە سزایان بدات لەدنیادا، گیانیان دەرچێ لە کاتێکدا کە ئەوانە بێبڕوابن، وێنەی ئەم ئایەتە تێپەڕیکرد لەئایەتی(٥٥)ی ئەم سوورەتەدا، بەڕوونترو درێژتر تەفسیریمان کردووە، کەواتە پێویست نییە بە دووبارە کردنەوە، بەس ئەوەندە هەیە دووبارە کردنەوەی لێرەدا بۆ ئەمەیە کە هیچ ڕێزو نرخێك دانەنرێ بۆ ماڵ و ئەولادیان، چونکە سەرسوڕمان لە هەر شتێك جۆرێکە لە نرخ و ڕێز پێدانێکی هەستی و ویژدانی، ئەوانەش شایستەی هیچ جۆرە ڕێزێك نین، بەڵکو هەر شایستەی ڕیسواکردن و گوێ پێنەدان و توڕ دانن.

ئینجا بە شێوەی گشتی دەست نیشان ئەکات بۆ بارو حاڵی ناپاکان لەبارەی تێکۆشان و فیداکاری بە ماڵ و بەگیان کە ئەوە بەهێزترین نیشانەی بڕوایە بە خواو بە پێغەمبەرو بە ئیسلام، وەك دەست نیشان ئەکات بە حاڵ و باری بڕوادارانی ڕاستەقینە لەو بارەیەوە بەجۆرێ دەرئەکەوێ دژایەتی ئەو دوو حاڵ و بارە، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ﴾ کاتێ سوورەتێك بهێنرێتە خوارەوە بەمەی کە بڕوا بهێنن بە خواو تێکۆشان بکەن لەگەڵ نێرراوەکەی،

ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُواْ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ

---

**﴿ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ﴾ ئەوانەی کە خاوەن سامان و دەسەڵاتن لەو ناپاکانە ئیزن لێ ئەخوازن ﴿وَقَالُواْ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ﴾ ئەڵێن لێمان گەڕێ و وازمان لێ بێنە با لەگەڵ دانیشتووەکان بین، لەوانەی کە دەستەپاچەو ناتواناو ئافرەت و منداڵن، ئەوانە کە خوا دەسەڵات و توانی پێداون، لەباتی سوپاسی ئەو چاکەو بەهرەی خوا بکەن و زۆر بە گرنگی پەلامار بدەن و بێنە مەیدان و شەرەفی جیهادو فیداکاری وەرگرن، کەچی زۆر بە داخیانەوە دەربەستیعارو سەر شۆڕ نایەن، ئەوەتا: ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ﴾ ڕازی بوون بەمەی کە لەگەڵ دەستەپاچەو منداڵ و ئافرەتەکان بن ﴿وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ مۆر نراوە بەسەر دڵەکانیاندا ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾ بەهۆی ئەوە نازانن و تێ ناگەن نەزان و بێئاگان لەسوودو قازانج و زیانی خۆیان، ئەو نەفام و بەش براوانە بەو جۆرەن ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ بەڵام پێغەمبەرو نێرراوەکەی خواو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە لەگەڵی، واتە بڕوایان پێهێناوەو وان لەگەڵی لە هەموو کارێکی پێویستدا ﴿جَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ تێکۆشان ئەکەن بە ماڵیان و بەگیانیان ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ﴾ ئەوانە هەر بۆ ئەوان هەیە ـ نەک بۆ ئەو ناپاک و دژانە ـ هەموو خێرو خۆشی و سوودو بەرهەمی چاک، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانە هەر ئەوانن گەیشتوون بە ئامانج و گەیشتوون بە سەربەرزی دنیاو خۆشبەختی ڕۆژی دوایی ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆیان باخات و بەهەشتانێ کە ڕووبارەکان دێن و ئەچن لە ژێریاندا، بە جۆرێ ئامادەی کردووە کە ئەوانە هەمیشەیی بن تیایاندا بەبێ دواهاتن و بڕانە بۆیان،**

ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٠﴾

﴿ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەپاش ئەوە باسی ناپاکەکانی مەدینەی کرد، ئینجا باسی ناپاکەکانی کۆچەرو لادێیەکانی عەرەب ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ﴾ لە عەرەبە کۆچەرەکان ئەوانەیان کە عوزرو بەهانەیان هەبوو هاتن بۆ ئەوەی ئیزن بدرێ بۆیان لەدەرنەچوون، واتە هاتن ئەوانەیان کە عوزرو بەهانە هێنەرن، ئیتر لەڕاستیدا عوزرو بەهانەیان بوو بێ یان بەدرۆ عوزرو بەهانەیان هێنابێتەوە، بەم دوو جۆرە تەفسیر کراوەتەوەو هەردوو هەڵئەگرێو ئەگونجێ، بەڵام باری یەکەم بەهێزترە دێتە دڵەوە بە بەڵگەی ئەوە کردویەتی بە هاوتای ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ﴾ دانیشتن لە جەنگکردنو هاتن بۆ عوزر هێنانەوە ئەوانەی کە درۆیانکرد لەگەڵ خواو پێغەمبەر، واتە بە ڕووکەشو ڕواڵەت خۆیان بە بڕوادار دائەناو لافی بڕوایان لێ ئەدا، کەچی درۆیان ئەکرد، بێگومان ئەمانە ناپاکی تەواون، بێجگە لەو دووبارە بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە بەم ڕەنگە مەبەست بە(المعذرون) ئەوانە بن کە بە درۆ عوزرو بەهانەیان هێنابێتەوە ئەو کاتە ئەبێ مەبەست پێیان هەر ئەمانە بن کە ناوی بردن بەم دانیشتوانە، مەبەست لەم دەستەواژەیە لەکەدار کردنو ناشیرین کردنیانە بەم دوو سیفەتە بەدە:

١- دانیشتن لە تێکۆشان.

١- درۆ کردن لەگەڵ خواو پێغەمبەر(ﷺ).

لەسەر هەر بار ئەو عەرەبە کۆچەرانە بە تێکڕاییو هەموو بەدو بێبڕوا نەبوونو بە یەک چاو سەرنج نادرێن، وەک دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بێگومان لە داهاتوودا دووچاری ئەوانەیان ئەبێ کە بڕوایان نەهێنابێ سزایەکی سەختی ئێشو ئازاردەر، ئیتر مەبەست سزای ئاگری ڕۆژی دوایی بێت، یان مەبەست سزای هەردوو دنیا بێت وەک هەڕەشەی پێکرد لەئایەتی پێشووی(٧٤)دا، خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ بە سزاکانی خۆی.

﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾

---

ئینجا بەدرێژیی باسی ئەو عوزرو بەهانانە ئەکات کە شەرعین و وەرگیراون لای خواو پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ﴾ نییە لەسەر لاوازو کەوتەکارو پەکەوتووەکان ﴿وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ﴾ نییە لەسەر نەخۆشەکان ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ﴾ نییە لەسەر ئەوانە کە بێنەوان و نیانەو دەستیان ناکەوێ ئەوەی کە بەکاری بێنن و بەختی بکەن بۆ پێویستی خۆیان و ئەوەی ئەرکی لەسەریانە، نییە لەسەر هیچ کام لەمانە کە باسکران هیچ تەنگی و گوناهێك لەسەر دەرنەچوون و بەشداری نەکردن لە جەنگ و تێکۆشان لەرێی خوا ﴿إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ کاتێ کە ئیخلاص و ڕاستییان ببێ بۆ خواو نێرراوەکەی خوا، ئیخلاص و ڕاستی بە بڕوای ڕاست و گوێڕایەڵی بە وتارو بەکردار، بە هەڵسان بەوەی لە توانایاندایە لە بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾ نییە لەسەر ئەو چاکەکەرانە کە ئیخلاص و ڕاستیان هەیە بۆ خوا. هیچ جۆرە ڕێگەیەك بۆ تاوانبار کردن و لەکەدار کردنیان و هیچ جۆرە گلەییەك لێیان لە بارەی دانیشتن و بەشداری نەکردنیان، هەر کەم و کوڕیەکیان هەبێ خوا لێ بوردەی میهرەبانە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوا لێبووردەی میهرەبانە، لە پێشەوە باسی هێندێکی کرد کە ساغ و توانا بوون بەڵام بێنەوا بوون و توێشوو هۆی ژیانیان نەبوو، ئینجا لێرەدا باسی دەستەیەکی تر ئەکات کە پێویستیان هەبوو لە حوشترو ولاغی سواری، ئەمانەش ئەگیرێ بە خاوەن عوزری شەرعی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ گوناهو تەنگی نییە لەسەر ئەوانەی کە کاتێ هاتن بۆلای تۆ ـ ئەی پێغەمبەر ـ بۆ ئەوەی حوشترو ولاغی سواریان پێبدەیت و سواری پێبکەن، یان هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ تاوانبار کردنی ئەوانەی کە هاتن...هتد، ﴿قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ تۆیش گوتت دەستم ناکەوێ ئەوەی کە بتانخەمە سەر پشتی و سواری

پێبکەن، ئینجا ئەوانیش ﴿تَوَلَّوا وَّأَعۡیُنُهُمۡ تَفِیضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ﴾ ڕۆیشتن‌و پشتیان تێکردی لەکاتێکدا چاوەکانیان پڕبوو هۆنەی ئەکرد لە فرمێسك ﴿حَزَنًا أَلَّا یَجِدُوا۟ مَا یُنفِقُونَ﴾ لەبەر داخ‌و غەمی ئەوەی کە بەختی بکەن‌و بەکاری بێنن بۆ ئەو مەبەستی خۆیانە، ئەمە شێوەو نموونەیەکە لە حەزو سۆزێکی بەهێزو ڕاستەقینە بۆ تێکۆشان‌و فیداکاری کە ئەو تاقمە بوونایە، ئەمە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە کە چەند ڕیوایەتێك هاتووە لەدیاریی کردنی ناوی ئەوانەدا، زۆربە لەسەر ئەوەن کە ئەوانە حەوت کەس بوون‌و بەناو بانگن بە:(البكائون السبعة) —خوا لێیان ڕازی بێ—و ئێمەش بەشدار بکات لەو سۆزو ئارەزووەدا ـ آمین ـ

ئابەو ڕۆحە بەرزە ئیسلام سەرکەوت‌و زاڵبوو، بەوانە ئاڵای بەرز بوویەوە لە جیهاندا، ئینجا با سەرنجێکی خۆمان بدەین‌و بەراوردی خۆمان بکەین لەگەڵ ئەو کۆمەڵە بەختەوەرەدا، ئینجا ئەگەر هەستمانکرد بە بوونی ئەو ڕۆح‌و هەستە بەرزە لە خۆماندا، ئەوا داوای یارمەتی خواو بەرزی‌و سەرکەوتن بکەین، ئەگەر وا نەبووین ئەوا با هەر کۆڵ نەدەین‌و خۆمان نزیك بخەینەوە لەونە بەیارمەتی‌و ئیزنی خوا، ئینجا بە جوانی ئەزانم دەست نیشان کردن بۆ شتێکی گرنگ کە دەستەواژەی دواترین ئایەت ڕێنموونیمان ئەکات بۆی. ئەوەش ئەمەیە: هەرچەند ئەو هاوەڵ‌و موسڵمانانە داوای حوشتریانکرد بەپێی ئەو کات‌و چەرخە کەشتێکی تر نەبوو کە هات‌و چۆو گواستنەوەو سەفەری پێ بکرێ، بەڵام دەستەواژەکەی قورئان گشتییە‌و هەموو ئەم سەیارەو تەیارەو کەشتیانەش ئەگرێتەوە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ﴾ کاتێ ئەوان هاتنە لات بۆئەوەی هەڵیان بگری، ﴿قُلۡتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَیۡهِ﴾ گوتت دەستم ناکەوێ ئەوەی کە بتانخەمە سەری‌و هەڵتان گرێ، کەواتە دەست نەکەوتنی ئەم هۆی سەفەرو گواستنەوەی ئەمڕۆ بۆ ئەو کەسانەی کە پێویستیان هەبێ پێیان، عوزرو بەهانەیەکی شەرعییە بۆ دەرنەچوون بۆ غەزا، پاکی‌و بێگەردی بۆ ئەو خوایە کە ئەم قورئانەی نارد.

لێرەدا دوایی هات جوزمی دەیەم بە یارمەتی خواو هەزاران سوپاس‌و
ستایش بۆ ئەو پەروەردگارە میهرەبانەو داواکارم کە لێم
وەرگرێ‌و ئەوەی کە ماوە پێم تەواو بکات
١٤١١/٢/٥هـ.

﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ

ئەم جزمی یازدەیە پێکهاتووە لەمەی کە ماوە لە سوورەتی(التوبە) لە ئایەتی(٩٣) تا دوایی سوورەتەکەو سوورەتی(یونس) بەتەواوی. لە بەشی یەکەمی ئەم سوورەتەدا کە زۆربەی جزمی دەیەم بوو ئەندازێك دواین لە سروشتی ئەم سورەتە بە شێوەی گشتی، لەو کات و بارو حاڵەتەی کە پەیوەندی هەبوو بە هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتەوە دواین لە بارەی گرنگی ئەم سوورەتە لە باس و لە روونکردنەوەی دواترین پەیوەندییەکانی نێوانی گەل و کۆمەڵی موسڵمان لەگەڵ گەل و کۆمەڵەکانی تردا، ئەوەی کە لە بەشی یەکەمدا گوتراوە بەسە بۆ ناسینی ئەم ئایەتانەی کە دێت لەم سوورەتی بەرائەتە، کەواتە پێویست نییە بۆ ئەم بەشەی کە ماوە هیچ بڵێین لێرەدا، بە یارمەتی خوا لە سەرەتای سوورەتی(یونس)دا کە زۆربەی جزمەکە ئەو سورەتەیە، لە سەرەتای ئەو سوورەتەدا ئەدوێین لەوەی کە پێویستە بۆ ناسین و ناساندنی ئەو بەشەی جزمەکە.

یەکەم ئایەتی ئەم جزمە وەك تەواوکەر وایە بۆ دواترین ئایەتی جزمی دەیەم، بەڵام لە هەمان کاتدا هۆی پەیوەندی و پەیوەستیەکی بەهێزە بۆ ئەم جزمە لەگەڵ جزمی پێشوودا، کەواتە زۆر جوانە کە قاپی ئەم جزمە ئەکاتەوە بەم ئایەتەو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ﴾ رێگە بۆ تاوانبار کردن و لەکەدار کردن هەر لەسەر ئەوانەیە کە ئیزنت لێ ئەخوازن بۆ دانیشتن لە کاتێکدا ئەوانە بێ‌پێویست و دەوڵەمەندن، واتە ئەبێ ئەمانە تاوانبار بکرێن نەك ئەو خاوەن عوزرانەی کە لە دوو ئایەتی پێشوودا باسکران، ئەمانە تاوانبارن کە تواناو دەسەڵاتدارن لەگەڵ ئەوەدا: ﴿رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ﴾ رازی بوون بەمەی لەگەڵ ئافرەت و مناڵ و دەستەپاچەکاندا بن، ﴿وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ خوا مۆری ناوەبەسەردڵەکانیاندا﴿فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوەنازانن،نازانن ئەوەی کەئەوان رازین پێی سەراسەر مایەی زیانبارییە لەهەردودنیادا،نەزان و بێ‌ئاگان بەهۆی ئەوەوەبێزارن لەتێکۆشان لەرێی خوادا کەمایەی زیندوویی یە لە هەردوو دنیادا. ئینجا هەروا ئەڕوات لەسەریان، حاڵ و باریان باس ئەکات لەپاش گەڕانەوەی پێغەمبەرو بڕواداران بۆ لایان ئەفەرموێ: ﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ﴾ عوزروبەهانەتان بۆئەهێننەوە،کاتێ کەئێوەگەڕانەوەبۆلایان،

قُل لَّا تَعْتَذِرُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ

﴿قُل لَّا تَعْتَذِرُواْ﴾ ئـەی پێغەمبـەر بڵـێ بەوانـە عـوزرو بەهانـە مەهێننـەوە بـۆ نـەهاتن و بەجێ‌مانەكەتان، چونكە: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ﴾ هەرگیز ئێمە بڕواتان پێناكەین، كەواتە عـوزرو بەهانەكـەتان هـیچ سـوودی نابـێ، هـۆی بـڕوا نەكردنەكـەشمان ئەمەیـە: ﴿قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ﴾ بە ڕاستی خـوا هـەواڵی پێداین لـە هێنـدێ لـە هـەواڵ و دەنگ و باسـەكانتان كـە هۆی بڕوا نەكردنەكەمانە، كەواتە قسەكانتان هیچ سوودی نییە، بەڵكو كردەوەی داهاتووتـان حسابە، ئەگـەر ڕێـك بـوو ئـەوا چاكە ئـەگینا هـیچ، وەك دەسـت نیشان ئـەكات بـۆ ئـەوە كـە ئەفـەرموێ: ﴿وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ﴾ لەمـەو پاش خـوا كردەوەتـان ئـەبینێ، نێرراوەكەشـی ئەیبینێ، ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئێوە ئەگێڕێنرێنـەوە لـە ڕۆژی دواییدا بۆلای زانای هـەموو پۆشیدەو ئاشكراكان، واتـە بـۆلای ئـەو خوایـە كـە ئاگـاو زانایـە بـە هـەموو شتێ، چ ئـەوەی كـە نهێنـی و شـاراوەیە لـە خـەڵكی، چ ئـەوەی ناسـراوو ئاشكرایە لایـان، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجـا ئـەو زانایـە هـەواڵتان پێ‌ئەدات بـەوەی كـە كردووتانە لە دنیادا، پرسیارو موحاسەبەتان لەگەڵ ئەكات و بە پێی كردەوەكانتان ڕەفتارتان لەگەڵ ئەكات، كەواتە وریای خۆتان بن لەم ماوەی ژیانەتاندا هەوڵ بدەن بۆ چارەسـەرتان، بـە ڕاستی هەڕەشەو ترساندنێكی سەختی تێدایە. ﴿سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ﴾ لەمـەو پاش سـوێند ئـەخۆن بـە خـوا بۆتـان، كاتێ ئەگەڕێنـەوە بـۆ لایان ﴿لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ﴾ بـۆ ئـەوەی چاوپۆشییان لێ بكەن و لۆمەو سەرزەنشتیان نەكەن و بێدەنگ بن لێیان. ئەو ناپاكانە لایان وابوو كە پێغەمبەرو هاوەڵەكانی لەو سـەفەرەدا تیا ئەچن و ناگەڕێنەوە، ئینجا كە گەڕانەوە ئەبێ دەست بكەن بە سوێندو پاكانەی درۆ خۆیـان ڕزگار بكـەن لـە تانـەو تەشـەرو ئابڕوو بردنیان، ئەوانە مەبەستیان ئەوە بوو بە ڕەزامەندییەوە چاوپۆشییان لێ بكرێ،

فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا

---

بەڵام لەبەر ئەوەی شیاوی ئەوە نەبوون فەرمانیدا بە پشت تێکردن و ڕوو لێ وەرگێڕانی خەشم و نیگەرانی فەرمووی: ﴿فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ﴾ دەی ڕوویان لێ وەرگێڕن و پشتیان تێبکەن بەمەی قسەیان لەگەڵ مەکەن و سەلامیان لێ نەکەن، وەک(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ -خوا لێی ڕازی بێ-(مقاتل) ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەرو یارانی گەیشتنە بەرەوە فەرمووی: لەگەڵیان دامەنیشن و قسەیان لەگەڵ مەکەن، ﴿إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ﴾ بە ڕاستی ئەوانە پیسن ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ﴾ جێ و شوێنی ئەوانە دۆزەخ ئەبێ لە ڕۆژی دواییدا ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ بەو تۆڵەیە بە هۆی ئەو تاوان و خراپەی کەلە دنیادا کردیان و بەردەوام بوون لەسەری لەماوەی ژیانیاندا، ئای مەرگ و بەدبەختی بۆ کەسێك کە خوا لە قورئانەکەیدا جاڕی پیسی لێ بدات و بە پیسی ناو ببا، بڕیاری دۆزەخی دابێ بە جێ و شوێنی هەر لە دنیادا!! خواپەنامان بدا بە میهرەبانی خۆی ﴿يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ﴾ فەرمووی: ئەوانە سوێندتان بۆ ئەخۆن بۆ ئەوەی ئێوە ڕازی بن لێیان، ئینجا قورئان بەم شێوە سەختە ئەدا لە دەماغیان و نیازو مەبەستەکەیان بە پووچ و بێ‌نرخ دەرئەخات و تیرێکی ژاراوی ئەدات بە بەنۆکەی جگەریانداو ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ﴾ ئینجا ئەگەر ئێوەش ڕازی بن لێیان ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ بێگومان خوا ڕازی نابێ لە کۆمەڵی یاخییان و دەرچووان لە فەرمانی خواو لە سنووری ئایینی خوا، واتە ئەگەر ئێوە بەو سوێندو پاکانەی ئەوانە ڕازی بن لەوانە، ڕەزامەندییەکەتان هیچ سوودی نابێ بۆیان، چونکە ئەوانە لە ئایینی خوا دەرچوون و خوایش لەوانە ڕازی نابێ، هەرکەسیش خوا لێی ڕازی نەبێ ڕەزامەندی هەموو جیهان و جیهانیان چارەسەری دەردی ناکات.

لەم ئایەتانی داهاتووەدا ﷺ ئەگاتە ئایەتی(١١٠) دەست نیشان ئەکات بۆ چەند دەستەو تاقمێك کەلەو کاتەدا لەوناو گەلی موسڵماندا بوون، یەکێ لەوانە عەرەبە کۆچەرەکان بوون کە پێیان ئەگوترا:(اعراب)، کەسێك لەوان بوایە پێی ئەگوترا(اعرابی) بە عەرەبی نیشتەجێ و دێهاتی و شارستانی ئەگوترێ: عەرەب و هەرکام لەوانە پێیان ئەگوترێ:(عربی)، چەند تیرەو تایفەیەك لەو عەرەبە کۆچەرانە لە دەورو بەری مەدینەدا بوون و پێش موسڵمان بوونیان چەند جار پەلامارو هێرشیان ئەدا بۆ سەر مەدینە، لەپاش موسڵمان بوونیان بە شێوەی گشتی ئەم دوو جۆرەیان تێدا هەبوو کە باسیان دێت لەم ئایەتانەدا، لەیەکەم جارەوە بە شێوەی یاسایەکی گشتی سروشتیان نیشان ئەدات و دوو سیفەتیان بۆ باس ئەکات:

یەکەم: ئەفەرموێ: ﴿ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرًا وَنِفَاقًا ﴾ عەرەبە کۆچەرو لادێییەکان بەتین تر لەبارەی بێبڕوایی و ناپاکییەوە بەتین ترن لە عەرەبە نیشتەجێی و شارستانیەکان.

دووەم: ﴿وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ﴾ شیاو و شایستەترن بەوەی نەزانن سنوورەکانی ئەو شەریعەتەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە، ئەوەش بەهۆی وشکی و دڵڕەقی و دوورییان لە زانایان و ئامۆژگاری کەران و دووریی و بێبەشییان لە کۆر وبینینی پێغەمبەرو یارانی لەو کاتەدا، واتە ئەوانە مافی ئەوەیان هەیە و شایستەی هەر ئەوەن بە پێی سروشتی تایبەتی خۆیان، هەرچەندە ئیسلام و بڕوا هێنان بە ئیسلام تا ڕادەیەکی زۆر زۆریانی پاك و خاوێن کرد لەو سیفەت و ڕەوشتەبەدانە، وەك لەمەو پاش باسی ئەوانە دێت، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ خوا ئەوپەڕی ڕادە زانای کاردروستە، زانایە بە حاڵ و بەسەرهاتی بەندەکانی و سیفەت و سروشتیان، کاردروست و لێزانە لە دابەشکردنی لێهاتن و ئامادەییەکاندا، لەو جۆر بەجۆرییە کە دایهێناوە لەناو دروستکراوەکانیدا، زانایە بەوەی لەدڵی بەندەکانی دایە و کاردروستە لە هەموو بڕیارەکانیدا.

لەپاش ئەوەی سیفەت و نیشانەی سەرەکی و گشتی ئەو کۆچەرانەی باسکرد، ئینجا جۆرەکانیان باس ئەکات، ئەوەش بەپێی کار کردنی ئیسلام و بڕوا بە ئیسلام لەو دڵانەدا کە ئەوەندە وشك و ڕەق بوون ئامادەییان نەبووبێ، ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا﴾ لەو عەرەبە کۆچەرانە کەسێکی وا هەیە کە ئەوەی بەختی ئەکات لەڕواڵەت ئەیدا لەڕێی خوادا، ئەوە دائەنێ بەباج و زیان کە بەناچاری دووچاری ئەبێ، چونکە بەڕیا و ڕووپامایی و لەترسان ئەیدات، نەك بە ئومێدی ئەجرو پداشت و ڕەزامەندی خوا،

وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ

---

﴿وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ﴾ چاوەڕوانی نەمان و لەناو چوون و بەسەرهات و ڕووداوە سەختەکانی چەرخ و ڕۆژگارتان بۆ ئەکەن، بەڵکو ڕزگار بن لێتان، ئاواتە خوازن کەی ڕۆژێك بێت ئێوە تێدا بچن و دوژمن زاڵ ببێ بەسەرتاندا؟ ئینجا بەرامبەر ئەو نیازو ئاواتە بەدەی ئەوانە خوا نزای شەڕیان لێ ئەکات، کە مەبەست بەنزای خوا بەدی هاتن و جێگیر بوونی ئەو نزایەیە، ﴿عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ﴾ واتە خوا بەسەر ئەوانەوە بێ بەسەرهات و ڕووداوی بەدو دەوری ئەوان بدات تا کەسیان دەرنەچێ، ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ خوا بیسەرە بۆ هەرچی ئەوانە ئەیڵێن، زانایە بەوەی ئەوان دەرئەخەن و دەری ئەبڕن و ئەوەی دەری نابڕن و ئەیشارنەوە بەڕاستی ئەم فەرمودەیە هەڕەشەیەکی سەخت و سامناك ئەدات بە گوێچکەو دڵ و دەروونی ئەو ناپاکانەدا، بەشێك لەو کۆچەرانە بەو جۆرەن، بەشێکی تریان کە ڕووناکی بڕوا داوێتی لەدڵیان بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ لەو عەرەبە کۆچەرانە کەسی وا هەیە کە بڕوای هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ﴾ ئەوەی کە ئەیبەخشێ و بەختی ئەکات لە شتە جۆر بەجۆرەکان هەرکام لەوانە دائەنێ بۆ خۆی بەهۆی نزیك کەوتنەوە لای خوا، بەهۆی سەڵەواتدانی فروستادەکەی خوا لێی، واتە ئەو شتانەی کە ئەیدا بۆ ئەوەو بەنیازی ئەوە ئەیدات کە ببنە هۆی نزیك کەوتنەوە لە خوا، ببنە هۆی سەڵەواتدانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری کە باوی وابووە سەڵەواتی داوە لەسەر ئەو کەسانەی کە ئەو خێرو صەدەقانەیان ئەکرد، وەك فەرمووی:(اللهم صل علي آل ابي عوف). ئەوانە کە بەو جۆرە بڕوای ڕاستەقینەی هەیەو کردەوەو نیازی پاکیان هەیە. ئەوانە خوای میهرەبان شایەتیان بۆ ئەدات بە پێی نیازە پاکەکەیان و موژدەی میهرەبانی خۆی ئەدات پێیان و ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ﴾ بێدارو ئاگادار بن کە بەڕاستی ئەو شتانەی کە ئەیدەن عیبادەت و هۆی نزیکین بۆیان لە خواوە

سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾

---

﴿سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ﴾ بێگومان خوا ئەیانخاتە ناو میهرەبانی خۆی، هۆی ئەو بەڵێنە گەورەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە، کەواتە تۆبەو گەڕانەوە وەرئەگرێ لە بەندەکانی، خێرو صەدەقەیان لێ وەرئەگرێ، لە گوناهو تاوانەکانیان ئەبورێ، میهرەبانی و بەزەیی بەکار ئەهێنێ لەگەڵ ئەوانەی کە بەدوای میهرەبانی خوادا ئەگەڕێن. لەپاش باسی جۆرەکانی عەرەبە کۆچەرەکان بە کورتی، ئینجا باسی جۆرو تاقمەکانی گەل ئەکات بەتێکڕایی، دانیشتوو، شارستانی، چ کۆچەر. ئەیانکات بە چوار جۆرو تاقم:

١- ئەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾ پێشکەوتووە یەکەمەکان کۆچەران و یارمەتی دەران ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ﴾ ئەوانەی بەدوای ئەواندا هاتن و پەیڕەوی ئەوانیانکرد کەلە کردەوەو ڕەوشتە چاکەکانیاندا ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ خوا لەوان ڕازیە بە وەرگرتنی کردەوە چاکەکانیان و پاداشت دانەوەیان، ئەوانیش لە خوا ڕازین بەئارامی دڵ بەو بەقەزاو قەدەری و سوپاس لەسەر چاکەکانی و خۆگریی لەسەر هەر بەسەرهاتێکی ناخۆش.

چەند ڕایەك هەیە لە مەبەست بەو پێشکەوتووە یەکەمجارانەدا، بەهێزترینیان ئەمەیە: ئەو هاوەڵانەن کەلەپێش ڕووداوی بەدردا کۆچیان کردبێ و یارمەتییان دابێ، مەبەست بە شوێن کەوتووەکانیان ئەوانەن کەڕێگەی ئەوانیان دابێتە بەرو لە ڕادەی بڕواو فیداکاریدا گەیشتنە پلەی ئەوان، هەرچەند بەو پێشکەوتنە ئەوان جیاوازیا بن لە هونەرو ڕێزو پاداشتدا.

گەلی موسڵمانی ڕاستەقینەی ئەم ئوممەتە لەوانە پێکهات و بوو بەهەڵگری ئاڵای ئیسلام و مامۆستای جیهان، ئەوان بوون لە هەموو تاقیکردنەوەیەکدا دەرچوون ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ ئامادەی کردووە بۆیان باخات و بەهەشتانێک کە ڕووبارەکان دێن و ئەچن لە ژێریاندا، بەجۆرێ ئامادەی کردووە کە ئەوانە نیشتەجێ بن لەو بەهەشتانەدا بە بێبڕاوەوە ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە کەلە هەموو ئامانجێك گەورەترە، بێگومان لەسەر هەموو بارو بەپێی هەموو ڕایەك ئەو چوار جێنشینەو هەرکام لە هاوەڵەکانی تر چ پیاو چ ئافرەت کە لەو چەرخ و چینی ئەو چوار جێنشینەدا بووبێ، بەری ئەم ئایەتەو بەڵێن و مزگێنی ئەم ئایەتە کەوتووە، کەواتە هەرکەس خۆی بە بڕوادار دابنێ ئەبێ چۆن بتوانێ دژی ئەوانە بێت بەتایبەتی چوار جێنشینەکە کە هەمیشە جێی ڕەزامەندی و ڕازو نیازی پێغەمبەر(ﷺ) بوون تا لەدنیا دەرچوو؟ بەڕاستی زۆر جێگای سەر سوڕمانە بۆ هەر کەسێك خۆی بە بڕوادار دابنێ لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە نەفام و نەزان و بێشەرم بێت ڕەخنە بگرێ و ناڕازی بێ لە کەسانێك کە خوا لە قورئانەکەیدا جاڕی ڕەزامەندی خۆی دابێ لەو کەسانە!!

بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە بۆ هەرکەسێك کە خۆی بە بڕوادار دابنێ و لەگەڵ ئەوەدا لای وابێ کە ئەو کۆمەڵە کە خوا جاڕی ڕەزامەندی خۆی لێدان و ئەو بەڵێنە گەورەی پێدان، ئەو کۆمەڵە لەپاش نەمانی پێغەمبەری ئازیز دەست بەجێ گەڕانەوەو پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام و ئایینە پیرۆزەکەی خوایان تێکداو بەناهەق و ناڕەوا بە پێچەوانەی فەرمان و وەسێتی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) جێنشینیان داناو تا ماوەی(٢٤) ساڵ هەرمانەوە لەسەر ئەو ناهەقی و بێشەرعییە گەورەیە!! هەرچۆنلا جێگای سەرسوڕمانە کە یەکێکی وەك ئیمامی عەلی وا دابنرێ کە بێدەنگ بوو لەو هەموو بێشەرعی و ناڕەواییەو بێدەنگ بوو لەو هەموو ستەم تاوانەو سەری کزکردو ئەو ماوە دوورو درێژە نوێژی کرد لە پشتی ئەو سێ جێنشینەوەو یارمەتیدان و شتی لێوەرگرتن!! بەڕاستی کەسێکی ژیر ئەبێ بیربکاتەوەو دڵی بشێوێ لەو قسە پڕو پووچانە، داواکارین لە خوای میهرەبان ئەو شتە پڕو پووچنە نەهێڵێ لەناو ئەم ئوممەتەدا، ئەوگومڕاوسەرلێ تێك چوانەبخاتەسەرڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام.

وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ ۖ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ

---

٢- لە جۆرەکانی گەل لەو کاتەدا دەستەیەکی تایبەتی هەبوو لە ناپاکان کەبە تەواوی دامەزرا بوون لەناپاکیدا، هەرچۆنێ دەستەو تاقمی یەکەم دامەزراو بوون لەپاکیو ئیسلامدا، ئەفەرموێ: ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ﴾ لەو عەرەبە کۆچەرانەی کە بەدەوروبەرتانەوەن ناپاکانێك هەن ﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ﴾ وەلە خەڵکی مەدینە کە ﴿مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ﴾ لێزانو دامەزران لەسەر ناپاکیو گەیشتوونەتە ئەوپەڕی ڕادە ﴿لَا تَعْلَمُهُمْ﴾ تۆ نایانناسی، واتە لەلێزانیو خۆپارێزیدا گەیشتوونەتە ڕادەیەك تۆ نایانناسی لەگەڵ ئەو هەموو ژیریو زانینەدا، ﴿نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾ ئێمە ئەیانناسین ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ﴾ بێگومان لەمەو پاش دووجار سزایان ئەدەین، ئیتر ئەو دوو جارە سزای بێئارامیو ترسی دەرکەوتنیان بێت، لەگەڵ سزای کاتی مردنیان کە فریشتە بەلێدانەوە گیانیان ئەکێشن وەك لەدەقی ئایەتدا هاتووە، یان سزاو داخی زاڵ بوونی موسڵمانانە لەگەڵ سزای مەترسی ئاشکرا بوونو دەرکەوتنیان، لەسەر هەر بار ئەو دوو سزایە لەم دنیایەدا بەدی هات، بێجگە لەسزای گەورەی ڕۆژی دوایی کەدەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئەگێڕێنرێتەوە بۆلای سزایەکی گەورە کە سزای ئاگری دۆزەخە، خوا پەنامان بدات لێی، ئینجا باسی دوو دەستەی تر ئەکات کەلەو کاتەدا هەبوون لەناو گەلو کۆمەڵی موسڵماناندا، یەکەم ئەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ﴾ کەسانێکی تر هەنو دانیان ﷻ بە گوناهەکانیاندا،

﴿خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا﴾ واتە لە کردەوەکانیاندا تێکەڵییان کردووە، بەم ڕەنگە کردەوەی چاکیانکردووەو کردەوەی بەدیشیان کردووە، وەك ئەوەی لەپێش و دوای تەبوکدا جیهادو تێکۆشانیان کردووە، لەڕووداوی تەبوکدا بەجێماون و بەشداریان نەکرد، وەك(حسن و سدی) ئەفەرموون،(کەلەبی) ئەفەرموێ: مەبەست تۆبەو گوناهە، یان مەبەست ئەوەیە لە هەردوو کردەوەکەدا تێکەڵیان کردووە، بەم ڕەنگە کردەوە چاکەکەیان تێکەڵ بووە بە کردەوەی بەدو بەدەکەیان تێکەڵ بووە بەچاکەوە. هیچ کام زاڵ نەبووە بەسەر ئەوی تردا و نەیشۆریوەتەوە، وەك ئەوەی نەچووە بۆ تەبوك و لەماڵی خۆی دانیشتووە بەبێ عوزرو بەبێ ئیزن خواستن، لەگەڵ ئەوەدا پاك و دڵسۆز بووە بۆ ئیسلام و هەستی کردووە بە گوناهباری خۆی و ترساوە لە کردەوەکەی، بەوێنەی کەسێك کە نوێژ بکات لەشوێنێکی داگیر کراودا، نوێژەکەی کە چاکە داگیر کردنەکەشی تێدایە کەبەدو خراپە، هێندێ لەزانایان بەو جۆرە تەفسیریان کردووەتەوە هەرچەند ئەگونجێ، بەڵام ڕای یەکەم بەهێزترە وەك لێکۆڵینەوەی تێدا کراوە لەسەر هەربار ڕای بەهێزو زۆربە لەسەر ئەوەیە کە ئەم دەستە موسڵمانن، ئیتر ئەوانە سێ کەس بووبن یان دە، یان حەوت کەس کە خۆیان بەستەوە بە ستوون و کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە کاتێ کە بیستیان ئایەت هاتە خوارەوە دەربارەی بەجێ ماوەکان، لەپاشان پێغەمبەر(ﷺ) گەشیتە بەرەوەو بەپێی باوی خۆی چووە مزگەوت و نوێژی کردو لەپاشان پرسیاریکرد لەوانەو وەڵام درایەوە کە ئەمانە سوێندیان خواردووە، خۆیان نەکەنەوە مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بیانکاتەوە، ئەویش فەرمووی: منیش سوێند ئەخۆم کە نایانکەمەوە تا فەرمانم پێنەدرێ، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ ئومێد وایە خوا تۆبەیان لێ وەرگرێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زاڵی لێبووردەی میهرەبانە، واتە هۆی وەرگرتنی تۆبەکەیان ئەمەیە، ئیتر تۆبەکەیان بریتی بووبێ لە دانان بە گوناهەکانیانداو پەشیمان بوونەوەیان لێیان وەك هێندێ ئەفەرموون، یان هەر بێجگە لەوە تۆبەی ڕێك و شەرعیان کردبێ وەك هێندێکی تر ئەفەرموون، بە هەرحاڵ ئایەتەکە

وا نیشان ئەدات کە تۆبەیان بووە، هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: ئەم ئایەتە لە هەموو ئایەتەکانی قورئان زیاتر جێگەی ئومێدە، هێندێ تر ئەفەرموون: لەهەموو ئایەتێك زیاترجێگەی ئومێدیی ئایەتی سوورەتی(الزمر)ە: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ مَسَّ.. ﴾ بێگومان ئەم ڕایە بەهێزترە لە دڵدا، لەو کاتەدا ئەوەی لەم ئایەتانی ڕابوردووەدا وەرئەگیرێ ئەمەیە: ناپاکانی ئوممەت دوو جۆر بوون: دەستەیەکیان ئەناسران بە وتەو کردەوەکانیان، دەستەیەکی تریان ئەوەندە لێزان و تەڵەکە بازبوون نەئەناسران، ڕاستی ئەو دوو لە هەموو چەرخێکدا هەر بوون و هەر هەن، بەتیبەتی ناپاکەکانی دەستەی ڕامیاری، کە پەیوەستن بەبێگانەوەو لەناو موسڵمانان و وڵاتی ئیسلامدا بۆ بێگانە کار ئەکەن، ئەگەر ئەو دار دەستانە نەبوونایە وڵاتی ئیسلام ئاوای بەسەر نەئەهات، هەروەها وەرگیرا کە کۆمەڵی موسڵمانانی ئەو چەرخە پێکهاتبوو لەو سێ دەستەیە:

١- پێشکەوتووە یەکەمەکانی کۆچەران و یارمەتی دەران.

٢- شوێنکەوتووە ڕاستەقینەکانی ئەوان.

٣- ئەم دەستەیە تێکەڵ و پێکەڵە،

ئینجا دەستەی یەکەم هاوتایان نەبووەو نابێ و ناگونجێ دووبارە بوونەوەیان، لە هەموو چەرخێکدا دەستەی دووەم هەر بووەو هەر ئەشبێ ئیتر زۆر یان کەم، زۆربەی ئوممەت لەم چەرخەو لە زۆر لە چەرخەکانی تریشدا لەم بەشی سێیەمە پێکهاتووە، بەدترین کردەوەکانیان ـ کەبوو بە بنەڕەت و هۆی سەرەکی هەموو کردەوە بەدەکانی تر ـ وازهێنانیان بوو لە تێکۆشان و فیداکاریی بەماڵ و بەگیانیان، خوا بە میهرەبانی خۆی ئەم ئوممەتە بێدار بکاتەوە لەو خەوی بێئاگاییەو بە یارمەتی و میهرەبانی خۆی دەستی کردووە بەبێدار کردنەوەیان لە هەموو جیهاندا، هەموو سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوا میهرەبان،(محمدی کوڕی سەعد) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئیبن و عەباس)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– کە ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بە فەرمانی خوا ئەو سێ کەسەی بەرەڵا کرد ماڵ و داراییەکەیان بردەخزمەتی وگوتیان:صەدەقەی لێدەربکە لەباتی ئێمەو نزمان بۆ بکەو داوای سڕینەوەی گوناهمان بۆبکە،ئەویش فەرمووی:هیچ شتێکی لێوەرناگرم تافەرمانم پێ نەدرێ،

خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ

---

ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ﴾ وەرگرە لەماڵو داراییەکەیانیان صەدەقەیەك، ئیتر زەکات بێیان خێری تریش کە ﴿تُطَهِّرُهُمۡ﴾ کە پاکیان بکەیتەوە پێی و لەچڵك و چەپەڵی چنگ قوچراوی و دڵ ڕەقی و ناپیاویی و ئەو سیفەتە بەدانەی تر کە خاوەن ماڵ چەپەڵ ئەکەن ﴿وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ گەشە بکەیت بەدڵ و دەروونیان و بەرزو بڵندیان بکەیت بە پیت و فەڕی خوو ڕەوشت و کردەوەی پاك و خاوێن، ﴿وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ سەڵەواتیان لەسەر بدە، واتە نزای خێریان بۆ بکە، هۆی ئەو فەرمانەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ﴾ بەڕاستی نزاکەی تۆ ئارام و دڵخۆشییە بۆیان، بێئارامی گوناهەکەیان ناهێڵێ، مایەی وەرگرتنی تۆبەو خێرو صەدەقەیانە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خبیسەری زانایە، بیسەرو وەرگری نزاکەی تۆیە، زانایە بەو خێرو بەرژەوەندییەی کە لەو نزادا هەیە، بیسەرە بۆ داننانی ئەوان بە گوناهەکانیاندا، زانایە تۆبەو پەشیمان بوونەوەکەیان و ڕاستییەکان و پێ خۆش بوونیان بەو صەدەقەی کەکردیان.

ئامۆژگاری بەو جۆرە خوای میهرەبان منەتی نا بەسەر ئەوانەدا، چونکە زانی کە ڕاستن لە تۆبەکەیاندا، بەهۆی ئەوەوە فەرمانیدا کە زەکات و صەدەقەکەیان وەرگرێ و سەڵەواتیان لەسەر بدات، واتە نزایان بۆبکات، شتێکی بەناو بانگە کە سەڵەوات لەلایەن خواوە بریتییە لە بەزەیی و میهرەبانی خوا دەربارەی ئەو سەڵاوات لەسەر دراوە، لەلایەن مەلائیکەوە بریتییە لە نزاو داوای لێبوردن و سڕینەوەی گوناه، لەلایەن ئێمەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لە داواو نزای ئێمەی بۆی بەو جۆرو شێوەی کەلە پاش تەحیات ئەیڵێین، هەروەها لەپاش بانگ کەئەڵێین:(اللهم رب هذه الدعوة التامة...هتد).

پێغەمبەر ئازیز(ﷺ) بە پێی فەرمانی خوا بە وتەی سەڵاوات نزای ئەکرد بۆ زەکات و صەدەقەدەرەکان،(ئیمامی بوخاری و موسلیم) حەدیسێك ئەهێنن لە(عبدالله ی کوڕی بەو عەوف)ەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) باوی وابوو کاتێ زەکاتیان ئەهێنایە خزمەتی

ئەیفەرموو:(اللهم صل علي فلان)، کاتێ باوکم زەکاتەکەی هێنا فەرمووی:(اللهم صل علي آل ابي عوف) بەوتەی تریش نزای کردووە بۆ زەکاتو صەدەقە دەر، وەك(نەسائی) ڕیوایەتی ئەکات لە(وائیلی کوڕی حەجەر)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی پیاوێك کە حوشترێکی چاکی لە زەکاتدا، فەرمووی:(اللهم بارك فيه وفي إبله) هەروەها جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە سوننەتە بۆ کاربەدەستانی ئیسلامیش نزا کردن بۆ زەکات دەرەکان، وەك(ئیمامی بوخاری) ئەوەی کردووە بەباسێکی سەر بەخۆ، ئەفەرموێ:(صلوة الإمام ودعائه لصاحب الصدقة) بەس هێندێ لەزانایان ئەفەرموێ: نزای ئەمان بە وتەی سەڵەوات نابێو ئەو وتەیە تایبەتی بووە لە پێغەمبەر(ﷺ)، وەك(ئیمامی شافیعی)ش ئەفەرموێ: سوننەتە بۆ ئیمام کە صەدەقەی وەرگرت نزا بکاتو بڵێ:(آجرك الله فيما اعطيت، وبارك لك فيما ابقيت) خوا ئەجرو پاداشتت بدات لەوەی کە بەخشیوتەو پیتو فەڕت بداتێ لەوەی کە هێشتووتەوە، ئینجا بە جوانی ئەزانم لێرەدا ڕای زانایان باس بکەم سەبارەت بە سەڵەواتدانی ئێمە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)و پێغەمبەرانو مەلائیکەو ئالی پێغەمبەر. هەرچەند سەڵەوات بەبێ سەلام بەس بێت، بەڵام وەك باوە باشتر ئەوەیە کە سەلامیشی لەگەڵ بگوترێ، هەروەها باسی ئالیشی لەگەڵ بکرێ بەم جۆرە:(صلي الله عليه وآله وسلم). وەك لەنوێژدا باسیان هاتووە، زۆربەی موسڵمانان سەلام بە تەنیا بەکار دێنن بۆ پێغەمبەرەکانی ترو بۆ مەلائیکە، هەروەها بۆ ئالیشی بەلای کۆمەڵێکەوە، زۆر لەزانایانی ئەهلی سوننەتیش بە پێویستی ئەزانن گوتنی سەلام بۆ فاطمەو عەلیو حسنو حسین(عليهم سلام الله ورضوانه) ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکان. لەئایەتی پێشوودا فەرمووی: لەماڵو داراییەکانیان صەدەقەیەك وەرگرە کە بەوە پاكو خاوێنیان بکەیتەوەو بەوە گەشە بکەیت بەدڵو دەروونیان، واتە پێغەمبەری گێڕا بەخاوەنی هێندێ کارو باری موسڵمانان، ئینجا لێرەدا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە لەڕاستیدا هەموو کاروبارەکان بەدەست خوایەو خوا خاوەنیانەو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانبەرەو کارەکانی خوا بەدی ئەهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ﴾ ئایا ئەوانە نەیانزانیوە؟ واتە با بزانن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ﴾ کە خوا هەر ئەو تۆبەو گەڕانەوەی بەندەکانی وەرئەگرێ: ﴿وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ ئەو صەدەقەکان وەرئەگرێو قەبوڵیان ئەکات،

وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾

---

**﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ خوا هەر ئەو وەرگری تۆبەو میهرەبانە، واتە نە پێغەمبەرو نەهیچ کەس ئەو شتانەی بەدەست نییە، بەڵکو تەنها بەدەست خوایە، پێغەمبەر(ﷺ) کە هەر کارێك بکات بە ئیزن و فەرمانی خوا ئەیکات، ئینجا لە کۆتایی باسەکەدا فەرمان ئەدات کە فەرمان بدات و هانی بەجێماوەکان کە تۆبەیانکردووە بدات لەسەر کردەوەی چاك تا بەڵگەیت لەسەر ڕاستی تۆبەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَقُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿ٱعْمَلُوا۟﴾ کردەوەبکەن، واتە پەشیمان بوونەوەو تۆبە بە تەنیا بەس نییە، چونکە بەرنامەی ئیسلام عەقیدەو بیروباوەڕەو کردەوەیە کە نیشانە بێت لەسەر ڕاستی عەقیدەو بیروباوەڕەکە ﴿فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ ئینجا خواو فروستادەکەی و بڕواداران کردەوەکەتان ئەبینن، خوا ئاگاو زانایەو بە چاوی قودرەت ئەیبینێ، پێغەمبەریش ئاگادار ئەکات پێی و دەریشی ئەخات بۆ بڕواداران وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە(ئیمامی ئەحمەد) و چەند کەسێکی تر ڕیوایەتی ئەکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر هەرکام لەئێوە کردەوە بکات لەناو بەردێکی ڕەقدا کە نەقاپی ببێ و نە کونێك بێگومان خوا کردەوەکەی دەرئەخات بۆ خەڵکی هەرچۆن ببێ، واتە بڵێ پێیانکردەوە بکەن، چونکە نیشانەی ڕاستییان لە تۆبەکەیاندا لە دنیایەدا لەمو کردەوە ئاشکرایە، ﴿وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ بێگومان لەپاش مردنیان ئەگێڕدرێنەوە بۆلای زانای هەموو نهێنی و پۆشیدەو هەموو ئاشکراکان ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجا ئەویش هەواڵتان ئەداتێ بەهەرچی کە ئێوە لەجیهاندا کردووتانە، واتە بەپێی ئەوە پاداشت و تۆڵەتان ئەبێ، بێگومان ئەم ئایەتە ترسێنەریش و دڵ خۆش کەریشە.**

ئینجا باسی دەستەیەکی تر ئەکات لە بەجێماوەکان لە ڕۆیشتن بۆ تەبوك، ئەمانەش سێ کەس بوون لە هاوەڵەپاکەکان:(کعبی کوڕی مالیكو میرارەی کوڕی ڕەبیعو هلالی کوڕی ئومەییە) وەك(ئیبنو عەباسو مجاهدو عیکریمەو ضحاك)و کەسانێکی تر ئەفەرموون، ئەمانە هیچ عوزرو بەهانەیەکیان نەبوو، بەڵکو هەر ئەوە بوو کاتەکە کاتێکی سەختو گەرم بووو سەفەرەکە دوورو درێژبوو ئەوانیش سستی گرتنی، ئەمانە ـ وەك بە درێژی باسیان دێت ـ کاریان دوا خراو ماوەی پەنجا شەو بەسەرگەردانی مانەوە تا ئایەتی تەوبە هاتە خوارەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ﴾ لەو دواکەوتووو بەجێماوانە کەسانێکیتر هەبوون کە دوا خران بۆ حوکمو بڕیاری خوا ﴿إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾ یان سزایان ئەدات، یان تۆبەیان لێ وەرئەگرێ، واتە تا ئەو کاتە بەسەر نەچوو حوکمو بڕیاری بۆ دەرنەکردنو ئاشکرای نەکرد بۆ خەڵکی، ئەو ماوە ئەوانە بەو داخو مەراقەوە ژیان تا بەوە تەمێ خوار بوون، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا زانای کاردروستەو بە پێی ئەو زانینو کاردروستییە حوکمو بڕیارەکانی دەرئەکات.

لەم چوار ئایەتی داهاتووەدا داستانێکمان بۆ باس ئەکات کە هێندێ لەناپاکەکان هەڵسان پێی، ئەم داستانە ڕووداوێکی گرنگو ئاشکرا بوو لەو سەفەرو ڕووداوی تەبوکەدا، لەبەر ئەوە باسێکی سەربەخۆی تایبەتی کرا بەو چوار ئایەتە، ئینجا لەپێش هێنانی ئایەتەکاندا داستانە کە بەدرێژی بهێنین:(ئیبنو کەسیر) لە تەفسیرەکەیدا ئەفەرموێ: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم چوار ئایەتە ئەمەیە، پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێك هەبوو لە هۆزی خەزرەج ناو ئەبرا بە:(ابو عامر الراهب) ئەو پیاوە لە سەردەمی نەفامیدا بوو بەنەسرانی عیبادەتو خواپەرستی هەبوو، شەرەفو ڕێزێکی گەورەی هەبوو لەناو هۆزەکەیدا، خوێندەوارو شارەزا بوو لە زانیاری نامەدارەکاندا، ئینجا کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچیکرد بۆ مەدینە، موسڵمانان کۆبوونەوە لە دەوری، وتەی ئیسلام بەرز بوویەوە و خوا لە ڕۆژی بەدردا موسڵمانانی زاڵ کرد، ئەو نەفرین لێکراوە حەسادەت گرتیو دوژمنایەتی خۆی ئاشکرا کرد ڕایکرد بۆ مەککەو دەستی کرد بە هاندانی بت پەرستەکان لەسەر جەنگکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هەموو کۆبوونەوەو لەساڵی ڕووداوی(احد)دا هاتن بۆ سەر مەیدنە، ئەو نەفرین لێکراوە لەو جەنگەدا چەند بیرو چاڵێکی هەڵکەندو دایپۆشین بۆئەوەی موسڵمانانی

تێبکەوێ، پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە ناو یەکێکیان و لەو ڕۆژەدا دووچاری ناڕەحەتی بوو، ڕووی فەڕی زامدار بوو، ددانی شەهید بوو، سەری شکا، ئەو نەفرین لێکراوە هەر لەیەکەم جارەوە چوو بۆلای خزم و عەشرەتەکەی و دڵی دائەهێنان بۆیارمەتیدانی، ئینجا کاتێ کە قسەکەیان بیست گوتیان: خوا لەناوت بەرێ ئەی فاسق ئەی دوژمنی خوا! جوێن و قسەی ناشیرینیان پێگوت، ئەویش بە نائومێدی گەڕایەوە و ئەیگوت سوێند بەخوا خزمەکانم لەپاش من دووچاری شەڕو خراپە بوون! لەپێش ڕاکردنی بۆ مەککە پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد بۆلای خواو هێندێ لە قورئانی بەسەردا خوێند، بەڵام ئەو سەرپێچی کرد لەوەی کە موسڵمان ببێ، بەهۆی ئەوەوە پێغەمبەر(ﷺ) نزای لێکرد کە بەتەنیا و دەرکراوی بمرێ و نزاکەی گیرابوو لێی، ئەوەش بەم ڕەنگە کاتێ دەست خاڵی بوو لە ڕووداوی(احد) کارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تابێ دەرئەکەوێ و بەرز ئەبێتەوە بۆلای(هرقل) پادشای ڕۆم داوای یارمەتی لێکردو لەوێ مایەوە و نوسی بۆلای ناپاک و دڵ نەخۆشەکان بەڵێنی پێدان و دڵخۆشی دانەوە کەبە لەشکرێکەوە دێتەوە بۆ جەنگ و زاڵ دەبێ، فەرمانی پێدان کە شوێنێکی چاکی بۆ دروست بکەن هەرکەسێك لەلایەنییەوە بڕوا لەو شوێنەدا بمێنێتەوە بۆ گەیاندنی نامەو نووسراوەکانی، ئەو شوێنە ئامانە بێت بۆی کاتێ کە بچێتەوە بۆلایان، ئەوانیش دەستیانکرد بە دروستکردنی مزگەوتێك لای مزگەوتی قوبادا، دروستیانکردو خانوویەکی محکەم و تێرو تەواویان پێکهێنا، پێش دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ تەبوك لێبوونەوە و هاتن بۆ خزمەتی و داوایان لێکرد کە نوێژێکی تیا بکات، تا بەهۆی ئەوەوە بە مزگەوت بناسرێ، گوتیان ئەمە دروست ئەکەین بۆ لاوازو نەخۆش و کەوتەکارەکان لەشەوە ساردو زستانەکاندا، بەڵام خوا پێغەمبەری پاراست(ﷺ) لەوەی بچێ نوێژی تیا بکات، فەرمووی: ئێمە لەسەر سەفەرین، بەڵام کاتێ گەڕاینەوە ئەگەر خوا ویستی، ئینجا کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە بەئەندازی ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێکی مابوو بگاتە بەرەوە، جوبرەئیل هاتە خوارەوە و هەواڵی مزگەوتی(ضرار) ی پێدا، نیازی بەدی دروستکەرەکانی ئاشکرا کرد، بەهۆی ئەوەوە پێغەمبەر(ﷺ) ناردی ڕووخاندیان پێش ئەوەی بگاتە بەرەوە و هەر بەم جۆرە ڕیوایەتە لە(ئیبن و عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیرو مجاهد و قتادە و عوروەی کوڕی زوبەیر)ەوە. ئەمەیە ئەو مزگەوتەی کە خوا فەرمانیدا کەنابێ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی تێدا بکات، نوێژ بکات لەو مزگەوتەی کە هەر لەیەکەمجارەوە بناغەی لەسەر خوا پەرستی و لە خوا ترسی دامەزراوە:(مزگەوتی قباء)،

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ﴾

**ئینجا بابێینەوە سەر ئایەتەکان کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا﴾ واتە لە ناپاکەکان ئەوانەی کە مزگەوتێکیان دروستکردو فەراهەم هێنا، هەر گیز نوێژی تێدا مەکە، چوار شت ئەکات بەهۆو مەبەست لەدروستکردنی ئەو مزگەوتە:**

**١- ﴿ضِرَارٗا﴾ لەبەر زیان گەیاندن و هەوڵدان بۆ زیانباری موسڵمانان.**

**٢- ﴿وَكُفۡرٗا﴾ لەبەر بێبڕواییان و لەو مزگەوتەدا بێبڕوایی ئەنجام بدەن، یان لەبەر بەهێز کردنی بێبڕوایی.**

**٣- ﴿وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لەبەر تێکدانی کۆمەڵی بڕواداران و دووبەرەکی خستنە نێوانیان، واتە ئەو کۆمەڵەی کەپێکەوە بە کۆمەڵ نوێژ ئەکەن لە مزگەوتی قوباد.**

**٤- ﴿وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ﴾ لەبەر چاوەڕوانی کردنی ئەو کەسەی کە جەنگی لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی کردووە لەپێشەوە واتە ئەبو عامری نەفرین لێکراو، بۆ ئامادەکردنی جێ و شوێنێکی باش بۆ ئەوو وێنەی ئەوانەی کە ئەو مزگەوتەیان دروستکردووە بەو نیازە بەدانەو بۆ پێك هێنانی ئەو مەبەستە پیسانەی خۆیان ﴿وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ﴾ سوێند بە خوا وا سوێند ئەخۆن کە نیازی هیچ شتێکیان نەکردووە بێجگە لە چاکترین کارو کردەوە، وەك نوێژو باس و یادی خواو فراوان کردنی جێ و شوێن و ئاسان کردنی هات چۆی بێهێزو پەك کەوتووان، ﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ خوا شایەتی ئەدات کە ئەوانە درۆزنن و درۆئەکەن لەوەی سوێندی لەسەر ئەخۆن ﴿لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ﴾ هەرگیز نەوەستی تێیدا، واتە نوێژی تێدا نەکەیت وەك(ئیبن و عبّاس) ئەفەرموێ -خوا لێیان ڕازی بێ- بێجگە لەوە نەوەستان تیایدا بە هیچ ڕەنگ نەوەستان بۆ نوێژیش ئەگرێتەوە. ﴿لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ﴾ بێگومان مزگەوتێك کە لەیەکەم ڕۆژەوە بناغەی لەسەر خۆپارێزی و لە خوا ترسیدا دامەزرابێ، واتە مزگەوتی(قباء) هەروەها مزگەوتەی پێغەمبەر(ﷺ) لەمەدینەدا،**

أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾

---

﴿أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ﴾ شایستەترە لە هەموو مزگەوتێکی تر بەوەی تێدا بکەیت، یان ئەو مزگەوتە شایستەیە نەك مزگەوتی(ضرار)، ئینجا سیفەتی تریش باس ئەکات کە هۆی شایستەیەکەیەتی، ئەفەرموێ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ۚ﴾ لەو مزگەوتەدایە پیاوانێك کە پێیان خۆشە خۆیان پاك بکەنەوەو بە پاکی خۆیان ڕاگرن بە تۆبەو خوا پەرستی، هەروەها پاکی لەش و جەستەو پۆشاکیان، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾ خوایش ئەوانەی خۆش ئەوێ کە بەو جۆرە پاکیان ئەوێ و زۆر خۆیان پاك ڕائەگرن. ئینجا هۆی یەکەم دووبارە ئەکاتەوەو جیاوازی ئەو دوو مزگەوتەو دروستکەرو خاوەنەکانیان ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ﴾ ئینجا ئایا کەسێك کە بناغەی بیناو دروستکراوەکەی خۆی دامەزراندبێ لەسەر خۆپارێزی و ترسان لە خواو بەدوا گەڕانی ڕەزامەندی خوا، ئایا ئەو کەسە چاکە ﴿أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ﴾ یان کەسێك کە بناغەی بیناو دروستکراوەکەی خۆی دامەزراندبێ لەسەر لێوی کەندێکی وا کە لافاوبن کەندی کردبێ و ژێرەکەی بردبێ و هەمیشە لەڕوخاندابێت؟ واتە ئایا کەسێك کە ئایینەکەی دامەزراندبێ لەسەر بناغەیەك کە بێهێزو لاوازترینی هەموو بناغەیەك بێت کە بریتییە لە ناهەقی و ناپاکی، کەوێنەو چیرۆکی ئەو بناغەیە لێوی کەندێکە کەبن کەند بووبێ بەسەر دۆڵ و شیوێك بێ لەشیوەکانی دۆزەخ، جالەبەر ئەوەوا بەسەر لێواری ئەو کەندەبن کەند کراوەوە هەمیشە لە کەوتندایە، لەبەر ئەوەی وا بەسەر قەراغی دۆزەخەوە، کاتێ کەوت و

ڕووخا هەر ئەڕوخێتە ناو بێخی دۆزەخ، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ﴾ كەواتە ئەو بینایە بە دروستكەرەكەیەوە ئەڕوخێتە ناو ئاگری دۆزەخ، كورتەی مەبەست لەم چیرۆكە ئەوەیە: دروستكەری بینای یەكەم مەبەستی لە خوا ترسی و ڕەزامەندی خوایە، دروستكەری بینای دووەم مەبەستی بێبڕوایی و ناپاكی و یاخی بوونە لەخوا، كەواتە بینای یەكەم پاك و پیرۆزەو ئەبێ بهێڵرێتەوە، دووەم پیس و بۆگەنەو پێویستە بڕوخێنرێ، بەڕاستی وێنەو چیرۆكێكی نایابی كەس نەدیدەیەو هەر بە قورئان ئەكەوێ فەرمودە بفەرموێ، هەركەسێك بە فەرمودەی قورئان نەگەڕێتەوە لە خراپ و نەكەوێتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەو كەسە خۆی تاوانبارەو ستەم لەخۆی ئەكات ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ خوا ڕێنموونی ئەوانە ناكات كە ستەمكارن لە خۆیان و بە مەیل و ئارەزووی خۆیان ستەم و ناهەقی ئەكەن لەخۆیان، ئینجا لەكۆتاییدا شێوەیەك كە ئەخاتە پێش چاو لەسەرەنجام و بەرهەمی بەدی ئەو مزگەوتە بەدە، ئەفەرموێ: ﴿لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ﴾ بیناكەیان كە دروستیانكرد هەمیشەو بەبێ كۆتایی بێئارام و گومانە لە دڵەكانیاندا، واتە هۆی گومان و بێئارامییە هەموو كاتێك ﴿إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ﴾ مەگەر دڵەكانیان پارە پارە ببێ، واتە گومان و بێئارامی دڵیان دامەزراوەو هەر ئەمێنێ تا مابن و گیانیان تێدابێت و بەو گومان و ناپاكییەوە ئەمرن، لەبارەی بوونی ئەو بینایە بە هۆی گومان و بێئارامی دڵیان چەند شتێك گوتراوە بەهێز ترینیان ئەمەیە: ئەو ناپاكانە زۆر دڵشادمان بوون بەو مزگەوتە بەدەی خۆیان، ئینجا كاتێ كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا بە ڕووخاندنی خەشم و قینیان بەتین تربوو و گومانیان بەهێز تربوو لە پێغەمبەرێتیەكەیدا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا زانای لێزانی كاردروستە، بەپێی ئەو زانین و كاردروستییە بڕیاریدا بەسەر ئەوانەداو بارو حاڵی ئاشكراكردن، ئەو مزگەوتە بەدەی ئەو ناپاكانە دروستیانكرد بۆ زیان گەیاندن بە موسڵمانان و بەهێز كردنی بێبڕوایی و پیلان و دوژمنایەتی ئیسلام و موسڵمانان، ئەو مزگەوتە بەدە بە چەند جۆرێكی ترو لە چەند

وێنەیەکی تردا دروست ئەکرێ بۆ ئەو مەبەستە بەدو بۆگەنانە لەهەر چەرخێکدا بە جۆرو شێوەیەك کە کار بکات و بەکار بێت بۆ بەرگری ئیسلام و لاواز کردنی و ناشیرین کردنی شێوەی شیرینی، پێك ئەهێنرێ لە شێوەی هەوڵ و تێکۆشانێك کە ڕواڵەت و ڕووکەشەکەی بۆ بەرزی ئیسلامەو لەژێرو لەڕاستیدا بۆ نەهێشتن و لەناو بردنی ئیسلامە، چەند فیلم و کتێب و نوسراو بلاو کراوەتەوە لەبارەی ئیسلامەوەو ڕووکەش و ڕواڵەتەکەی بۆ بەرزی ئیسلامەو لەناوەرۆکیاندا دەست نیشانکراوە بۆ چەند شتێك کە بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ لەگەڵ ئیسلام و دژی ئیسلامن. موسڵمانان ئەبێ ئاگادار بن و نەخەڵەتێن بەو جۆرە شتانە، بەڵکو با نەچین بۆ وێنەو هەر مزگەوتی ڕاستەقینە بگرین بەدەستەوە، ئەوەتا لە گەلێ لە دەوڵەتە بەناو ئیسلامییەکاندا مزگەوت و خوێندنگای زۆرو زەبەندە دروستکراوەو دروست ئەکرێ، بەڵام مەبەستەکە ئەوەیە کە موسڵمانان بخەڵەتێنن و بخەوێنن و باسی ئەو هەموو شتانە ئەکەن کە دژی ئیسلامن کراون بە باوو پیشە.

لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا باسی ئەو بڕیارەی کە ماوە لەو بڕیارە هەمیشەییانە ئەکات، لەبارەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵی موسڵمان و کۆمەڵەکانی ترەوە لە یەکەم جارەوە دەست پێئەکات بەدیاریی کردنی پەیوەندی نێوانی بەندەو پەروەردگاری، دیاریی کردنی سروشتی ئەو ئیسلامەی کە گرتویەتە گەردن، باس و ئەرکی ئەو ئایینەی ئەکات کەوا بەسەری، بەرنامەی تێکۆشان و بزووتنەوە لە هەموو بارو ڕوویەکییەوە بێگومان هاتنە ژێر سایەی ئیسلام و گرتنە گەردنی ئیسلام مامەڵەو کڕین و فرۆشتنێکە کە خوا بکڕەو بڕوادار بفرۆشە، بڕوادار ئەبێ گیان و ماڵ و هەموو شتێکی بفرۆشێ بە خواو ئیتر خۆی بە خاوەنی نەزانێ وتەنها خوابەخاوەنی دابنێ، بەرامبەریەك شت کەبریتییەلەبەهەشت کەئەوەی بڕوا دارە کە ئەیدات و دەستی لێ هەڵئەگرێ هاوتای ناکات و هیچ نرخێکی نییە لە چاو ئەو بەهەشتەی کەڕازی بووەپێی وبەتەمایەتی، بێجگە لەوەی ئەوەی کە ئەیدات هینی خوایەو موڵکی خوایە،

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ﴾

---

بەلاّم خوا خوایەو خاوەن بەهرەو میهرەبانە بەندەكەی بە خاوەن شت نیشان ئەداتو بەرامبەر زاتی پاكی خۆی ئەیوەستێنێو مامەڵەی لەگەڵ ئەكاتو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم﴾ بەڕاستی خوا كڕی لە بڕواداران خۆیانو گیانو ماڵیان ﴿بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ﴾ بەمەی كە بۆ ئەوانە بەهەشت، واتە بەهەشتیان پێئەدات لەباتیدا، بەڕاستی ئەم فەرموودەیە زۆر زۆر سەختو گرانو سامناكە، بەڕاستی پیاوی ئەوێ كەبتوانێ هەڵسێ بەم ئەركە زۆر گەورەیە، پیاوی ئەوێ كە ئەو فرۆشتنە بەڕاستی بەجێ بێنێ، زۆر پێویستە لەسەر بڕواداران كە خۆیان بەراورد بكەن لەگەڵ ئەوەی كە ئەم فەرموودەیە ئەیگەیەنێو داوای ئەكات، خوا بە میهرەبانی خۆی دڵمان دامەزرێنێ لەسەر فرۆشتنی گیانو ماڵمان بە پەروەردگارمان، آمین. ئەم فرۆشتنە هەروا بەقسەو بەدەم نابێ، بەڵكو بەمە ئەبێ كە بەندە گیانو ماڵی پاكو خاوێنو تایبەتی بكات بەخواوەو هیچكام بەهینی خۆی نەزانێ، هەر هیچ نەبێ بەوێنەی ئەوە ئەگەر ماڵێكی هەبوو فرۆشتی بەیەكێك تازە خۆی بە خاوەنی نازانێو خۆی بە مافدار دانانێو بكڕەكەی بە ئارەزووی خۆی هەرچی كارو كردەوەیەك بكات لەو ماڵەدا نابێ ئەم هیچ قسەو تەگبیرێكی تێدا بكات، بەڕاستی كارەكە زۆر زۆر سەختو سامناكەو مەردوم گوێی ئەبەسترێ لە حاستیو نازانێ چی بڵێ، بێجگە لەوەی داوای كۆمەكی بكات لە خوا كە ئەم كارەی پێ‌ببات بەڕێوە؛ ئینجا بابزانین ئەو فرۆشتنە چۆن پێكدێتو ئەو فرۆشراوە چۆن ئەدرێ بە بكڕەكەی؟ ئەفەرموێ: ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ﴾ ئەو بڕوادارانە جەنگ ئەكەن لە ڕێی خوادا، ئینجا ئەكوژنو ئەكوژرێن، ئیتر بكوژەكان بكوژرێن یان دەستەیەكی تر بكوژرێنو بكوژەكان قوتار بنو دووچاری هیچ نەبن، واتە كە جەگیان كرد كوژراو بكوژیان تێدائەبێت، ئەوانەی كە جەنگ ئەكەن لەڕێی خوادا بەهەرحاڵو لەسەر هەر بار فرۆشتنەكەیان بەدی هێناوەو فرۆشراوەكەیان داوە بە خواو هەڵساون بە كارو ئەركی خۆیان، ئەگەر جەنگیان نەكرد لەڕێی

خواداو تێكۆشانیان نەكرد بۆ چەسپاندنی خوایەتی خواو دەركردن و لەناوبردنی زۆردارو ستەمكاران كە لاف خوایەتی لێ ئەدەن، ئەو دانیشتوانە ئەو مامەڵەو فرۆشتنەیان نەكردووە لەگەڵ خوادا، ئیتر هەرچەند هەڵسابن بە كردەوە چاكەكانی تر، جا لێرەدا هەر بڕوادرێك ئەو مامەڵەو فرۆشتنەی نەكردبێت ئەبێ زۆر بترسێ لەوەی لە ڕیزی بڕواداردا حساب نەكرێ، چونكە ڕووكەش و ڕوواڵەتی ئایەتەكە هەر ئەوە ئەگەیەنێ كە بڕوادار كەسێكە كەئەو مامەڵەی لەگەڵ خوای خۆی كردبێ، ئەگەر موسڵمانان ئەو ترسەیان لە دڵدا ببوایە نەیان ئەتوانی واز لە تێكۆشان و فیداكاری بهێنن ئەو حەلە هەرگیز دوژمن و بێگانە زاڵ نەئەبوو وڵات و خاك و ماف موسڵمانان داگیر نەئەكراو ژێرپێ نەئەكرا، بەڵێ بێگومان ئەم مامەڵەو فرۆشتنە لە گەردنی هەموو بڕوادارێكدایەو پێویستی سەرشانیەتی بەپێی دەسەڵات و توانا.

ئەم ئایەتە كاتێ چوو بە گوێچكەی یەكەم چینی ئەم ئوممەتەدا، دەست بەجێ لە دڵیانەوە هاتە دەرەوەو بەكردەوەو لە ژیاندا بەدی هات، نەمایەوە لە دەروونیدا هەر بە هەست و بیروباوەڕێكی ڕووت، ئەم ئایەتەیان وەرگرت بۆ كردەوەو گێڕانی بە بزوتنەوەیەك كە بە چاو ببینرێت، نەك هەر شتێكی دەروونی بێت و بەبێ لێبكرێتەوە،(ئبن و ڕەواحە) -خوا لێی ڕازی بێ- بەو شێوە ڕاستەقینە وەری گرت لە پەیمانی(عقبة)ی دووەمدا، وەك(محمدی كوڕی كەعب)و كەسانێكی تر ئەفەرمون: كە(عبدالله ی كوڕی ڕەواحە) لەو شەوەدا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئارەزوو ئەكەیت مەرج دابنێ لەسەرمان بۆ خواو بۆ خۆیشت، ئەویش فەرمووی: مەرجم بۆ خوا ئەمەیە كە بیپەرستن و هیچ شتێك نەكەن بە هاوبەشی، مەرجم بۆ خۆم ئەمەیە: كە بەرگریم لێ بكەن لە هەر شتێك كە بەرگری خۆتان و ماڵتانی لێ ئەكەن. ئەویش گوتی: ئایا ئێمە چیمان بۆ هەیە ئەگەر ئەوەمان كرد؟ ئەویش فەرمووی: بەهەشتتان بۆ هەیە،(عبدالله)و هاوەڵەكانی گوتیان: مامەڵەو كڕین و فرۆشتنەكەمان قازانجی كرد، نە پەشیمان بوونەوەت لێ وەرئەگرین نە داوای پەشیمان بوونەوەت لێ ئەكەین، وەریان گرت بە كڕین و فرۆشتنێكی ڕاستەقینەی بەدی هاتوو لە نێوان دوو كەسدا: بفرۆش و بكڕ، كارەكەیان تەواو بووە بەبێ گەڕانەوەو سەر لێكردنەوەو پەشیمان بوونەوە بەهەشتیشیان دانا بە هەق و بریتیەكی وەرگیراو،

وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾

---

چونكه خوا بكڕەكەیەو ئەفەرموێ: ﴿وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا﴾ واتە بوونی بەهەشت بۆ ئەو بڕوادارانە بەڵێنی خوایە بە بەڵێنێك كە ڕاستەو بڕیاری داوە لەسەر خۆی ﴿فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ﴾ لە تەورات و لە ئینجیل و لە قورئاندا، دەی ﴿وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ﴾ ئایا چ كەسێك بەدیهێنەر ترە بۆ بەڵێن و پەیمانی خۆی لە خوا؟ چ كەسێك ڕاست ترە لە خوا لە بەجێهێنانی بەڵێنی خۆیدا؟ بێگومان هیچكەس وێنەی خوا نیە، ﴿فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ﴾ كەواتە ئەی بڕواداران، مۆژدە بەخش و شادمان بن بە فرۆشتنەكەتان كە مامەڵەو كڕین و فرۆشتنتان پێكرد، واتە موژە بەخش و شادمان بن بەوەی كە گیانتان و ماڵتان پاك و خاوێن و تایبەتی بكەن بۆ خوا، بەهەشت لەباتیدا وەرگرن، وەك خوا بەڵێنی پێدان، ئایا بڕوادار چیت لەدەست دەرئەچێ؟ بێگومان هیچ، چونكە گیان ئەبێ هەر دەرچێت و مردن ئەبێ بێت، ماڵیش ئەبێ هەر بڕواو نەمێنێ، كەواتە بەهەشتەكەت لە خۆڕایی وەرئەگرێ، بێجگە لەوەش خۆت و ماڵەكەت موڵكی خوان و خوا دروستی كردون، دەی ئیتر بەهەشتەكەی خوا لەباتی چیدا وەرئەگری؟! ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ ئەو فرۆشتن و مامەڵەیە كە لەگەڵ خوادا كردتان و ئەیكەن هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورە، ئینجا با بوەستین لەبەردەم ئەم بەڵێنەدا كەلە نامە پێشووەكانیشدا هاتووە، بێگومان بەڵێنی خوا لە قورئاندا ناسراو بەناوبانگە، هیچ گومان ناهێڵێتەوە لەمەدا كە تێكۆشان و فیداكاری لەڕێی خوادا بەش و پارچەیەكی بنەڕەتی و سەرەكییە لە ئیسلامدا، بەمەی ئەبێ ببێ بەرامبەر دەست درێژیی كردن و ڕێگرتنی دوژمن و هێزی نەفامی كە هەمیشەو لە هەموو كات و وڵاتێكدا ئەوەستێ بەرامبەر ئایین و بەرنامەی خواو ئەگەر سەركوت نەكرێ، ئایین و بەرنامەكەی خوا

ناچەسپێ و نابێ بەکار بەدەست و جڵەوی ژیان ناگرێتە دەست و ئەو ژیان و جیهان بێبەش ئەبن لەدادو ستەم داگیریان ئەکات، پێویستکردنی تێکۆشان و فیداکاری بە تێکۆشەران لە قورئاندا شتێکی ئاشکراو بەناوبانگە، بەڵام لەتەورات و لە ئینجیل دا پێویستی بەهێندێ ڕوونکردنەوە هەیە: شتێکی ڕوون ئاشکرایە کە ئەم تەورات و ئینجیلی ئەمڕۆ کەوا بە دەست جوولەکەو گاورەکانی ئەمڕۆوە ئەو تەورات و ئینجیلە نییە کە هاتە سەر موساو عیسا ـ سەلامی خوایان لێبێ ـ تەنانەت جوولەکەو گاورەکانیش ناتوانن بڵێن: ئەم تەورات و ئینجیلە ئەسڵییە کەئەمڕۆ هەیە، بەڵکو باش ئەزانن کە ئەم تەوارت و ئینجیلی ئێستا دەستکەوتن و نووسرانەوە لەپاش ماوەیەکی دوورو درێژ کە زۆربەی ئەو دوو نامە ئەسڵییە زایە بوو بوو، بەشێکی کەمیان بووە لەبیری خەڵکدا ئەویش زۆر شتی تری تێکەڵ کراوە! لەگەڵ ئەوەدا لە تەورات و نامەی چاخی کۆندا چەند دەست نیشان هەیە بۆ تێکۆشان، هاندانی جوولەکە لەسەر جەنگ و کوشتاری دوژمنە بت پەرستەکانیان، بۆ یارمەتی و زاڵکرنینایین و خواپەرستییەکەیان! ئەگەر چی دەست کارییەکی ناشیرین کرابوو لە بۆچوونیان دەربارەی خواو تێکۆشان لەڕێی خوادا، بەڵام لە ئینجیلەکانی ئەمڕۆدا هیچ باس و دەست نیشانیان تیا نییە بۆ تێکۆشان و فیداکاری لەڕێی خوادا، بەڵام ئەم ئینجیلانە ـ وەك گوتمان ـ تێکدران و دەست کارییەکی زۆر ناشیرین کران، هەر بە شایەتی زۆر لەو نەسرانییانەی کە زۆر بەڕێکی و گرنگی کۆڵینەوە لەم ئیجیلانە، لە پێش هەموو شتێکدا شایەتی دانی قورئان بەسە کەلەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: ﴿وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ﴾، قسە هەر قسەی ئەم قورئانەیە کە گەورەترین ڕابەرو موعجیزەی خوایە لەم جیهانەدا، کەواتە هیچ گوێ ناگیرێ لە ئینجیلە دەست کاری کراوەکان، بەڵێ بێگومان تێکۆشان و فیداکاری شتێکی پێویستکراوە لە گەردنی هەموو بڕواداڕێکدا، بەڵام ئەو تێکۆشان و فیداکارییە بریتی نییە تەنها لە پەلامار دان و ڕاپەڕینێك بۆ جەنگ و کوشتار،

بەڵکوتێکۆشان و فیداکارو لەرێی خوادا پایەو پلەیەکی بەرزەو کەسانێ کە پێی هەڵسن ئەبێ بەم جۆرەبن کەلەم ئایەتەدانیشانیان ئەدات ونۆسیفەت ونیشانەیان بۆباس ئەکات:

١- ئەفەرموێ: ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ﴾ واتە ئەو بڕوادارانەی کە مامەڵەو کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ خوادا کردووە، ئەوانەن کە تۆبەکارن لەو گوناهو تاوان و کردەوە بەدانەی کە تێپەڕیانکردووە لێیانەوە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئیتر ئەوەی کە تێپەڕی کردووە بێبڕوایی و هاوبەش ڕەوادان بێت، یان ناپاکلا بێت، یا هەر گوناهێکی تر، یان کەم و کوڕی لە کردەوەی چاکدا، یان بێئاگایی و دووریی لەیادی خوا، تۆبە لە هەر کام لەمانە بەمە ئەبێ کە بڕوادار دەست بەجێ کۆتایی بێنێ و بەدڵ پەشیمان ببێتەوەو دڵی ئازاری پێبگات لەوەی تێپەڕی کردووە، بڕیاری وابێ نەگەڕێتەوە بۆ سەری، لە شوێنی ئەوو لەباتی ئەو کردەوەی چاك بکات، ئەگەر ماڵی ئادەمی بەسەرەوەبێت لێی دەرچێ و خۆی لێ ڕزگار بکات.

٢- ﴿ٱلۡعَٰبِدُونَ﴾ ئەوانەی کە بەدڵ ڕووئەکەنە خوا بەتەنیا پەرستن و گوێ ڕایەڵی و بەندەیی، هەڵئەسن بەو نیشانەو دروشمانەی کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی.

٣- ﴿ٱلۡحَٰمِدُونَ﴾ ئەوانەن کە سوپاس و ستایشی خوا ئەکەن بە وتەیەك کە شایستەو شایانە بۆ خوا، بە دڵ دان ئەنێن بە چاکەو بەهرەی خوادا، لەخۆشی و ناخۆشیدا، لە خۆشیدا لەسەر ئەو چاکە ئاشکرایەی کە خوا پێی بەخشیوە، لەناخۆشیشدا لەسەر ئەوەی کە ئەو ناخۆشییە تاقیکردنەوەیەو بێگومان بەرژەوەندی تێدایە، لەسەر ئەوەی ئەو ناخۆشییە ئەجرو پاداشتی هەیە.

٤- ﴿ٱلسَّٰٓئِحُونَ﴾ بە چەند جۆرێك تەفسیرکراوەتەوە: کۆچکەران، تێکۆشان، ڕۆژووەوانان، گەشت کەران و گەڕۆکان بەدوای زانین و زانیاریدا، ئەوانەی کە بیرئەکەنەوە لە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوەکانی خوا کە پەیوەندییان بەهێزئەکات بەخواوە وباشترتێئەگەن لەگەورەیی ودەسەڵات و لێزانی وکاردروستی خوا،

ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْأَٰمِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾

---

**٥- ٦) ﴿ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ﴾ ئەوانەی کە ڕکوع و سوژدە بەرن بۆ خوا لە نوێژەکانیاندا یان مەبەست ئەوەیە نوێژکەرانن بەڕێك و ڕاستی، لەسەر هەر بار ڕکوع و سوژدە دوو کردەوەی تایبەتی جیاوازن لە کردەوە ئاساییەکانی بەندە، زیاتر نیشانەن لەسەر ئەوپەڕی ملکەچی و بەندەیی بەندە، کەواتە شایستەی ئەوەن بەتایبەتی باس بکرێن.**

**٧-٨) ﴿ٱلْأَٰمِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ ئەوانەن کە فەرمان دەرن بە چاکە و جلەوگیریی ئەکەن لە خراپە.**

**٩- ﴿وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەن کە پارێزەرن بۆ شەریعەت و بڕیارەکانی خوا، کە دیاریی کراون ج ئەوانەی کە پێویستکراون و ج ئەوانەی کە قەدەغەکراون پارێزەریانن بە بەدی هێنان و لەخۆیان و لەخەڵکی تریشدا، بەرگرییان لێ ئەکەن لەوەی زایە بکرێن و دەست درێژییان بکرێتەسەر، ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ موژدە بدە بەو بڕوادارانە، ئەو بڕوادارانەی کە خوا مامەڵە و کڕین و فرۆشتنی لەگەڵ کردن و لەگەڵیان ئەکات ئەوانەن کە خاوەن و دارای ئەم سیفەتانەن:**

**١- تۆبەیەك کە بیان گێڕێتەوە بۆلای خوا، بەرگرییان بکات لەگوناه، پاڵیان پێوە بنێ بۆ کردەوەی چاك.**

**٢- عیبادەت و خوا پەرستییەك کە پەیوەستییان بکات بە خواوە، خوا بکات بە مەبەست و ئامانجیان.**

**٣- سوپاس و ستایشێك لە خۆشی و ناخۆشیدا کە نیشانە و بەرهەمی ملکەچییەکی تێرو تەواوە بۆ خوا.**

٤- گەشت و چەرخەکردنی دڵ لەم بوونەوەرەدا تا دەرکەوێ ئەوپەڕی لێزانی و کاردروستی خوا لە هەموو کارو بارێکدا.

٥- ٦) رکوع و سوژدە بۆ پەروەردگار کە بەهێزترین هۆی پەیوەندی بەندەیی بەندەیە بە خواوەو جێگیربوونی یادی خوا لەدڵیدا.

٧-٨) فەرمان بە چاکەو جڵەوگیرییە لە خراپە کە هۆی چاکی و چاککردنی ژیان و جیهانە.

٩- پارێزگاری شەریعەت و بڕیارەکانی خوا کەهۆی ڕزگار بوونە لە هەموو ستەم و تاوانێك، مایەی حەوانەوەیە لە سایەی دادو دادپەروەرییدا، پێویستە بزانێ کە ئەم سێ سیفەتە دوایییەکانی پێویستن و کەڵکیان هەیە کە بەکار بهێنرێن لەناو گەل و کۆمەڵێکدا کەشەریعەتی خوا حاکم بێت تیایدا، یان گەل و کۆمەڵەکە بڕوایان هەبێ بە ئایین و شەریعەتی خوا، هەر گەل و کۆمەڵێك کەنە شەریعەتی خوا حاکم بێت و خۆیشیان بڕوایان هەبێ بە ئایین و شەریعەتی خوا، ئەبێ هەوڵ و تێکۆشان بۆ دووشت بکرێ:

أ- چەسپاندنی چاکەی هەرەگەورە بریتییە لە خوایەتی خواو بڕوا تەنها بە بەرنامەو شەریعەتی خوا.

ب- جڵەوگیریی لە خراپەی هەرەگەورەی کە بریتییە لە بڕواو ملکەچی بۆ هەر شەریعەت و یاساو بەرنامەیەکی تر بێجگە لەشەریعەت و یاساو بەرنامەی خوا.

ئینجا بەجوانی ئەزانم باس و لێکۆڵینەوە لە شتێك بکەم کە پەیوەندی بە یاسای زمانی عەرەبییەوە هەیە، ئەوەش ئەمەیە: کە حەوت لەو سیفەتانەی هێنا بەدوای یەکدا بەبێ هێنانی پیتی(و) بەڵام بۆ هەشتەم و نۆیەم پیتی(و)ی هێنا، زانایان لەو بارەیەوە چەند شتێکیان فەرمووده:

١- هێنانی(و) لەنێوان فەرمان بەچاکەو جڵەوگیریی لەخراپە، دەست نیشانە بەوەی کە ئەو دووانە پێکەوە فەرزێکن لە فەرزەکانی ئیسلام، هیچکام بەتەنیا بەس نییە، بەڵام پێشووەکان هەرکام بە تەنیا فەرزێکە لە فەرزەکان.

٢- ئەم دووانە لەبارێکەوە بەرامبەر و دژی یەکترن، بەم ڕەنگە یەکەم داوای کردنەو دووەم داوای نەکردنە، لەبارێکی ترەوە نووساون پێکەوەو هیچکام بەبێ ئەویتر نابێ، چونکە داوای کردنی هەر شتێك جڵەوگیریی لە دژەکەی، کەواتە ئەم دووانە نە پەیوەستی تەواو هەیە لەنێوانیاندا، نەدووری و دژایەتی تەواو هەیە، بەپێی باوو یاسای ڕەوانبێژیی هەردوو شتێك کە بەو جۆرەبن، هەرکام بەدوای ئەویتردا بێت پیتی(و) ئەخرێتە نێوانیان.

٣- جڵەوگیریی لە بێشەرعی گرنگترو سەخت ترەو لەوانەیە کە جەنگ و ئاژاوەی لێ پەیدا ئەبێ، لەبەر دەست نیشان بەوە(و)ی لەپێشەوە باسکراوە تا بزانێ کە سەربەخۆیەو ئەگەر وا نەبوایە گومان ئەبرا کە لەگەڵ فەرمان بە چاکەدا پێکەوە بەندێکن، بۆ هێنانی ئەو پیتە لەپێش ڕستەی(والحافظون)وە چەند شتێك گوتراوە هێندێکیان باس ئەکەین:

١- ئەم ڕستە کورتەیە کە بۆ پێشووەکان، ئەگەر ئەو پیتە نەبێ و وا گومان ئەبرێ کە یەکێکەو بەشێکی تایبەتییە.

٢- مەبەست بەم سیفەتە پارێزگارییە بە کردەوەی پارێزەرەکان لە خۆیاندا، بە هاندانی خەڵکیش، ئەگەر ئەو پیتە نەبێ گومان ئەبرێ کە تایبەتییە بە جۆرێکیانەوە.

٤- بێگومان هەموو موسڵمانان لەپلەو پلەی ئەوانەدا نەبوون کە ئەو مامەڵە و کڕین و فرۆشتنەیان کرد لەگەڵ خوادا، بەتایبەتی پاش گرتنی مەککەو هاتنی خەڵکی پۆ پۆل بۆ ژێر سایەی ئیسلام، زۆر کەس هەبوو کە بەتەواوی تێنەگەیشتبوو، پێنەگەیشتبوو، بە هۆی ئەوەوە خۆیان دائەڕنی لە هەموو پەیوەندیەکی تر بێجگە لە پەیوەندی ئیمان و ئیسلام، بە تایبەتی پەیوەندی خزمایەتی بەهێز بوو لەدڵ و دەروونیاندا، بەهۆی ئەوەوا دەرئەکەوێ کەهێندێ لە موسڵمانان داوای لێبوردنیان ئەکرد بۆ باوك و کەس و کارە بێبڕواکانیان کە بە بێبڕوایی مردبوون، هەروەها داوایان ئەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە داوای لێبوردنیان بۆ بکات لە خوا،

مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾

---

ئینجا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە جڵەوگیریی کرد لەوەو فەرمووی: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ڕاستو ڕەواو شایستە نەبووەو نییە بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ﴿أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ داوای لێبووردن بکەن بۆ هاوبەش ڕەوا دەرانو بت پەرستەکان، واتە نابێ بیکەنو با نەیکەن بۆیان ﴿وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ﴾ با ئەوانەی خاوەن خزمایەتیو کەسو کاریشیان بن، بەڵام بەم مەرجە ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ لە پاش ئەوەی کە دەرکەوێ بۆ پێغەمبەرو بڕواداران کە ئەو هاوبەش ڕەوا دەرانە دۆزەخینو هاوەڵو نیشتە جێی ئاگری دۆزەخن بە هەمیشەیی، ئەو دەرکەوتنەش بەم ڕەنگە بیان بینن کۆتایی نەهێنن تا لەسەر ئەو بارەئەمرن، یان سروشتی خوا هاتبێو هەواڵی دابێ بەوە، کەواتە تا ئەوە دەرنەکەوێ دروستە داوای لێبووردن بۆیان، بەڵام بەم بیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاستو موسڵمان بن نەك داوای لێبووردن بۆیان با موسڵمانیش نەبن، لەحەدیسی صەحیح(بوخاریو موسلیم)دا هاتووە کە ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە بەهۆی(ئەبو تالیب)ەوە کەلە پاش ئەوەی سەرپێچی کرد لە بڕوا هێنانو موسڵمان نەبوو، پاش ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: داوای لێبووردنت بۆ ئەکەم مەگەر بەرگری بکرێم، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئاشکرایە(ئەبو تالیب) لە مەککە مرد پێش کۆچکردن بۆ مەدینە، سوورەتی(براءة ) کە ئەمە یەکێکە لە ئایەتەکانی لە دوادوایی چەرخو سەردەمی مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە، کەواتە یان ئەبێ بڵێین: ئەم ئایەتە مەککەییەو خراوەتە ئەم سوورەتە مەدینەییە، چونکە بڕیارەکەی ڕێكو شیاوە لەگەڵ بڕیارەکانی ئەم سوورەتەدا، یان ئەبێ بڵێین: ئەم بڕیاری بەرگریو جڵەوگیرییە ئەو کاتە نەهاتو دواکەوت تا ئەم کاتەی ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە، هیچ بەرگری کەرێك نییە لەوە نابێ گوێ نەدرێ بە حەدیسەکە، چونکە لە چەند ڕێگەیەکی صەحیحەوە ڕیوایەتکراوە ئەو جڵەوگیرییە لەداوای لێبووردن بۆ

هاویـەش ڕەوا دەران، هـەروەها ناپاکـان و هـەموو بێبڕواکـان شـتێکی ڕاسـت و ڕەوا و زۆر بەجێیە، چونکە یەکەم و سەرۆک و سەردەستەی هەموو پەیوەندیەکانی ئادەمی بریتییە لە پەیوەندی عەقیدە و بیروباوەڕ، دەی کاتێ ئەو پەیوەندییە نەبوو بچڕا ئیتر هیچ نرخێک نامێنێ لەپاش نەبوون و نەمانی یەکەم پەیوەندی و گەورەترین پەیوەندی و پاک ترین و بەنرخ ترین پەیوەندی، بەڵکو ئەگەر پەیوەندی گەورە هەبوو ئەوا پەیوەندیەکانی تریش لەپەنای ئەودا هەن، ئەگەر ئەو نەبوو ئەوا هیچ جۆرە پەیوەندیەکی تر نامێنێ لەنێوان هیچ دوو کەسێکدا، ئینجا لێرەدا جێگەی پرسیارێکە کە چۆن ئیبراهیمی خەلیل داوای لێبوردنی کرد بۆ باوکی وەک لە ڕیوایەتێکدا هاتووە تاکاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە موسڵمانەکان گوتیان: بێگومان ئیبراهیم داوای لێبوردنی کرد بۆ باوکی بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ داوای لێبوردنی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر هیچ شتێک نەبوو ﴿إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ﴾ بێجگە لە بەڵێنێک کە دابووی بە باوکی کە داوای لێبوردنی بۆ بکات، ئەو بەڵێنەش پێش ئەوە بووە کە دەرکەوێ بۆی کە باوکی دوژمنی خوایە و هەرگیز بڕوا ناهێنێ ﴿ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ﴾ ئینجا کاتێ دەرکەوت بۆی کەباوکی دوژمنی خوایە و بەردەوامە لەسەر ئەوە، ئەوەش بەمە کە خوا سروشی کردەلای کەبڕوا ناهێنێ، یا بەمە ـ وەک قەتادە ئەفەرموێ ـ کە مردووو بڕوای نەهێنا، کاتێ ئەوەی بۆ دەرکەوت خۆی لێ بەری کرد و بە هەموو جۆر لێی دوور کەوتەوە، هۆی ئەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خواترس و هاوارو لاڵاوە بوو لە خوا، لەسەر خۆ و پەلەنەکەر لەسەر ئازارو ناڕەحەتی، باوکی ئازاری زۆریدا ئەو هەر بە هێواشی و لەسەر خۆ بوو لەگەڵی، کاتێ بۆی دەرکەوت دوژمنی خوایە لێی دوور کەوتەوە و خۆی لێ بەری کرد و بەلالاو پاڕانەوە گەڕایەوە بۆلای خوا. ڕیوایەتکراوە کە کاتێ ئەم دوو ئایەتی ڕابوردووە هاتە خوارەوە، ئەوانەی کە داوای لێبوردنیان کردبوو بۆ ئەو بێبڕوایانە کەوتنە ترس و بیم لەوەی کە گومڕا بووبن، بەهۆی ئەو داواو نزاوە، بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و دڵئارامی کردن لەوەو دەست نیشانی کرد بە یاسایەک لە یاساکانی ئیسلام کە تۆڵە نییە و تاوان و گوناه نییە بەبێ ڕاگەیاندن و ڕوون کردنەوە و هەواڵدان لەپێشەوە.

وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۚ

---

فەرمووی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ﴾ شایستە نەبووەو باوی خوا وا نەبووە کە هیچ دەستەو کۆمەڵێك بە گومڕاو تاوانبار دابنێ لەپاش ئەوەی کە ڕێنموونی کردبن و خستبنیە سەر ڕێگەی ڕاست، هیچ کام لەوانەی بە گومڕاو تاوانبار دانەناوە بەهۆی وتارو کرداری بەدەوە ﴿حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ﴾ هەتا بە ڕوونی باسی ئەکات بۆیان ئەوەی کە خۆیانی لێ ئەپارێزن و پێویستە خۆپاراستن لێی، ئینجا پاش ئەو باس و ڕاگەیاندنە ئەوانە هەر کۆتایی نەهێنن، واتە خوا بەندەکانی ئاگرێ و لەسەر هیچ کردارو وتارێکی بەد تا لەپێشەوە بەڕوونی پێیان ڕانەگەیەنرێ کە ئەو وتارو کردارانە بەدو قەدەغەن، کەواتە ئەو موسڵمانانەی کە داوای لێبووردنیان کرد بۆ خزمە بێ بڕواکانیان، تاوانبار نەبوون ماتوڵ لە پێشەوە پێیان ڕانەگەیەنرا بوو و حاڵی نەکرابوون، لە میهرەبانی خوا بەزیاد بێت، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا بە تەواوی زاناو ئاگایە بە هەموو شتێك کە یەکێك لەو شتانە پێویستی بەندەکانییەتی بەو باس و ڕاگەیاندنە.

خوای میهرەبان ئەم ئایینە پیرۆزەی نارد بە سووك ئاسانی و بەندەکانی تەنگەتاو ناکات، ئەوەی کە قەدەغەی کردووە بەڕوونی باسی کردووە، بێدەنگ بووە لەهێندێ شت بەڵێزانی و کاردروستی خۆی، جڵەوگیریی کردووە لە پرسیارکردن لەوەی کە خۆی بێدەنگ بووە لێی، جالەبەر ئەوە هیچکەس بۆی نییە هیچ شتێك لەوانە قەدەغە بکات کە خوا لێی بێدەنگ بووە، بۆی نییە جڵەوگیریی بکات بکات لە هەر شتێ کە ئەو باسی نەکردووە. ئینجا کۆتایی ئایەتەکانی ڕابوردوو لەو کاتەدا کە بانگی بەندەکانی کرد بۆ خۆ ڕووتکردنەوە لە هەر پەیوەندی یەك کە پەیوەندی بڕواو عەقیدەی لەگەڵ نەبێ، لەم کاتەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ بەڕاستی هەر بۆ خوایە خاوەنی و پادشایەتی هەموو ئاسمانەکان و زەوی، خوا گیان ئەبەخشێ بەبێ گیانان و گیان ئەسێنێ لە گیانداران، خوا ئەژیەنێ و ئەمرێنێ،

وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ

---

﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ نییە بۆ ئێوە بێجگە لە خوا هیچ کار بەدەست و خاوەن و یارمەتیدەرێك، ڕووی فەرموودە ئەکاتە بەندەکانی بەو فەرموودەیە کە دڵ و دەروون بێدار ئەکاتەوە کە پەیوەندی و پەیوەستی بە خواوە بەسە، چونکە پەیوەندی بە هەر شتێکەوە بکرێ موڵکی خوایە و بەدەست خوایە، ماڵ و گیان و ئاسمانەکان و زەوی و ژیان و مردن و یارمەتیدان و هەموو شتێ هەر بەدەست خوایە.

بێگومان زۆربەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە هاتووەتە خوارەوە دەربارەی ئەو ڕووداو و سەفەری(تەبوك)ە و پەیوەندیان هەیە پێیەوە، چونکە بەسەرهات و ڕووداوەکانی زۆر زۆرن، وەك لە ئایەتەکانی ڕابردوودا دەرکەوت، بەهۆی ئەوە سەخت و سامناك بووە لەشکرەکەی ناو براوە بە(جیش العسرة) لەشکری سەختی ناڕەحەتی، لەڕاستیدا خەڵکی لە تەنگی و ناڕەحەتیدا بوون لە هەموو بارێکەوە: دووری سەفەرەکە، کەمی خواردن و نان و ئاو، قات و قڕی و گەرمای بەتین، کەمی وڵاخی بار و سواریی، پیلان و دوژمنایەتی ناپاکەکان لە هەموو بار و ڕوویەکەوە، لەبەر ئەو هەموو هۆیە بەڕاستی جێگەی ئەوە بوو کە خەڵکی دووچاری هەڵە و ترازان بین، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا خوای میهرەبان هەر لێبوردن و چاوپۆشی بەکار هێنا وەك لەم ئایەتانەی داهاتووەدا دەرئەکەوێ کە ئەفەرموێ: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ بێگومان خوا تۆبە و گەڕانەوەی وەرگرت بە میهرەبانی خۆی لە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەرچەند گوناهی نەبووە بەڵام بەندە بەرامبەر بە خوای خۆی کەم و کوڕی و ناتەواوی زۆرە و پێویستی هەیە بە لێبووردن و چاوپۆشی خوا، یەکێ لەو ناتەواوی و کەم و کوڕییە ئەوە بوو کە ئیزنی ئەو دەستە ناپاکەیدا، وەك(ئیبن و عەباس) -خوا لێی ڕازی بێ- لێرەدا ئەیبرێ بەسەر ئەوەدا.

﴿وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ﴾ تۆبەی وەرگرت لەو هاوەڵە کۆچەر و یارمەتی دەرانەی ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾ کە شوێنی کەوتن لە کاتی سەختی و تەنگیدا ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ﴾ لەپاش ئەوەی نزیك بوو دڵەکانی دەستەیەك لەوان لابدەن لەڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام بە سەرپێچی کردن لەشوێن کەوتن و فەرمانبەریی پێغەمبەر(ﷺ)، بەم فەرموودەیە ڕوونی ئەکاتەوە کە سەختی و تەنگییەکەیان گەیشتبووە ئەوپەڕی ڕادە،

ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ

---

**ئینجابۆزیادەدڵنیایی لەسەروەرگرتنی تۆبەکەیان دووبارە ئەفەرموێ:** ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ﴾ ئینجا خوا تۆبەی لێ وەرگرتن، یان مەبەست ئەوەیە لە یەکەمجارەوە لە پێش باسی گوناهەکەیاندا هەواڵی دا بە وەرگرتنی تۆبە بۆ دڵخۆش کردنیان، ئینجا بۆ ڕێز پێدانیان لەپاش باسی گوناهەکە هەواڵو بەڵێنەکە ئەمێنێتەوە بە دوایدا، هۆی ئەو بەڵێنو وەرگرتنە ئەمەیەکە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا میهرەبانە بەوان بەلابردنی زیان لێیانو میهرەبانە پێیان بە گەیاندنی سودو بەهرە، یان مەبەست بە ﴿رَءُوفٌ﴾ ئەوەیە میهرەبانە بۆ لەمەوپێشیان، مەبەست بە ﴿رَّحِيمٌ﴾ میهرەبانە بۆ لەمەو پاشو داهاتوویان، لەپێشەوە فەرمووی: ﴿وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ﴾ لەو بەجێماوانە کەسانێکی تر هەن حوکمو بڕیارو فەرمانی خوا، ئەو کەسانە ئەم سێ کەسەن کە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ﴾ خوا تۆبەی وەرگرت لەو سیانەی کەکاریان دواخراو بڕیاریان لەسەر نەدرا لەوکاتەدا ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ هەتا زەوییان لەسەر تەنگ بوویەوە بەو فراوانییەی کە هەیەتی، واتە دنیایان لێهاتبووە یەکو جێگای ژیانو نیشتەجێیان بۆ نەمابوو لەو دنیا فراوانەدا، بەهۆی بێزاریو تێکەڵ نەبوونی خەڵکی لێیانەوە ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ﴾ دڵو گیانی خۆیشیان لەسەر تەنگ بوو بوو، واتە بێزار بوون لەگیانی خۆیشیانو غەمو پەژارە دڵی داگیر کردبوون تا ڕادەیەك جێگای خۆشیو شادمانی نەمابوو تیایدا ﴿وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ﴾ زانیان کە هیچ پەناگایەك لە خواو لە خەشمو ناڕەزایی خوا نییە کە پەنای پێبەرن، مەگەر پەنا بۆلای خوا خۆی بە تۆبەو گەڕانەوە بۆلایو ملکەچیو گوێڕایەڵی بۆی، تەنانەت ئومێدی لای پێغەمبەریشیان نەما(ﷺ)، کە چەندە میهرەبانو بەزەیی دارە دەربارەی بڕواداران‌و ئوممەتەکەی، ئەوە بوو بە خۆیو پارەکانیشییەوە دەنگیان لێ وەرگرتن، چ جای ئەوە تکایان بۆ بکەن، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ناتوانێ تا بکات بۆ هیچکەس نەلەدنیا ونەلەڕۆژی دواییدابێجگەبۆکەسێك کە خوا ئیزن بداتو ڕازی بێت بە تکاکردن بۆی،

﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾

﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە خوا بەزەیی و میهرەبانی پێکردن و ئایەتی تۆبەی ناردە خوارەوە بۆ سەریان، یان یارمەتیدان و بۆی ڕێك خستن تۆبەو گەڕانەوە ﴿لِيَتُوبُوٓاْ﴾ بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر تۆبەو گەڕانەوە، یان بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ئەگەر لادان و گوناهێکیان هەبوو تۆبەی لێ بکەن و نائومێد نەبن لە بەزەیی خوا، یان بۆ ئەوەی تۆبە بکەن لە هەموو گوناهێکی ڕابردوو و هەموو گوناهێکی داهاتوو کاتێ کە پەیدا بوو، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بە ڕاستی خوا هەر ئەو زۆر وەرگری تۆبەو میهرەبانەو بەزەیی فراوانی هەیە بۆ ئەوانەی کە چاکەکارن گەڕاوەن بۆلای لە هەڵەو تاواندا، ئینجا با ڕاست ترین ڕیوایەت بهێنین لە بارەی ڕووداوو بەسەرهاتی ئەم سیانە، تا باشتر تێبگەین لەو شێوەو نەخشەیە کە قورئان کێشای لەو بارەیەوە، با گوێ بگرین لە یەکێ لەو سیانە ڕووداوو بەسەرهاتەکەمان بۆ باس بکات.(ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و موسلیم) لە ڕێگەی(زەهەری) یەوە ڕیوایەت ئەکەن کە ئەفەرموێ:(عبدالرحمن ی کوڕی عبدالله ی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك) هەواڵی پێدام کە(عبدالله) دەست ڕاکێشی باوکی بوو لە ناو کوڕەکانیدا کاتێ کە چاوی بینایی نەما،(عبدالله) ئەڵێ: لە(کەعبی کوڕی مالیك)م بیست باس و داستانەکەی خۆی بۆ باسکردم لە بارەی دواکەوتن و نەچوونیەوە بۆ(تەبوك)، کەعب ئەڵێ: لە هیچ غەزایەکدا دوا نەکەوتووم لە پێغەمبەر(ﷺ) بێجگە لە غەزای تەبووك، بەڵێ بۆ غەزای بەدر دەرنەچووم، بەڵام هەر کەس نەچوو بۆ ئەو غەزایە لۆمەو گلەیی لێ نەکرا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو موسڵمانانەی کە دەرچوون بۆ بەدر نیازی ئەو کاروانەی قوڕەیشیان هەبوو، واتە بۆ جەنگ نەچوون، بەڵکو بۆ ئەو هەنگوینە بێمێشە چوون، تا خوا کارەکەی گۆڕی و گێڕای بەو جەنگە گەورەو گرنگە، ئەڵێ: من ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووم، کە نایگۆڕمەوە بە بەدر هەرچەندە بەدر بەناوبانگ ترەو زۆر تر باس ئەکرێ. هەواڵ و دەنگو باسی من لە بارەی تەبووکەوە ئەمەیە: ئەو کاتەی کە من نەچووم و بەجێمام لە هەموو کاتێکم بەهێزترو بە دەسەڵات تر بووم، سوێند بە خوا لەو غەزایەدا دووبارە بەرم هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەوەو پێش نیازی هەر غەزایەکی بکردایە زۆر تر وای نیشان نەئەدا بۆ چ لایەك دەڕوا، بەس بۆ ئەو غەزایە بە ڕوونی باسی فەرموو کە ئەچین بۆ تەبووك، چونکە کاتەکە زۆر گەرم بوو، سەفەرەکە زۆر دوور بوو، بە چۆڵ و بیابان و

بێ‌ئاودا گوزەریان ئەکرد، بەرەو دوژمنێکی زۆر ئەڕۆیشتن، لەبەر ئەوە کارەکەی بۆ ڕوونکردنەوە تا باش خۆیان ئامادە بکەن، موسڵمانەکانیش زۆر بوون، کەعب ئەڵێ: هەر کەس مەیلی خۆشاردنەوەی ببوایە بۆی ئەکرا، مەگەر بە دەگمەن، چونکە لەبەر زۆری پێی نەئەزانرا، مەگەر ئایەت بهاتایەتە خوارەوەو هەواڵی لێ بدایە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو غەزایەی کرد لە کاتێکدا کە میوە پێگەیشتبوو و سفرە خۆش بووبوو، ئینجا بە ڕێکەوت ئەوەی بەردەوام بن لەسەر تۆبەو گەڕانەوە، یان بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ئەگەر ئەو لادان و گوناهێکیان بوو تۆبەی لێ بکەن و نائومێد نەبن لەبەزەیی خ. یان بۆ ئەوەی تۆبە بکەن لە هەموو گوناهێکی ڕابردووو هەموو گوناهێکی داهاتوو کاتێ کە پەیدابوو، ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی خوا هەر ئەو زۆر وەرگری تۆبەو میهرەبانەو بەزەیی فراوانی هەیە بۆ ئەوانەی کە چاکەکارو گەڕاوەن بۆلای لە هەڵەو تاواندا، ئینجا با ڕاست ترین ڕیوایەت بهێنین لەبارەی ڕووداوو بەسەرهاتی ئەم سیانە، تا باشتر تێبگەین لەو شێوەو نەخشەیە کە قورئان کێشای لەو بارەیەوە، با گوێ بگرین لەیەکێ لەو سیانە ڕووداوو بەسەرهاتەکەمان بۆ باس بکات.(ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و موسلیم) لە ڕێگەی(زەهەری) یەوە ڕیوایەت ئەکەن کە ئەفەرموێ:(عبدالرحمنی کوڕی عبدالله ی کوڕی کەعبی کوڕی مالیک) هەواڵی پێدام کە(عبدالله) دەست ڕاکێشی باوکی بوو لە ناو کوڕەکانیدا کاتێ کە چاوی بینایی نەما،(عبدالله) ئەڵێ: لە(کەعبی کوڕی مالیک)م بیست باس و داستانەکەی خۆی بۆباسکردم لەبارەی دواکەوتن و نەچوونییەوە بۆ(تەبوك)، کەعب ئەڵێ: لەهیچ غەزایەکدا دوا نەکەوتووم لە پێغەمبەر(ﷺ) بێجگە لە غەزای تەبوك، بەڵێ بۆ غەزای بەدر دەرنەچووم، بەڵام هەرکەس نەچوو بۆ ئەو غەزایە لۆمەو گلەیی لێ نەکرا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو موسڵمانانەی کە دەرنەچوون بۆ بەدر نیازی ئەو کاروانەی قوڕەیشیان هەبوو، واتە بۆ جەنگ نەچوون، بەڵکو بۆ ئەو هەنگوینە بێ‌مێشە دەرچوون، تا خوا کارەکەی گوڕی و گێڕای بەو جەنگە گەورەو گرنگ. ئەڵێ: من ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووم، کە نایگۆڕمەوە بە بەدر هەرچەندە بەدر بەناو بانگ ترەو زۆرتر باس ئەکرێ، هەواڵ و دەنگ و باسی من لەبارەی تەبوکەوە ئەمەیە: ئەو کاتەی کە من نەچووم و بەجێمام لە هەموو کاتێکم بەهێزترو بەدەسەڵات تربووم، سوێند بەخوا لەو غەزایەدا دووبارە بەرم هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەوەو پێش نیازی هەر غەزایەکی بکردایە زۆرتر وای نیشان ئەدا بۆ چ لایەك ئەڕوا، بەس بۆ ئەو غەزایە بەڕوونی باسی فەرموو کە ئەچین بۆ تەبوك، چونکە کاتەکە زۆر گەرم بوو، سەفەرەکە زۆر دوور بوو، بەچۆڵ و

بیابان‌و بێ‌ئاودا گوزەریان ئەکرد، بەرەو دوژمنێکی زۆر ئەڕۆیشتن، لەبەر ئەوە کارەکەی بۆ ڕوونکردنەوە تا باش خۆیان ئامادە بکەن، موسڵمانەکانیش زۆر بوون، کەعب ئەڵێ: هەرکەس مەیلی خۆشاردنەوەی ببوایە بۆ ئەکرا، مەگەر بەدەگمەن، چونکە لەبەر زۆری پێی نەزانرا، مەگەر ئایەت بهاتایەتە خوارەوەو هەواڵی لێ بدایە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو غەزایەی کرد لەکاتێکدا کەمیوە پێگەیشت بوو سێبەر خۆش بوو بوو، ئینجا بەڕێکەوت موسڵمانان لەگەڵی بوون، منیش خەریك بووم خۆم ڕێك بخەم لەگەڵیان، کەچی لە خۆمەوە هیچم نەئەکرد، لەدڵی خۆمدا ئەم گوت: من دەسەڵاتم هەیەو توانام هەیە هەرکات ویستم، هەر بەو جۆرە مامەوەو خۆم ڕێك نەخست، بەکورتی ئەڵێ: هیچ بەهانەیەکم نەبوو هەر لە خۆمەوە سستیم کرد تا ئەوان دەرچوون‌و لەپاش ئەوان غەمبار بووم لەوەی کە کەسێکم نەئەبینی بەجێمابێ، مەگەر کەسێك بە ناپاك دانرابێ یا کەسێك کە عوزرو بەهانەی بووبێ، پێغەمبەر(ﷺ) هیچ باسی منی نەکردبوو هەتا گەیشتبوونە تەبوك، ئینجا لەوێدا ئەفەرموێ: کەعبی کوڕی مالیم چی کردبێ؟ لەوێدا پیاوێك لە بەنی سەلەمە ئەڵێ: خۆشی‌و کەشخەو سەرنجدانی دەسەڵات‌و سامانی خەریکی کردووە، لەوەڵامدا موعازی کوڕی جەبەل ئەڵێ: قسەیەکی بەدت کرد. سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا بێجگە لە خێرو چاکە هیچمان نەزانیوە لەبارەی ئەو پیاوەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ ئەبێ، کەعب ئەڵێ ئینجا هەواڵم پێدرا کە پێغەمبەر گەڕاوەتەوە لە تەبوك بەرەو مەدینە غەم‌و بیم داگیری کردم، بیرم ئەکردەوە درۆیەك بدۆزمە خۆمی پێ‌ڕزگار بکەم، ئەم گوت: بەچی خۆم ڕزگار بکەم لە خەشم‌و ناڕەزایی پێغەمبەر(ﷺ)؟ پرسم ئەکرد بەوانەی کە ژیر بوون لە کەس‌و کارم لەو بارەیەوە، ئینجا کاتێ هەواڵیان پێدام کە پێغەمبەر(ﷺ) گەشتە بەرەوە ئەو خەیاڵەم لە دڵدا نەما‌و بڕیارمدا کە هەر ڕاست بڵێم‌و درۆی لەگەڵ نەکەم، باوی پێغەمبەر(ﷺ) وابوو کەلە سەفەر ئەگەڕایەوە لە یەکەمجارەوە چووەتە مزگەوت دوو ڕکات نوێژی ئەکردو دائەنیشت لەناو خەڵکەکەدا، ئینجا کەبەو جۆرەی کرد بەجێماوەکان کە هەشتا‌و ئەوەندە کەس بوون هاتنە خزمەتی‌و دەستیانکرد بە بەهانە هێنانەوەو سوێند خواردن، پێغەمبەریش(ﷺ) بەپێی ڕووکەش‌و ڕواڵەتەکەیان قسەکانیانی وەرئەگرت‌و پەیمانی لەگەڵ ئەبەستن‌و داوای لێبووردنی بۆئەکردن‌و نیازو نهێنیەکانی حەواڵەی خوا ئەکردن، هەتا منیش چوومە خزمەتی، ئینجا کە سەلامم کرد زەردەخەنەیەکی کرد لە شێوەی کەسێکا کە خەشمانك بێت، ئینجا فەرمووی پێم: وەرە پێشەوە، منیش ڕۆیشتم هەتا دانیشتم لەبەردەستیدا، ئینجا فەرمووی پێم: ئایا چی تۆی

دواخست هەتا بەجێمایت؟ ئایا وڵاخی سواریت نەگرتبوو بۆ خۆت؟ ئەڵی منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا ئەگەر من لای کەسێکی تر دانیشتمایە لە پیاوانی دنیایی ئەمزانی بەعوزر هێنانەوە لە خەشمو ناڕەزایی خۆم دەرکەم، چونکە دەمو زمانم تیژەو دەمە قاڵێم پێئەکرێ. بەڵام سوێند بەخوا وا ئەزانم ئەگەر ئەمڕۆ بەقسەی درۆ تۆ ڕازی بکەم لەخۆم لەوانەیە خوا بەزوویی ناڕازیت بکات لێم، ئەگەر قسەی ڕاستت بۆ بکەم کەدڵت بیەشێ لێم، من ئومێدم وایە کە پاشەڕۆژی باشی تێدابێت لای خوا، سوێند بەخوا هیچ عوزرو بیانوویەکم نەبووە، سوێند بەخوا هیچ کاتێ لەوکاتە بەدەسەڵات ترو بەهێزتر نەبووم کە بەجێمام لە تۆ! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەمە ڕاستی کرد، کەواتە هەستە هەتا خوا بڕیاری خۆی ئەدات دەربارەت، منیش هەستام، چەند کەسێك لەبەنی سەلەمە کەوتنە شوێنم گوتیان پێم: سوێند بەخوا پێنازانین کە لەمەو بەر گوناهێکت کردبێ، بەڕاستی دەستە پاچە بوویت لەوەی بهێنیتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەوێنەی ئەوانەی کە عوزریان هێنایەوە، بێگومان بەس بوو بۆت داوای لێبووردنی پێغەمبەر بۆ گوناهەکەت، کەعب ئەڵێ: سوێد بەخوا ئەوەندە سەرزەنشتیان کردم خەریك بوو بگەڕێمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) خۆم بخەمەوە بە درۆوە، لەپاشان گوتم پێیان: هیچ کەسێکی تر هەیە کە ئەمەی منی بەسەر هاتبێ؟ گوتیان: بەڵێ دوو کەسی تر وەك تۆیان گوتووەو ئەوەی بە تۆ گوترا بەوانیش گوتراوە، گوتم: کێن ئەو دووانە؟ گوتیان مەرارەی کوڕی ڕەبیعو هلالی کوڕی ئومەییە. دوو پیاوی چاکیان بۆ باسکردم کە ئامادەی جەنگی بەدر بوون، منیش پەیڕەوی ئەوانە ئەکەم، ئینجا ڕۆیشتم کەباسی ئەو دووانەیان بۆ کردم، ئەڵێ: لەنێوان هەموو بەجێماوەکاندا جڵەوگیریی کرد لەوەی قسەبکرێ لەگەڵ هەرسێکمان، بەهۆی ئەوەوە خەڵکی لێمان دوور کەوتەوە یان گوتی دڵیان گۆڕی لێمان هەتا خاكو وڵاتەکەم لێ گۆڕاو بەو خاكو وڵاتە نەمابوویەوە کە ئەمناسی لەمەوبەر لەسەر ئەو بارە ماینەوە پەنجا شەو، دوو هاوڕێ یەکەم چوون لە ماڵ بۆخیان کەوتن، بەڵام من کە بەهێزترو چالاکتر بووم لەماڵ دەرئەچوومو ئامادەی نوێژ ئەبووم لەگەڵ موسڵمانانندا، لەبازارد ئەگەڕام، بەڵام هیچکەس قسەی لەگەڵ نەئەکردم، ئەچوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) سەمم لێ ئەکرد کە دائەنیشت لەپاش نوێژ، لەدڵی خۆمدا ئەمە گوت: ئایا لێوی جولاندەوە بە وەڵامدانەوەی سەلامەکەم یان نە ؟ ئینجا لەنزیکییەوە نوێژم ئەکردو بەدزییەوە سەرنجم ئەدا، کاتێ کە خەریکی نوێژەکەم ئەبووم سەرنجی ئەدام، کاتێ لام بکردایەتەوە بۆلای ڕووی وەرئەگێڕا لێم، دەنگ وەرگرتنی خەڵکی درێژەی کێشا لێم هەتا

ڕۆیشتم و لای باخێکی ئەبو قەتادەی ئامۆزام و چوومە ناو باخەکەو سەلامم کرد لێی، سوێند بە خوا وەڵامی نەدامەوە، ئینجا پێم گوت: ئەی قەتادە سوێندت ئەدەم بە خوا کە تۆ ئەزانی من خواو پێغەمبەرم خۆش ئەوێ(ﷺ)، ئەویش بێدەنگ بوو تا سێ جار ئەوەم گوت، لەم جارەدا لەبەر خۆیەوە گوتی: خواو پێغەمبەر باش تر ئەزانن و زانینی تەواو لای ئەوانە، منیش ئاو بە چاوما هاتە خوارەوەو پشتم تێکرد هەتا لە باخەکە چوومە دەرەوە، کەعب ئەڵێ: جارێك بەبازاڕی مەدینەدا ئەگەڕام سەرنجمدا یەکێ لە شامیەکان کە خۆراکیان هێنا بوو بۆ فرۆشتن لە مەدینەدا ئەڵێ: ئایا کێ(کەعبی کوڕی مالیك)م نیشان ئەدا؟ خەڵکیش دەست نیشانیانکرد بۆ من، ھەتا هات و نامەیەکی پێدام لەپادشای(غەسان)ەوەو وتی کە ئەوە نامەیەو بۆتۆی ناردووەو بیکەرەوە بزانە چی تێدایە، نامەکەم کردەوە بەڵام سەد خۆزگا کە نەم کردایەتەوەو پێش ئەوە چاوم کوێر بوایە!! بەخۆمم دەگوت: کەعب، پلەی مونافیقیت بەرز بووەتەوە!! ئەوەندە لاواز بوویت پاشای غەسان تەماح بکاتە ئایینەکەت و بۆت بنووسێت:(بیستوومە هاوڕێکەت ـ مەبەستی پێغەمبەر بووەـ ئازاری داوی، تۆ خوا نەیکردوویت بە جێگەی ڕیسوایی و چەوساندنەوە وەرە بۆلای ئێمە، ڕێزت لێ دەگرین). لەبەر خۆمەوە گوتم: خوایە گیان، منی دڵبریندار دەردو ئازاری خۆمم بە زۆر دەزانی، وا پاشای غەسانیش دەیەوێت برینەکانم هەڵکۆڵێ و بەم ڕەنگە کوژێ... لەوانەشە ئەمەی بە هەلێکی باش زانیبێ بۆ ڕاو کردنی ماسی لەئاوی لێڵدا.... بە هۆی تەمبەڵی و کەمتەرخەمەی خۆمەوە باوەڕەکەم لاواز بوو، وا ئێستا ئەویش دەیەوێ بە تەواوی باوەڕەکەم بمرێنێ.... نا، نا، والله ی دوژمن بە خۆم شاد کەم، هەرگیز نابێ پەنا بەرمە بەر خیانەت و ناپاکی، دەبێ ئەو پەروەردە ئیمانییەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکاتی وادا نەبێ و، لە چ کاتێکدا دەرکەوێت؟؟ پاشای گەمژەی وا نازانێ کە من ویژدانم ئازارم دەدات، ئەو کەئیمانی نییە چوزانێ ئازاری و ویژدان چییە؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵمی پڕکردووە بە خۆشەویستی خواو بەرنامەکەی پرشنگی زێڕو خرنگە خرنگی زیوو نەرموڵی ئاوریشم ئەو باوەڕەم لەق ناکات... بەدبەخت تۆ لە کوێ مرۆڤێکی بەندکراوی وەك من دڵخۆش ئەکەیت؟ ئەگەر بتوانم هەڵبێم زیندانەکە لەگەڵمایەو بگرە قایم ترو بتەوتر دەبێت.... تەنیا دەستی دەسەڵاتی پەروەردگار نەبێت، هیچ هێزێك نییە بتوانێ ئەڵقەڕێزی دەرگای ئەو زیندانە بشکێنێ و ڕزگارم کات.... هەی پاشایماڵکاول، کێ گوتی: من ڕیسوا کراوم، ڕیسوایی مرۆڤ لەوەدایە کافر بێ و هاوەڵ بۆ خوا دانێ، نزیکی پێغەمبەرم لەنزیکی و ڕێزی تۆ خۆشترە، بڕۆ بە شوێن یەکێکی تردا

بگەڕێ، من بە تۆ هەڵ ناخەڵەتێم... تۆ زۆر لەوە کەمتری بتوانی بمگێڕیتەوە بۆ کوفرو بێباوەڕی... لام کردەوە بینیم تەنووریێ داخراوە، تا هێزم تیا بوو نامەکەم فڕێ دایە گڕەکەیەوە، چاوم تێبڕی تا بە تەواوی سووتا، وام دەزانی بە ئاگری بڵێسەداری ڕق و کینەی دەروونم دەیسووتێنم!! بڕیارم دابە پەلەبەرەو ماڵ بڕۆمەوە، چونکە ئیتر پێم نەبوو کەس ببینم، لە ئەو باوەڕەی لەدڵمدا ماوەتەوە زەدەنەبێت، لەدڵی خۆشمدا ئەم بڕیارەم داو گوتم: کە ڕۆیشتمە ماڵەوە، ئیتر مان دەگرم و نایەمە دەرەوە، تا خوا دەروویەکم لێدەکاتەوە، بەڵێ ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵ و تا ماوەیەك نەهاتمە دەرەوە، ڕۆژێ پیاوێك هات بۆ ماڵمان و هەواڵی منی پرسی، کە گوێم لێبوو هەواڵی من دەپرسێ، لە خۆشیدا وەخت بوو باڵ بگرمەوە، چونکە لەم ماوە دوورو درێژەدا ئەمە یەکەم جار بوو موسڵمانێك هەواڵم بپرسێ و بیەوێ لەگەڵمدا بدوێت!! بە پەلە بەرەوپیری چووم کە زانیم ئەمە نێرراوی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەوەندەی تر شادمان بووم!! چونکە وام دەزانی مژدەی لێخۆش بوونی بۆ هێناوم و لەم زیندانە ڕزگارم دەبێت، ئەو زیندانەی کە چل ڕۆژی ڕەبەقە تیا دەتلێمەوەو بەلامەوە لە چل هەزار ساڵ کەمتر نەبوو!! کەعب ئەڵێت: چل شەو لەو پەنجا شەوە تێپەڕی کرد، کە سەرنجمدا فروستادەی پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لام و پێی گوتم: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانت پێئەدات دوور بکەویتەوە لە ژنەکەت، منیش گوتم تەڵاقی بدەم یان چی بکەم؟ ئەویش گوتی: نەخێر هەر دووربکەوەو کەنارگیربە لێی و نزیکی نەکەویتەوە، ناردبووی بۆلای ئەو دوو هاوەڵەکەم بەوێنەی من، منیش گوتم بە ژنەکەم: بچۆرەوە بۆماڵی خۆتان و لەوێ بمێنەوە هەتا خوا بڕیار ئەدات لەم کارەدا، ئینجا ژنی هلال دێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی هلال پیرێکی پەك کەوتەیە، هیچ کەسێك نییە خزمەتی بکات، ئایا پێت ناخۆشە خزمەتی بکەم؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، بەڵام نزیکت نەکەوێتەوە، ئەویش ئەڵێ: سوێند بەخوا جوڵەی لێ بڕاوە، سوێند بەخوا لەو کاتەوە کە ئەو فەرمانەت داوە تا ئەمڕۆ هلال بە هەمیشەیی ئەگری، کەعب ئەڵێ: ئینجا هێندێ لە کەس و کارم گوتیان: تۆیش ئیزن بخوازە لەبارەی ژنەکەتەوە، ئەوەتا ئیزنی ژنەکەی هلالی دا کە خزمەتی بکات، ئەڵێ: منیش گوتم: سوێند بە خوا ئیزنی لێ ناخوازم چوزانم چی ئەڵێ دەربارەی من کە گەنجم؟ کەعب ئەڵێ: دە ڕۆژ لەسەر ئەو بارە ماینەوە تا پەنجا شەوە کە تەواو بوو، لەبەیانی پەنجاکەدا نوێژم ئەکرد بەسەر بانەوە من لەسەر ئەو بارو حاڵە سەختە بووم کە خوا فەرمووی، گوێم لێبوو یەکێك بەسەر شاخی سەلعەوە بوو بەدەنگێکی زۆر بەرز گوتی: ئەی کەعبی کوڕی مالیك مژدە

بێت، منیش دەست بەجێ چووم بە سوژدەداو زانیم کە خوا دەروی کردووەتەوە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵیدا بەوەرگرتنی تۆبە لێمان، ئینجا خەڵکی دەستیانکرد بە موژدە پێدانمان، چووین بۆلای ئەو دوو هاوەڵەکەم بە موژدە دانەوە پیاوێك بەغارو بەسواری وڵاخەوە سەرکەوت بە شاخەکەداو دەنگەکەی چەسپانتر بوو کاتێ گەیشتە بەرەوە موژدەی پێدام منیش جلەکانی خۆم داکەندو کردنمە بەری لە موژدانەدا، سوێند بە خوا هەر ئەو دەستە جلەم هەبوو، جلو بەرگم خواستو کردمە بەرم، ئینجا دەرچووم بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، خەڵکی پۆل پۆل تووشم ئەبوون پیرۆزباییان لێئەکردم لەسەر وەرگرتنی تۆبەکەم، هەتا گەیشتمە مزگەوت، کە سەرنجمدا پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتووە لە مزگەوتداو خەڵکی وان بەدەوریدا، لەناو خەڵکەدا(طلحة) هەستاو بەپیریمەوە، بە خۆشییەوە دەستی خستە ناو دەستمو پیرۆزبایی لێکردم، ئیتر کەسی تر لە کۆچەران هەڵنەسا، بەهۆی ئەوەوە کەعب تاما ئەوەی لەبیر بوو(طلحة) دەربارەی کرد. کەعب ئەڵێ: کاتێ سەلامم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم لەکاتێکدا کە ڕووی پیرۆزی لە خۆشیدا ئەدرەوشایەوە: موژدە بێت بە چاکترین ڕۆژێك کە تێپەڕی کرد بەسەرتدا لە ڕۆژێکەوە لەدایك بووی، منیش گوتم: لەلایەن خۆتەوە ئەی فروستادەی خوا یان لەلایەن خواوە؟ فەرمووی: نەخێر بەڵکو لەلایەن خواوە. پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کەیف خۆش بوایە ڕووی بریقەی ئەدایەوە وەك پارچەیەك لە مانگ بێت وا بووە، ئێمە ئەوەمان ئەزانیو هەستمان پێئەکرد لێیەوە، ئینجا کاتێ کە دانیشتم لەبەردەمیدا گوتم: ئەی فروستادەی خوا بەشێك لە تۆبەکەی من ئەوەیە لە ماڵەکەم بچمە دەرەوەو هەمووی صەدەقە بێت بۆلای خواو فروستادەکەی(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: هێندێ لە ماڵەکەت بهێڵەرەوە ئەوە چاکترە بۆت، منیش گوتم: ئەو بەشەم کە هەمە لە خەیبەر ئەیهێڵمەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا من هەر بەهۆی ڕاستییەوە خوا ڕزگاری کردم بەشێ لە تۆبەکەم ئەمەیە کە تا ماوم هەر قسەی ڕاست بکەم، سوێند بە خوا لەو ڕۆژەوە تا ئێستا بەدەست قەست درۆم بەدەمدا نەهاتووە هیوام وایە کە خوا بمپارێزێ بۆ داهاتوویش، سوێند بەخوا لەپاش ئەوەی خوا خستمیە سەر ڕێی ئیسلام هیچ چاکەیەکی لەگەڵ نەکردووم گەورەتر لەوەی کە ڕاستمکرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)و درۆم لەگەڵ نەکرد تا تێدا چوومایە وەك تێدا چوونی ئەوانەی کە درۆیان لەگەڵ کرد، ئەوەبوو ئەوانەی کە درۆیانکرد ئایەت هاتە خوارەوە دەربارەیانو لەپێش گەڕانەوە بۆ مەدینە فەرمووی: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا

يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾وەك تێپەڕی کردو تەفسیرمان کردەوە، ئەوە بوو داستان و بەسەرهاتی کەعب و دوو هاوەڵەکەی، وەك خۆی گێڕاوە، لە هەموو بەش و پارچەیەکیان پەندو ئامۆژگاری هەیە، لە هەموو داستانەکەدا شێوەیەکی ئاشکرا هەیەو دەرئەکەوێ بۆ بناغەیەکی پتەوی بەهێزی ئەو موسڵمانانە، بۆ پاك و خاوێنیان، بۆ گوێڕایەڵی و فەرمانیان، ئەوە بوو کەعب و هاوەڵەکانی بە پێی باوی ئادەمی سستی و لاوازی ڕووی تێکردن و لەو کاتە تەنگەدا بەجێمان لە موسڵمانان، درێژی سەفەرو گەرمای سەختی کات و خۆشی سێبەرو سەهەندو میوەو ئاوی ساردی ماڵ کاری لێکردن و دوای خستن، بەڵام دەست بەجێ لەپاش دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) کەعب وەك خۆی گێڕایەوە هەستی کرد بەناڕاستی کردەوەکەی کاتێ سەرنجیدا هیچ کەسێکی تر بەجێ نەماوە بێجگە لە کەسێك کە گومانی ناپاکی پێئەبرا یا کەسێك کە عوزرێکی شەرعی بووبێ.

ئەوە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە لە خوا ترسیەکەی کە نەیتوانی بەقسەی درۆ خۆی ڕزگاربکات، بەڵکو ڕاستی لەخۆی گوت و کاری خۆی هەواڵەی خوا کرد، ئەوەی بەسەر کەعب و هاوەڵەکانی هات گێڕایەوە بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە کە ماوەی پەنجا شەو ئەو بارە گرانەیان هەڵگرت، ئەوەیان بەسەر هات کە قورئان بۆی باسکردین، تا خوا میهرەبانی کرد تۆبەی بۆ ناردنە خوارەوە! ئینجا بیرێك لەو ڕێك و پێکی و ڕاستی و لێبڕانەی کە موسڵمانان بەکاریان هێنا دەربارەی ئەو سیانە، کە نەخزمایەتی و دۆستایەتی لە ئارادا و نە هیچ پەیوەندی و پەیوەستیەکی تر، بەڵکو بەجارێ دەنگیان وەرگرت لەو سێ کەسە! بەڕاستی گەل و کۆمەڵی پاك ئەبێ ئاوا بێت خوا لێیان ڕازی بێت، ئینجا بە بۆنەی ئەم داستانە سەرسوڕهێنەرەوە لەیەکەمجارەوە بانگی بڕواداران ئەکات بۆ لە خوا ترسی و هاوڕێیەتی ڕاستان،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ

ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی ئەو كەسانەی كە بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە تۆڵەو خەشمو ناڕەزایی خوا بە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵی لێی ﴿وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ لەگەڵ ڕاستاندا بن و لە ڕیزی ئەواندا بن، نەك لەگەڵ ناپاكان و درۆزنان كە بەدرۆو سوێندی درۆ ویستیان و ئەیانەوێ خۆیان پاك بكەنەوەو كە بێگومان هیچ سودێك وەرناگرن و ئێجگاری باری خۆیان قەرس تر ئەكەن، كۆمەڵی ڕاستان ئەوانەن كە پەنا هەر بەڕاستی ئەبەن و هەرگیز دەستی لێ بەرنادەن، لە تێكۆشان و فیداكاریاندا، لە عەهدو پەیمانیاندا، لە قسەو بەڵێنیاندا، لەتۆبەو گەڕانەوەیاندا بۆلای خوا، بە پێچەوانەی ناپاكان لە هەموو ئەوانەدا، ئینجا بێزاری و ناڕەزایی دەرئەبڕێ بە تایبەتی لە مەدینەییەكان و دانیشتوانی دەوروبەری مەدینە كە پایتەختی ئیسلامەو جێی نیشتەجێی پێغەمبەرە(ﷺ) بێزاری و ناڕەزایی دەرئەبڕێ لە دواكەوتن و بەجێمانیان لە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەر جەنگ و غەزاو سەفەرێك كە ئەو پێی هەڵسێ، ئەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ﴾ ڕاست و ڕەوانە بووەو نییە بۆ دانیشتوانی مەدینەو ئەوانەی كە بە دەورو بەریاندا لە عەرەبە كۆچەرو لادێییەكان، ڕاست و ڕەوا نەبوو بۆیان ﴿أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ﴾ جوێ بوونەوەو دواكەوتن و بەجێمانیان لە فروستادەكەی خوا ﴿وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ﴾ واتەی باوی نەفسی خۆیان نەدەن بەسەر نەفسی پێغەمبەردا، بەم ڕەنگە نەفسی بپارێزن لە شتێ كە نەفسی ئەوی لێ نەپارێزن، بەڵكو ئەبێ بە پێچەوانەی ئەوەبن و هەمیشە ئامادەبن بۆ فیداكاری بە گیان و بەماڵ و بە هەموو شتێكیان لە پێناوی پێغەمبەرە ئازیزەكەیاندا وەك لە حەدیسی صەحیحدا بەو جۆرە فەرمان دراوە، بەم فەرموودەیە پلارو سەرزەنشت ئاڕاستەی كەسانێ ئەكات كە خەیاڵی ئەوە بكات و لەدڵی هەستی ئاوا بەدو ناڕەوا هەبێ، بە ڕاستی بڕوادار ئەبێ شەرم بكات لەو هەستە بەدە ئەگەر فەرمانی خوایش نەبووایە، چ جای ئەوە خوا بەو جۆرە فەرمان ئەدات و ئەو ئەجرو پاداشتە بەرزو بڵندەش ئەخاتە بەرچاو كە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی كە ئەبێ جوێ بوونەوەو دواكەوتن نەبێ لە پێغەمبەرو بڕواداران و باوی خۆیان نەدەن بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ)،

بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾

---

﴿بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەیە کە ئەو بڕوادارانە دووچاریان نابێ ﴿ظَمَأٌ﴾ هیچ تینوێیەك ﴿وَلَا نَصَبٌ﴾هیچ ماندوو بوونێك﴿وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ هیچ برسێتیەك لە ڕێی خوادا﴿وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ﴾پێنانێن بەهیچ جێگەپێ وشوێنێکداکەڕق وخەشمی بێبڕواکان هەڵنەسێنێ و دڵتەنگیان ئەکات ﴿وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا﴾ وەرناگرن لە هیچ دوژمنێك هیچ شتێك لە کوشتن و بڕین و بەدیل گرتن و شکان و دەستکەوتێك ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ﴾ مەگەر لەکاتێکدا ئەنوسرێ بۆیان بەهۆی هەرکام لەوانەی باسکران کردەوەیەکی چاك﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾بێگومان خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات ﴿وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً﴾ هیچ شتێك نادەن لەڕێی خواداو هیچ ئەرك و نەفەقەیەك ناکێشن نەبچوك و نە گەورە ﴿وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا﴾ لە ڕۆشتن و هاتوچۆیان بۆ هەر غەزایەك هیچ شیوو دۆڵێك نابڕن و تێپەڕ ناکەن لێی ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ﴾ مەگەر لەکاتێکدا ئەوەی کە باسکرا نوسراوە بۆیان ﴿لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بۆ ئەوەی خوا پاداشتیان بداتەوە بە باشترین و جوانترین پاداشتی ئەوەی کە کردوویانەو بەردەوام بوون لەسەری، واتە پاداشتی تێکۆشان و فیداکاری لەڕێی خوادا کە گەورەترین لە کاتێکدا کە فەرز بێ، چونکە بەوە ئیسلام ڕاگیر ئەبێ و بەرگری ستەم و تاوان ئەکرێ، مەبەست ئەوە نییە کە پاداشت نادرێتەوە لەسەر کردەوە بچووکەکان، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو جیهاد تێکۆشانە گەورەترین کردەوەیانە، یان لە گەورەترینەکانە، هێندێ ئەفەرموون مەبەست ئەوەیە: خوا پاداشتی ئەوانە ئەداتەوە لەسەر هەر کردەوەیەکیان لەوانەی کەباسکران بە باشترینان، بەم ڕەنگەبچووك وکەمەکان بە گەورەو زۆر دائەنێ و بەو جۆرە پاداشتی ئەداتەوە.

وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ

---

کەلەبی لە(ئیبن و عەباس)ەوە ئەگێڕێتەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە کاتێ ئەو هەموو توندو تیژیە کرا لەسەر ئەوانەی کە دواکەوتن لە غەزا، گوتیان: ئیتر هیچکام لە ئێمە دوا ناکەوێ لەهیچ لەشکرو کەمتر لە لەشکرێك، ئینجا بەو جۆرەیان کرد تاوای لێهات پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بە تەنیا مایەوە بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً﴾ ڕاست و ڕێك نەبووەو نییە بڕوادارەکان هەموو بە یەکجار ڕاپەڕن و دەرچن بۆ جەنگ جیهاد ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ چەند ڕیوایەتێك هاتووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، کۆمەڵێك کە زۆربەن مەبەست ئەوەیە: ماقوڵ و ڕاست و شایستە نییە ڕاپەڕین و دەرچوونی هەموان، دەی با دەرچوونایە بۆ غەزاو جەنگ لەناو هەموو کۆمەڵێکی گەورەدا دەستەو تایفەیەك بە پێی پێویست بۆ ئەوەی کۆمەڵی بڕواداران کە دەرنەچوون بە هەوڵ و تێکۆشان و زەحمەت تێگەیشتن و زانینی لەئاییندا وەرگرن و فێری بن، واتە ئەمان کە دەرنەچوون و دەستیان خاڵییە با بە گرنگی خەریکی زانین و وەرگرتن و تێگەیشتن بن لە ئاییندا، بۆ ئەوەی ئەو دەستەو تاقمەیان کە دەرچوون بترسێنن کاتێ کە گەڕانەوە بۆ لایان، واتە مەبەستی گرنگیان لەو زانین و فێربوونە ڕێنموونی ئەوانەیان بێت کە دەرچوون، فێرکردنی ئەوەی خۆیان فێری بوون و زانا بوون پێی، کۆمەڵێکی تر لەزانایان ئەفەرموون: مەبەست ئەوەیە: با هەموو بڕواداران بەجارێ دەرنەچن، بەڵکو لە هەموو کۆمەڵێکی گەورە هەر جارێ دەرنەچن، بەڵکو لە هەموو کۆمەڵێکی گەورە هەر جارێ بە نۆبە دەستەیەك دەرچێ بۆ ئەوەی ئەو دەستەیە کە دەرنەچێ بەهۆی ئەو دەرچوون و ڕاپەڕین و بینینی سەرکەوتن و زاڵ بوونی بڕواداران و ژێر کەوتن و ڕیسوا بوونی دوژمنانی ئایینەکەیانەوە تێبگەن و بێن بە ئیسلام و زاڵبوونی بەسەر هەموو ئایینەکەیاندا، کە بەهۆی ئەو گەل و کۆمەڵەی خۆیان کە دەرنەچوون ڕێنموونی بکەن و زانایان بکەن و بیانترسێنن لە سزاو تۆڵەی خوا دەربارەی بێبڕواو یاخییەکان، بەم دوو

جۆرە تەفسیر کراوەتەوەو هەر دووبارە کە هەڵئەگریّ بۆ هەرکام ڕیوایەت هاتووەو هەرکام باو دراوەتەوە لەلایەن دەستەیەك لە زانایان، لەسەر هەربار ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە فەرزو پێویستە فێربوون و تێگەیشتن و زانا بوون بە ئیسلام و ئامادەیی بۆ فێرکردن و ڕاگەیاندن بە خەڵکی. لەسەر ڕای یەکەم یەکەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لیّ بڕاون بۆ ئەو فێربوون و فێرکردنە، هاوتایەو کەمتر نی یە لای خوا لە جەنگ و تێکۆشان لە ڕێی خوادا، خوا بە میهرەبانی خۆی بمانکات بە زاناو تێگەیشتوو لە ئایینەکەماندا، بمانکات بە تێکۆشەرو فیداکار لە ڕێی خوادا ـآمین ـ.

لەپاش ئەوە یاسایەك لەیاساکانی جەنگمان تیّ ئەگەیەنیّ کەپێغەمبەروجێنشینەکانی لەسەر بوون، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێك کە بڕواتان هێناوە ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ﴾ جەنگ بکەن و تیّجەنگن بەرە بەرە لەگەڵ ئەو بیّبڕوایانەی کە نزیکن لێتانەوەو وڵاتەکەیان وا بەسنووری ئێوەوەو هاوسێتانن، بیّگومان سروشتی کارەکە کە هەروا هاتووەو هەرواش ئەبیّ لە هەموو شتێکدا بێجگە لە جەنگ مەگەر لە هێندیّ کاتدا کە پێویست و ناچاری ببیّ بەدەست پێکردن بەدوور ئەو کات و جۆرە شتانە شتێکی تایبەتین و بەری ئەم یاسایە ناکەون، بەس پێویستە بیرێك بکەیتەوە لەم فەرمانە کە بەگشتی و بیّهیچ مەرجێك هاتووەو نەیفەرمووە: ئەگەر دەست درێژیان کردە سەرتان یان وڵاتان، لەمەوە وەرئەگیریّ ئەمە دواترین فەرمانی هەتا هەتاییە مەگەر بەرگری کەرێکی کاتی پەیدابیّ، دیارە ئەو کاتە ئەبیّ بەرگری کەرەکە نەمێنیّ، ئەمە دواترین فەرمانەو نیشان ئەدات کە ئەم ئایینە ئەبیّ نەوەستیّ و بڕوا بەناو وڵات و جیهاندا تا وای لێبیّ هیچ کۆمەڵێك نەمێنیّ بێجگە لە موسڵمان یا ملکەچ و ئاشتی خواز وەك دەست نیشان ئەکات بەوە لەئایەتی سوورەتی(محمد)دا کە ئەفەرمویّ: ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَا﴾ هەتا جەنگ چەك و کەرەسەکانی دانیّ، ئەوەش بەوە ئەبیّ کەکەس لەئارادا نەمێنیّ بێجگە لە موسڵمان یان کەسانێك کە ملکەچ بن و کۆتایی بە جەنگ بێنن، ئیسلام بۆ ئەوە هاتووەو جەنگ لە ئیسلامدا بۆ ئەو مەبەستە دانراوە، نەك هەر بۆ بەرگری و وەستاندنی دوژمن، لە بڕیارە کاتی و قۆناغیەکانی یەکەمجاری پێکهاتنی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەدا، هەروەها هەر کاتێك لە هەر وڵاتێکدا وێنەی ئەو چەرخ و سەردەمە پەیدا ببێتەوە لەم کاتەیشدا ئەبیّ هەر یەکەمجار بگەڕێتەوە بۆ بڕیارەکانی کاتی و قۆناغی یەکەمجار، چونکە وەك لە پێشەوە گوتمان ئەو بڕیارە کاتی و

قۆناغیانەی یەکەمجار نەسڕاونەتەوە بە تەواوی و هەتا هەتایە، بەڵکو هەر ماونەتەوە بۆ وێنەی ئەو کات و قۆناغانەی یەکەمجارە. هێندێ لەوانەی کە ئەمڕۆ باسی پەیوەندی ناو میریی و دەوڵەتان ئەکەن بەپێی ئایینی ئیسلام، هێندێ لەوانەی کە تەفسیری ئایەتەکانی جیهاد ئەکەن لە قورئاندا ئەیانەوێ ئەم ئایەتە بێمەرجەی ئێرە ببەستنەوە بە مەرجێك لەو مەرجە قۆناغیانەی سەرەتای پەیدا بوونی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەدا، بەم ڕەنگە ئەڵێن:

جەنگ بکەن لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەی کە لێتانەوە نزیکن بەمەرجێك دەست درێژیی بکەنە سەرتان یان مەترسی بکەن لەدەست درێژییان ! لەگەڵ ئەوەدا دەقی ئایەتەکە هیچ مەرجێکی پێوەنییەو بێباوەڕەکانی مەرجە، دواترین بڕیارە لە بارەی جەنگ و جیهادەوە. بۆ نووسەرانە مەترسی ئەکەن و سام ئەیانگرێ کە فەرمانی ئیسلام و وابێ، جەنگ بکرێ لەگەڵ بێبڕوایانداو جەنگ نەوەستێ لە سنوورو وڵاتێکدا، ئەوانەیان نەشارەزاو نەزانن، یان خۆیان نابەڵەد ئەکەن ئەگینا شتەکە کە ئاشکرایە کە ئەبێ وابێ، چونکە ئیسلام هاتووە بۆ چەسپاندن و دامەزراندنی خوایەتی و بەرنامەو حوکمی خوا لە هەموو خاك و وڵات و جیهاندا، بۆ دەرکردنی هەموو یاخیەکان کە خۆیان بە ناهەق زاڵکردووە بەسەر بەندەیانی خواداو ئەڵقە لەگوێیان کردوون بۆ بەرژەوەندیی و خزمەتکاریی بۆ خۆیان، ئیسلام هاتووەبۆ ئازاد کردنی بەندەیانی خوا لە هەر بەندەیی و کۆیلەییەك کە بۆ خوا نەبێ، تێکۆشان و فیداکاری پێویستکراوە بۆ زاڵکردنی بەرنامەی خوا بەسەر هەموو بەرنامەکانی تردا، کەواتە ئەبێ بەری ئیسلام بەرەڵاکرێ لە هەموو جیهان و زەویدا، ئەبێ هیچ جێگەو گۆشەیەك نەمێنێ کە ئیسلام حاکم نەبێ تیایدا، ئەمە شتێکی ئاشکرایەو دەقی ئایەت ئەفەرموێ: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ﴾ وەك بەدرێژیی تەفسیر کرا لە سوورەتی(البقرة)دا.

کاتێ ئەو نووسەرانە ئاگایان نەبێ لەم شتە ڕاستە یا خۆیان نابەلەد بکەن، ئەبێ دەمیان نەمێنێ ئەك جۆرە ئایەتانە تەفسیر بکەنەوە بەبێ ئەو مەرجانەی کە خۆیان ئەیانهێنن و دەستکاری ئایەتەکانی خوای پێئەکەن بە ناهەق و ناڕەوا! ئەو نووسەرانە دووشت بووەتە هۆی ئەوە ئەو مەرجانە بهێنن بۆ ئەم ئایەتانەو ئەو دەستکارییە ناڕەوا بکەن لە ئایەتەکانی خوادا بەپێی بۆچوونی خۆیان:

١- پڕو پاگەندەی صەلیبیەکانی کە ئەڵێن: ئیسلام بەزۆری چەك و شمشێر بڵاو بووەرتەوەو جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا بۆ زۆر پێهێنانی خەڵکییە لەسەر موسڵمان بوون، بەرپەرچدانەوەو پووچەڵ کردنی ئەو پڕو پاگەندەیە زۆر ئاسانەو بەدەقی ئایەتی قورئان کە ئەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ هیچ زۆر پێهێنان لە عەقیدەو بیرو باوەڕدا. هەروەها بەدانانی یاسای سەرانەو جیزیە کە بەپێی ئایەت و حەدیس و بڕیاری هەموو زانایانی ئیسلام، یاسایەکی ڕاست و دامەزراوە هەتا هەتایە، مانەوەی گاوورو جوولەکەو بێبڕواکان تر لەوڵاتی ئیسلامدا بەئازادی و سەربەستی لە هەموو چەرخ و سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامدا مانەوەی ئەوانە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ناڕاستی و پووچەڵی ئەو پڕو پاگەندە ناڕەوایە. بەڵێ ئاشکرایە کە ئیسلام زۆر ناکات لەهیچکەس لەسەر عەقیدەو بیرو باوەڕ بۆ ئەوە نەهاتووە بەڵکو بە پێچەوانەوە هاتووە بۆ پاراستنی ئازادی و سەربەستی لە عەقیدەو بیروباوەڕدا، چونکە هاتووە بۆ دەست بەستنی هەموو یاخییە ستەمکارەکان کە ئەیانەوێ بەندە یاخیەکانی خوا ملکەچ بکەن و بە زۆر بیانگێڕن بە بەندەی خۆیان، هاتووە بۆ نەهێشتن و لابردنی ئەو هەموو یاساو ڕژێمانەی کە بناغەکەیان لەسەر ملکەچی بەندە بۆ بەندە دامەزراوە ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی بە زۆری چەك ئەو ڕژێمانە نەهێڵێ، ئەو هێزانە لە کار بخات کە پارێزگاری ئەو ڕژێمە بەوانە ئەکەن، ئینجا لە پاش ئەوە ئەیەوێ کە خەڵکی ئازاد و سەربەست بن لە هەڵبژاردنی هەر عەقیدەو بیروباوەڕێك، ئەگەر ویستیان موسڵمان بن ئەوا ئەبن بە برا بۆ هەموو موسڵمانان و بەشدارن لەگەڵیان لە هەموو شتێکدا، ئەگەر ویستیان بمێنن لەسەر بیروباوەڕی خۆیان ئەوا پارێزگاری ئەکرێن لە هەموو دەست درێژییەك و بە ئازادی و سەربەستی خۆیان ئەژین لەوڵاتی ئیسلام و لەژێر سایەی ئیسلامدا وەك بە چاو بینرا.

ئیسلام زۆری بە هیچکەسێك نەهێناوە لەسەر گۆڕینی بیروباوەڕکەی، هەرچۆنێ صەلیبێتی بەدرێژایی مێژووی هەر پیشەی کوشتن و برین و لەناو بردنی گەلانێك کە کەوتبنە بەر دەستی وەك گەلی ئەندەلوسی لە کۆن و گەلی زەنجەبار لە تازەدا، لەسەر ئەوەی نەئەبوون بەگاور، لەهێندێ کاتدا وازی نەئەهێنان هەرچەند ببونایە بە گاور، هەر لەبەر ئەوەی کە موسڵمان بوون لە پیشەی ئەهێنان، هێندێ کات گاوریشیان لەناو ئەبرد لەبەر ئەوەی لایان

دابوو لە مەزهەبی ڕەسمی کەنیسە، دوانزە هەزار لە گاورەکانی مصریان لەناو برد بە سووتاندن هەر لەبەر ئەوەی کەمێك بیروباوەڕیان جیاوازبوو لە کەنیسەی ڕۆما وەك بە درێژیی لە مێژوودا باسکراوە!

٢- شتێکی تر کە بوو بە هۆو پاڵدەر بۆ ئەو نووسەرانەو مەرج و شەرت پەیدا ئەکەن بۆ ئەم ئایەتەی کە خەریکین پێیەوە ئەمەیە: بیم و ترس ئەکەن لەو هەموو هێزو دەسەڵاتەکەی کە هەیە لای بێبڕواکان لەبەر ئەوە کارەکە بە کارێکی نەگونجاو دائەنێن: چۆن ئەبێ هەموو کەل و میللەتەکانی دنیا ملکەچ بکەن بۆ ئیسلام و شتی وا هەرگیز بەدی نایەت؟! بەڵێ ئەمە ڕاستە بەدیمەن و ڕواڵەت، کارە بە نەگونجاو دائەنرێ، بەڵام ئیسلام لەڕیوە داوا ناکات لەم موسڵمانە لاوازو چەوساوەو ژێر دەستانە هەڵسن بەو کارە گەورەیە، بەڵکو وەك لە یەکەمجاری مەدینەدا ئەبێ دەوڵەتێك پەیدا ببێ کە بە فەرمانی خوا حوکم بکات، ئەو دەوڵەتە پێکهاتبێ لە دەستەو کۆمەڵێك کە بەڕاستی پەیمانیان دابێ و خۆیان فرۆشتبێ بە خواو ئینجا بەرە بەرە دەست پێبکەن و خوایش یارمەتیان ئەدات و سەریان ئەخات، وەك یەکەمجار، قۆناغ بەقۆناغ و جەنگ لەدوای جەنگ. ئیسلام لە ڕێوەداوا ناکات بۆ ئەو کارە لە موسڵمانانی ئەمرۆ کە هەر تاقمێك بیرو بۆچوون و مەزهەب و بەرنامەیەکی هەیە، هەر کۆمەڵێك ئاڵایەکی بەرز کردووەتەوە، بەڵکو داوا لەدەستەو کۆمەڵێك ئەکات کە تەنها یەك ئاڵایان هەبێت، ئاڵای(لا إله إلا الله محمد رسول الله) هەنگاو بەهەنگاو پەیڕەوی کۆمەڵی موسڵمانانی یەکمجار بکەن لە هەموو بارو ڕوویەکیانەوە، ئەو کاتە خوا سەریان ئەخات وەك یەکەمجار سەری خستن لە جیهاندا، لە ماوەی چارەکە چەرخێکدا زاڵی کردن بەسەر ئەو دوو ئیمبراتۆریەتە گەورەیەدا.

هەرکەسێك بیرێك بکاتەوە لە حاڵی ئەو دەستەو تاقمە ڕەش و ڕووت و بێچەك و بێدەسەڵاتەی ئەفغان، کە چۆن بەهێزترین و دڕندەترین دەوڵەتیان دەرکرد لە وڵاتەکەیاندا لەپاش دامەزران و جێگیربوونی ئەو دەوڵەتە، لەگەڵ ئەوەدا کرم و ماری ناوخۆیان بە هەموو هێزو فیداکاری یەك یارمەتی ئەو دەوڵەتە دڕندەیان دا، هەرکەسێك بیرێك لە حاڵی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە بکات، هەرگیز سەرسام نابێ و سەر ناکاتەوە لە فەرمانی ئەم ئایەتەو وێنەی ئەم ئایەتە، ئەزانێ ئەم کارو فەرمانە شتێکی بەجێ و گونجاوە.

ئینجا بابێینەوە بۆ ژێر سایەی ئایەتەکە، فەرمانیدا بە جەنگکردن لەگەڵ ئـ
بێبڕوایانەی کە نزیکن و هاوسێن کەلەو کاتەدا نامەدارەکان بوون کە پێیان ئەگوترا:(ڕۆ
ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ﴾ با بێبڕواکان دەستیان بکەوێ لە ئێوەدا توند
بەتینی و چالاکی و خۆگریی، واتە با ئێوە لە جەنگدا بەو جۆرەبن تا بێبڕواکان سام و بیمت
لێ بکەن و نەتوانن بەرەنگارتان بوەستن، با بزانرێ کەلە ئیسلامدا چەند شتێك دانراو
پێویستکراوە ئەبێ چاودێریی ئەوانە بکرێ و ڕەفتاریان پێ بکرێ، با گوێ بگیرێ لـ
حەدیسانە ئەو شتانەمان نیشان بدات:(موسلیم و ئەبو داود و ترمزی) حەدیسێك ئەهێن
لە(بەرید)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: باوی پێغەمبەر(ﷺ) وابوو کاتێ ک
فەرمانەدەی دیاریی ئەکرد بەسەر لەشکرێکەوە، لەبارەی خۆی و لەشکرەکەیەوە فەرمان
ئەداو وەسیەتی ئەکرد لە خواو ترس و خۆپارێزیی لە بێشەرعی، ئینجا ئەیفەرموو: بەناو
خوادا جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوەی بڕوای نەهێناوە بە خوا، دزی نەکەن لە غەنیمەت
دەستکەوتی جەنگدا، ناهەقی و ناپەیمانی نەکەن، دەستکاری کوژراو مەکەن، بەڵکو چۆ
کوژراوە لێی گەڕێن، ئینجا کەگەیشتن بە دوژمنی بت پەرست بانگی بکەن بۆ سێ شت، ئەگ
گوێڕایەڵبوون و وازیان لێ بێنە، بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون و لێیا
وەرگرە و واز بێنە لە جەنگ لەگەڵیاندا، داوایان لێبکە کە کۆچ بکەن لە وڵاتی خۆیانەوە ب
وڵاتی کۆچکەران، هەواڵیان بدەرێ ئەگەر وابکەن ئەوا چی هەیە بۆ کۆچکەران بۆ ئەمانیش
هەیە، چی لەسەریانە لەسەر ئەمانیشە، ئینجا ئەگەر بەگوێیان نەکردی لەوەدا، ئەوا وە
عەرەبە کۆچەرەکان ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکرێ بەم ڕەنگە ئەو حوکم و بڕیارانەی کە ئەدر
بەسەر بڕواداراندا، ئەدرێ بەسەر ئەوانیشدا، بێبەشن لەدەست کەوتی دەوڵەتی ئیسلام،
ئەوەی بەبێ جەنگ دەستکەوت بووبێ، هیچکام لەمانەیان بۆ نییە مەگەر لەگەڵ موسڵمانان
بێنە مەیدان بۆ جەنگ و جیهاد، ئەگەر سەرپێچیان کرد داوای سەرانەیان لێبکەن، ئەگەر ب
گوێیان کردی ئەوا لێیان وەرگرە و وازیان لێ بێنە، ئەگەر سەرپێچیان کرد ئەوا داوا
یارمەتی و کۆمەکی بکە لە خواو جەنگیان لەگەڵ بکە.

(بوخاری‌و موسلیم) حەدیسێ ئەهێنن لە(ئیبن‌و عومەر)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: ئافرەتێکی کوژراوم بینی لە غەزایەکدا، پێغەمبەر(ﷺ) جڵەوگیریی کرد لە کوشتنی ئافرەتان‌و منداڵان، پێغەمبەر(ﷺ)(مەعازی کوڕی جەبەل)ی ناردر -خوا لێی ڕازی بێ- بۆ یەمەن بە مامۆستاو ڕێنیشاندەرو وەسیەتی بۆی ئەمەبوو: فەرمووی: تۆ ئەچیت بۆ ناو گەل‌و کۆمەڵێك کە نامەدارن، بانگیان بکە بۆ شایەتومان هێنان بە خوایەتی خوا فروستادەکەی، ئەگەر بەگوێیان کردی ئەوا پێیان ڕاگەیەنە کە خوا لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر پێویست کردوون، ئەگەر بەگوێیان کردی پێیان ڕاگەیەنە کە خوا صەدەقەیەکی لەسەر پێویست کردوون کە لەدەوڵەمەندەکانتان وەرئەگیرێ‌و ئەگێڕێتەوە بۆ سەر بێبڕواکانتان، ئینجا ئەگەر گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەوەش ئەوا خۆت بپارێزە لەوەی چاکترین‌و هەڵبژاردەیان لێ بسێنێ، خۆت بپارێزە لە نزای شەڕی ستەم لێکراو، چونکە هیچ پەردەیەك نییە لە نێوان خواو ئەو نزادا.

(ئەبو داود) لە پیاوێکی جوهەینییەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لام وایە ئێوە جەنگ ئەکەن لەگەڵ کۆمەڵێکداو زاڵ ئەبن بەسەریاندا ئەوانیش ئەیانەوێ سوڵح بکەن لەگەڵتان بەمەی واز لە خۆیان‌و ژن‌و منداڵیان بێنن‌و هەموو ماڵ‌و سامانەکەیان بدەن پێتان، ئێوە ڕازی ببن زیاد لەوەیان لێداوا مەکەن، چونکە شایستە نییە بۆتان.

(عیربا ضي کوڕی سارییە)-خوا لێی ڕازی بێ-ئەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) قەڵای خەیبەرمان گرت لەسەرۆکی خەیبەر پیاوێکی نەبەردی خۆ بەزل زان هات‌و ڕووی کردە پێغەمبەر(ﷺ)و گوتی ئەی محمد: ئایا بۆتان هەیە گوێ درێژەکانمان سەر ببڕن‌و میوەجاتەکانمان بخۆن‌و بدەن لە ئافرەتەکانمان؟ بەهۆی ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) خەمناك بوو فەرمووی بە(عبدالرحمنی کوڕی عەوف): سواری وڵاخەکەت ببە، ئینجا بانگ بکەو جاڕبدە کە بێگومان بەهەشت حەڵاڵ نییە بۆ بڕوادار نەبێتە کۆببنەوە بۆ نوێژ و موسڵمانەکانیش کۆبوونەوە، ئینجا نوێژی بۆ کردن، لەپاشان هەستاو فەرمووی: ئایا کەسێك لە ئێوە گومان وا ئەبا کە خوا هیچ شتێکی قەدەغە نەکردووە بێجگە لەوەی کەلە قورئاندایە؟! بێدار ببنەوە کە بێگومان من ئامۆژگاری ئەکەم‌و فەرمان ئەدەم‌و جڵەوگیریی ئەکەم لە چەند شتێك، بەڕاستی ئەوانە وێنەی قورئانن‌و بە ئەندازەی ئەو یان زۆرتر، خوا حەڵاڵی نەکردووە بۆ ئێوە

بچنە ماڵی نامەدارەکان، مەگەر بەئیزنی خۆیان، حەڵاڵی نەکردووە لێدانی ئافرەتەکانیان و خواردنی میوەجاتەکانیان، کاتێ ئەوەی کە لەسەریانە دانراوە لەسەریان بیدەن.

لەجەنگدا کچێکی منداڵیان بردە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە کوژرابوو لە مەیداندا، ئەویش زۆر بەتێن و غەمباربوو، هێندێ لە موسڵمانان گوتیان: بۆچی غەمبار ئەبێ ئەوانە منداڵی بت پەرستەکانن، پێغەمبەر(ﷺ) خەمناك بوو بەوەو فەرمووی: بە ڕاستی ئەوانە چاکترن لەئێوە، ئەوانە لەسەر سروشتن، ئایا ئێوەش کوڕی بت پەرستان نین، دووجار فەرمووی: ئامان خۆتان بپارێزن لە کوشتنی منداڵان.

لەپاش پێغەمبەر(ﷺ) جێنشینەکانی ئەو ڕێگە ڕاستەیان دایە بەر:(ئیمامی مالیك) ئەگێڕێتەوە لە(ئەبو بەرکری صدیق)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە فەرمووی بە موسڵمانان: ئێوە کەسانێك ئەبینن کە لایان وایە لێ براون بۆ خواپەرستی، دەی لێیان گەڕێن لەسەر باری خۆیان، واتە ئەو عابیدو ڕاهیبانە نەکوجن، ئافرەت و منداڵ و پیر مەکوژن،(زەیدی کوڕی وەهەب) ئەڵێ: نامەی(عومەر)مان بۆ هات و لەو نامەیەدا ئەمە هەبوو: دزی نەکەن لەگەڵ غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگ، ناهەق و ناپەیمانی نەکەن، منداڵ نەکوژن، لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەبارەی فەلاحەکانەوە.

جەنگی موسڵمانان بەو جۆرە کراو هەر بەو جۆرە بەسەر براوە، ئەوپەڕی بەزەیی و میهرەبانیان بەکار هێناوە لەگەڵ هەر کەس کە شایستەی بووبێ، ڕەقی و توندی هەر لەگەڵ ئەوانە بەکار هێنراوە کە ڕێگربوون لەئایینی خواو بەبێ لەکار خستنی ئەوانە بەرنامەکەی خوا ڕانەئەگەیەنراو نەئەگەیشت بە بەندەیانی خوا. دوای هێنانی ئایەتەکە بەم فەرموونەیە: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ بزانن کە خوا لەگەڵ خۆپارێزەران دایە، دەست نیشانی تێدایە بە چاودێریی ئەو فەرمان و ئادابانەی کە خواو پێغەمبەر دایان ناوە بۆ جەنگ، وەك دەست نیشانی تێدایە بە پێویستی هەڵسان بە هۆی زاڵبوون و سەرکەوتن، ﴿وَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٌ﴾ کاتێ کە سوورەتێك لە قورئان ئەهێنرێتە خوارەوە،

فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ

---

**﴿فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ﴾ له ناویاندا هەیه كەسێك كه ئەڵێ: ﴿أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا﴾ كام له ئێوه ئەم سوورەته زیادی كرد لەبارەی بڕواوەو بڕوای بەتین تر ئەكات؟ ئەو ناپاكه ئەم پرسیاره ئەكات لەهاوڕێكانی، یان لەوانەی كه لاوازن لەبارەی بڕواكەیانەوە به هەركام مەبەست بێت ئەو ناپاكه لەم پرسیاره نرخ پێنەدان و لاقرتی كردنه به قورئان و دەربڕینی بێ بڕوایی خۆی تا ناپاكەكان بەد گومانترو ناپاك تر بكات، لاوازەكان لاوازتر بكات، لەبەر ئەوه لەلایەن خواوه ئەم وەڵامه هات و ئەو ناپاكه بەرپەرچ درایەوەو دەم كوتكرا بەم جۆره كه ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ ئەوانەی كه بڕوایان هێناوه ئەو سوورەته زیادیان ئەكات لەبارەی بڕواوەو بڕواكەیان بەهێز تر ئەكات، لەكاتێكدا ئەوانه موژده بەخش و شادمانن بەهاتنه خوارەوەكەی، بڕوایان زیادو بەتین ئەبێ، چونكه هەموو سورەتێك، بەڵكو هەر ئایەتێك لەم قورئانه بەڵگەو ڕابەرێكی ڕوون و بەهێزه لەسەر ڕاستی ئەم قورئانەو پێغەمبەر(ﷺ)، بەهۆی ئەوەوه موژده بەخش و كەیف خۆش ئەبن، [illegible] ئەكەن بەلوتف و چاودێریی خوا بۆیان، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوانەی كەله دڵەكانیاندا نەخۆشی هەیه، نەخۆشی گومان و دوو دڵی كه ئەبێ بەهۆی ناپاكیەكەیان، یان مەبەست ناپاكییه، ﴿فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ﴾ ئەوانه سورەتەكه زیادیان ئەكات لەبارەی ناپاكییەوە**

زیادو سەرباقی ناپاکیەکەی خۆیان، واتە ئەو سورەتە ناپاکیەکەیان دووقاتو دوو بەرابەر ئەکاتەوە ﴿وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوانە ئەمرن لە کاتێکدا کەبێبڕوان، واتە ئەو ناپاکییە بەهێزو دامەزراو ئەبێ هەتا ئەمرن لەسەر ئەو بارە بەبێبڕوایی، ئینجا پێش ئەوەی شێوەی دووەمی ئەو ناپاکانە بخاتە برچاو، بەبێزاریەوە پرسیارێك ئاڕاستە ئەکات سەبارەت بەوەی ئەو ناپاکانە ئامۆژگاری وەرناگرنو تاقیکردنەوەو بەسورهاتی سەخت نایانگرێتەوە لەو بارە بەدەی خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ﴾ ئایا ئەوانە نازانن، یان نابینن کە ئەوانە خۆیان تاقی ئەکرێنەوە لە هەموو ساڵێکدا جارێك یان دووجار، واتە چەند جارێك تاقی ئەکرێنەوە، تاقی ئەکرێنەوە بەوەی دەرئەخرێنو نیازو نهێنیەکانیان ئاشکرا ئەکرێن بۆ خەڵکی، یان بەزاڵکردنی موسڵمانەکان بە بێپێویستی بەوانو بە بێباوەڕەکانی یارمەتی ئەوان، یان بەدی هاتنی هەواڵە نهێنیەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، یان هەر جۆرێکی تر، واتە بەڵێ ئەوانە تاقی ئەکرێنەوە بەو جۆرە، ﴿ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ﴾ کەچی لەپاش ئەوە ئەوانە ناگەڕێنەوەو تۆبە ناکەن لەناپاکیو کردەوە بەدەکانیان، ﴿وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ تەمێ خوار نابنو ئامۆژگاری وەرناگرن، ئینجا شێوەیەکی تری ئەو ناپاکانە ئەخاتە بەرچاو کاتێ ئامادەبن لای پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی هاتنە خوارەوەی قورئانو بەبیرو بۆچوونو وەرگرتنیان بۆی ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ﴾ کاتێ کە سورەتێك بهێنرێتە خوارەوە ﴿نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ هێندێکیان سەرنج ئەدەنو ئەڕوانن بۆلای هێندێکی تریانو سەرنجی یەکتر ئەدەنو بێزارن لەبیستنیو چاوە چاویانەو ئەیانەوێ هەڵسنوخۆیان بدزنەوە،ئەڵێن:﴿هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ﴾ ئایا هیچکەس ئەتان بینێ

ثُمَّ ٱنصَرَفُواْ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

---

﴿ثُمَّ ٱنصَرَفُواْ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە بۆیان دەرئەکەوێ کە کەس پێیان نازانێ هەڵئەسن‌و ئەڕۆن ﴿صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم﴾ ئەم ڕستەیە هەڵئەگرێ هەواڵ بێت یان نزا بێت لەلایەن خواوە، هەرکام ببێ پشت شکێنە بۆ ئەو ناپاکانە، لەسەر باری یەکەم: خوا دڵەکانی ئەوانی وەرگێڕاو لایدان لە بڕوا هێنان‌و ڕێنموونی وەرگرتن بە ئایەتەکانی قورئان ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ بەهۆی ئەوەی ئەوانە دەستەو کۆمەڵێکن ناگەن‌و تێگەیشتنیان نییە تا بیربکەنەوە لە قورئان‌و ڕێنموونی لێ وەرگرن، لەسەر باری دووەم: ئەوانە هەڵئەسن‌و ئەڕۆن بەهۆی ئەوەی ئەمانە تێ ناگەن‌و تێگەیشتنیان نییە، خوا دڵەکانیان وەرگێڕێ‌و لایاندا لەسەر هەربار خۆیان تاوانبارو شایستەن بۆئەوە، چونکە بە مەیل‌و هەڵبژاردنی خۆیان لایانداوە لەڕێگەی ڕاست‌و ئەو ڕێگە چەوتەیان داوەتەبەر.

ئینجا سورەتەکەی دوای ئەهێنێ بە دوو ئایەت، ئیتر مەککەیین یان مەدینەیین وەك ریوایەت هاتووە بە هەردووبارەکەیان، ئایەتی یەکەم باسی پەیوەندی ئەکات لەنێوان پێغەمبەرو ئوممەتەکەی کە چەند سۆزو بەزەیی دارو میهرەبانە، ئایەتی دووەم: ئامۆژگاری پێغەمبەر ئەکات(ﷺ) بەمەی پشت هەر بەخوا ببەستێ کاتێ ئەوانە پشتی تێ بکەن‌و بڕوانەهێنن، ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ بێگومان هاتووە بۆتان فروستادەك لە نەفسی خۆتان، واتە لەتیرەو بەرەی خۆتان کە عەرەبە وەك زۆربەو جەماوە ئەڵێن: ئەم ئایەتە هاتووە بۆ مەنەت نان بەسەر عەرەبدا کە خوا خۆیان فروستادەیەکی نارد بۆ سەر ئەمانیش‌و هەموو جیهانیان کە ئەوە ئەوپەڕی چاکە‌و بەهرەیە‌و لە پێش هەموو کەسدا عەرەب سەر بەرز بووە بەوە، یان بێگومان هاتووە بۆتان ئەی ئادەمی فروستادەك لە نەفسی خۆتان، واتە ئادەمییەکە وەك ئێوە، وەك هێندێ ئەفەرموون، لەسەر هەر بار ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) مایەی فەخرو شانازیە لە یەکەمجارەوە بۆ عەرەب ئینجا بۆ هەموو ئادەمی،

ئەوەی کە ئەفەرموێ: لە نەفسی خۆتانو نەیفەرموو لە ئێوەیە، پەیوەستییەکە بەهێز تر نیشان ئەدات، وەك بە سیفەتەکانیشی خۆشەویستی ئەکات کە ئەفەرموێ:

١- ﴿عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ﴾ سەختو قورسو گرانە لەسەری، ناڕەحەتیو زەحمەتو هۆی ناخۆشیو دڵگرانی ئێوە.

٢- ﴿حَرِيصٌ عَلَيۡكُم﴾ زۆر سووروو بەتینە لەسەرتانو زۆر ئارەزوو مەندە بە بڕواهێنانو ڕێنموونیتان.

٣- ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ زۆر بەزەیی دارو میهرەبانە بەبڕواداران، ئەم دوو سیفەتە هێندێ ئەفەرموون: هەر یەکنو واتاو مەبەستیان یەکە، ئەو کاتە هێنانی هەردوو پێکەوە بۆ زیادە دڵنیاییو بەهێزکردنی مەبەستەکەیە، هێندێ ئەفەرموون: جیاوازن لە یەکتر، بەم ڕەنگە یەکەم بریتییە لە میهرەبانیو بەزەیی بەتین، دووەم: هەر میهرەبانیو بەزەیییە، ئەو کاتە ئەبوایە دووەم پێش بخرایە بەپێی باوی قسەو گفتو گۆ، بەڵام بەو جۆرە نەکرا، لەبەر ڕێك بوونی لەگەڵ دوایی ئایەتەکانی تردا، کە پێی ئەگوترێ:(رعایة الفواصل) بە پێی یاسای ڕەوانبێژیی ئەوە بەکار ئەهێنرێو چاودێریی ئەکرێ، هێندێکی تر ئەفەرموون بەرهەمی یەکەم بەرگری زیانە لە یەندەکانو بەرهەمی دووەم فەراهەم هێنانی سوودو قازانجە، هەمیشە بەرگری زیان گرنگ ترو لەپێش ترە، لەبەر ئەوە سیفەتی یەکەم پێش خوا، چەند شتێکی تر گوتراوە لەبارەی جیاوازی ئەم دوو سیفەتەوە بەڵام هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەریان لەبەر ئەوە باسم نەکردن، میهرەبانییەکەی تایبەتی کرد بە بڕوادارانەوە هەرچەندە ڕەوانەکردنەکەی بۆ میهرەبانییە بە هەموو جیهانیان لەبەر ئەوەی هەر بڕواداران پەیانەکەی ئەمیان ئەوێ، بێبڕواکان خۆیان هۆی بەربەستکردنو بەرگری کردنی ئەو میهرەبانیەن کە خراوەتە بەر دەستیان بە فراوانی، کەواتە بێبڕواکان شیاوو شایستەی ئەوەن ڕەقیو توندو تیژیان لەگەڵ بکرێ، پێویست کردنی جەنگو فیداکاری لەسەر بڕواداران، ڕەقیو توندو تیژیی نییە لەگەڵیان، بەڵکو لەبەر میهرەبانییە پێیان، میهرەبانییە پێیان لەبەرگری کردنی ڕیسواییو ژێر دەستەیی، میهرەبانییە پێیان بە سڕینەوەی گوناهو تاوانیان، میهرەبانییە پێیان بەهەڵگرتنی ئاڵاوبانگەوازی خواو گەیشتنیان بە ڕەزامەندی خواو بەهەشتێ کە ئامادەکراوە بۆیان.

ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە ڕێگە ڕاستەکەی خۆی بداتە بەرو پشت بە خوا ببەستێ کاتێ کە بێبڕواکان یاخی بوون لێی‌و پشتیان تێکرد، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوان ڕوویان وەرگێڕاو پشتیان تێکردی، ﴿فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ﴾ ئەوا بڵێ بەسە بۆ من خوایە کە ناوی(اَللّٰهُ)یەو ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوو خوایەك نییە کە من پەنای پێ‌ببەم بێجگە لەو ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ هەر پشت بەو ئەبەستم، کەواتە ئومێدو چاوەڕوانی‌و مەترسیم نییە هەر لەو خوایە نەبێ، کاری خۆم هەر حەواڵەی ئەو ئەکەم ﴿وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ئەو کار بەدەست‌و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە کە ئەو عەرشە جێگەی تەگبیری هەموو جیهانە.

لە چەند شوێنکدا باسی عەرشمان کردو ڕای زانایانمان ڕوونکردووەتەوە لەم بارەیەوە کەواتە لێرەدا هیچ نالێین‌و با سەرنجی ئەو شوێنانە بدرێ، ئەم سورەتە جەنگ‌و جیهادییەی دوایی هێنا بە فەرمانذان بە مەیلی دڵ هەر بۆ لای خوا، پشت بەستن هەر بە خواو داوای هێزو دەسەڵات تەنها لە خوا، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لە پیت‌و فەڕی ئەم سورەتەو گوێ ڕایەڵێتی بۆ فەرمانەکانی آمین.

وصلي الله وسلم علي سيدنا محمد و آله أجمعين.

# سورەتی ﴿یونس﴾
## مەککەییەو(١٠٩) ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە مەککەییەو نزیکی سێ لەسەر چواری ئەم جزمی یازدەیەیە، بێگومان قورئان بەتێکڕایی هەرچەند فەرمودەی خوایەو هیچکەس ناتوانێ وێنەی بڵێ. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو دوو بەشە قورئانە جیاوازن لەیەکتری لەتام و بۆن و هەناسەو شێوەو مەبەستدا، وەك چەند جارێ باسکراو ڕوونکرایەوە.

ئەم سورەتە ناونراوە بە سورەتی ﴿یونس﴾ هەرچەند بە تەنیا ئایەتێك دەست نیشان ئەکات بۆ داستانی یونس و بە چەسپانی تێپەڕ ئەکات بەسەریدا، بەڵام لەو داستانەدا دوو شتی گرنگ هەیە کە لەداستانی هیچکام لە پێغەمبەراندا نەبووە:

١- ئەو گەلە لەکاتی هاتنی ئەو سزادا فریای خۆیان کەوتن بە تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خواو پێش ئەوەی سزاکە داگیریان بکات.

٢- ئەو گەلە تاقانە گەلێك بوون کە بە یەکجارو بە تێکڕایی بڕوایان هێنا، بەڕاستی هەردوو شتەکە پاڵدەرن بۆ ئەوەی ئوممەتەش بیربکەنەوەو فریای خۆیان بکەون.

مەبەست و مەسەلەی سەرەکی ئەم سورەتە مەسەلەی خوایەتی و بەندەییەو ڕوونکردنەوەی ئەو دوو شتە، ڕوونکردنەوەی داخوازی ئەو دوو شتەیە لە ژیانی ئادەمیدا، ئەو مەسەلانەی تر کەلەم سورەتەدا هاتوون، وەك مەسەلەی سروشتی خواو ڕۆژی دوایی و باسی پەیامەکانی پێشوو، هەموو ئەوانە هاتوون بە بۆنەی ڕوونکردنەوەی ئەو دوو مەسەلە سەرەکییانەوە کە باسکران، ڕاست بوونەوەی ژیان لەم سەر زەوییەدا بەستراوە بەو دوو شتە سەرەکییەوەو بەدی هێنانی داخوازی ئەو دوو شتە لە ژیاندا، ئەم سورەتە هاتووەتە خوارەوە لەپاش سورەتی(الإسراء) لەکاتێمدا کە دەمەقاڵێ و قسەو باس زۆر گەرم و بە تین بوون لە لایەن بت پەرستەکانەوە سەبارەت بەڕاستی سروشتی خوا، لەبارەی ئەم قورئانەوە، ئەوا سەرەتای ئەم سورەتەش هەر لەو بارەیەوە هاتووە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ

---

**ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * الٓر﴾ لەبارەی ئەو پیتە بچڕاوانەوە لە سەرەتای چەند سورەتێکدا قسەو باسمان بە تایبەت سورەتی(یس) کەلە پێش ئەم سورەتەدا تەفسیرمانکرد. کەواتە پێویست نییە لێرە هیچ بڵێین. ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ ئەم ئایەتە گرنگ و پایە بەرزانەی کە لەم سورەتەدا یالە هەموو قورئاندایە، ئایەتەکانی کتێبێکی لێزان و کاردروستن، بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوەو هەموو هەر باشن و ئەگونجێن، بەڵێ ئەم کتێبە کاردوست و حەکیمە لەگەڵ ئادەمیدا ئەدوێ و قسە ئەکات بەجۆرێ ڕێکە لەگەڵ سروشتیدا، چەند شتێکی نیشان ئەدا کە ڕاست و دازراوەو لە هەموو کات و چینێکدا نیشانەی ڕاستییەکەی دەرئەکەوێ، لێزان و کاردروستە، نەزان و بێئاگایان وریا و زانا ئەکاتەوەو ڕێنموونیان ئەکات بۆ بیرکردنەوە لەو هەموو بەڵگەو ڕابەرو نیشانانە کە خوا پێکی هێنان و دایناون لەم بوونەوەرەدا، لێزان و کاردروستەو هەموو بڕیارەکانی ڕاست و دروست و بەجێن و شیاو و شایستەن لە هەموو کات و چەرخێکدا بۆ هەمووان. بێبڕواکانی ئەم ئوممەتە، هەروەها هەموو بێبڕوایان لەگەڵ ئوممەتەکانی ڕابوردوو سەریان سوڕ ئەما لەوەی کە خوا لە ئادەمییەك بکات بە فروستادەی خۆی بۆ لای بەندەکانی ـ لەبەر نەفامیان ـ لایان وابوو کە فروستادەیی ئەبێ لە تیرەکەی تربێت، فریشتەیان هەر دروستکراوێکی تر کە پایەو پلەی بەرز تربێت لە ئادەمی! نەیان ئەزانی کە ئەم ئادەمییە زۆر بەڕێزو بەنرخەو وا دروستکراوە دەست ئەدات بۆ ئەو کارە گرنگەو بۆ ئەو فروستادەییە، بەڵکو لەبەر نەفامیان نەیان ئەزانی کە ناگونجێ دروستکراوێکی تر کە سروشتی جیاوازە لە سروشتی ئادەمی، بێجگە لەوەش فروستادەکە ئەگەر فریشتە یان جنۆکە بوایە ـ وەك ئەوان ئەیانەوێ ـ ئەبوو وێنەو شێوەی ئادەمی بکێشرایە بەسەریدا، ئەو کاتە هەمان گرێ و هەمان**

ڕەخنە هەر ئەمانە گوێ‌و هەمان ڕەخنە هەر ئەمانە کایەوە، کەواتە لەڕاستیدا قسەو بیرو بۆچوونەکەی ئەوان شتێکی ناڕاست‌و ناڕەوایەو ئەبێ سەر سوڕبمێنێ لێی‌و بەبێزاری دەربڕینەوە ئەم پرسیارە ئەکات‌و ئەفەرموێ: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ ﴾ واتە ئایا(وەحی) سروش کردنی ئێمە بۆلای پیاوێك لە ئادەمی، شتێکی نایابەو هۆی سەر سوڕمانە بۆیان؟! واتە نەخێر ئەوە شتێکی ڕاست‌و دروستەو جێگەی سەرسوڕمان نییە، بەڵکو بێزاری‌و سەر سوڕمانەکەی ئەوان جێگەی سەرسوڕمان‌و بێزاری دەربڕینە لێی! ئایا هۆی سەر سوڕمانە ئێمە سروش بکەین بۆلای یەکێ لە ئادەمی، ﴿أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ﴾ بەمەی کە ئادەمی بە تێکڕایی بترسێنە، واتە هەواڵیان پێبدەیت بەجۆرێ بیانترسێنە لە یاخی بوون‌و سەرکێشی لە فەرمانی خوا ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ مـوژدە بدە بەوانەی بڕوایان هێناوە بەمەی کە بۆیان هەیە لای پەروەردگاریان بڕواو نیازو کردەوەی چاك کە پێشکەوتووە لەزانینی ئەودا! یان بۆیان هەیە لای پەروەردگاریان پایەو پلەی بەرز، یان ئارامی‌و دامەزراوی لە هەموو کات‌و بەسەرهات‌و ڕووداوێکدا، ترساندنە کە بۆ هەموانە، بەڵام موژدەکە تایبەتییە بە بڕوادارانەوە لەبارەی ڕاست‌و ڕەوایی(وەحی) سروشەوەو پووچەڵکردنی هەر گومان‌و دوو دڵی یەك لەلایەنە بێبڕواو نەفامانەوە، زانایانی ئیسلام خوا پاداشتیان بداتەوە ئەوەی پێویست بێت هەڵساون پێی‌و خراوەتە بەرچاو لە کتێبەکاندا، بەڕاستی زانای بەرز(سید رشيد رضا) خوا پایەی بەرزی تایبەتی پێببەخشێ لە بەهەشتی بەریندا، ئەو زانا بەرزە پاڵفتەی فەرموودەکانی زانایانی ئیسلامی هێناوە لە تەفسیرەکەیدا بەتایبەتی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە خەریکین پێیەوە، هەروەها لە کتێبە نایابەکەیدا کە جێگەی ڕێز بووە لەکاتی دانانیدا کە کاتێکی زۆر ڕەش‌و تاریك بووە، بێبڕوایی ماددێتی‌و صەلیبیەتی‌و صەهیۆنێتی ئاسمانی جیهانی داگیر کرد بوو، ئەو کتێبە تایبەتییە کە ناوی نا بە(الوحي المحمدي) دەم کوتی بێبڕواو یاخی بووانی پێکردو بەجوانی مەسەلەکەی ڕوون‌و ئاشکرا کرد، بەجۆرێ زۆر لە بێبڕوایان بڕوایان هێناو ئەوەش کە بڕوادار نەبوو ناچار بوو بە پەسەندکردن‌و دەربڕینی ڕێز بۆ ئەو کتێبە، جا هەرکەس ئەوەیەوێ با تەماشای ئەو کتێبە بکات تا بەباشی مەسەلەکەی بۆ ڕوون‌و ئاشکرا ببێتەوەو بتوانێ نەفامو نەزان

ڕێنموونی بکات، بەڵام بەڕاستی هەرکەسێك لە ڕاستە شەقامی ژیریی لانەدا بەهێندێ بیرکردنەوەو تێفکران بۆی دەرئەکەوێ ڕاستو ڕێکی ئەم دوو شتە کە نەفامو بێبڕوا سەری لێ ئەکەنەوەو دەمبازیان تێدا ئەکەن:

١- پێویستیو ناچاری بە سروش کردنی خواو داخوازیو کاردروستی خوا بە سروش کردنو ڕاگەیاندنی فەرمانی خوا بە بەندەکانی.

٢- سروش کردنی بۆلای ئەو بەندەیانەی کەلە تیرەی ئادەمیینو هەرکام لەو بەندەیانە هەڵبـژێریو دیاریی بکات بۆ گەیاندنی پەیامەکانی خوا، کاردروستی لە سروش کردنی بۆلای ئەو بەندەیانەی کەلە تیرەی ئادەمین نەك لە تیرەی فریشتەو جنۆکەو هەر تیرەیەکی تر، شتێکی ڕوونو ئاشکرایە، چونکە ئەو فروستادەیە هەست ئەکات بەهەر شتێك کە ئەوان هەستی پێئەکەن، کەواتە ئاگادارە بە هەموو دەردو دەرمانێکیان، هەر داواو ئەرکێکیان بخاتە سەرشان ـ کە خۆی ئەبێ یەکەم کەس بێ لە بەجێهێنانی ئەو داواو ئەرکانەدا ـ هیچ سەری لێناکەنەوە، چونکە ئەوا خۆی بەشدارە لەگەڵیان، بێجگە لەوانە کاتێ فروستادە لە تیرەی خۆیان بوو یەکتریان ئەناسی هیچ سڵەمینەوەیەك نابێ لە نێوانیاندا، بەسوكو ئاسان فەرمانی لێ وەرئەگرنو ڕایەڵئەبن، بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر لەتێرەیەکی تربێتو سروشتیان جیاوازبێت، کاردروستی لە سروش کردنو ناردنی فروستادەوپێویستیو ناچاری بەوە شتێکی زۆر ڕوونو ئاشکرایە، چونکە ئەم ئادەمییە ئامادەیە بۆ چاکەو بۆ خراپە، ئەو شتەی کە چاکەو خراپەی پێ جوێ بکاتەوە لە یەکتر تەنها ژیرییەکەیەتی، ئەو ژیرییەش پێویستی هەیە بە ترازوویەکی ڕێكو ڕاست کەلە هیچ مەسەلەیەکدا سەر ناکاتو لارو خوار نەبێ، پێویستی هەیە بەوە هەرکاتێ کە ژیریی خۆی هەڵە بکاتو ڕاستو ناڕاستی بۆ جوێ نەبێتەوە، هەرکاتێ لایدابێ ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، ئەو ترازووە ڕێكو ڕاستودامەزراوەتەنهاڕێنموونی خواوشەریعەتی خوایە،ئینجالەگەڵ ئەمەداکەبەوجۆرە ناچاری هەیە بە(وەحی) سورشی خواو بە سروش کردن بۆلای پیاوێك کە لە خۆیان،

بێبڕوای نەفام سەری ئەمێنێ لەو شتە ئاشکرایە تا ئەو ڕادەیە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ بێبڕواکان ئەڵێن: ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ مُّبِينٌ﴾ زۆر لەباتی(ساحر)(سحر) ئەڵێن و بەمە ئەخوێننەوەو هەردوو خوێندنەوەکە ڕاستەو هاتووە، لەسەر باری یەکەم کە ئێستا باوە ئەڵێن: بێگومان ئەم پیاوە ـ واتە محمد ـ جادوبازێکی ئاشکرایە، لەسەر خوێندنەوەی دووەم ئەڵێن: بێگومان ئەمە ـ واتە قورئان ـ جادوویەکی ڕوون و ئاشکرایە، بێگومان هەرکام لەم دووبارە ئەویتر ئەگەیەنێ: ئەگەر پیاوەکە بەجادووباز دابنرێ ئەبێ ئەوەی کە ئەیڵێ جادووبێت، ئەگەر ئەوەی کە ئەیڵێ بە جادوو دابنرێ ئەبێ ئەو کەسەی کە ئەیڵێ جادووبازبێت، نەفرینی خوایان لێ بێت کاتێ کەداماو دەستە پاچە بوون بەرابەری ئەو قورئانە، لەبەر چی نەیان گوت: ئەم پیاوە ئەبێ فروستادەی خوا بێت، ئەوەی کە ئەیڵێ ئەبێ فەرموودەی خوا بێت و سروشی پێکراوە بۆلای ئەو پیاوە؟!

مەسەلەی بڕوابوون بە خوایەکی داهێنەر بۆ ئەم بوونەوەرە شتێکی وەرگیراوی دان پیا نراوبوو لەلایەن بت پەرستو نەفامەکانی کۆنەوە وەك قورئان لە چەند شوێنێکدا دەست نیشانی بۆ ئەکات، بەڵکو ئەوەی کە بڕوایان پێی نەبوو، جێگەی قسەو باسیان بوو، گرێ بوو لە دڵیاندا مەسەلەی تاك و تەنیایی بوو، ئەوە بوو چەند هاوبەشێکیان ڕەوا ئەدا بۆ خواو ئەیانپەرستن، بە ئومێدی ئەوە نزیکیان بکەنەوە لە خواو تکایان بۆ بکەن لای خوا، هەرچۆنێ ڕەوایان ئەدا دانانی شەرع و حاکمێتی تایبەتی بە خواوە، جا قورئان لە چەند شوێندا ئەو بیروباوەڕانە بە ناهەق و پووچەڵ دەرئەکات بە شێوەیەکی سووك و ئاسان و بێگیرو گرفت مەگەر لەلایەن کە سێکەوە کە نەفام بێت و هێزی ژیریی لەکار کەوتبێ، یەکێ لەو شوێنانە ئێرەیە کەواتە بەم دوو سێ ئایەتە دڵ پاراو ئەکاتەوەو بە هەموو ئارامییەکەوە بڕوا بەتاك و تەنیایی خواو حاکمێتی خوا ئەچەسپێنێ، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارو خاوەن و کاربەدەستی ئێوە ئەو خوایە کە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾ یە،

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ كە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە لە شەش ڕۆژدا لەم ڕۆژانەی ئێمە، چونکە ئاشکرایە ئەم ڕۆژانی ئێمە لەپاش دروستکردنی ئاسمان و زەوی پەیدا بوون، باشتر ئەمەیە ئێمە هیچ واتا و مەبەستێك دیاریی نەکەین بۆ ئەم ڕۆژانەو بڵێین: ئەمە یەکێکە لە غەیب و نهێنییەکانی خواو خۆی ئەزانێ چین، بەس ئەمە وەرئەگیرێ کە ئەم دروستکراوانە بە یەکجارو پێکەوە دروستکراون، چاك وایە زانین و مەبەست بەوانە بگێڕینەوە بۆلای داهێنەرەکەی وەك لێرەشدا ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ کە چاك وایە هیچ واتاو مەبەستێك دیاریی نەکەین و حەواڵەی خوای بکەین، کە ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەوانەی پێیان ئەگوترێ(متشابه)، لە چەند شوێنێکدا ڕای زانایانی ئوممەتمان باسکردووە لەوانەدا، ڕای پێشووەکان کە ناو ئەبرێن بە(سلف) ئەوەیە کە ئەفەرموێ: بڕوامان پێیان هەیە لەسەر ئەو بارەی کە مەبەستە لای خواو بڕوامان وایە کە بە گوێرەی ڕووکەش و ڕواڵەتەکەیان مەبەست نین، وەك لێرەدا لە(ئیمامی مالیك و ئەحمەد)ەوە ئەگێڕنەوە، فەرموویان:(الاستواء معلوم والكيفية مجهولة والسؤال عنه بدعة والإيمان به واجب) واتە وتەی(استوا) شتێکی زانراوەو چۆنێتییەکەی نەزانراوەو پرسیار کردن لە مەبەست بە(استوا) بیدعەیەو لە چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) و یارانیدا پرسیاری لێ نەکراوە پێویستە بڕوا هێنان پێی لەسەر ئەو بارو جۆرەی کە هاتووە، واتە زانینی مەبەستەکەی حەواڵەی خوا ئەکەین و ئێمە هیچ مەبەستێك دیاریی ناکەین، دەستەی پاش ئەوان کە ناوبران بە(خلف) کە لەبەر ئەوەی نەزانەکان و ئەوانەی کە لەڕاستە شەقامی ئیسلام لایانداوە ئەو جۆرە ئایەتانە بەپێی ڕووکەش و ڕواڵەتەکانیان تەفسیر ئەکەنەوە بۆ سەرتێکدان لەخەڵکی، ئەم دەستەی دووەمە لەبەر ناچاری ئەو جۆرە ئایەتانە ئەبەن بەسەر واتا و مەبەستێکدا کە بگونجێ بۆ خوا، بۆ وێنە مەبەست بەو وتەیە پادشایەتی و زاڵی و دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا، تەواو بوونی هەموو کاروبارێکی ئەو پادشایەتییە لەسەر ئەو بارو جۆرەی کە خوا ویستویەتی، بە وێنەی ئەوە کە کاتێ کاروباری پادشاکانی جیهان تەواو ئەبێ و دائەمەزرێ، ئەڵێن: پادشا چووە سەر تەخت. مەبەستیان ئەوە نییە: پادشا دانیشت و جێگیر بوو بەسەر تەختی

پادشایەتییەوە جا لێرەدا هەرچەند ئەم واتاو مەبەستە زۆر پەسەند کراوە لەلایەن زانا بەرزەکانەوە بەڵام بەڕاستی چاك وایە هیچ واتاو مەبەستێك دیاریی نەکەین، بەوێنەی ئەم شەش ڕۆژەو هەموو غەیبیو نهێنییەکانی تر کە مەبەستیان بۆ دیاریی نەکراوە، بە ڕاستی پێویستە ئێمە خۆمان بناسینو لە خۆمانەوە دەم نەکوتین لەو جۆرە شتانەی کە زانینان نەدراوە پێمانو لەڕادەو پلەی زانینو ژیریی ئێمەدا نین. بەدرێژیی ئەم باسەم هێناوەو ڕا جیاوازەکانی زانایانم باسکردووە لە تەفسیری ئایەتی(٧)ی سورەتی ﴿آل عمران﴾دا، بە پێویستم نەزانی لێرەدا هیچی تر بنووسم، بەس لێرەدا پێویستە بڵێین: وتەی ﴿ثُمَّ﴾ لێرەدا بۆ دواکەوتنی کاتو زەمان نییە، چونکە عەرش لە پێش ئاسمانەکانو زەویدا دروستکراوە، وەك لە ئایەتی(٧)ی سورەتی ﴿هود﴾دا دەریئەکەوێ کە ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ﴾ واتە لەپێش دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا عەرشەکەی خوا بەسەر ئاوەوە بووە. بەڵکو وتەی ﴿ثُمَّ﴾ بۆ دواکەوتنی هەواڵ دانە بەم ڕستەیە لە هەواڵدان بە ڕستەی پێشوو لەبەر دەست نیشانکردن بە ڕادەو پلەی بەرزی عەرش، وەك لە دەستوورو یاسای ڕەوانبێژییدا ئەم جۆرە شتانە باسکراوە لێرەدا گوتراوە: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ خوا تەگبیری هەموو کاروباری ئاسمانەکانو زەوی هەرچی وا لە نێوانیانداو هەموو شتێ ئەکات، کە یەکێ لەوانە ناردنی پێغەمبەرانو ناردنی شەریعەتەکانیەتی لەڕێی ئەو پێغەمبەرانەوە، واتە بڕیاری هەموو شتەکان ئەداتو چاودێری هەمووی ئەکات چ پێشو چ هێنی داهاتوو پاش، چ سەرەتاو چ سەرەنجام، تەگبیری ئەکاتو بڕیار ئەدات، بە ئەو پەڕی دادو لێزانیو کاردروستی کە بەهیچ کلۆجێ و دەست ناداتە ڕێكو ڕاست تر لەوەی ئەو خوایە ئەیکات. بێگومان هەموو تەگبیرو بڕیارەکانی لە پێشەوە کراونو دراون بەبێ سەرەتاو هەر لە ئەزەل دا، ئەوەی کەلەپاشدا کراوەو ئەکرێ بەدی هێنانی تەگبیرو بڕیارە ڕابوردووەکانە، بەرە بەرە بەپێی زانینو بەرژەوەندیو کار دروستی خۆی. لەبەرئەوە بە وتەی ڕابوردوو نەیفەرموو: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ بەڵکو بە وتەی ئێستاو داهتوو فەرمووی: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ کە نەوەستانو بەردەوامیش ئەگەیەنێ، سبحان من أنزل هذا الكتاب الكريم.

ئەو هەموو کاروبارەی کردووەو ئەیکات بە خود سەری و بە تەنیا خۆی و بەبێ پێویستی بە هیچ شت و بە هیچکەس وەك دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦ﴾ هیچ تکا کەرێك نییە لە هیچ کاتێکدا بۆ هیچ کەسێك، مەگەر لەپاش ئیزن و ڕەوادانی خوا، کەواتە هەموو کارێ هەر بۆ ئەوەو بەدەستی ئەوە، هەموو بڕیارێ ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەو، تکا کاران نین کە بتوانن خەڵکی نزیك بخەنەوە لە خواوە، هیچ کام لە دروستکراوکانی ناتوانێ تکا بکات مەگەر کاتێ ئیزنی تکا کردن بدات، بە پێی تەگبیرو بڕیاری، شایستەی تکایش بەهۆی بڕوا و کردەوەی چاك نەك تەنیا بە پەنا بردن بە تکا کاران و گێڕانی بە تکا کار، وەك بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەران گومانیان ئەبرد کە پەرستنی مەلائیکە تکایەکی وەرگیراوەو هەرگیز ژێر پێ ناکرێ! ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەوا زاتە پایە بەرزەی کە خاوەنی ئەو سیفەتانەیە کە باسکرا. ئەوە خوایەکە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یە ﴿رَبُّكُمۡ﴾ پەروەردگارو خاوەن و کاربەدەستی ئێوەیە ﴿فَٱعۡبُدُوهُ﴾ کەواتە ئەو بتپەرستن بە تاك و تەنیا و بەبێ هیچ هاوبەشێك ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بیرناکەنەوە واتە ئایا ئێوە ئەو شتە ئاشکرا نازانن بەهۆی ئەوەوە ئامۆژگاری وەرناگرن و بیر ناکەنەوە لەوە کە تەنها ئەو خوایە بپەرسترێ؟! لە پێشەوە گوتمان: ئەو بت پەرستانە دانیان ئەنا و باوەڕیان بوو بەبوونی داهێنەرێکی دەسەڵاتدار بەسەر هەموو شتێکدا کە ڕۆزی دەری هەموو زیندەوەرێکەو مردن و ژیان بەدەست ئەوە، کەواتە ئەبوایە بە پێی ئەوە تەنها ئەو خوایە بپەرسترایەو ملکەچی هەر بۆ ئەو بکرایەو پەیڕەوی هەر بەرنامەو شەریعەتی ئەو بکرایە، کەچی بەو جۆرەیان نەئەکردو چەند پەرستراوی تریان بڕیار ئەدا، بێگومان ئەوەش ئەو پەڕی نەفامییە لە هەموو سەردەم و چەرخە نەفامیەکاندا خەڵکی بەو جۆرە بوون و هەن، لایان وایە بڕوا بەبوونی ئەو خوایە بەسە، هەرکەس ئەو بڕوایەی هەبوو ئیتر ئەو کەسە بڕوادارەو ئیتر با شوێنی بەرنامەی ئەو نەکەوێ و پەیڕەوی و گوێڕایەڵ نەبێ بۆ شەریعەتەکەی ئەوا هەروەها لەبارەی پەرستن و عیبادەتەوە گومانیان وایە هەر بریتییە لە سوژدە بردن و نوێژو دروشمەکانی پەرستن، هەرکات هەڵسان بەو دروشمانە ئیتر بەسە بۆ خواپەرستیەکان، لەگەڵ ئەوەدا عیبادەت و پەرستن بریتییە لە ئەوپەڕی ملکەچی و گوێڕایەڵی و پەیڕەوی فەرمان لە هەموو شتێکدا، هەڵسان بەو دروشمانە شێوەو بەشێکە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی.

إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٤﴾

نەفامێتیو سەردەمی نەفامی بریتییە نییە لە ماوەو کاتێکی تایبەتی، قۆناغێکی تایبەتی نییە لە قۆناغەکانی ژیان، بەڵکو بریتییە لە کاتو چەرخێك کە شەریعەتی خوا کاریەدەستو حاکم نەبێت، ئیتر با لە ولاتی ئیسلامدا بێت، با هەموو دانیشتوان هەڵسن بە نوێژو ڕۆژو دروشەکانی تر. تەنها ئەو خوایە بپەرستن، چونکە گەڕانەوە هەر بۆ لای ئەوە لەپاش مردن، حیسابو پاداشتو تۆڵەی تاوان لەوێدا بەدی دێت، وەك دەست نیشان ئەکات بەوە ئەفەرموێ: ﴿إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ﴾ هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوەتان بە هەموو تیکڕاییو کۆمەڵی ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ﴾ خوا بەڵێنی داوە بەوە بە بەڵێنێکی هەقو ڕاستیو ئەو بەڵێنە ئەبێ بەدی بێت، چونکە بەڵێنی خوایە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی ئەو گەڕانەوەو زیندوو بوونەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ واتە بێگومان خوا لەیمجارەوە دروستی کرد بە دروستکردنو خەڵکی دروستکرد. ئینجا لەپاش ئەوە ئەیمرێنێو لەپاشان دووبارەی ئەکاتەوە ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ بۆ ئەوەی ئەو پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێهێناوە، پاداشتیان بداتەوە بەدادو ئەجری ئەو کردەوە چاکانەیان بداتە دەست بە میهرەبانی خۆی، نیعمەتو چاکەو بەهرە بەبێ ناخۆشی یەك کە تێکەڵ بێت یان بێت بەدوایدا مەبەستێکە لە مەبەستەکانی دروستکردنو دووبارە کردنەوە، ئەوەیە پۆپەی هەرە بەرزی تێرو تەواوی کە پێی بگات، شتێکی ئاشکرایە کە ئەم جیهانە تێکەڵە لە بێئارامو ناخۆشی، هەرگیز هیچ خۆشییەك خاڵی نابێ لە ناخۆشییەك کە تێکەڵی بێت یان بێت بەدوایدا، ئەگەر لەم ژیانو جیهانەدا هیچ ناخۆشییەکی دووچار نەبێ بێجگە لە هەست کردن بە نەمانی ئەو خۆشیو بەهرەیە کە

تێیدایه ئەوە بە تەنیا بەسە بۆ ناتەواویو نەگەیشتن بە پایان، کەواتە ئادەمی هەرگیز لەم جیهانو زەوییەدا ناگات بەو پۆپە هەرە بەرزە کە شایستەیەو بۆی دانراوە، کە بریتییە لە ڕزگار بوون لە هەر ناتەواویو کەمو کوڕیو لاوازییەك، ڕابواردن بەبێ هیچ جۆرە تەمو غەمو بێئارامیو مەترسی نەمانو دوا هاتن، ئەوەش تەنها لە بەهەشتدا دەست ئەکەوێو بەس وەك قورئان باسی فەرمووە، کەواتە ئەبێ یەکێ لە مەبەست دروستکردنو دووبارە کردنەوە گەیاندنی بڕواداران بێت بەو ڕادەو پۆپە هەرە بەرزە، چونکە ئەو ڕێگەیەیان داوەتە بەر. بەڵام بێبڕوایان کە لایان داوە لەڕێگەی گەیشتن بەو ئامانجەی کە باسکرا، ئەبێ نەگەن بەو ئامانجو پایەو پلە بەرزە، ئەبێ دووچاری پاشە ڕۆژو سەرەنجامو بەرهەمی ئەو لادانەی خۆیان بێت وەك دەست نیشانی بۆ ئەکات کە بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ﴾ بۆیان هەیە خوراوەیەك لەئاوی گەرم، ئەو ئاوە گەرمەی کە بە ئاگری دۆزەخ گەرم کرابێ، ئەو ئاوە گەرمەی کە لە چەند جێگەیەك لە قورئاندا باسی ئەفەرموێ، کە بەڕاستی ئەبوایە تەنیا باسی ئەوە بەس بوایە بۆ گەڕانەوە لە هەموو خراپەیەكو ڕێنموونی وەرگرتن، ﴿وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی سەختی ئازار دەر بەهۆی ئەوەی بڕوایان نەهێناوەو بەردەوام بوون لەسەری تامردن.

لەسەر تەفسیری ڕابردوو ڕستەی ﴿إِنَّهُۥ يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ﴾، سەربەخۆ هێنراوە بۆ دەست نیشان بۆ هۆی ئەو گەڕانەوە کە لەڕستەی پێشوودا باسی فەرموو وەك تەفسیرمان بەو جۆرە کردەوە. هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: ڕستەی ﴿إِنَّهُۥ﴾ هەر بۆ باسو ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەی کەبەڵێنی پێدراوە واتە خوا بەڵێنی داوە کەلە یەکەم جارەوە دروستکردن بەجێ ئەهێنێ، ئینجا پاش مردن دووبارە کردنەوە ئەکات لەبەر بەجێهێنانی داد لە پاداشتو تۆڵەدا، ئەمەش هەر چاکەو ئەگونجێ، لەسەر ئەم بارە ڕستەی ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ﴾ هۆی ڕستەی ﴿إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ﴾ واتە گەڕانەوەتان بە تێکڕایی هەر بۆ لای خوایە چونکە خوا بەڵێنی داوە بە دروستکردنو دووبارە کردنەوە.

له پێشەوە دەست نیشانی کرد بەهێندێ لە ڕابەرو بەڵگە بوونوەریەکان و بەوە سەرنجی ڕکێشاو فەرمانیدا بە پەرستنی پەروەردگارو هۆی ئەو پەرستنە، ئینجا هەمیتر ئەگەڕێتەوە بۆ لای چەند بەڵگەو ڕابەرێکی تری بوونەوەریی، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا﴾ زۆر لە زانایان ئەفەرموون مەبەست بەم دوو وتەیە: ﴿ضِيَآءً﴾و ﴿نُورًا﴾ هەریەکە بەلام ڕای ئەوانە بەهێزە کە ئەفەرموون: جیاوازن. بەم ڕەنگە ﴿ضِيَآءً﴾ بریتییە لەڕووناکی یەکی بەهێز کە بڵێسەو هەڵگرانی لەگەڵ بێت. ﴿نُورًا﴾ ڕووناکییە بەگشتی، یان یەکەم ڕووناکییە کەلە خوودی ڕووناکەکەوە هەڵقوڵابێ، دووەم ڕووناکییە کە بەهۆی شتێکی ترەوە هاتبێ و وەرگیرابێ و بێگومان ناوبردنی خۆر لە قورئاندا بەچراو ناوبردنی مانگ بە نور بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەری ڕای دووەم و سێیەم، کەواتە بەو جۆرە تەفسیری ئەکەینەوەو ئەڵێین: خوا کەسێکە کە خۆری داهێناوەو دروستی کردووە لە کاتێکدا کە خاوەنی ڕووناکییەکی بەهێزی هەڵگیرساوی بڵێسەدارە، یان لە کاتێکدا کە ڕووناکییەکی وایە کەباسکرا، واتە بە زیادە ڕەوی ناوبراوە بەو ڕووناکییەو وەك ڕووناکی بێت وایە، مانگی گێراوەو دای هێناوە بە خاوەنی ڕووناکی یان گێراویەتی بە ڕووناکی و وەك بریتی بێ لە ڕووناکی، هێندێ ئەفەرموون: ﴿ضِيَآءً﴾ کۆیەو ﴿ضوء﴾ تاکەکەیەتی وەك(حوض)و(حياض)، بەم جۆرەش هەر چاکەو دەست نیشانی تێدایە بە شتێکی غەیبی و نهێنی کەلەم دواییەدا زانراوە، ئەوەش ئەمەیە: شوعلەو ڕووناکی خۆر پێك هاتووە لە حەوت ڕەنگ وەك دەریش ئەکەون لە هەسونە زێڕینەدا، خوا ئەو خوایەیە کە خۆر و مانگی بەو جۆرە دروستکرد و داهێنان، ﴿وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ﴾ بڕیاری داوەو دیاریی کردووە بۆ مانگ چەند خولگەو جێگاو شوێنێك بۆ گەڕان و چەرخە کردنەکەی، یان گەڕان و چەرخەکردنەکەی مانگی بڕیار داوە لە چەند خولگەو شوێنێکدا کە هەر ڕۆژێ لە یەکێ لەوانەدا ئەگەڕێ و ڕۆژێ تر لە جێگاو شوێنێکی تردا بەبێ دواو بەرو هەڵە کردن، وەك بەچاوی ڕووت ئەبینرێ هەر ڕۆژە لە ڕادەیەکداولەسەرباروشێوەیەکی تایبەتی،ئەوەش بەپێی جیاوازی بارودۆخی لەگەڵ خۆردا،

هۆی ئەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ﴾ بۆ ئەوەی بزانن ژمارەی ساڵەکان‌و بزانن حیساب‌و ژمارەی کات‌و مانگ‌و ڕۆژەکان، بۆ دیاریی کردن‌و زانینی کاتی عیبادەت‌و مامەڵەکانی دینی‌و دنیایی‌و ماڵی‌و شتەکانی تر کە پێویستن بەوە ئەگەر ئەم یاسا و ڕژێمە ڕێك‌و ڕاستە نەبوایە نەئەگونجا بۆ نەخوێندەوار زانینی ئەوانە، چونکە حیسابی ساڵ‌و مانگی خۆری خوێندەواری‌و زانینی ئەوێ، جا بە هۆی ئەو سوك‌و ئاسانی ساڵ‌و مانگی شەریعەتی ئیسلامە کە بۆ هەمووان هاتووە مانگی ڕۆژوو و حەج‌و عیدەی تەڵاق‌و شتەکانی تری بڕیار داوە بە حیساب‌و ژمارەی مانگییەوە، بەتایبەتی بۆ ڕۆژوو و حەج مەبەستێکی تریش هەیە کە چەرخەو گەڕانیانە بە هەر چوار وەرزەکەدا، تا لە هەموو کاتەکانی سەرما و گەرما و خۆشی و ناخۆشیدا موسڵمانان هەڵسن بە پەرستن‌و عیبادەتی پەروەردگاریان، هیچ بەرگری ناکرێ کە زانایان سوود وەرگرن لە حیسابی کات‌و ساڵ‌و مانگی خۆری کە بۆ چەند شتی تر دەست ئەدات‌و سوود بەخشە، قورئان ڕێنموونی کردووە بۆ ئەوە لە چەند ئایەتێکدا بۆ وێنە لە سورەتی ﴿الرحمن﴾دا ئەفەرموێ: ﴿ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ﴾و لەئایەتی(١٧)ی ﴿الإسراء﴾دا ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةٗ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ﴾ وەك بە یارمەتی خوا لە شوێنی خۆیاندا بەدرێژیی لەسەری ئەدوێن، ئایا خوای میهرەبان لە خۆڕایی‌و بێباوەڕەکانی سوود ئەو کاروبارەی فەراهەم هێنا؟ ئایا ئەوانە کارێکی بێ هودە بوون؟! ئایا لە خۆوەو بەڕێکەوت ئەوانە پەیدا بوون؟ نەخێر نەوالله ﴿مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ خوا ئەوانەی دروست نەکردوو بە حەقیانەت‌و ڕاستی نەبێت، واتە لە خۆڕایی دروستی نەکردوون، بەڵکو بە ئەوپەڕی کاردروستی‌و زانین دروستی کردوون‌و چاودێریی بەرژەوەندی کراوە لە هەموو شتێکیاندا، ئەوە هەموو ئەو ڕابەرو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە کە ئایەنە ژمارە شایەتی ئەدەن لەسەر ئەوە، وەك دەست نیشان ئەکات،

يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾

**ئەفەرموێ: ﴿يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئايەتەكانی بەڕوونی باس ئەكات، ئايەتە قورئانيەكان كە خۆيان لە خۆياندا ڕابەرو بەڵگەی ئاشكران و ئايەت و ڕابەرە بوونەوەريەكانيش ئەخەنە بەرچاوو دەست نيشانيان بۆ ئەكەن بۆ هەموو كەس بەڵام هەر ژيرو زانا سوود وەرئەگرن و بەهرەمەند ئەبن پێيان، لەبەر ئەوە تايبەتی ئەكات و ئەفەرموێ كە ﴿لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ ئايەتەكان بەڕوونی باس ئەكەن بۆ دەستەو كۆمەڵێك كە زانايان و ئەزانن بەو هەموو بەرژەوەندی و كاردروستییە كە خوا ڕێنموونی بەندەكانی پێدەكات، ئينجا لە دروستكردنی ئاسمانەكان و گێڕانی جۆرو مانگ بەو جۆرەی كە باسمانكردو دياريی كردن و بڕيار دانی چەند خولگەو جێ و شوێن بۆ مانگ، لەوانەوە شەوو ڕۆژ پەيدا ئەبێ كە دوو شتی زۆر گرنگ و سەرنج ڕاكێشن لەناو ئەو بوونەوەرە ناياباەدا، هەروەها ئەو هەموو گيانلەبەرو ڕووەك و دارو درەخت و هەموو كان و شتە نايابەكانی تر كە زۆريان دەركەوتوون و بەرەبەرە زياتر دەرئەكەون و دەستكەوت ئەبن، لەپاش باسی ئاسمانەكان و زەوی و مانگ و خۆر لە ئايەتی پێشوودا دێتە سەر باسی ئەم شتانەی تر لەم ئايەتەدا كە چەند بەڵگەو ڕابەری ئاشكران.**

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ بێگومان لە جياوازی شەوو ڕۆژو بەدوادا هاتنيان بۆ يەكترو چوونيان بەناو يەكدا ﴿وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ لەو هەموو شتە گرنگ و نايابانەی كە خوا دروستی كردوون لە ئاسمانەكان و زەويدا ﴿لَأٓيَٰتٖ﴾ لە هەموو ئەوانەدا چەند جۆر ڕابەرو بەڵگەی ئاشكرا هەيە لەسەر تاك و تەنيايی خواو دەسەڵات و زانين و كاردروستی خوا، بەڵام هەموو كەس سوود وەرناگرێ لەم بەڵگەو نيشانە ئاشكرايانەش، بەڵكو كەسانێ كە سوود وەرئەگرن كەلە خوا ترسن و پارێزەری خۆيانن لەدوا ڕۆژی بەدو سزاو تۆڵەی خوا، چونكە هەر ئەمانە دڵيان دائەچڵەكێنێ سەرنج ئەدەن و بير ئەكەنەوە لەو هەموو بەڵگەو ڕابەرە ئاشكرايانە كەلەبەر زۆر بينين و دەق و ئولفەت گرتن بێيانەوە خەڵكی بێئاگا ئەبن لێيان و دڵيان نادەنێ، جا لەبەر ئەوە لێرەشدا تايبەتی ئەكات و ئەفەرموێ:**

﴿لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ﴾ بۆ دەستەو کۆمەڵێك کە خۆیان ئەپارێزن. هەر بە قورئان ئەکەوێ فەرمایش بفەرمووێ بۆ نموونە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بە کورتی دەست نیشان ئەکات بۆ شتانێ کە بۆ ئێمە نایەنە ژمارە، زانینی ئێمە پێیدا ناگات، تا بێت بەرەبەرە دەرئەکەون، بەو کورتییە دەست نیشان ئەکات ئیتر لێی ئەگەڕێ تا خەڵکی بە پێی ڕادەو پلەو زانین و ژیریی خۆیان بیربکەنەوە لە ڕابەرو بەڵگەکان لە هەموو چەرخ و کاتێکدا.

ئا ئەمەیە بەرنامەی قورئان لەدوان و گفت‌وگۆ کردن لەگەڵ سروشتی ئادەمیدا، ئەدوێ لەگەڵیان بەو هەموو بەڵگەو ڕابەرە بوونەوەریانە کە بەلێشاو بڵاوبوونەتەوە لەم بوونەوەرە گەورەو فراوانەدا کە خوا خۆی ئەزانێ باشترین شێوەو شت ئەمەیە بۆ تێگەیاندن و سەرنج ڕاکێشانیان، سوك و ئاسانترین ڕێگەیە بۆ ڕێنموونیان، ئەم ڕێگەو بەرنامەی بەکار نەهێنا لەگەڵیان کەلەم دواییەدا زانایانلا فەلسەفەو کەلام بەکاریان هێنا، چونکە خوای پەروەردگار خۆی ئەم جۆرە ڕەوشتی ئەمانە دانامەزرێنێ لەدڵداو نایخاتە بزووتنەوەو ژیانی لەسەر دانامەزرێ، بەڵام ئەو بەڵگەو ڕابەرانەی کە قورئان ڕێنموونییان پێ‌ئەکات لەسەر ئەم بارەی کە هێناویەتی بەهێزترین و ئاسانترین جۆرو شێوەیە کە ئارامی ئەدات بە دڵ و ژیریی.

ئەو کەسانەی کە ئەم هەموو بەڵگەو ڕابەرانە ئەبینن، نازانن هێندێ لە داخوازی ئەم ڕژێمە نایاب و دامەزراوە ئەمەیە ئەبێ ڕۆژی دوایی بەدی بێت، ئەم جیهان و ژیانە دواترین قۆناغ نییە، چونکە ئادەمێتی تیایدا ناگات بە پلەی هەرە بەرزی خۆی، ناگات بە پایان، ئەو کەسانەی کە بەبێ ئاگایی گوزەر ئەکەن بەلای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانەدا، دڵیان ناکەوێتە بزووتنەوە بۆ بیرکردنەوەی، ژیرییان ناکەوێتە کار، ئەوانە هەرگیز ڕێگەی بە پایان گەیشتن نادەنە بەر، هەرگیز ناگەن بەو هەستەی کە بەڵێن دراوە پێی بەلە خوا ترسان وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە چاوەڕوانی ناکەن و بەتەمای گەیشتن نین بە ئێمەو خیساب و پرسیاری ئێمە، کەواتە نە بەتەمای خۆشی بن لەلای ئێمەوەو نەمەترسیان هەیە لەسزای ئێمە، ﴿وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا﴾ ڕازین بەم ژیانە نزیکەو دڵ ئارامن پێی ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ﴾ ئەوانەی کە بێ‌ئاگان لە ئایەتەکانی ئێمە، ئایەتە بوونەوەریەکانمان، یا ئەیەتە قورئانیەکانمان کە ڕێنموونی ئەکەن بۆلای ئایەتە بوونەوەریەکان.

أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْۖ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ ئەوانە کە باسکران جێ و شوێنیان هەر ئاگرەو نیشتەجێن تێیدا بە بێ‌ڕزگاربوون. ﴿بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەو کردەوانەی کە خۆیان بە حەزو ئارەزووی خۆیان کردیان، فەراهەمیان هێنا، کردەوە دەروونیەکانیان لە یەکەم جارەوە کە کان و هۆی کردەوە بەندەکانی تریانە، ئینجا بەرامبەر بەوانە دەستەی بڕواداران کە بارو حاڵ و دوا ڕۆژیان بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ‌هێناوە ﴿يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْۖ﴾ بەهۆی بڕواکەیانەوە پەروەردگاریان ڕێنموونیان ئەکات بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خۆی لە هەموو کارو بارو کردەوەیەکیاندا، تا لە پاشە ڕۆژدا ئەیانخاتە بەهەشت کە بەشێکە لە حاڵ و باریان لەو بەهەشتەدا بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان دێن و ئەچن بەژێر جیگای دانیشتنەکانیانداو لەبەر دەستیاندان ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ لە باخ و بەهەشتانی نازو نیعمەتدا، واتە ئەو دەستەیە کە حاڵیان ئەوەیە بڕوایان هێناوە بەهۆی بڕواکەیانەوە کردەوە چاکەکانیان بەجێهێناوە، ئەوانە بڕواکەیان کە پاڵدەرێکی دەروونییە ئەبێتە هۆی ئەوە کە دامەزراوو بەردەوام بن و هەر ڕێگەی خوا بدەنە بەر تا سەریان لە بەهەشتەوە دەرئەچێ، هێندێ لە زانایان بەو جۆرە تەفسیریانکردووەتەوە، هێندێکی تر ئەفەرموون: ئەو دەستەیە بەهۆی بڕواکەیانەوە خوا ڕێنموونیان ئەکات بۆ جێ و شوێنی نیشتەجێیان کە بەهەشتە، بەم جۆرەش هەر باشە، بەڵام بێ‌گومان تەفسیری پێشوو لە دڵدا جێگیر ترو بەهێزترە، لەسەر هەربار ئەم ئایەتە بەڵگەنییە لەسەر ئەوە کە بڕوای ڕووت ڕزگار کەر نییە، خاوەنی بڕوای تەنیا و ڕووت هەر هەمیشەیی ئەبێ لەدۆزەخدا.

ئەو خوا پێداوانە غەمی هیچ شتێکیان نییە، نەماڵو سامانو نە مەترسی لەهیچ شتێك، بەڵکو ئەوەی کە خەریکی بن پێیەوەو داوای بکەن ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ﴾ داواو نزای ئەوان لەو بەهەشتانەدا ئەمەیە کە ئەڵێن: ئەی خوایە پاکیو بێگەردی بۆ تۆو تۆ پاکی لە هەر لەکەو عەیبو ڕەخنەیەك ﴿وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞ﴾ وتەیەك کە ڕێزی ئەوانی پێ بگیرێ لەو بەهەشتانەدا سەلام لێکردنیان لەلایەن خواوە یان لەلایەن مەلائیکەوە، واتە ئەگوترێ پێیان: سەلامتان لێ بێ باوەڕەکانی، واتە میهرەبانی خواو بێباك کردنیان لە هەر شتێ کە مەترسی لێبکەن ﴿وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئاخرو کۆتایی داواو نزاکەیان ئەمەیە: کە بێگومان هەموو سوپاسو ستایش بۆ خوایە کە داهێنەرو پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، واتە ئەوانە ڕزگار ئەبن لە هەموو داخو مەراقو خەریك کەرەکانی ئەم جیهانە، زاڵو بەرز ئەبنەوە بەسەر هەموو پێویستیەکاندا، بەرز ئەبنەوە بۆ ئاسۆ هەرەبەرزەکانی ڕەزامەندیو سوپاسو سەلام، کە ئەوە شایستەیە بەو خوا پێداوانەو بەو گەیشتن بە ئادەمییە، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەوەدا آمین، چەند ڕایەکی هەیە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبەکانی تەفسیربکات.

ئینجا بەرەنگاری ئەو بێبڕوایانە ئەوەستێ کە بەریان ئەبڕییەوەو پەلەیان ئەنایەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هاتنی سزایەك کە هەڕەشەی لێکردن پێی، وەك لەم سورەتەو لە چەند سورەتێکی تردا قورئان بۆمان باس ئەکات، کە ئەوەش ئەوپەڕی لاریو سەرکێشی ئەوانە نیشان ئەدات کە بەرەنگاری ئایینی خوایان پێکرد، بەزەییو کاردروستی خوا داخوازی ئەوە بوو کە پەلەیان لێ نەکات، بەوێنەی بێبڕواکانی گەلە ڕابووردووەکان سزایەکی لەناوبەرو لە ڕیشە هێنەریان نەدا بەسەردا، چونکە خوا زانیویەتی زۆربەی ئەو سەر کێشانە لەپاشدا موسڵمان ئەبنو ئەبن بە پاسەوانی ئەم ئایینەو بڵاوی ئەکەنەوە لە جیهاندا، هەر بەو جۆرە هات لەپاش فەتحی مەککە، کە ئەوان نەزانو نەفام بوونو پەلەیان ئەنایەوە بە هاتنی سزا، نەزان بوون بەوەی خوا ئەیوست لێیانکە ئەوە چاك بوو بۆ ئەوانیشو ئایینو بڕواداران.

﴿ وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ﴾ ئەگەر خوا پەلەی بکردایەو پەلە بکاتو بە پەلە ئەو شەڕو سزای بهێنایە بۆ خەڵکی، ئەو شەڕو سزای کە بە لاقۆتیو بێبڕواییەوە پەلەیان پێ ئەنایەوە. ئەگەر خوا پەلەی بکردایە بە وێنەی پەلە نانەوەی ئەوانە بەخێرو خۆشیو داوا کردنیان بۆ پەلە پێکردنی ﴿لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ﴾ ئەجەلو ماوەکەیان دوایی ئەهێنراو کۆتایی پێئەهێنرا، واتە بە یەکەمجار ئەمردنو بەناو ئەبران، بەڵام پەلە ناکات ﴿فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ کەواتە ئەوانەی کە بە تەمای گەیشتن نین بە ئێمەو بە زیندوو بوونەوەو حیسابو پرسیار، ئەوانە مۆڵەت ئەدەینو ئەیانهێڵینەوە لەناو گومراییو سەکێشیەکەیاندا بەسەر گەردانی لەکاتێکدا نابیناو دڵکوێرن، تا کاتی ئەجەلی نابراویان دێت، بێگومان ئەم فەرموودیە هەڕەشەو ترساندنێکی گەورەی تێدایە دەربارەی ئەو نابیناو دڵ کوێرانە. ئینجا بە بۆنەی باسی ئەو پەلە نانەوەی ئەو بێبڕوایانە بەو بۆنەیەوە شێوەیەکی ئادەمی نیشنا ئەدات، کاتێ کە زیانو ناخۆشی دووچاربێن. لەو کاتەدا پەلە نانەوەکەی لەبیر نامێنێو پەنا ئەهێنێ بە نزاو تکاو لاڵانەوە، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ﴾ کاتێ کە زیان دووچاری ئادەمی بێت، ئیتر هەر جۆرو بابەتێ ﴿دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا﴾ هاوارو نزمان لێ ئەکاتو ئەپاڕێتەوە، بە پاڵەوە کەوتبێو بەلادا یا بە پێوە یان بە دانیشتنەوە، واتە ناوەستێ لە نزاو کۆتایی ناهێنێ هەتا زیانەکەی ناهێڵین ﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ﴾ ئینجا کاتێ لەپاش نزاکەی زیانەکەیمان لێ لابردو نەهێشت ﴿مَرَّ﴾ ئەڕواو ئەچێتەوە سەر بارو حاڵی پێش دووچار بوونەکەی، یان ئەڕواو لائەدات لە هەڵوێستی نزاکەیو پشتمان لێ ئەکات،

﴿كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ﴾ وەك هاوارو نزای نەكرد بۆلێمان بۆ لابردنی زیانێك كە دووچاری بووە، ئایا مەبەست بەم ئادەمییە تیرەی ئادەمییە بە سروشت، یان مەبەست ئادەمی بێبڕوایە؟ هەركام بەحسێت ئەدات و هێندێك لەزانایانی لەسەرە، مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە كە ئادەمی بێبڕوا یا ئادەمییە بەسروشت خۆگر نییە لەكاتی زیان و بەسەرهاتی بەددا، كەم سوپاس گوزارە لە كاتی چاكەو خۆشیدا، قەدرو ڕێزی چاكەو خۆشی لە بیر ئەچێ، جا قورئان ئاگادارمان ئەكات بەم سیفەتە بەدە تا خۆمانی لێ دوور خەینەوە، بڕواداری ڕاستەقینە لەكاتی زیان و بەسەرهاتی بەددا ئەبێ ڕازی بێ بە قەزاو قەدەری خواو هیچ ڕەخنە نەگرێ لە بە زمان و نەبە دڵ، چونكە ئەبێ بڕوای تەواوی هەبێ كە هەرچی خوا بیكات هەر ئەوە هەق و ڕاستە، ئەبێ بزانێ كە هەر زیان و ناخۆشی ئەجرو پاداشتی هەیەو وەك تیمارو تەداوی نەخۆش، لەو كاتانەدا هەر خەریك ئەبێ بە یادو باسی خواوە، ئەوە چاكترە لە نزاو لاڵە، وەك لە حەدیسی قودسیدا هاتووە، هەركەس یادی من خەریكی بكات لەداواو نزا كردن لێم، پێی ئەبەخشم چاكتر كە بیدەم بەوانەی نزاو داوا ئەكەن، ئینجا ئەگەر نزای كرد بۆ لابردنی سزاو ناخۆشی ئەبێ بڵێ ئەگەر بەرژەوەندی تێدایە بۆ ئایینم ئەوە چاكە لە پاش باسی ئەو سیفەتەی ئادەمی لە كاتی زیان و خۆشی و ناخۆشیدا، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بەوێنەی ئەو سروشت و تەبیعەتە، سروشتی بیركردنەوە لە كاتی سزاو زیاندا، لەبیرچوون و گەڕانەوە بۆ سەر حاڵەتی بەد كاتی خۆشی پەیدا بوویەوە بەوێنەی ئەو سروشتە شیرینكراوەو ڕازێنراوەتەوە بۆ زیادە ڕەوی كەران و لە سنوور دەرچووەكان، ئەو كردەوە بەدانەیان كە هەمیشەیی و بەردەوامن لەسەریان، یان بەو جۆرو وێنە شیرین كردنە جوان و شیرین كراوە بۆ لەسنوور دەرچوو و زیادە ڕەوی كەران، ئەو كردەوە بەدەی كە ئەوان بە هەمیشەیی كردیان، واتە ئەوانەی كە جڵەوی نەفسی خۆیان بەرەڵا ئەكەن و زیادە ڕەوی ئەكەن لە خراپەكارییدا، ئەوانە كامەران و دڵخۆشن بە خراپەكاریەكان، ئەو كردەوە لە پێش چاو شیرین ئەكرێت، كەواتە گەڕانەوەیان نابێ و لەسەر ئەوبارەئەمرن، دیارەئەوكەسەی كەئەوكردەوانەشیرین ئەكات لەڕاستیداخوایەوشەیتان هۆیەتی،لەبەرئەوەلەهێندێ ئایەتدابەهێنی خوای دائەنێ،لە هێندێ ئایەتدا بە هێنی شەیتان.

وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ

ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند گەل‌و ئوممەتێك كە بەهۆی زیادە ڕەوی‌و لە سنوور ترازان لەناو بران‌و لە ڕیشە هێنران، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ سوێند بە خوا چەند گەل‌و ئوممەتمان لەناو بردو لە ڕیشە هێنان لەپێش ئێوە لە چەرخەكانی ڕابوردوو ﴿لَمَّا ظَلَمُوا۟﴾ كاتێ كە ستەمیانكرد بە سەركێشی‌و بڕوا نەهێنان بە ئایین‌و فروستادەكانی خوا ﴿وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ لە كاتێكدا كە فروستادەكانیان هاتن بۆ لایان بە موعجیزەو بەڵگە ڕوونەكاتەوە ﴿وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟﴾ ئەوانە نەبوون بەوەی بڕوا بهێنن، واتە لە شانیاندا نەبوو بڕوا هێنان‌و ئامادەنەبوون بۆی، ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ بەو جۆرەو بەوێنەی تۆڵەی ئەوانە تۆڵە ئەسێنین لە گەل‌و كۆمەڵی تاوانباران، یان بە وێنەی ئەو تۆڵە سەخت‌و بەتینە كە بریتییە لە لەناو بردن‌و لە ڕیشە هێنان بەیەكجاری‌و بە تەواوی، ئێمە تۆڵە ئەسێنین لەم تاوانبارانە، لەسەر هەربار ئەمە ترساندن‌و هەڕەشەیە لە یەكمجارەوە بۆ دانیشتوانی مەككەو لەپاش ئەوان بۆ وێنەی ئەوان، لەم كاتەدا كە دوا ڕۆژی ئەو تاوانبارانە ئەخاتە بەرچاو، كە فروستادەكانیان بۆ هات بە موعجیزەو بەڵگەی ئاشكراوە كەچی بڕوایان نەهێنا، بەهۆی ئەوەوە سزای پێویست بوو بۆیان، لەم كاتەدا ئەم ئوممەتە ئەترسێنێ بەمەی جێنشینی ئەوانەی ڕابوردوون، كەواتە باوریان بن‌و فریای خۆیان بكەون، با وەك ئەوان دووچاری سزای خوا نەبن، ئەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ ئینجا ئێوەمان گێڕا بەجێنشین‌و جێگری ئەو ئوممەت‌و گەلە ستەمكارە لەناو براوانە، ئێوەمان گێڕا بەجێنشین لەزەوی‌و لە وڵاتدا لەپاش ئەوان ﴿لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾ بۆ ئەوەی سەرنج بدەین چۆن ئێوە ڕەفتارو كردەوە ئەكەن؟ بەڕاستی بەم فەرموودەیە دەستكارییەكی بەهێزی دڵ‌و دەروون ئەكات، لەم كاتەدا كە ئەیخاتە بەرچاو كە ئێوە كراون بە جێنشین لە وڵاتێكدا كە خاوەنە پێشووەكانی دەركراون لێی، دانیشتوانی پێشووی كە خاوەن‌و دەسەڵاتدار بوون

تێیدا لەناو بران، ئێوەی جێنشینیش ئەبێ لێی دەرچن، چەند ڕۆژێك ئەمێننەوە بۆ تاقیکردنەوە، حیساب و پرسیارتان لێ ئەکرێ لەسەر ڕەفتارو کردەوەکانتان! هەواڵتان پێ ئەدەین کە ئێوە لە ژێر ڕەقابەو چاودێری دان. ئا بەم جۆرو شێوەیە ئەو بۆچوونەی کە ئیسلام دایهێناوەو دایئەمەزرێنێ لەدڵ و هەست و هۆشی بڕواداراندا، کە ئەم بۆچوونە جیاوازو دژەو نەگونجاوە لەگەڵ هەموو بۆچوونەکانی تر کە لەم زەوییەدا هەڵقوڵاون. کەواتە بەهیچ کلۆجێك نابێ و ناگونجێ ڕێك خستن و دەستە مل کردنی ئەم دوو بۆچوونە لە ژیاندا! لەپاش ئاڕاستەکردنی ئەو فەرموودانە، ئینجا چەند نموونەیەك لە کردەوەکانیان ئەخاتە بەرچاو لەپاش گێڕانیان بە جێنشین، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍۙ﴾ کاتێ کە ئەخوێنرێتەوە بەسەریاندا ئایەتەکانی ئێمە لە کاتێکدا کە ڕوون و ڕەوانن ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾ ئەوانەی کە بەتەمای گەیشتن بە ئێمە نین و چاوەڕوانی زیندوو بوونەوەو حیساب و پرسیار ناکەن، ئەوانە ئەڵێن: ﴿ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُۚ﴾ قورئانێکی تر بێنە جیاواز لەم قورئانە یان بیگۆڕەو گۆڕانکاری بکەو دەستکاری تێدا بکە. بەم ڕەنگە ئەوەی کە ئێمە بێزارین لێی و ناچێتە دڵمانەوە بیگۆڕە بەوەی ئێمە پێمان خۆشە، بەڕاستی داواکەیان زۆر سەیرو بێجێیە، لەلایەکەوە گاڵتەو لاقرتی نیشان ئەدات، لەلایەکی ترەوە نەفامی و نەزانی ئەگەیەنێ بە مەبەست و کارو ئیشی ئەم قورئانە، کەواتە ئەو داوایە لە کەسێکەوە دێت کە بڕوای بەزیندوو بوونەوە نییەو بە تەمای حیساب و پرسیار نییە، وا دەرئەکەوێ مەبەستی داوا کەران ئەوە بووبێ فرو فێڵێك بەکار بێنن بۆ یەك خستن و لاقرتی کردن بە پێغەمبەر(ﷺ) بەم ڕەنگە بەگوێیان بکات لەدەستکاری کردنی ئەم قورئانە، ئەو کاتە بڵێن: ئەك قورئانە لەلایەن خواوە نەهاتووە وەك محمد ئەڵێ بەڵکو لەلایەن خۆیەوە ئەوەتا بە ئارەزووی خۆی گۆڕان و دەستکاری تێدا ئەکات، مەبەستیان ئەوە نەبوو ئەگەر کردن بڕوابێنن، یان لەبەر نەفامی و نەزانییان لایان وابووبێ کە پێغەمبەر(ﷺ) بەلێزانی و لێهاتنی خۆی ئەم قورئانەی هێناوە کەواتە ئەم بەر لێ بڕینەوەی ئێمە وەرگرێ و قورئانێکی تر بێنێ، یان دەستکاری و گۆڕانکاری تێدا بکات، بە هەر جۆرو لەسەر هەربار ئەوا قورئان فەرمان ئەدات بە وەڵام دانەوەیان بە جۆرێ دەم کوتیان بکات و نەفامی و نەزانیەکان دەربخات بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓۖ﴾ نابێ و ناشێ بۆ من و ناگونجێ گۆڕاندن و دەستکاری کردنی لەلایەن منەوە

إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٧﴾

**﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ﴾ من پەیڕەوی ناکەمو شوێنی هیچ شتێك ناکەوم بێجگە لەوەی سروش(وەحی) کراوە بۆ لام بە بێزیادو کەمو گۆڕاندنو دەستکاری کردن، واتە کارو کردەوەی من بەرامبەر ئەم قورئانە هەر پەیوەندیو شوێن کەوتنیەتی، لەلایەن منەوە هیچ شتێکی تر نییە، ئەگەر لەلایەن خواوە فەرمانم پێدرا بە سڕینەوەو گۆڕانکاری یەك ئەوە هینی من نییەو بەڵکو هینی خوایەو من ڕاپەڕەکەیەنم ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ بەڕاستی من ئەترسم ئەگەر نافەرمانیو سەرپێچی بکەم لە پەروەردگارم لە سزای ڕۆژێکی گەورە کە ڕۆژی دواییە، واتە بێجگە لە پەیڕەوی کردنی ئا فەرمانیو سەرپێچییە لە فەرمانی خوا، منیش ئەترسم لە سزای خوا ئەگەر نافەرمانی بکەم، کەواتە بێجگە لە پەیڕەوی هیچ شتێکی تر ناکەم. ﴿قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ﴾ بڵێ پێیان: ئەگەر خوا بیویستایەو مەیلی ببوایە من ئەم قورئانەم نە ئەخوێندەوە بەسەرتاندا، خوا زانا و ئاگاداری نەئەکردن پێی بەهۆی منەوە بەڵگە لەسەر ئەوە کە کارەکە بە مەیلو ویستی خوایە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ﴾ چونکە بێگومان من مامەوەو نیشتەجێ بووم لەناوتاندا ماوەی تەمەنێکی درێژ لە پێش هاتنی ئەم قورئانە یا پێش کاتی هاتنی، واتە ئەو ماوە درێژە لەناوتاندا بووم، چونکە خوا مەیلی نەبوو هیچم پێ ڕانەگەیاندن، ئەگەر کارەکە بەدەست خۆم بوایە ئەبوایە لەم ماوە درێژەدا ئەمەم پێ ڕاگەیاندنایە، واتە لەمەو پێش خوا مەیلی نەبوو منیش هیچم نەگوت، ئێستا مەیلی بوو ئەوا پێتان ڕائەگەیەنم ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ ئەی ئێوە ژیر نین؟ واتە ژیربنو بیرێك لەوە بکەنەوە تا بزانن ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووە، بەم جۆرە تەفسیر ئەکرێتەوەو ڕوونو ئاسانو ڕێکە لەگەڵ شوێنەکەدا، بەجۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە لەلایەن زۆر لە زاناکانەوە هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبەکانی تەفسیر بکات، بەس یەك پرسیار ماوەتەوە لێرەدا، ئەوەش**

ئەمەیە: داوای بێبڕواکان یەکێ بوو لەدووشت: هێنانی قورئانێکی تر کە لەسەر شێوەی ئە
نەبێ، یان دەستکاری کردن و گۆڕانکاری لەم قورئانەی کە هێناویەتی، وەلامەکە هەر بۆ
دووەمە، لەوەلامی ئەم پرسیارەدا چەند شتێك گوتراوە:

١- هەر وەلامو بەرپەرچی دووەمی داوەتەوە، بەلام وەلامو بەرپەرچی ئەم نەبێتە وەلامو
بەرپەرچ بۆ یەکەمیش بە جۆرێکی باشتر، چونکە لەجێیە بەدەست کاری و گۆڕانکاری
هێندێکی پێ نەکرێ ناتوانێ هەر بە تەواوی لایبەرێ و قورئانێکی تر بێنێ لەجێگەی.

٢- وەلامو بەرپەرچی هەردوو داواکەی داوەتەوە، دووەم کە ئەفەرموێ: ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِ نَفۡسِيٓۖ﴾ و یەکەم کە فەرمووی: ﴿ قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ ﴾ بێجگە
لەم دوو وەلامە وەلامی دراوەتەوە بەلام لاوازن لەبەر ئەوە باسم نەکردن.

﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ ﴾سەبارەت بەم ئایەتەسێ ڕاهەیە:

١- پەیوەستە بە وەلامو دەم کوتکردنی بێبڕواکان و تەواوکەرە بۆی، واتە هیچ کام لەو
دوو داوایە بەجێ ناهێنم، واتە نە قورئانێکی ترتان بۆ ئەهێنمو نە گۆڕانکاری ئەکەم لە
قورئاندا، چونکە بە من ناکرێ و مافی من نییە، ئەگەر من بەگوێتان بکەم ئەبێ درۆ
هەڵبەستم بەدەم خواوە و ئەبێ ئایەتەکانی خوا کە ناردوویەتیە سەرم، بەڕاستیان
نەزانم ئەو کاتە لە هەموو کەس ستەمکار تربم ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ ﴾ چونکە ئایا کێ
ستەمکار ترە لەو کەسەی کە درۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە یان بڕوای نەبێ بە
ئایەتەکانی خواو بە درۆیان بزانێ؟ واتە هیچکەس لەو کەسە ستەمکار تر نییە، ئینجا
ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ بەڕاستی کار بەو جۆرەیە کە تاوانباران ڕزگار
نابن و ناگەن لە ئامانج.

٢- ئەم ئایەتە پلارە لە هاوبەش ڕەوادەران، واتە ئەوان لە هەموو ستەمکار ترن، بەهۆی
هاوبەش ڕەوادان و درۆ هەڵبەستنیان بە دەم خواوە، بڕوایان نییە بە پێغەمبەرێتی
پێغەمبەرو ئەو ئایەتانە کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەری.

٣- بەشی یەکەم بۆ دەم کوتکردنی بێبڕواکانە و دوور خستنەوەی ئەو گومانە بەدەی
ئەیانبرد بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەدەم خواوە درۆ هەڵئەبەستێ و ئەم قورئانە لەلایەن
خواوە نەهاتووە، بەشی دووەم بۆ تاوانبار کردنی بێبڕواکانە بەوەی بڕوایان نییە بە
ئایەتەکانی خوا.

وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخۡتَلَفُواْۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٩﴾

---

ئەم دوو ڕایەش هەر ڕێکەو ئەگونجێ، بەڵام شتێکی ئاشکرایە کەڕای یەکەم ساف‌و ڕوون‌و بێ‌گرێیە، خوا خۆی باش ئەزانێ، ئینجا هەمیتر وتارو کرداری بەدی ئەو جێنشینانە ئەخاتە بەرچاوو نیشانیان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ ﴾ ئەمانە شتێك ئەپەرستن کە نە زیانیان پێ‌ئەگەیەنن‌و نە سوودو قازانج، واتە توانا نین بەسەر هیچکام لەو دووانەدا کە پەرستراو ئەبێ توانا بێ بەسەر ئەوەدا! یان ئەوانە ناتوانن زیانیان پێ‌بگەیەنن، ئەگەر سەر پێچی بکەن لێیان‌و نەیانپەرستن، ناتوانن سوودو پاداشتیان پێ بگەیەنن ئەگەر بیانپەرستن، بێ‌گومان پەرستراو ئەبێ توانا بێت بەسەر ئەوەدا، لەسەر هەر بار ئەوانە ئەیانپەرستن لە کاتێکدا تێپەڕ ئەکەن لە خواو ئەو ناپەرستن، چونکە پەرستنەکەی ئەو بە هاوبەش ئەکەن، پەرستنی واش پەرستن نییە بەلای خواوە لەڕاستیدا، یان مەبەست ئەوەیە پەرستنی خوایان بەلاوە بەس نییەو ئەیگێڕن بە وێنەو هاوسەری پەرستنی ئەو بتانە کە ئەو تێپەڕکردنە ئەوپەڕی نەفامی‌و نەزانییە، کاتێ کە نەفسی ئادەمی ترازاو لایدا لەسروشتی خۆی، ناوەستێ لە سنوورێکدا، ئەو بتە بێ نرخانە ئەپەرستن کە توانای نە زیان‌و نە قازانج‌و سوودیان هەیە ﴿ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾ ئەڵێن ئەو بتانە تکاکارمانن لای خوا، لەبەر ئەوە ئێمە ئەو هەیکەلانە ئەپەرستین، خوای پەروەردگار فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە دەم کوتیان بکات‌و بە درۆیان بخاتەوەو بەم جۆرو شێوەیە کە بۆنی لاقرتی لێدێت ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە:

﴿أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئایا ئێوه هەواڵ ئەدەن به خواو ئاگاداری ئەکەن به شتێك که بێئاگایه لێی نەله ئاسمانەکان و نەله زەویدا، واته نەبوونی ئو بتانه به تکاکار لای خوا شتێکه به هیچ کلۆجێك نییەو نابێ، چونکه هەرشتێك که خوا بێئاگا بێت لێی ئەبێ نەبێ، ئایا ئێوه شتێك ئەزانن که خوا نایزانێ؟! ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ خوا پاك و بێگەردەو بەرزو بڵندە لەوەی که ئەوانه هاوبەشی خوای پێئەکەن، پاك و بێلەکەیه لەوەی هاوبەشی ببێ.

ئەگەر مەبەستیان به تکاکردن بۆ ڕۆژی دوایی بێ وەك جەماوەر لەسەر ئەویه، ئەبێ بڵێین: مەبەستیان ئەوە بووە: ئەگەر زیندوو بوونەوەو حیساب و پرسیار ڕاست بێ، چونکه ئەوانه بێبڕوا بوون به هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەگەر مەبەستیان تکاکردن بووبێ لەم جیهانەدا وەك(حسن) ئەفەرموێ: ئەوا هیچ گرێ و قۆرتێك پەیدا نابێ، ئینجا پێش ئەوەی هەموو کردارو ڕەفتاره بەدەکانیان نیشان بدات دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوەی که بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان لادانه له سروشت، هات به دوای بڕوا به تاك و تەنیایی خوادا که شتێکی سروشتییەو ئادەمی لەسەر ئەوەیه، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ ئادەمی له پێشەوه هەر یەك ئوممەت بوون و هەموو لەسەر بڕوا به تاك و تەنیایی خوا به پێی سروشتەکەیان، ﴿فَٱخۡتَلَفُواْ﴾ ئینجا له پاشان دووبەرەکی بوون و بوون به دوو دەستەو کۆمەڵ، لەگەڵ ئەوەدا ئیرادەو ویستی خوا داخوازی بۆ ئەوە بوو که مۆڵەتیان بدات هەتا ماوەی ناوبراو و دیاری کراویان، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەگەر بڕیارێك پێش نەکەوتایه لەلایەن پەروەردگارتەوە، بڕیاری مۆڵەتدان و دواخستنی تۆڵەی گشتی، ئەگەر ئەو بڕیاره پێش نەکەوتایه، ﴿لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾حوکم و بڕیار ئەدرا له نێوانیاندا لەوەی که ئەوان دووبەرەکی بوون تیایدا. حوکم و بڕیاری ڕاست ئەدراو جێبەجێ ئەکرا به تۆڵەو سزادان و لەناوبردنی بێبڕواکان و سەرکێشەکان.

وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾

ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر بێبڕواکان و وتارو کرداری بەدیان ئەخاتەوە بەرچاو و ئەفەرموێ:

﴿ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ ئەوانە گوتیان و ئەڵێن: با بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەری لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەو نیشانەیەکی بوونەوەری.

ئەو نەفامانە ئەو هەموو ئایەت و بەڵگە ڕوونانەی کە خوا ناردیە خوارەوە لەم قورئانەدا ئەو هەموو نیشانەو بەڵگە ئاشکرایانەی کە خوا پرژو بڵاوی کردوونەتەوە لە ناو ئەو ئاسمان و زەوییەدا، ئەو هەمووەیان ئەبینی و ئەبیست، بەوانە تەمێ‌خوارو ملکەچ نەئەبوون و پەڵپیان ئەگرت و داوای موعجیزەیەکیان ئەکرد خۆیان هەڵیبژێرن بە وێنەی ئەو موعجیزانەی کە گەل و ئوممەتە بێبڕواکانی ڕابردوو پەڵپیان پێ ئەگرت و داوایان ئەکرد کە لە پاش بەدی هێنانیان بێبڕواکان لە ڕیشە ئەهێنران، ئەو نەفامانە داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان ئەکرد، چونکە نەیان ئەزانی و تێنەگەیشتبوون لە سروشتی ئەم دواترین پەیامە گشتیە هەتاهەتاییە، کە شتێکی ئاشکرایە پەیامی ئاوا نابێ موعجیزەکەی کاتی بێت و هەر بۆ ئەوانە دەست بدات کە ئامادەن و ئەیبینن، پەیامی هەمیشەیی و هەتاهەتایی ئەبێ موعجیزەی هەمیشەیی و هەتاهەتایی هەبێ وەك ئەم قورئانە کە هەمیشەییەو بە ئاسمانی هیدایەتەوە ئەرەوشێتەوە هەمیشەو هەتاهەتایە، ئەگونجێ لەگەڵ ژیریداو بۆ هەموو تاقم و چین و وڵاتێ بەکارە، بەرامبەر ئەو پەڵپە ناڕاستەی ئەوان خوای پەروەردگار فەرمان ئەدا بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) حەواڵەی خوایان بکات کە هەر ئەو غەیب و نهێنییەکان ئەزانێ، هەر ئەو دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئەوەدا ئەو پەڵپی ئەوانە بەجێ بهێنێ یان بەجێی نەهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿فَقُلْ﴾ ئینجا تۆیش بڵێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ﴾غەیب و نهێنی هەر بۆ خوایەو هەر ئەو ئاگایە بەسەریداو هەر بەدەست ئەوە، ﴿فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾ کەواتە چاوەڕوانی بکەن، بەڕاستی منیش لەگەڵ ئێوەدا لەو کەسانەم کە چاوەڕوانی ئەکەن، چاوەڕوانی بکەن بۆ ئەوەی خوا ئەیەوێ بیکات لەگەڵ من و ئێوەدا، بێگومان ئەم وەڵامە لە بارێکەوە وا نیشان ئەدات کە ئەوانە مۆڵەت ئەدرێن و پەلە ناکرێ لە سزادانیان، لە بارێکی ترەوە هەڕەشە ئەگەیەنێ لەو بێبڕوایانە، هەرچۆنێ سنووری بەندەیی ڕوون ئەکاتەوەو

دووری ئەخاتەوە لە سنووری خوایەتی، ئەوەتا پێغەمبەرمان(ﷺ) کە گەورەترینی هەمووانە وای نیشان ئەدات کە لەبارەی غەیبەوە هیچی بەدەست نییە، بەڵکو غەیب هەر لای خوایەو بەدەست خوایە، لەبارەی خەڵکیشەوە خاوەنی هیچ کارێکیان نییە، هەموو کاروباریان بەدەست خوایە.

لە چەند شوێنێکدا باسی غەیبمانکرد بە درێژیی و گوتمان: غەیب دوو بەشە بەشێکیان تایبەتییە بە خواوە، ئەوەش ئەمەیە کە هیچ بەڵگەو نیشانەیەك نەبێ لەسەری، بێگومان مەبەست بەم غەیبە لێرەدا ئەو بەشە تایبەتییە یە، قورئان ئەگێڕێتەوە لە بێبڕواکانەوە لەهێندێ سورەتدا پەڵپ گرتنیان بۆ ئایەتێك یان چەند ئایەتێك بە بێدیارییکردن، وەك لەم سورەتەدا کە داوای ئایەتێ نادریان کرد، لە چەند سورەتێکدا پەڵپی ئایەتی دیاریی یان لێوە ئەگێڕێتەوە، وەك سورەتی ﴿الأنعام، الحجر، الأنبياء، العنكبوت، الرعد، الأسراء، الفرقان﴾ لێرەدا وەڵامی دانەوە بەو جۆرو شێوەی کە بیستمان، لەم سورەتانەدا بە چەند جۆرو شێوەیەکی تر وەڵامی داونەتەوە، هێندێکیان بە کورتی و هێندێ بەدرێژیی، کورتەی ئەوەی کە هاتووە لەبارەی ئەو پەڵپانەی کە گیراون، لەدیارییکراوو دیاریی نەکراو، هێندێکیان ئەبن بە تەفسیرو ڕوونکەرەوە بۆ هێندێکی تریان، بێگومان ئەوەی کە خوا کردوویەتی بە موعجیزەو بەڵگە بۆ دواترین پەیامەکەی کە قورئانە لە چەند بارێکەوە موعجیزەیەکی تێرو تەواوە هەرکەس ئەمەی بەس نەبێ بەڕاستی بینایی ژیریی خۆی کوێر بووەو چارەسەری نییە، وەك لە چەند شوێنێکدا باسمانکردووە، بەڵێ پێغەمبەرمان(ﷺ) چەند موعجیزەی گەورە گەورەی پێدراوە لە وێنەی ئەو موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ، بەڵام هیچکام لەوانە خوا نەیکردوون بە نیشانەو بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی پێغەمبەرمان(ﷺ)، فەرمان نەداوە کە بەوانە بەر بپرێتەوە لە خەڵکی، بەڵکو هەرکام لەوانە بەهرەو چاکەیەکی زیادەیە کە خوا لەگەڵی کردووە لەپاش ئەوەی هێندێ لەوتارو کرداری بەدی ئەو بێبڕوایانەی نیشاندا، دووبارە ئەگەڕێتەوە بۆ باسی ئادەمی هێندێ لەحاڵو بارو سروشتیان دەرئەخات لەکاتێکدا کە لەپاش زیان میهرەبانی یان لەگەڵ ئەکرێ،

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ﴾ کاتێ کە بچەژێنین بە خەڵکی خۆشیو کامەرانیو تەندروستیو فراوانی ڕۆزیو میهرەبانی لەگەڵ بکەین ﴿مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ﴾ لەپاش بەسەرهاتێکی زیانو ناخۆشی کە دووچاری بووبێو لێیدابێ، ئەو خەڵکە سپڵەو ناسوپاسە لەباتی چاو لەبەریو ملکەچی، دەست بەجێیە پێچەوانە ڕەفتار ئەکەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ﴾ ئیتر دەست بەجێ بۆ ئەوانە پیلانو نیازو قسەی بەد هەیە لەئایەتەکانی ئێمەدا، هەوڵدان بۆ بەرگری کردن لێیان، ئیتر مەبەست بەم ئایەتانە قورئانییەکان بێت، یان ئایەتە بوونەوەریەکان کە کاتێ خۆشیو فراوانی ئەهێنا لەپاش قاتو قڕیو برسێتی نەیان ئەگوت: سوپاس بۆ خوا، کە ئەوەی بۆ کردین، بەڵکو ئەیانگوت: ئەمە بەهۆی فلانەوە ئەستێرەو بورجەوە پەیدا بوو. هەروەها هەر شتێکی تر بێجگە لە میهرەبانیو چاکەی خوا، ئەم ئادەمییە زۆر سەیرەو جێی سەر سوڕمانە، بێجگە لەوانەی کەلەسەر سروشتی پاکی خۆیان مابنەوەو ڕێنموونی خوایان وەرگرتبێ، بێجگە لەوانە حاڵو باریان وایە هەر لەکاتی تەنگاوەدا خوایان لەبیرەو پەنای پێ ئەهێنن، کە تەنگاوەکە نەما یاخی ئەبنو چاکەو بەهرەی خوایان هەر لەبیر نامێنێ، قورئان چەند نموونەیەکمان بۆ باس ئەکات لەو بەدو سپڵانە. گەلەکەی فیرعەون ئەو هەموو بەسەرهاتە بەدەیان بەسەرهات هەرجارێ پەنایان ئەهێنا بە موسا(علیه السلام) بەڵێنی بەهێزیان ئەدا بەبڕوا هێنان ئەگەر خوا ئەو سزایان لەسەر لاببات، بەڵام کاتێ کە خوا خۆشی ئەهێنا دەست بەجێ ئەچوونەوە سەر یاخی بوونو بێبڕواییەکانو ئەو چاکەو بەهرەیان لە خواوە نەئەناسیو بەهینی شتێکی تریان دائەنا، هەروەها قوڕەیش دووچاری قاتو قڕییەکی سەخت بوون تا مەترسی لەناو چوونو مردنیانکرد، ئینجا هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و لالانەوە بە ناوی ڕەحمو خزمایەتییەوە کە**

نزایان بۆ بکات لای خوا ئەویش نزای کردو خوایش نزاکەی وەرگرت و بارانی بۆ باراندن، ئینجا پاشان وەرگەڕانەوە شەر پیلان و بێبڕواییەکەی خۆیان. ئەم بارو حاڵە بەدەشتێکی هەمیشەییە لەم ئادەمییەدا مەگەر بڕوا هێنان بیانپارێزێ. ﴿قُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێبڕوا پیلان گێڕانە ﴿اللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا﴾ خوا چەسپاترە لە ئێوە لە بارەی نیازی شەڕو پیلانەوە، واتە خوا دەسەڵاتدار ترە بەسەر تەگبیرو هەڵوەساندنەوەی پیلانەکانی ئێوەداو تۆڵە سەندن لێیان. ئێوە ئاگاتان نییە لەوەی خوا بڕیاری داوەو بەسەری ئێوەی ئەهێنێ، پیلان و کردەوە بەدەکانی ئێوە ئاشکرایە لای خوا، شتی ئاشکرایش بەگری کردن و لەناو بردنی زۆر ئاسانە. هەرچۆنێ لای خوا ئاشکراو هی چشتێ پۆشیدە نییە، هەروەها لای نێرراوو فروستادەکانی خوایش ئاشکرایە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ﴾ بەڕاستی فروستادەکانمان پیلان و فڕو فێڵەکانتان ئەنوسن، ئەو فروستادانەی کە بریتین لەو فریشتانەی کە ئەو کارەیان پێ سپێرراوە کەلە زمانی شەرعدا پێیان ئەوەترێ:(حفظة، الکرام، کاتبون) ئینجا ئایا ئەنووسن ئەوە شتێکی پۆشیدەو غەیبییەو ئێمە بڕوامان پێی هەیەو چۆنییەتی ئەو نوسینە نازانین؟ لە ئایەتی پێشوودا باسی سپڵەیی و ناسوپاسی خەڵکی کرد ئەو ڕادەی لەپاش گۆڕاندنی ناخۆشی و ڕزگار کردن و دەروو کردنەوە دەست بەجێ یاخی ئەبنەوە، ئینجا لەم ئایەتەدا ئەو مەبەستە نیشان ئەدات لەوێنەیەکداو ئەیخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ خوا کەسێکە کەئێوە ئەگێڕێ و هات و چۆتان پێئەکات لەوشکی بەڕو دەریادا. ﴿حَتَّىٰ إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ﴾ هەتا ڕوودەدات لە هێندێ لەو گێڕانەتان لە دەریادا، بوونتان لە کەشتیدا لەسەر ئەو بارو شێوەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ﴾ کەشتیەکان ئەیانگێڕن بەهۆی بایەکی پاک و خاوێن و ئاسانی و بە پێی مەبەست و ئارەزوو ﴿وَفَرِحُوا بِهَا﴾ دانیشتوانەکانی کەشتییەکە خۆش حاڵ و کەیف خۆش ئەبن پێی بەهۆی ئەو ئارامی و خۆشییەوە کە ئەژین تیایدا، لەو کاتە خۆش و پڕ ئارامەدا ﴿جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ﴾ بێت و با هەڵکات لەو کەشتییە، یان بێت بەسەر ئەو با نەرم و ناسکەدا بایەکی بەتینی سەخت و بە تەوژم ﴿وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ بۆیان بێت لە هەموو شوێن و لایەکیانەوە شەپۆلی دەریاکە

مَكَانٍ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ

---

﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ﴾و لایان وا ئەبێ کە دەورە دراون‌و تیا ئەچن، لەو کاتە سەخت‌و سامناکەدا، لەو نائومێدییەدا ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ هاوارو نزا ئەکەنە خوا لە کاتێکدا کە ئایینەکەیان پاک‌و خاوێن ئەکەن بۆی بە تاک‌و تەنیا بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێک‌و بەبێ پشت بەستن بەڵام بەهیچ کەس بێجگە لە خوا بە هەموو تکاو تاسێکەوە ئەڵێن: ﴿لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر تۆ ئێمە ڕزگار بکەیت لەم بەسەرهاتە سەختە، بێگومان ئێمە لە ڕیزی بڕوادارو سوپاس کەران ئەبین بۆ تۆ و چاولەبەری چاکەکانت ئەبین‌و سپڵەو ناسوپاس نابین بۆ هیچ چاکەیەکت، ﴿فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ﴾ ئینجا کاتێ ڕزگارمانکردن لەو تەنگی‌و سەختییە ﴿إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ ئیتر دەست بەجێ دەست ئەکەنەوە بە تێکدان‌و تاوان‌و خراپەکاری لە خاک‌و وڵاتدا بە ناهەق‌و بە ناڕەوا، واتە بەجۆرێ خۆیشیان ئەزانن کە ستەم‌و تاوان ئەکەن.

بەڕاستی شێوەو وێنەیەکی تێرو تەواوە بۆ کۆمەڵ‌و نموونەیەکی گەورە لە ئادەمی‌و لە هەموو چەرخ‌و چینێکدا، لەبەر ئەوە بەدوایدا ئەم ترساندنە ئەهێنێ‌و ڕووی فەرموودە ئەکاتە هەمووان‌و ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمییە تاوانبارو خراپەکارەکان ﴿إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ﴾ تاوان‌و ستەم‌و ناهەقیەکەتان لەڕاستیدا هەر بۆ خۆتانە، بە زیان‌و دژی خۆتانەو دەست درێژییە بۆ سەر نەفسی خۆتان، نەک هەر بۆ سەر ئەوانەی کە ستەم‌و دەست درێژییەکەیان لێ ئەکەن، ئەوانەی کەبەو جۆرە ستەم‌و تاوان‌و خراپەکاری ئەکەن تۆڵەو سزاکەی ئەچەژن هەر لەم ژیانی دنیادا پێش تۆڵەو سزای ڕۆژی دوایی ﴿مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ لەکاتێکدا ئێوە بەو ناهەقی‌و خراپەکارییە ڕائەبوێرن بە خۆشی‌و لەزەتی ئەم ژیانە نزیکە کە شتێکی بێنرخی دوایی هاتووەبەزوویی،خۆشی ولەزەتەکەتان هەربریتییەلەوشتەکەم‌وکورتە

ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٣﴾ إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ السَّمَآءِ فَاخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَاللَّهُ يَدْعُوٓا إِلَىٰ دَارِ السَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٥﴾

---

﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەتان ﴿فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجا بەدوای ئەو گەڕانەوەتان ئێمە هەواڵتان پێئەدەین بەوەی کە کردووتانە لەدنیاداو هەمیشەیی بوون لەسەری، بەپێی ئەو کردەوە بەدانەتان تۆڵەتان لێ ئەسێنین.

ئینجا بێنرخی و کەمو کوڕی ژیانی دنیا نیشان ئەدات لە وێنەی چیرۆکێکدا کە هەر لەدەست قورئان دێت و ئەو نیشاندانە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا﴾ وێنەو شێوەی نایاب و سەر سوڕهێنەری ئەم ژیانی دنیایە لەجوانی و شیرینی و لەناو چوونی بە زوویی ﴿كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ السَّمَآءِ﴾ هەروەك وێنەو شێوەی بارانێکە کە هێنابێتمانە خوارەوە لەلای سەرو لە ئاسمانەوە ﴿فَاخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ الْأَرْضِ﴾ ئینجا بەهۆی ئەو ئاوو بارانەوە سەوزەو ڕووەکی زەوی زۆر ببێ، بە جۆرێ بچن بەناو یەکداو تێکەڵ ببن، ﴿مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَٰمُ﴾ ئەو سەوزەو ڕووکەش لەوەی کە خەڵکی ئەیخۆن، لەوەی مەڕو ماڵاتو حوشترو وڵاخ ئەیخۆن، ئەو سەوزەو ڕووەکانە بڕوێن و سەوز ببن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا﴾ هەتا زەوی ڕەونەق و تەواوی جوانی خۆی وەرگرێ ﴿وَازَّيَّنَتْ﴾ خۆی بڕازێنێتەوە بەو هەموو ڕەنگ و شێوەو، دیمەنە شیرینانەی کە ئەو ڕووەك و سەوزەیانە هەیانە ﴿وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ﴾ دانیشتوان و خاوەنی ئەو زەوییە شیرین و ڕازاوەیە لایان وایە کە توانای دەسەڵاتدارن بەسەریداو توانان بەسەر سوود وەرگرتن لەو هەموو بەرو بەرهەم و خێرو بێرو فەڕە، ئینجا لەم کاتەدا کە ئەوانە شادمان و بەهیواو دڵخۆشن ﴿أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا﴾ بێت بۆ ئەو زەوی و کشتوکاڵ و بەرو میوەیە فەرمان و بڕیاری ئێمە لەو شەو یان ڕۆژەدا، فەرمان و بڕیارمان بە

لەناو بردن و ویران کردنیان بە هەر ئافەتێ لەو ئافەتانەی کە ویران کەرو لەناو بەرن، ﴿فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەو ڕووەك و کشتوکاڵە بگێڕین وەك دروێنە کراوی لە ریشە هێنراو بە جۆرێ ﴿كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ﴾ وەك دێنیی و لەوەو پێش ئەو کشت و کاڵ و بەرو میوەیە هەر نەڕوا بێت و نەبووبێ لەو زەوییەدا ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەو جۆرو شێوە ڕوونە باسی ئەکەین بە ڕوونی ئایەتەکان بر گەل و دەستەیەك کە بیر ئەکەنەوەو تێ ئەفکرێن لە واتاو مەبەست و ئاگادار ئەبن بەسەر هەق و ڕاستیدا، دنیا و ژیان و خۆشی دنیا بەو جۆرە کەم و کورت و لەدەست دەرچووە، ئەو دنیا و ژیان و خۆشییەی کە خەڵکی نەفامی بێئاگا پشتی پێئەبەستێ و بە گرنگ و مەبەستی سەرەکی دائەنێ و شەیتان بانگی بۆ ئەوە ئەکات ﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ﴾ خواش بانگ ئەکات بۆ ماڵ و نیشتمانی ئارامی و ئاشتی و بێباکی، لە هەر ناخۆشی و ناڕەحەتی، پاك و خاوێن لە هەر جۆرە کەم و کوڕی و ئافەتێ ﴿وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ هەرکەس بیەوێ ڕێنموونی ئەکات بۆ ڕێگەی ڕاست و ئەیگەیەنێ پێی. ئای هاوار بۆ جیاوازی و دووری ئەو دوو ماڵ و نیشتمانە. ماڵ و نیشتمانێ کەلە کاتێکی کەمدا لەناو ئەچێ و نیشانە و دروشمیشی نەمێنێ و شەیتان بانگی بۆ ئەکات، ماڵ و نیشتمانێکی بێ وێنە کە خوا بانگی بەندەکانی بۆ ئەکات!! لەبارەی ئەو وێنەو چیرۆکەو مەبەست پێی چەند شتێ گوتراوە و بە چەند جۆرێك دامەزراو و بەهێز ترە ، خوا خۆی باش ئەزانێ.

ئینجا لەم ئایەتی(٢٦)ەوە تا ئایەتی(٧٠) یەك مەبەستی سەرەکی نیشان ئەدات و بەهێزو دامەزراوی ئەکات لە دڵ و دەروندا: ئەوەش بریتییە لەڕێ بڕینەوە و بەرەنگار وەستانی سروشتی ئادەمی بە چەند ڕابەرو بەڵگەو نیشانەی تاك و تەنیایی خوا و ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) و بڕوای تەواو و بەهێز بە ڕۆژی دوایی و داد و دادپەروەریی لەو ڕۆژەدا. ئەم ئایەتانەدا لە چەند بارو ڕوویەکەوە و بە چەند جۆرو شێوەیەك دەستکاری دڵ و دەروون ئەکات و دای ئەچڵەکێنێ، بە جۆرێ هەر سروشتێ هێزی وەرگرتنی ساغ بێت خۆی پێ ناگیرێ و ناتوانێ گوێ ڕایەڵ نەبێ. وەك بۆمان دەرئەکەوێ لەکاتی تەفسیر کردنەوەیان و بیر لێکردنەوەیان...

بەڕاستی بێبڕواکان مافی خۆیان بوو کە ئەوەندە ئەترسان لە کارکردنی ئەم قورئانە لێیان و لە تێکدانی کۆڕو کۆمەڵیان، لەبەر ئەوە بە هەموو هێزو هەوڵیان ئەدا کە دوور کەونەوە لەم قورئانەو گوێی لێ نەگرن!

لە ئایەتی(٢٥)دا بانگی بەندەکانی کرد بۆ بەهەشت، ئینجا ئەوا لەم دوو ئایەتەدا باسی یاسای تۆڵەو پاداشت ئەکات بۆ ئەوانەی نایەن بەدەم بانگکردنەکەی خواوەو ئەوانەی کە دێن. ئەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ﴾ بۆ ئەوانەی کەلە دنیادا کردەوەی چاکیان کردووەو هەڵساون پێی بە پێی فەرمانی خوا، بۆ ئەوانە هەیە جەزاو پاداشتی زۆر چاك و شیرین و زیاترە لە کردەوەکەی خۆیان، لای خواروی بەدەقات وەك لەحەدیسی صەحیحدا هاتووە، بۆیان هەیە زیادە لەو پاداشتەش کە بریتییە لە سەرنجدان و بینینی زاتی پاکی بێهاوتای خوا کە هیچ پاداشت و خۆشی و لەزەتێکی پێناگات و هیچ چاکەو بەهرەیەك هاوتای ناکات، خوا بە میهرەبانی خۆی بێبەشمان نەکات لێی، تەفسیری ئەم ئایەتە زیادەیە بەوە هاتووە لە(ئەبو بەکری صدیق و علی و ئیبن و عەباس و ئیبن و مەسعود و ئەبو موسا) و کەسانێکی ترەوە، لە حەدیسیشدا هاتووە لە ڕیوایەتی(ئەحمەدو موسلیم و ترمزی و ئیبن و ماجە) و چەند کەسانێکی تریش، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست بە(حسنی) چاکترو شیرین تر لە کردەوە کەیانە، مەبەست بە(زیادة) چەند قات و بەرامبەر کردنەوەی پاداشتە لە یەك بەدە تا هەر ئەندازو هەر چەند خوا خۆی مەیلی هەیە، بێجگە لەو دوو تەفسیرە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە، هێندێ ئەفەرموون: هیچ بەرگری کەرێك نییە کە خوای میهرەبان منەت بنێ بەسەر هێندێ لە بەندەکانیدا بەوە هەموو پاداشتەکە زیادن لە چوونی بەهەشت و بەهرەیەکی ترن، لەسەر ئەم ڕایە تەفسیری(حسنی) ئەکرێتەوە بە بەهەشت و(زیادة)ەکەش ئەوانەیە کە گوتمان.

وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ

ئەو خوا پێداوانە وەك ئەگەن بەو پایەو پلە بەرزە، ڕزگارن لە ناڕەحەتیەكانی ڕۆژی دوایی، لەبەسەرهاتە سەختەكانی وەستانی ئەو ڕۆژە پێش بڕینەوەی كاری خەڵكی، وەك لەم فەرموودەیەوە وەرئەگیرێ ﴿وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ﴾ ڕووو دەمو چاویان داگیر ناكات و دایان ناپۆشێ هیچ ڕەشی و تەمو تاریكی و ڕیسوایی و سەر شۆڕییە كە دووچاری بێبڕواكان ئەبێ لەو ڕۆژە سەختەدا وەك دەرئەكەوێ لەباسی دەستەی تردا كەلە ئایەتی داهاتوودا باسی دێت، دەی ڕزگار بوون لەوانە بەهرەو چاكەیەكی زۆر گەورەترە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانەی كە دارای ئەو سیفەت و بەهرەیانەن كە باسكران هاوڕێی جوێ نەبووەوەی بەهەشتن و خاوەنی بەهەشتن، ئەوانە لەو بەهەشتەدا نیشتەجێن بە هەمیشەیی و هەتا هەتایە. ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ ئەوانەی كە بەمەیل و ئارەزووی خۆیان بێبڕوایی وگوناهوكردەوەبەدەكانیان كردووەئەمانەچوار تۆڵەو بەسەرهاتیان بۆ باس ئەكات:

١- ﴿جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا﴾ تۆڵەی هەر كارو كردەوەی بەدیان بە ئەندازو وێنەی كارو كردەوە بەدەكەیانەو بەپێی دادو كاردروستی هیچی لێ زیاد ناكرێ، نەك وەك چاكان و دەستەی پێشوو كە بەپێی بەزەیی و میهرەبانی خوا پاداشتی زیادەی هەیە بۆ كارو كردەوە چاكەكانیان، پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری میهرەبان.

٢- ﴿وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ﴾ ڕیسوایی و بێئابڕووییەك كە بەتین داگیریان ئەكات و سوار باریان ئەبێ و دڵتەنگ و ئارامیان ئەكات.

٣- ﴿مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ﴾ نییە بۆیان هیچ پەنا دەرێك لە خەشم و سزای خوا، یان نییە بۆ ئەوانە لەلایەن خواوە هیچ پەنادەرێك لە كردەوەی چاك و لەتكاكارو لێبوورن كە ئەمانە هەن بۆ چاكان بە ئیزن و ڕەوادانی خوا.

٤- ﴿كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ﴾ ئەوانەبەجۆرێكن لەڕوو ڕەشیدا وەك دەمو ڕوویان داپۆشرابێ بە چەند پارچەو پەردەیەك لە شەو لە كاتێكدا شەوە زەنگ و تاریك بێت،

أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡۚ فَزَيَّلۡنَا بَيۡنَهُمۡۖ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمۡ إِيَّانَا تَعۡبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ إِن كُنَّا عَنۡ عِبَادَتِكُمۡ لَغَٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانەی کە باسکران بە خۆیان و سیفەت و نیشانەکانیانەوە، ئەوانە هاوڕێی نەبووەو خاوەنی ئاگرن، ئەوانە هەمیشەییین لەو ئاگرەوە بەبێبڕانەوە. خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ و پەنامان بدات، آمین. ئەوانە لە دنیا بە تەمای هاوبەشی و تکاکار بوون و کە پەنایان بدەن و فریایان بکەون، جا ئەوا هەر لە دنیادا نائومێدیان ئەکات و ئەدا بە بەنوکەی دڵیاندا، بە هەواڵدان و بەگێڕانەوەی داستان و بەسەرهاتی ئەو ڕۆژەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا﴾ باسی بکە ئەی پێغەمبەر بۆ هەردوو دەستە، باسی ڕووداوی ئەو ڕۆژەی کە ئێمە ئەوانە زیندوو ئەکەینەوەو هەموو کۆ ئەکەینەوە پێکەوە ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ﴾ لەپاش وەستانێکی زۆر دوورو درێژو هیچ قسەیەکیان لەگەڵ ناکرێ، ئینجا ئەڵێن بەوانەی کە هاوبەشیان بڕیاردا بۆمان لەدنیادا ﴿مَكَانَكُمۡ﴾ لە جێگەو شوێنی خۆتاندا ڕاوەستن و لێی نەترازێن هەتا ئەبینن چیتان دەربارە ئەکرێ، بوەستن ﴿أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡ﴾ ئێوەو هاوبەشەکانتان، واتە ئەوانەی کەلە دنیادا گێڕا بووتان بە هاوبەشی خواو ئەتاپەرستن، بۆ ئەوە حوکم و بڕیار دەرئەکەین لەنێوانیاندا لەبارەی پەرستنیان بۆیان، لەبارەی وت و وێژیان لەگەڵ یەکتر ﴿فَزَيَّلۡنَا بَيۡنَهُمۡۖ﴾ ئینجا جیاوازی ئەخەینە نێوانیان و جیایان ئەکەینەوە لەیەکتر وەک باو وایە کە داواچییان ئەکرێنەوە لە یەکتر. لەو کاتەدا هاوبەش ڕەواداران قسە ناکەن، بەڵکو هاوبەشەکان ئەکەونە قسەو گفت و گۆ بۆ ئەوەی خۆیان بەری بکەن لەو تاوانە کەورەیە وەک ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم﴾ هاوبەش ڕەوا دراوەکان ئەڵێن: ﴿مَّا كُنتُمۡ إِيَّانَا تَعۡبُدُونَ﴾ ئێوە ئێمەتان نەپەرستووە ﴿فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ﴾ ئینجا بەسە خوا بە شایەت و حەکەم لەنێوان ئێمە و ئێوەداو ئاگا و زانایە بە حاڵ و باری ئێمەو ئێوە ﴿إِن كُنَّا عَنۡ عِبَادَتِكُمۡ لَغَٰفِلِينَ﴾ بەڕاستی و بێگومان ئێمە بێئاگا بووین لە پەرستنی ئێوە بۆمان. ئەمانە ئەو هاوبەشانە بوون کە ئەمان لەدنیادا ئەیانپەرستن، ئەمانە بێهێزو ئەیانەوێ ڕزگار بن لە گوناهێک کە بەشدار نەبوون تیایدا!

هُنَالِكَ تَبْلُواْ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ

﴿هُنَالِكَ تَبْلُواْ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ﴾ لەو شوێنە سەخت و سامناکەی ڕۆژی دواییدا هەموو نەفس و هەموو کەسێك بڕوادار بووبێ یان بێبڕوا تاقی ئەکاتەوە و بۆی دەرئەکەوێ هەر کردەوەیەك کە پێشی خست و هەڵسا پێی لەدنیادا، هەر سەرەنجام بەرووبوومێك کەلە کردەوەکانیەوە پەیدابوو ئەبێ، بەمەی پاداشت و تۆڵەی کردەوەکانی ئەبینێ، لەوێدا دەرئەکەوێ کە تەنیا خوایەك هەیە و بێجگە لەو هەموو ناهەق و بێنرخە و بەتاڵە، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ﴾ هەموو ئەگێڕێنرێنەوە بۆلای حوکم و بڕیاری خوا کە هیچ حوکم و بڕیارێکی تر نییە، ئەگێڕێنرێنەوە بۆ پاداشت و تۆڵەی خوا، ئەگێڕێنرێنەوە بە ناچار کردنیان بەدانانان بە خوای تاك و تەنیادا لەپاش ئەوەی لە دنیادا شتی تریان ئەپەرست ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ ون ئەبێ لێیان و نامێنێ هەرچی لە دنیادا ناهەق هەڵبەستیان ئەکرد لە هەموو لاف و بۆچوون و بت و پەرستراوەکانیان.

ئینجا بەجۆرو شێوەیەکی تر ڕابەرو بەڵگە ئەهێنێ لەسەر تاك و تەنیایی خوا، لە پاش ئەوەی کە گەردش و خولانەوەیەکی کرد بە دڵ و دەروون لە ڕۆژی دواییدا، لەو ڕۆژەدا ئاشکرا ئەبێ کە هەر خوا خوایە، سەرنجیان ڕائەکێشێ و گەردش و خولانەوەیان پێئەکات لەو بارو حاڵەتەی کە تێیدا ئەژین، لە نەفسی خۆیاندا کە ناسراوە لای خۆیان، لەو هەموو بینراوو چەشمەندازەی کە خۆیان ئەیانبینن لە ژیاندا، بەڵکو داننانی خۆیان بەوەی ئەو هەموو شتە بە فەرمانی خوایە و دروستکراوی خوان، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو هاوبەش ڕەوادەرانە: ﴿مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئایا کێ ڕۆزی ئێوە ئەدات لە ئاسمان و لەزەوییەوە؟ لە ئاسمانەوە بەباران و هەر هێزو وزەیەکی تر کە خۆی ئەزانێ،

لەزەوییەوە بەو هەموو ڕووەك و سەوزەوات و دانەوێڵە كەوان بە بەرچاوەوە؟ ﴿أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ﴾ وازبێنن لە ڕۆزی ئەی ئایا كێ خاوەن و دەسەلاتدارە بەسەر دروستكردنی گوێ و چاوەكان و پێكهێنانی هێزی بیستن و بینین و هۆش و زانین و لەو ئەندامانەداو خستنیانە كارو فەرمانیان و لەكار خستنیان؟ ئەم ئەندازەیە بەسەو هەموو چین و تاقمێك زانان و پێی و بەسە بۆ ئاراستەكردنی ئەم پرسیارە، هەتا بێت خەڵكی زاناو شارەزا تر ئەبن لە نایابی و ئەو هەموو وردەكارییە كە كراوە لەم جیهازو كۆئەندمانەدا، هەركام لەمانە بە تەنیا جیهانێكەو هەموو كەس سەرگەردان و سەرسام ئەكات و ئەبێ هەر بڵێ: هەر پەروەردگار خاوەن و داهێنەرو خوای هەمووە، بەڕاستی زۆر جێگەی سەر سوڕمانە كە خەڵكی بەبێ هۆشانە ئەو هەموو شتە نایابانە ئەبینن و تێپەڕ ئەكەن بەلایاندا، كەچی دەستكردێ لەم دەستكردە تازانەی ئادەمی ئەبینن بەجارێ شێت و شەیدا ئەبن، وەك هەر ئەمانە ببینن و كەڕو كوێر بن لە ئاستی دروستكراوەكانی خوادا، لەگەڵ ئەوەدا دەستكردەكانی بەندە هەر هیچ نین لە چاو دروستكراوەكانی خوادا!

﴿وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ كێ زیندوو لە مردو دەرئەهێنێ و مردوو لە زیندوو! بە پێی زانین و بۆچوونی خەڵكی لەو كاتەدا زیندوو بریتی بوو لە هەر شتێ كە كەشە بكات یان بزووتنەوەی هەبێ و بجوڵێ، مردوو هەر شتێكە كە هیچكام لەو دوو نیشانەی نەبێ، كەواتە واتا و مەبەست بە پرسیارە كە دەرئەكەوێ لە دەرچوونی گیا و درەخت لەناوكەو دانەوێڵە، دەرچوونی بێچوو لە هێلكەو هێلكە لە بێچوو، هەروەها هەموو ئەو شتانەی كە ئەبینرێن، ئەوەیان بەلاوە شتێكی نایاب و سەر سوڕهێنەرە، لە ڕاستیشدا وایە تەنانەت پاش ئەوەش كە زانراوە ئەو ناوكەو هێلكەو دانەوێڵەش هەر زیندوون، بەهۆی ئەو گیانە شاراوەو ئەو ئامەییە بۆ گیان، چونكە ڕاستی شاردنەوەی گیان بەو هەموو نیشانەو دروشمەو شتە تایبەتییانەی كە خوا دایناون لەو ناوكەو تۆمەو هێلكانەدا، ئێجگار نایاب و جێگای سەر سوڕمانە!! بەڕاستی وەستان و بیركردنەوەیەك لەو دانەوێڵەو ناوكەو

تۆمەیەکە ئەو هەموو گیاو درەختەی لێ دەرئەچێ، یان ئەو هێلکە بێچووو ئادەمی لێ دەرئەچێ، بەسە بۆ بەخت کردنی گیانو ژیان لەبیرکردنەوەو کەوتنە دڵە لەرزە لە ئاستی ئەو کارو کردەوانەی خوا، ئایا درەختە خورما یان گوێزەکە بەو هەموو گەورەییە بە هەموو ساقو پەلو گەڵا و ڕەگو ڕیشەو بەرو تامو بۆنو ڕەنگەکەیدا چۆنو لە کوێدا شاراوەتەو لەناو ئەو ناوکە بچووکەدا، چۆن هەرکام لەوانە جوێ بووەوەو دامەزرا لە جێگەو شوێنی تایبەتی دیاریکراوی خۆیدا؟! هەروەها هەر شتێکی تری بە مردوو زانراو کە دەردێت لە زیندوو یان بە زیندوو زانراو کە دەر دێت لەمردوو!

ئەم ئادەمییە ئایابە سەر سوڕهێنەرە بەو هەموو کەرەسەو هێزو وزەو ڕەنگو شێوەو نیشانەو دروشمی باوکو دایکو بەرە بابەوە...هتد، ئەو هەمووە لە کوێو چۆن شارایەوە لەناو ئەو گەراداو چۆن جوێ بوونەوەو هەر شتێ بۆ شوێنی تایبەتیو دیاریی کراوی خۆیان!! بێگومان کۆبوونەوەی ئەو هەمووە لەو ناوکەو دانەوێڵەو گەراداو جوێ بوونەوەیانو یەك گرتنی هەر بەشو پارچەو کۆئەندامێكو دامەزرانیان هەر کام لەشوێنی خۆیاندا، هیچ جۆرە هۆو فەراهەم هێنەریان نییە بێجگە لە دەسەڵاتو تەگبیری خوای پەروەردگار. هەتا بێت خەڵکی بۆیان دەرئەکەوێو دەری ئەخەن شتە نهێنیەکانی مردنو گیان، دەرهێنانی مردوو لەزیندووو زیندوو لە مردوو، وەرگەڕانی چەند کەرەسە لە چەند قۆناغێکدا بۆ لای مردن یان زیندوویی، گۆڕانی خۆراك کە بە کوڵانو ئاگر ئەمرێ، گەڕانی بە خوێنێکی زیندوو لە لەشێکی زیندوودا، وەرگێڕانی ئەو خوێنە بەو پیسیانەی کە ئەمرن بەهۆی سوتاندنیانەوە، بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێنەرنو تا بێت زیاتر جێگای سەرسوڕمانن، هەتا زیاتر بزانرێن، گیانو زیندوویی بەڕاستی شتێکی نەزانراوو نەناسراونو هەر قسەو باسێکی لێ بکرێ سەری لە هیچەوە دەرئەچێو ناگونجێ بوونی شتی وا بەبێ بوونی خوایەك کە بەخشندە بێت بۆی!

وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ

﴿وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ﴾ ئایا کێ تەگبیری کاروباری ئەم هەموو شتە ئەکات کە گوتران‌و هەر شتێکی تر لەم بوونەوەرەو لەم ئادەمییەدا؟ ئایا کێ تەگبیری ئەو هەموو ئەستێرەو مانگ‌و خۆرو زەوییە ئەکات بەم جۆرو شێوەیە کە ئەو هەموو وردەکاریەی تێدا کراوەو هەموو ژیرییەك سەرگەردان‌و سەرسام ئەکات؟ ئایا کێ تەگبیری بزووتنەوەی ژیان ئەکات کە بەڕێگای دیاریی کراوی خۆیدا ئەڕوات بەبێ گۆڕان‌و هەڵەو دواوبەر؟ ئایا کێ؟ ئایا کێ؟

ئەو پرسیارانەی کە لە ئایەتەکەدا ئاڕاستەکران هیچ وەڵامێکیان نییەو پرسیار لێکراوان هیچ چارەیان نییە ئەبێ هەر ئەمە بڵێن کە ئەفەرموێ: ﴿فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ﴾ بێ‌گومان ئەوانە ئەڵێن: خوایەکە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یە، چونکە ئاشکرایە ئەو پرسیار لێکراوانە هەن، دەی بوونەکەیان ناگونجێ لە خۆوەو بە ڕێکەوت بێت، کەواتە هەر ئەبێ بڵێن: خوا فەراهەمی هێناوە، بێجگە لەوەش ئەو هاوبەش ڕەوادەرانە دانیان ئەنا بەبوونی خوادا، دانیان ئەنا بەوەی دەستی قودرەتی خوا لە کاردایە لەم بوونەوەرەدا، بەڵام تێکچوون‌و شێوازی سروشتیان هۆی ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەو داننانەدا هاوبەشیان بۆ ڕەوا ئەداو ئەو هاوبەشانەیان ئەپەرست، هەرچۆن شوێنی شەریعەت‌و بەرنامەیەك ئەکەوتن کە ئیزنی لەسەر نەبوو ﴿فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ کەواتە ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: دەی ئایا ئێوە خۆتان ناپارێزن لە خەشم‌و تۆڵەو سزای خوا بەهۆی هاوبەش ڕەوادان‌و پەرستنیان لەگەڵ ئەوەدا خاوەنی هیچ شتێك نین تەنها خوا خاوەن‌و داهێنەرە بۆ ئەوانەو بۆ هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا؟

﴿فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلۡحَقُّۖ﴾ کەواتە ئەو خوای کەناوی ﴿ٱللَّهُ﴾ یەو ئێوە ئەڵێن: ئەو پرسیار لێکراوانە بەدەست ئەوەو ئەو ئەیانکات، کەواتە ئەو خوا کە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یەو خاوەن‌و کاربەدەست‌و پەروەردگاری ئێوەیە کە ڕاستەو هەیە خۆی بە خۆی، دەی کە هەر ئەو خاوەن‌و کاربەدەست بێت ئەو بپەرسترێ‌و شایستە بێت بۆ پەرستن ﴿فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ﴾ دەی ئایا لەپاش هەق‌و ڕاست هیچ هەیە بێجگە لە گومڕایی‌و بەتاڵ؟ واتە نەخێر، چونکە هەق‌و ڕاست هەریەك دژو پێچەوانەی نابێ‌و ناگونجێ ڕاست بێت،

فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٣﴾ قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهۡدِي لِلۡحَقِّۗ أَفَمَن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ إِلَّآ أَن يُهۡدَىٰۖ فَمَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴿٣٥﴾

---

﴿فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ﴾ ئەی ئایا چۆن ئێوە لادراون لە هەقەوە بۆ بەتاڵ و لە ڕێنموونییەوە بۆ گومڕایی؟ واتە لادان و وەرگەڕانەکەتان جێگای بێزاری لێدەربڕین و سەر سوڕمانە ﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ﴾ بەوێنەی ئەو لادانە لە ئایین و بیروباوەڕە ڕاست و ڕوونەکە کە هاوبەش ڕەوادەرەکان دانی پێدائەنێن و هەڵناسن بە بەرهەم و داخوازەکەی، بەوێنەی ئەوە بڕیارو باوی پەروەردگارت دامەزراو جێگیربوو لەسەر ئەوانە. یان هەڕەشەکەی لەسەر ئەوانەی کە دەرچوون لە سنووری بڕواو دامەزراون لە بێبڕواییدا ﴿أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بڕیارو حوکمی خوایش ئەمەیە کە ئەوانە بڕوا ناهێنن، خۆیان بە مەیل و هەڵبژاردن و خواهیشی خۆیان بێبڕوایی هەڵئەبژێرن و خوایش بڕیاری لەسەر ئەدات، نەک مەبەست ئەمەیە زۆریان پێ ئەهێنرێ و ناچا ئەکرێن. ئینجا هێندێکی تر لە بەرهەمی دەسەڵاتی خوا ئەخاتە بەرچاو کە هاوبەش ڕەوا دەران هیچ بەشێکیان نییە تیایدا، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ئایا هەیە لەناو هاوبەش ڕەوادەرەکانتاندا کەسێک کەلە یەکەمجارەوە دەست بکات بە دروستکردن و شت دروست بکات ئینجا لەپاش نەمان و مردن دووبارەی بکاتەوە؟ ئەو هاوبەش ڕەوادەرانە هەرچەند بڕوایان بە دووبارە کردنەوە نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بەڵگە و ڕابەر و نیشانەی ڕوون و ڕەوان زۆر گوێ نادرێ بە بێبڕواییەکەیان و وەک بڕوایان هەبێ پێی وایە ﴿قُلِ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ بڵێ: خوا لە یەکەمجارەوە شت دروست ئەکات و ئینجا لەپاش مردن و نەمان دووبارەی ئەکاتەوە ﴿فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾ کەواتە ئایا چۆن ئێوە لادراون لە بڕوا بەو شتە ڕاستە کە سروشت و ژیریی و بیر ﴿قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ﴾ بڵێ پێیان: ئایا لەناو هاوبەش ڕەوادراوەکانتاندا هەیە

کەسێك کە ڕێنموونی بکات بۆلای هەق‌و ئایینی ڕاست‌و بەرنامەی ڕاست، بەم ڕەنگە نامەو فروستادە بنێرێ‌و شەریعەت‌و یاسا دابنێ‌و شەریعەت دیاریی بکات‌و بترسێنێ‌و تەمێ بکات بۆلای خێرو خۆگرتنەوە لە خراپە، ئایەت‌و ڕابەرەکانی دەروون‌و بوونەوەر ڕوون بکاتەوە، دڵی بێئاگا بێداربکاتەوە، هەست‌و هۆشە لەکار کەوتووەکان بخاتەوە ئیش‌و کار، وەك ئەبینین لە لایەن خواوە وەم فروستادەو ئەم قورئان هاتووە بۆتان بۆ ڕێنموونی‌و خستنە سەر ڕێگەتان؟ ئەوانە هەرچەند بڕوایان نەبوو بەمانە، بەڵام لە ڕاستیدا شتەکە حازرو بزرو ئامادەیە لە پێش دەمیاندا، کەواتە با فروستادەکەی(ﷺ) بۆیان باس بکات بەڕوونی‌و بیدات بەناوچاویاندا، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿قُلِ﴾ پێیان بڵێ: ﴿ٱللَّهُ يَهۡدِي لِلۡحَقِّۗ﴾ خوایەکە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یە ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەو هەق‌و ڕاستییەو بۆ ئەو ئایین‌و ڕێگە ڕاستە ﴿أَفَمَن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ﴾ ئایا کەسێك کە ڕێنموونی بکات بۆ هەق شایانترو شایستەترە بەوەی پەیڕەوی بکرێ ﴿أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ إِلَّآ أَن يُهۡدَىٰۖ﴾ یان کەسێك کە ڕێنموونی وەرناگرێ‌و ڕێگەی ڕاست ناداتە بەر مەگەر ڕێنموونی بکرێ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە شتێکی ئاشکرایەو هیچکەس ڕێگەی نییە وەستان‌و دەمە پێچەی تێدا بکات، هەموو کەس ئەزانێ کە هەرچی پەرستراوەکان هەیە بێجگە لە خوا، تەنانەت فریشتەو عیسایش ئەگەر خوا ڕێنموونیان نەکات ڕێگەی ڕاست نادەنە بەرو خۆیان بە خۆیان ناکەونە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿فَمَا لَكُمۡ﴾دەی ئایا چییە بۆ ئێوەو چی ڕوویداوە بۆتان‌و چیتانە کەوا بۆچوون‌و بیروباوەڕی ئاوا ناڕاست‌و بەدو پووچتان هەیە، واتە ئەوەی کە ئێوەی لەسەرن مایەی سەرسوڕمانە! ئایا چۆن ئێوە ئەو بتانە ئەپەرستن کە دەستەپاچەن‌و هیچ شتێکیان بە دەست نییەو ئەوانە ئەکەن بە هاوبەشی خوای پەروەردگار کە هەموو شت بەدەست ئەوەو موڵکی ئەوەو داهێنراوی ئەوە؟ ﴿كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ﴾ ئایا ئێوە چۆن بڕیار ئەدەن بەڕەوادانی پەرستنی ئەوانەو گێڕانیان بە وایستە بۆلای خوا؟ لەپاش ئەوەی لێ بوویەوە لە پرسیارو وەڵامەکانیان، ئەو وەڵامانەی کەڕێریی‌و زانین پێویستیان ئەکات، ئینجا بەدوای ئەوانەدا بارو حاڵیان ڕوون ئەکاتەوە لەبارەی بیروباوەڕو بڕیاریانەوە کەبە بێ بەڵگەو پشت گیین لەوانەداو دژ بە گومان‌و ئارەزووی نەفس ئەجووڵێنەوە،

﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ (٣٦)﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا﴾ زۆربەی ئەوانە لە عەقیدەو بیروباوەڕو قسەو گفتوگۆكانیاندا شوێنی هیچكەس ناكەون بێجگە لە جۆرە گومانێكی ڕوون كە بنەڕەتی لەسەر خەیاڵو بۆچوونێكی ناڕەوایە بەبێ هیچ زانینو تێگەیشتنێك، ئەفەرموێ: زۆربەی ئەوانە، چونكە هەموویان بەوجۆرە نەبوون، بەڵكو هێندێكیان ئەیانزانی كە ئەو جۆرە بۆچوونو بیرو باوەڕانە ناڕاستو پڕوپووچن، ئەوەی كە خوا ناردی ڕاستە، بەڵام لەبەر مل هوڕیو سەكێشی ملیان كەچ نەئەكردو شوێنی هەق نەئەكەوتن، ئینجا حوكمو بڕیاری خوا باس ئەكات لەبارەی ئەو جۆرە گومانانەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ گومان هیچ جۆرە سوودو بێپێویستیەك نادات بە خاوەنەكەی لەبارەی هەقو لەباتی هەقدا لەو شوێنانەدا كە پێویستی نەزانینو دامەزراوی ڕاستو ڕەوا وەك مەسەلەی عەقیدە، نەك مەسەلەی كارو كردەوە لە ـ میهرەبانی خوادا ـ گومان لە زۆریاندا، بەڵام مەسەلەی عەقیدە پێویستە بەزانینو بێگومان تێرو تەواو كە زۆربەی ئەوانە بێبەشن لەوەدا بە گومانێكی لاوازو شوێن كەوتنێكی كوێرانەی باو باپیر هەڵئەسن بەكارو كردەوەی ئاینو باوەڕكەیان. لەسەر ئەوە دائەمەزرێن، ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ بەڕاستی خوا بە ئەوپەڕی ڕادە زاناو ئاگایە بە هەموو كارو كردەوەیەك كە ئەوانە ئەیكەن، بەم فەرموودەیە هەڕەشەیەكی سامناك ئاڕاستەی ئەو كەسانە ئەكات كە هەڵئەسن بەكرداری ناشەرعیو ناشیرینو شوێنی ناڕاستو ناڕەوا ئەكەون.

ئینجا گەردشێكی تر ئەكات بەدڵو دەروون لەبارەی قورئانەوە:

یەكەم: دەست نەدانو نەگونجانی بۆ ئەوەی دەست هەڵبەست بێت، بەر ئەبڕێتەوە لە بێبڕوایان كە بتوانن سورەتێك بەوێنەی قورئان بڵێن، لەكەداریان ئەكات بەمەی بەبێ بیر كردوەو بەپەلە بڕیار ئەدەن بە بێزانینو لێكۆڵینەوە.

دووەم: لەبارەی بارو حاڵی ئەوانە بەرامبەر قورئانو بەهێزكردنو دامەزراندنی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ڕێگە ڕاستەكەی خۆیو گوێی نەبێ لە هەڵوێستی بێبڕوایان.

﴿وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ﴾

---

ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە نائومێدکردن لە دەستەی گومڕاکان و دەست نیشان کردن بە دوا ڕۆژی سەخت و بەدیان ستەمیان لە خۆیان کردووە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ نەبووە و نەگونجاوە و کاری قورئان ئەوە نەبووە و نییە کە دەست هەڵبەست بێت بەدەم خواوە و لەلایەن بێجگە لە خواوە هاتبێ، چونکە تەنها دەسەڵاتێك کە دەسەڵاتی بێسنووری خوایە ئەتوانێ نامەیەکی وا بنێرێ کە وابێ بەر ببڕێتەوە لە هەموو کەس کە بتوانێ وێنەی بێنێ، بەڵکو دە سورەتی، بەڵکو وێنەی کورت ترین سورەتی بێنێ، تەنها قودرەتێك ئەتوانێ کە دەوری هەموو شتی دابێ بەزانینۆ بە توانین، چ لەمەو پێش و ڕابردوو، چ ئێستا و داهاتوو، چ ئاشکراو چ پۆشیدەو نهێنی، تەنها توانین و دەسەڵاتێك ئەتوانێ کە بەرنامەیەکی ئاوا دابنێ کە پاك و بێگەرد بێ لە هەموو کەم و کوڕی و ناتەواوی و هەر جۆرە نیشانەی نەزانین و دەستە پاچەیی، کەواتە مەسەلە هەر ئەمە نییە کە بگوترێ: دەست هەڵبەست نەکراوە، بەڵکو مەسەلەکە گەورە و گرنگ ترە لەوە ئەوەش ئەمەیە کە هێنانی لەلایەن خواوە نەبێ نەگونجاوە و ناگونجێ و لە سنووری دەسەڵات و توانینی بێجگە لە خوادا نییە، ﴿وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بەڵکو ڕوون کەرەوە و بەڕاست گێڕ و دەر خەری ڕاستی ئەوەی کە لە پێش ئەمدا هاتووە لە سروش و شەریعەتەکانی خوا، بەڵکو ئەگەر ئەم نامە موعجیزە نەهاتایە کەس هەواڵ و بەسەرهاتی سروش و نامەکانی تری بەڕێك و ڕاستی نەئەزانی، یان مەبەست ئەوەیە: ئەم قورئانە هاتووە بۆ ڕاست گێڕان و بڕوا پێکردنی سروش و نامەکانی تری خوا کەلەپێش ئەمدا هاتوون، هەروەها بە هەردوو جۆر تەفسیر ئەکرێتەوە ﴿وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ لەسەر باری یەکەم: بەڵکو ئەم قورئانە ڕوون کەرەوەی نامەی خوایە فروستادەکان هێنایان لەلایەن خواوە کە هەموو یەکن و یەك نامەن لە مەبەست و ئەسڵ و بناغەدا، ڕوونکردنەوە و باسیان بە ڕوونی و درێژیی جیاوازە، لەسەر باری دووەم ئەم قورئانە هێنرایە خوارەوە لەبەر ڕوونکردنەوەی نامەی خوا.

لەسەر باری یەکەم مەبەست بەڕاست گێڕو باوەڕ پێهێنانە بە نامە پێشووەکان لە عەقیدەو بانگکردن بۆلای خێرو ئەو کارو کردووەو ڕەوشتانەی کە دەست نادەن بۆ گۆڕان و هەمیشەیین، هەروەها بانگ کردن بۆ خۆپارێزیی لە هەر کارو کردەوەیەك کە دەست نادەن بۆ وەرگرتن و ڕەوادان لە هیچ کات و چەرخێکدا وەك کوشتن و دزی، ئەم قورئانە ڕوون کردنەوەیە بۆ نامەی خوایی کە فەرمان دراوە نووسینی دراوە نوسینی بۆ ڕێنموونی کردن بۆ لای هەر شتێك کە پێویستە بۆ بەندەکانی خوا، ئەم قورئانە ﴿ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ هیچ گومانی تێدا نییە، واتە شایستە نییە بۆ هیچ ژیرییەك کە گومانی ببێ تیایدا لەبەر بەرزی شان و شەرەف ڕوونی نیشانەو بەڵگەو ڕابەرەکانی ڕاستیەکەی ﴿ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ هاتووە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانیانەوە، لە سروش و وەحی کراوی ئەوەو هیچ کەسێکی تری توانای نییە بەسەریدا، لەپاش ئەوەی بەو جۆرو شێوە زۆر بەهێزە ڕوونی کردەوە نەگونجانی دەست هەڵبەستکردنی ئەم قورئانەو دڵنیا کردن لەسەر هاتنی لەلایەن خواوە، لە پاش ئەوە بە شێوەی بێزاری دەر بڕین و سەرسوڕهێنان ئەم پرسیارە ئاڕاستە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ﴾ ئایا ئەوانە ئەڵێن: محمد ئەم قورئانەی دەست هەڵبەستکردووە بەدەم خواوە؟ واتە قسەکەیان جێگای سەرسوڕمانەو بێزاری لێدەربڕینە، ئینجا بەریان لێ ئەبڕێتەوە بەمەی کە محمد ئادەمییەکە وەك ئەمانە، کەواتە با ئەمانیش وێنەی سورەتێکی ئەم قورئانە بڵێن و بیهێنن، ئەفەرموێ: ﴿ قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە ﴿ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ﴾ دەی کەواتە سورەتێك لەوێنەی ئەم قورئانە بێنن لە ڕەوشت و هۆنینەوەو ڕێنموونی کردن و پاك و بێگەردی لە هەر کەم و کوڕی یەك بێنن نەك هەر خۆتان بە تەنها بەڵکو﴿ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بانگیش بکەن هەر کەسێك کە ئەتوانن بانگی بکەن بۆ کۆمەك و یارمەی دانتان بۆ ئەوە، بانگ بکەنە هەرکەس کە ئەتوانن بێجگە لە خوا ﴿ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەم لەوەدا کەئەڵێن: من دەست هەڵبەستن کردووە، ئەم بەر لێ برینەوە چەند جارێك کرا، دەستەپاچەیی و پەك کەوتنی بێبڕواکانیش دەرکەوت و ڕوون بوویەوە، هەروەها لەپاش ئەو چینە تا ئێستاو لەمەو پاشیش تا دنیا دنیایە، نەك تەنها لەبارەی گوتن و هۆنینەوەی وشەکانییەوە بەڵکو لە چەند بارو ڕوویەکی تریشەوە هەموو کەس داماوو پەککەوتوو دەستەپاچەیە، وەك لە چەند شوێنێکدا ئەندازێك لەوە دواین و ڕوونمانکردەوە، هەرکەسێك هەر گوناهێکی هەبێ لەو دەستەپاچەیی و پەك کەوتنە، بابیربکاتەوە لەوە کە ئەگەر بێبڕواو

دوژمنان تا ئێستا شتێکیان پێبکرایە بە ئاشکرا مریان ئەبڕیو بە نامەیەك بڵاویان ئەکردەوە بەرامبەر قورئان،(سید قطب) -خوا لێی ڕازی بێ- لەم شوێنەدا باسێکی دوورو درێژی هێناوە بەڕاستی کەس نەدیدەیەو هەرکەس تێگەیشتنی هەبێ و ژیرییەکەی لەکار نەکەوتبێ بەڕاستی بەو باسی بەوە بە ئەوپەڕی ئارامیو دڵنیاییەوە مەسەلەکەی بۆ ڕوون ئەبێتەوەو بۆی دەرئەکەوێ دەستەپاچەیی و چۆنێتی ئەو دەستەپاچەییە. لە پاش ئەو بەر لێ بڕینەوە ئینجا واز ئەهێنێ لە دەمە قاڵێ لەگەڵیانو ئەگوێزرێتەوە بۆ باسی ئەوەی ئەوانە شوێنی گومانی ڕووتکەوتوونو بڕیار بەسەر شتێکدا ئەدەن کە زانا نین پێی، بڕیاریش ئەبێ لە زانینەوە بێت، نەك لە ئارەزووی نەفس، یان لە گومانەوە بێت، نەك لە ئارەزووی نەفس، یان لە گومانەوە بێت، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ﴾ واتە واز بێنە لە دەمەقاڵێ لەگەڵیانو باسی ئەوە بکە کە ئەوانە ﴿كَذَّبُوا۟ بِمَا﴾ بڕوایان نەهێناوەو بێبڕوان بەشتێ، واتە قورئان وەك(حسن) ئەفەرموێو زانا بەرزەکانی تەفسیریش هەر بەو جۆرە ئەفەرموون کە ﴿لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ﴾ دەوریان نەداوە لە بارەی زانینەوە واتە هیچ زانینێکیان نییە کە بناغەو بنەڕەت بێت بۆ بڕوا نەهێنانەکەیان، واتە بەبێ بیر لێکردنەوە لە ڕاستیو گەورەیی ئەم قورئانە، هەر لە خۆیاننەوەو بە چەسپانی بڕوانەهێنانی خۆیان دەربڕی کە ئەوەش نیشانەی نەفامیانە، ﴿وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ﴾ هێشتا بۆیان نەهاتووەو دوا ڕۆژو سەرەنجامی بڕوا نەهێنانەکەیان، واتە ئەو سزاو تۆڵەی کە خوا هەڕەشەی کردووە لێیان بە دووچار بوونیان لە دنیادا پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، لەسەر بڕوا نەهێنانیان، گەلێك لە زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە مەبەست بە ﴿تَأْوِيلُهُۥ﴾ تەفسیرەو دەرکەوتنی ڕاستیەتی، دەرکەوتنی واتاو مەبەست بەرزەکانیو نیشانەی ڕاستیەکەی کە بریتییە لە بەدی هاتنی هەواڵەکانی، بەڵام تەفسیری یەکەم بەهێز ترە لەدڵدا:

١- لەبەر ئەوە لەزمانی قورئاندا بەو واتایە باوە.

٢- واتایەك ئەگەیەنێ جیاواز لە واتای ڕستەکەی پێشی، بەڵام بەپێی تەفسیری دووەم هەر ئەوە ئەگرێتەوە، دەی بەپێی باوی گفتو گۆو ڕەوانبێژیی گەیاندنی واتای تازە چاکترە لە دووبارە کردنەوەی.

﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٩ وَمِنۡهُم مَّن يُؤۡمِنُ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن لَّا يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُفۡسِدِينَ ٤٠ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ٤١ وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَۚ أَفَأَنتَ تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوۡ كَانُواْ لَا يَعۡقِلُونَ ٤٢﴾

---

**٣- گێڕانی چۆنییەتی بڕوا نەهێنانی ئەو بێبڕوایانە بۆ بێبڕواکانی ڕابردوو ئەو تەفسیری یەکەمە بەهێز ئەکات کە ئەفەرموێ:** ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ﴾ **واتە بە وێنەی بڕوا نەهێنانی هاوبەش ڕەوا دەرانی قوڕەیش، بڕوایان نەهێنا ئەوانە کەلەپێش ئەمانەوە بوون، واتە ئەوانیش بەبێ زانین و لە خۆیانەوە بێبڕوایی خۆیان دەربڕی، هێشتا بۆیان نەهاتبوو نیشانەی ڕاستی و دوا ڕۆژو سەرەنجامی بڕانەهێنانەکەیان، واتە ئەو سزای کە هەڕەشەیان لێکرا پێی لەسەر بڕوا نەهێنان، بەم دوو جۆرە تەفسیر کراوەتەوەو زانینی ڕاستەقینەی لای خوایەو بەڵام تەفسیری یەکەم ـ وەك گوتمان بەهێزترە لە دڵداو بەڵگەی زۆر لەسەری هەیە لە ئایەتەکانی تردا وەك خاوەنی تەفسیری(المنار) بەدرێژیی هێناویەتی** ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ **ئینجا سەرنج بدە ئایا چۆن بوو دوا ڕۆژو چارەنووسی ستەمکارەکان، واتە بێبڕواکانی پێش ئەمان، لەسەر تەفسیری یەکەم: واتە بەدی هاتنی ئەو هەڕەشەی لێیان کرا. سەرنج بدە تا بزانی دوا ڕۆژی ستەمکارەکانی پاش ئەوان. لە ئایەتەکانی ڕابردوودا بارو حاڵی بت پەرستەکانی باسکرد لە بارەی بێبڕوایانەوە. ئینجا لەمدوو ئایەتی داهاتووەدا چەند جۆرو دەستەیەك لەوانە ئەمێنێ کە جیاوازن لە یەکتر لە چەند ڕوویەکەوە، ئەفەرموێ:** ﴿وَمِنۡهُم مَّن يُؤۡمِنُ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن لَّا يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ﴾ **لەناو ئەوانەدا هینی وا هەیە کە بڕوا ئەهێنێ، هینی وا هەیە کە بڕوا ناهێنێ، واتە گەلەکەی تۆ وەك پێشووەکان نین کە بڕوایان نەئەهێنا مەگەر کەمێك، بەهۆی ئەوەوە لەناو ئەبران و لە ڕیشە ئەمێنران، بەڵکو ئەمان ئەبن بەدوو بەش بەشێك بڕوا ئەهێنێ بەم قورئانەو بەشێك بڕوای پێناهێنێ هەرگیز**

﴿وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ پەروەردگاری تۆ زاناترەو ئەوپەڕی زانینی هەیە بەوانەی کە خراپەکارو تێک دەرن لەوڵاتدا بە بت پەرستی و ستەمو تاوان و دەست درێژیی، بەکورتی ئەوانەی کە بڕوانـاهێنن و هیچ خراپەو تێکدانێك ناگاتە ڕادەی لادان و ترازان لە بڕوا بە پەروەردگارو بەندەیی تەنها بر ئەو، هەر تێکدان و خراپەیەك کە ڕووی دابێ لە دنیادا هەمووی بەهۆی بەندەییە بۆ غەیری پەروەردگار، هەر شەڕو خراپەیەك پەیدا ئەبێ لە ژیاندا هۆکەی شوێن کەوتنی نەفسەو هۆی بەرپا بوونی چەند پەرستراوێکە بە ناهەق و ناڕەوا لە وڵاتدا، مێژووی نەفامێتی و نەفامان لە کۆن و لە تازەدا پڕە لە تێکدان و خراپەکاری ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوەو بڕوا ناهێنن، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز کە ناڕەحەت ئەبێ بە بڕوانەهێنانی بێبڕواکان، نائومێدیش ببێ لێیان، جارێ بەری بوونی خۆی لێیان بدات، بەرامبەریان بوەستێ بەو هەق و ڕاستییەی کە پێیەتی، بەرامبەریان بوەستێ بە ڕوونی و بەئارامی دڵەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوایان پێنەهێنای ﴿فَقُل﴾ ئەوە بڵێ پێیان: ﴿لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ﴾ کردەوەی خۆم هەر بۆ خۆمەو کردەوەی خۆتان هەر بۆ خۆتانە ﴿أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ﴾ ئێوە بەرین لەوەی من ئەیکەم ﴿وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ منیش بەریم لەوەی ئێوە ئەیکەن. بەم جۆرەو ئەو گفت و گۆیانە دەست کاری ویژدان و دەروون ئەکات و زۆرجار هەڕەشەیە سوودو کەڵکی هەیە بۆ هێندێ کەس، بەوێنەی ئەوەی منداڵێکی نەفامت ببێ و سەپێچی بکات لەوەی لەگەڵێتی، تۆش بەجێی بێڵی لە ناوەڕاستی ڕێگەدا بە تەنیا کە دووچاری چارەنووسی خۆی ببێ بێئەوەی هیچ کۆمەك و پاڵپشتی ببێ لەلایەن تۆوە! ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَۚ﴾ لەناو ئەوانەدا کەسانێك لەو ناپاکانە هەیە کە گوێ ئەگرن لێت لەکاتی قورئان خوێندنتداو ئەڕوانن بۆ لات بەڵام سوود وەرناگرن و ئەوەی کە ئەیڵێیت وەری ناگرن بە وێنەی ئەوانەی کە بە تەواوی کەڕن و نابیستن ﴿أَفَأَنتَ تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوۡ كَانُواْ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا تۆ شت ئەبیستی بەکەڕەکان و ئەتوانی ئەوە بکەیت، تەنانەت با ئەو کەڕانە ژیریش نەبن؟

وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِي ٱلْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ

---

﴿وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ﴾ لەو ناپاکانەیە کەسێك کەلەناو ئەوانەدا هەیە کە ئەڕوانێ‌و چاو هەڵئەخات بۆ لات، بەڵگەو نیشانەکانی ڕاستیتئەبینێ، بەڵام وەك کوێر ڕێی پێدەرناکات و ناکەوێتە سەر ڕێگا، ﴿أَفَأَنتَ تَهْدِي ٱلْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ﴾ دەی ئایا تۆ کوێرەکان ئەخەیتە سەر ڕێگەو ئەتوانێ ڕێگەیان پێ‌ببینێ، تەنانەت بابە چاوی دڵیش نەبینێ‌و نابینا بن؟ واتە ڕێنموونی خستنە سەر ڕێگەی هەست‌و بیستن‌و بینایی، نابێ‌و ناگونجێ بۆ کەسێك نەبێ کە ئامادە بێت بۆی بەهۆی ڕێنموونی ژیرییەوە، ڕێنموونی ژیریش نابێ‌و بەمە نەبێ کە بەقەست‌و نیازی ڕاست دەروون بکاتە مەبەست‌و شتەکە، ئەو جۆرە بێ‌بڕوایانە ژیرییان بەکار ناهێنن لە بەڵگەو نیشانە بیستن‌و بینینەکاندا، بۆ ئەوە نەبێ بگەن بە مەبەست‌و ئامانجی ئارەزووەکانی نەفس بە شێوەی کەوتنێکی کوێرانە، بە مەیل‌و خواهیشی خۆیان بەکاریان ناهێنن لە شتی بە کەڵك‌و پڕ سووددا، نەك مەبەست ئەوە بێت کە ژیریی‌و هەستی سروشتیان نەبێ، تا داوا کردن لێیان بە زۆر پێ‌هێنان‌و ناچار کردن بەبێ هۆش‌و دەسەڵات، بەکورتی ئەوانە هۆو کەرەسەی ڕێنموونیان بە ڕێکی هەیەو بەڵام خۆیان بە مەیلی خۆیان بەکاریان ناهێنن لە جێگەو شوێنی بەکەڵکی خۆیاندا، کەواتە خۆیان ستەم لە خۆیان ئەکەن، وەك ئەوە شتێکی ئاشکرایەو هەرکەس خۆی کوێر نەکات ئەزانێ مەسەلەکە بەو جۆرەیەو قورئانیش لە چەند شوێنێدا دەست نیشان ئەکات بەو شتە ڕاستەقینە، یەکێ لەو شوێنانە ئەمەیە کە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا﴾ بێ‌گومان خوا کەم‌و کوڕی هیچ شتێکی نەکردووە لە خەڵکی لەوەی هۆی ڕێنموونی بێت بۆیان‌و کەوتنە سەر ڕێگەی ڕاستیان‌و هۆی خۆشبەختی لەهەردوو جیهاندا، کە ئەو هۆیانەش بریتین لە هەست‌و ژیریی‌و هەموو هێزو وزەکان کە پێویست بن، سەر باقی ئەوانە ناردنی پێغەمبەران‌و نامەی خۆی بۆیان، کەواتە مەبەست بەوتەی(ظلم) مەبەست‌و واتەکەیەتی لە ئەسڵدا ئەوە مەبەستە:

نەك مەبەست ئەوەیە كە بەكار ئەمێنرێ لە ستەم و تاواندا، چونكە خوا هەرچی بكات بەجێیەو تێپەڕكردن نییە لەماڵ خۆی، بەو مەبەستە ئەسڵییە هاتووە لە چەند شوێندا، یەكێ لەو شوێنانە سورەتی ﴿الكهف﴾ە كە ئەفەرموێ: ﴿ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا .. ﴾ خۆ دیارە ئەم وتەیە لێرەدا هەر بۆ نەبوونی كەم و كوڕی دەست ئەدات، وەك لە ئایەتەكەیشدا دەڵێن: بەڕاستی خوا لەدروستكردنی خەڵكیدا كەم و كوڕی هیچ شتێكی لێنەكردوون لەوەی هۆی ڕێنموونی بێت، وەك گوتمان ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵكو خەڵكی كەم و كوڕی لە خۆیان ئەكەن. بەم ڕەنگە ئەو هۆیانە كە خوا پێی بەخشیون بۆ ڕێنموونیان ئەوان بەكاریان ناهێنن لەوەدا كە مایەی خۆشبەختی هەردوو جیهانیانە، بەڵكو لە دژو پێچەوانەی ئەوەدا بەكاری ئەهێنن، ئەوەی كە بچێتە دڵەوە لە تەفسیری ئەفەرموێ: ئەم ئایەتەدا ئەمەیە كە بەو جۆرە تەفسیر بكرێتەوە، هەرچەندە هەڵیش ئەگرێ مەبەست ئەوەبێت وەك گوتراوە لەلایەن زانایانەوە، خوا بەبێ گوناهو تاوان سزای بەندەكانی نادات و تۆڵەیان لێ ناسێنێ، یان زیاد لە ئەندازی گوناهەكانیان سزایان نادات.

ئینجا دەستكاریەكی دەروون و ویژدانیان ئەكات، بەمەی شێوەیەك لە شێوەكانی ڕۆژی دوایی ئەخاتە بەرچاو كە هەموو ژیانی دنیا بە گەردش و كۆچێكی چەسپان نیشان ئەدات كە خەڵكی بەسەریان بردبێ، ئینجا گەڕابنەوە بۆ جێ و شوێنی ڕاستەقینەو هەمیشەیی خۆیان، ئەو ژیانی دنیا كە هەست و ژیریی خەریك كردبوون، جا لەوێ بۆیان دەرئەكەوێ كە تا چ ئەندازەیەك جەورو ستەمیان لە خۆیان كردووو هەل و هەڵكەوتیان لە دەست خۆیان دەركرد، ئەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ﴾ باسی ئەو كاتە بكە كە خوا، یان بیانترسێنە لەو ڕۆژەی كە خوا هەموویان كۆئەكاتەوە بە زیندوویی و حاڵ و باری ئەو ڕۆژە ئەبینن، بە جۆرێكیان لێ دێ و خۆیان وا ئەبینن ﴿كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ﴾ وەك نەبووبن و نەمابنەوە لە دنیادا مەگەر ماوەی ساتێك، واتە ماوەیەكی زۆر كەم لە ڕۆژ ﴿يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ﴾ كە شناسی بكەن و ناسراوی بكەوێتە نێوانیان، ئینجا لەبیر كردنەوە لە كورتی ئەو ژیانەو بەراورد كردنی لەگەڵ ژیانی پڕ كامەرانی ئەو دنیاوە دەرئەكەوێ لە زیانبازیی و ڕەنجەڕۆیی كە چاو ئەبڕنە هەر ئەم ژیانە كەم و كوڕە پڕ لە داخ و دووەی ئەم دنیا و خۆیان بەش براو ئەكەن لە ژیانی پاك و خاوێنی نەبڕاوەی ئەو دنیا،

﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ٤٥ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ ٤٦ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولٞۖ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمۡ قُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ﴾

---

وەك دەست نیشان ئەكات بەوە كە ئەفەرموێ: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ﴾ بەڕاستی زیانیان كردو زیانبار بوون ئەوانەی كە بڕوایان نەمێنا بەلیقاو گەیشتن بە حوزوری خوا، لەدنیادا ڕێنموونی وەرگر نەبوون تا مردن لەسەر ئەو بارە، خوا پەنامان بدات لەو بەد بەختییە، بەڵێ بەڕاستی ئەوانە زیانباری ڕاستەقینەن‌و هیچ زیان‌و زیانبارییەكی پێناگات، چونكە زیانەكەیان وەك بەش بڕاوییە لە هەموو خۆشبەختیەك، هەروەها نەبڕاوەو دوا نەهاتووە! ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا ڕووی فەرموودە ئەكاتە پێغەمبەر(ﷺ) چەند شتێكی گرنگی نیشان ئەدات‌و ئاڕاستەیان ئەكات، لە یەكەمجارەوە لەبارەی هەڕەشەی خوا لە بێبڕواكان، ئەو هەڕەشەی كەكاتی دیاریی نەركردووەو نازانن كەی دووچاری ئەبن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ﴾ ئەگەر نیشانت بدەین هێندێ لەو سزایە كە هەڕەشەی پێئەكەین لەو بێبڕوایانە، واتە كاتی ژیانی خۆت لەدنیادا بەدی بێت ببینی ﴿أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یان تۆ بمرێنین پێش نیشاندان‌و بەدی هاتنی ﴿فَإِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ﴾ ئەوا گەڕانەوەی ئەوانە هەر بۆ لای ئێمەیە، واتە بە هەر حاڵ‌و لەسەر هەر بار ئەوەی كە هەڕەشەمان پێكردووە لە دنیادا بەدی دێت‌و ڕزگار بوون نابێ لێی، یان مەبەست ئەوەیە سزای ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا داشتێكی بڕیار دراوە، ئیتر سزای دنیا ببێ یان نا، هێندێكی تر ئەفەرموون مەبەست ئەوەیە: ئەگەر نیشانت بدەین ئەوا چاكەو ئاوات‌و مەبەست پێكدێت، یان تۆمان مراندو نیشانمان نەدایت لە دنیادا ئەوا گەڕانەوەیان هەر بۆلای ئێمەیەو سزاو تۆڵەی ڕۆژی دوایی بەدی دێت.

ئینجا ئەم هەواڵەش ئەدات: ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ﴾ ئینجا خوا شایەتە لەسەر ئەوەی ئەوانە ئەیكەن لەپاش تۆ، یان شایەتە لەسەر كردەوەكانتان، كەواتە تۆڵەیان لێ ئەسێنێ بەپێی زانین‌و ئاگاداری خۆی.

كاری ئەم سزایە سزای لەناوبردن‌و لە ڕیشە هێنان لە دنیادا لەم ئایەتەو لە چەند ئایەتێكی تردا باسكردو هەڕەشەی پێكرد، بەڵام بەبێ دیاریی كردنی دان نان بەمەی بەدی

دێت دەربارەی ئەم ئوممەتە، بەڵام دەست نیشانی بۆ کرد لە ئایەتی(٩٣)ی سورەتی(٢٣)دا: ﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴾ بڵێ ئەی پەروەردگارم ئەگەر نیشانم ئەدەیت ئەو سزای کە هەڕەشەیان لێکراوە پێی ﴿ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەی پەروەردگارم نەمگێڕە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ستەمکارە بێبڕوایانە، واتە هەرچۆنێ باوت وابووە لە فروستادەکانی ڕابردوداو ئەوانت جوێ کردووەتەوە خوایش نزاکەی وەرگرت بەمەی فەرمووی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾ نەبووەو کاروباری خوا وا نەبووە کە ئەوانە سزا بدات بەو سزای لەناو بردنە، لەکاتێکدا کە تۆ لەناو ئەوان دا بیت. هۆی ئەو دان نەنان و دیاریی نەکردنەش ترساندنیانە لە هەموو جۆرە هەڕەشەکان، لەگەڵ ئەوەدا خوا ئەزانێ و لەزانیندا تێپەڕی کردووە کە ئەو سزای لەناو بردنە نابێ، چونکە ئەو سزایە بە مەرجێك بووە لە گەلە پێشووەکانداو بە مەرجێك ئەبێت کە گەلەکە داوای موعجیزەیەکی تیبەتی و پەلپی موعجیزەیەکی بوونەوەری بگرن و ئەو موعجیزەش بەدی بێت و گەلەکە هەر سووربن لەسەر بێبڕوایی، دەی ئەم ئوممەتەش ئەوەیان نەکردو داوای ئەوەیان نەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێ لەم ئایەتی(٤٦)ی ئەم سورەتەدا دەست نیشان هەیە بەوەی کە خوا لە پاش هاتنی ئەم ئایەتە هێندێ لەو هەڕەشەیانە نیشانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەدات، پاشان ئەوە بوو بە نزای پێغەمبەر(ﷺ): دووچاری برسێتی و قات و قڕی بوون و خوا زاڵی کرد بەسەریاندا لە یەکەم جەنگدا و لە چەند جەنگی تردا تا پایەتەختەکەی گرتن و ئایینەکەی تەواو کردو خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلام، سوپاس بۆ خوا.

هەموو گەل و ئوممەتێك مۆڵەت دراون هەتا فروستادەکەیان بۆ هاتووە ئەویش ترساندوونی و ئەوەی پێویست بێت لەسەریان بە ڕوونی ڕایگەیاندووە پێیان، ئەو بەڵێنەی کە خوا داوێتی بەدی هاتووە کە سزای هیچ گەل و کۆمەڵێك نەدات هەتا فروستادە نەنێرێ بۆیان، هیچ بڕو بیانوویان نەهێڵێ، ئینجا بەدادو دادپەروەری حوکم و بڕیاری داوە لەنێوان ئەو گەل و فروستادانەدا بە گوێرەی هەڵوێستیان لەگەڵ فروستادەکاندا، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ ﴾ بۆ هەموو گەل و ئوممەتێك نێرراوو فروستادە هەبووە ﴿ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ ﴾ ئینجا کاتێ نێرراوو فروستادەکەیان هاتبێ بۆ لایان ﴿ قُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ﴾ حوکم و بڕیار دراوە لە نێوانیاندا بەدادو هەقیانەت

وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾

﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە هیچ جۆرە ناهەقی و ستەمیان لێ ناكرێ و هیچ كەم و كورپیەكیان لەگەڵ ناكرێ وەك لە پێشەوە باسكرا. ئەم ئایەتە بە جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە: بۆ هەموو ئوممەتێك فروستادەیەك هەیە كە بەناوی ئەو فروستادە ناو ئەبرێن و بە ئوممەتی ئەو دائەنرێن لە ڕۆژی دواییدا، ئینجا كاتێ ئەو فروستادە دێت بۆ ئەوەی شایەتی بدات بۆیان یان بەدژیان و لەسەریان حوكم و بڕیار ئەدرێ لە نێوانیاندا بە هەق و بەداد... هتد، بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ و ڕێكە و ڕواڵەتی ئەم فەرموودەش بەهێزی ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بێبڕوایانی ئەم ئوممەتە ئەڵێن: ئەم بەڵێن و هەڕەشەیە كەی ئەبێت و چ كاتێ بەدی دێت، ئەم فەرموودەیە بە ڕواڵەت ئەم تەفسیری دووەمە بەهێز ئەكات، چونكە ڕووكەشەكەی وا ئەگەیەنێ كە مەبەست بەو بەڵێن و هەڕەشەیە بۆ سزای ئەم دنیایە، لە هەمان كاتدا ئەگونجێ كە ئەم فەرموودەیە سەربەخۆ بێت و پەیوەست نەبێ بە پێشەكەیەوە، بەڵكو ئەیهێنێ بۆ بەرپەرچ دانەوە، بەڵام وەڵامەكەی كە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) ئاڕاستەیانی بكات: ﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: من خاوەنی هیچ زیانێك و هیچ سودێك نیم بۆ خۆم، واتە ناتوانم بەرگری هیچ زیانێك بكەم لە خۆم، ناتوانم هیچ سوود و قازانجێك بگەیەنم بە خۆم چ جای بە ئێوە و بۆ ئێوە، بەڵام ئەوەی خوا مەیلی بووبێت و ویستبێتی بەدی دێت و هەر ئەوە ئەبێ، هێندێ ئەفەرموون من خاوەنی هیچ زیان و سودێك نیم مەگەر ئەوەی كە خوا ویستبێتی ئەمەش ئەگونجێ، بەڵام ڕای یەكەم بەهێزترە و جێ و شوێنەكە داخوازە بۆ ئەوە كە خۆی بەری بكات لە هەموو شتێ، لەسەر هەربار ئەوەی كە بێبڕواكان ئەیانویست و داوایان ئەكرد و پەلەیان پێئەنایەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) ئیتر بەنیازی بەر لێ برینەوە و لاقرتێ كردن یان بە هەر نیازێكی تر، ئەوەش كە بریتی بوو لەمێنان و بەدی هێنانی ئەو بەڵێن و هەڕەشەیە هەر بە دەست خوایە و بەدەست پێغەمبەر(ﷺ) نییە، لێرەدا زیانی پێش خست، چونكە شوێنەكە شوێنی دەربڕینی دەستەپاچەییە لە بەرگری كردنی زیان كە ئەوە ئەوپەڕی دەستەپاچەییە، بێجگە لەوەش ئەوانە پەلەیان ئەنایەوە بە هاتنی زیان، كەواتە لە وەڵام و بەرپەرچ دانەوەدا ئەبێ زیان پێش بخرێ، ئەم جێ و شوێنە داخوازە بۆ ئەوە بەڵام لە

سورەتی ﴿الأعراف﴾دا لەوێنەی ئەم ئایەتەدا نەفعو سوودی پێش خست، چونکە گەیاندنی سوودو قازانج مەبەستێکی گرنگو سەرەکییە بۆ کارو کردەوەی مەردومو شتی گرنگیش ئەبێ پێش بخرێ، لەسەر هەر بار مەبەست لە بێدەسەڵاتییە لەو کارو کردەوانەدا کەلە توانای خەڵکی بەدەرن بۆ وێنە وەك هێنانی سزا بۆ بێبڕواکان و بەخشین و سەرکەوتن و زاڵ کردن بەبڕواداران، ئینجاهەرچۆنێ وهەموو کارو هەموو زیان و سوودێك هەر بەدەست خوایە، هەروەها هەموو شتێك کات و ماوەی دیاریی کراوی خۆی هەیە بەبێ دواو بەر نەبە داواو پەلە نانەوە پێش ئەکەوێ و نەبە هیچ شتێکی تریش پێش ئەکەوێ وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾ بۆ هەموو ئوممەتێك کات و ماوەی دیاریکراو هەیەو بووە، ئەو گەل و ئوممەتانەی کە کۆتاییان نەهێناوە لە بێبڕوایی و گوناهو تاوان بەو شێوەیە ماوەتەوە، بەو شێوەیە ئەوانە کات و ماوە دیاریی کراوەکەیان تەواو نەبووە ﴿إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ﴾ کاتێ کە کاتی دیاریی کراویان بێت و هاتبێ ﴿فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً﴾ ئەوا لێی دوانەکەوتوون و ناکەون ساتێك، واتە کەمترین، ئینجا هەرچۆن دوا ناکەون لەکاتی دیاریی کراوی خۆیان هەروەها پێشیش ناکەون لەو کاتە وەك بەم ڕستە سەربەخۆیە ئەوە ئەگەیەنێ و ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ و پێش ناکەون لێی، ئینجا ئەو ئوممەتانە کە ماوەیان تەواو بووبێ هێندێ بە تەواوی لەناو براون و لە ڕیشە هێنراون، وەك هێندێ لە گەل و ئوممەتەکانی ڕابردوو، هێندێ جار بەشکان و پەرتەوازەیی و زایە بوون، کە ئەوە زۆر ڕووی داوە لەناو گەلاندا، ئیتر بۆ ماوەیەك و لەپاشان هاتبنەوە سەر خۆیان، یان ئێجگاری و بەگەل و ئوممەت نەمابنەوە، هەرچەند بە شێوەی تاکە تاکە مابنەوە، هەموو ئەوانیش بە پێی باوی نەگۆڕاوی خوا، نەك بە ڕێکەوت و گۆترەکاری، ئەو گەل و ئوممەتانەی کە هۆی ژیانیان بەکار هێنابێ، ژیان و مانەتەوە، ئەوانەی کە لایان دابێ و هۆی ژیانیان بەکار نەهێنابێ لاواز بوون یان هەر بە تەواوی لەناو چوون، یان پەرتەوازەو سەر لێ شێواو بوون، ئەوەش بە پێی جیاوازی لادانەکەیان، ئەم ئوممەتی ئیسلامە ژیان و بۆ شتێ کە زیندوویان ئەکاتەوەو ژیانی بەختەوەری و کامەرانیان پێئەدات، جا نەك هەر بەبڕوای ڕووت، بەڵکو بە کردەوەش کە عەقیدەو بڕواکەی بۆ دیاریی کردووە، بە پێی ئەو بەرنامەی کە بۆی داناوە، ئەگینا ئەمیش ماوەکەی دوایی دێت و وەك گەل و ئوممەتەکانی تری بەسەر دێت، بێجگە لە لەناو چوون و لە ڕیشەهێنان،چونکەخوا بڕیاری داوەکەئەم دواترین ئوممەتەبمێنێتەوە تائەم دنیابەسەرئەچێ،

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾

---

ئینجا دەست کاریەکی تری دەروونیان ئەکات، بەمەی لە هەڵوێستی لاقرتی کردنەوە بۆ هەڵوێستی هەڕەشە لێکراوێکی وا کە هەمیشە بە شەوو بە ڕۆژ لە مەترسیدا بژین، لە سزاو بەسەرهاتی سەخت، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ﴾ ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ بەوانە: پێم بڵێن و هەواڵم بدەنێ ئەگەر سزای خوا هات بۆتان ﴿بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا﴾ لەشەوداو لەکاتی بێکاری و بێئاگاییدا، یان لە ڕۆژو لەکاتی خەریکی بوون و کردەوەدا، واتە ئەو سزاتان بۆ بێت کە پەلەی پێئەنێتەوە سزا هەمووی ناخۆشەو خۆشی تێدانییە، ئەگەر ئەو سزایان بدرێت ﴿مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ ئایا بێبڕوا تاوانبارەکان لەکام لەو سزایانە پەلە ئەنێنەوە؟ واتە پەلە نانەوە بە هاتنی سزا ئەوپەڕی نەفامی و نادانییە. لەم کاتەدا بەو پرسیارە ئەیانخاتە بیم و ترس، بەپێی باوی قورئان ئەو سزایە ئەخاتە بەرچاوو سەرنجی بۆ ڕائەکێشێ وەك ئێستا کاتی بەدی هاتنی ئەو سزایە بێت کە لە ڕۆژی دواییدا بەدی دێت، ئەفەرموێ: ﴿أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ﴾ ئایا لەپاش ئەوەی ئەو سزایە ڕوویداو بەدی هات ئێوە بڕوای پێئەهێنن، واتە تازە کاتی بڕوا هێنان نەماو هیچ سوودێکی لێ وەرناگرن و پێتان ئەگوترێ: ﴿ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ ئایا ئێستا بڕوای پێئەهێنن لەکاتێکدا لەدنیادا کە کاتی بڕوا هێنان بوو ئێوە بە ڕاستتان نەئەزانی و بە لاقرتی و خۆ بەزل زانین پەلەتان پێ ئەنایەوە؟ ﴿ثُمَّ قِيلَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئەگوترێ ﴿لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ بەوانەی کە ستەمیانکرد لە خۆیان: ﴿ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ﴾ بچەژن سزای ماوەی نەبڕاوە بە هەمیشەیی ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ ئایائێوە تۆڵەتان لێ ئەسێنرێ مەگەر بە هۆی ئەوەی ئێوە ئەتانکردو بەردەوام بوون لەسەری لەوبێبڕواییەجۆربەجۆرەی کەئەوپەلە نانەوەتان لە لاقرتییەوە بە شێك بوو لەوانە.

﴿ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ

ئا بەو جۆرو شێوەیە دڵو دەروون ئەگوێزێتەوە لەم دنیاوە بۆ مەیدانی حیسابو پرسیارو سزای ڕۆژی دوایی! هێندێ لە بێبڕواکان لە گوماندا بوونو دڵنیا نەبوون لە ناڕاستی هەڕەشەو هەواڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بێبڕواییيەی کە دەریان ئەبڕی لەبەر لاریو سەرکێشی بوو، یان بە شوێن کەوتنێکی کوێرانە، جا دەربارەی ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ﴾ ئەی پێغەمبەر داوات لێ ئەکەن کە هەواڵیان پێ بدەیت لەبارەی ئەو سزای کە ئەیانترسێنێو هەڕەشەیان لێ ئەکەیت پێی، بەم ڕەنگە ئەڵێن: ﴿أَحَقٌّ هُوَ﴾ ئایا ڕاستە ئەو سزایەو بەدی دێت؟ ﴿قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ﴾ بڵێ پێیان: بەڵێ ڕاستە سوێند بە پەروەردگارم ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ بێگومان ئێوە نین بەدەستەپاچەکەرو پەك خەرو بەرگری کەر لەهاتنی ئەو سزایەو ئێوە لەدەستی تووڕەیی خوا دەرناچن. لەم کاتەدا کە ئەوانە وان لەم زەویو جیهانەداو داوای هەواڵو وەڵام ئەکەن. لەم کاتەدا کتو پڕ ئەمانباتە سەر پرسیار، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ﴾ ئەگەر هەرچی وا لەزەویو جیهاندا هینی هەرکەسێك بێت کە ستەمی کردبێ لەدنیادا فیداکاری پێئەکاتو هەموو ئەدات لە ڕێی ڕزگار بوونی خۆی لەسزای ئەو ڕۆژە لە بۆی دانراوە! جا وەرە خەیاڵ بهاوێژەو بیربکەرەوە لەم زەوییە پانو فراوانەو لەو هەموو شتە جۆر بە جۆرە بەنرخەی کە خوا دروستی کردووە لەم زەوییەدا کە هێشتا زۆر زۆری ئێمە پێی نازانینو بەرە بەرە دەرئەکەون، ئەو هەموو شتە بە نرخو دڵڕفێنانەی کەلە دنیادا لەسەر هێندێکی زۆر کەمی ئەو هەموو جەنگو کوشتارو فیداکاریەی لەسەرئەکرێ، خەیاڵ بهاوێژەو بیربکەرەوە کە هەموو بەجارێ هینی کەسێك بێت لەو ستەمکارانەو ئینجا بگونجێ فیداکاری لەو ڕۆژەدا پێی هەرکام لەو ستەمکارانە بە سۆزو خۆشبەختی ئامادەیە بۆ فیداکاریو دەست هەڵگرتن لەو هەمووە لەڕێی ڕزگار بوونی لە سزای ئەو ڕۆژە. بیر لەوەبکەرەوە تا بۆت دەرئەکەوێ ڕادەو پلەی سەختی ئەو سزایە!! پەنا

ئەگرین بە خوا، کە میهرەبانی خۆی ڕزگارمان بکات. ئایا مەبەست بەو ستەمە ستەمی هەرە گەورەیە کە بریتییە لە بێبڕوایی، یان هەر ستەمێکی تریش! هەرچەند زۆر تر لەزمانی قورئاندا مەبەست بەو وتەیە هەرە گەورەکەیانە، بەڵام لە ڕاستیدا هەرکەس لەو ڕۆژەدا ئەو ئاگری دۆزەخەببینێ و ئامادەکراوبێ بۆی بێگومان ئامادەیە بە سۆزو پەرۆشەوە بۆ ئەو فیداکاریە، کەواتە لەدڵدا ڕای ئەوانە لەدڵدا ڕای ئەوانە پەسندە کە بە شێوەی گشتی ئەو ستەمە ئەگرن، ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ ئەو ستەمکارانە پەشیمانی و داخ و خەفەتی خۆیان لەو ڕۆژەدا ئەشارنەوەو دەری نابڕن کاتێك کە ئەو سزایە ئەبینن، واتە نیشانەکانی پەشیمانی و غەم و خەفەت، وەك گریان و هاوارو قەپ کردن بەدەستی خۆیاندا، واتە نیشانە دەرنابڕن لەبەر بێهۆشی و سەرگەردانیەك کە ڕوویان تێئەکات لەبینینی ئەو سزایە، یان مەبەست سەرۆکەکانە کە مات و بێدەنگ ئەبن لەبەر ڕیسوایی و خەجاڵەتی خۆیان لەئاستی ژێر دەستەکان کە شوێنی ئەمان کەوتن و دووچار بوون، لەترسی تانەو تەشەری ئەوان، هێندێ ئەفەرموون: واتەی(أسرّة) بەکار ئەهێنرێ لەزمانی عەرەبدا بۆ هەردوو شاردنەوەو دەربڕین و لێرەدا مەبەست دەربڕینە، کەواتە بەم جۆرەش ئەگونجێ و دەست ئەدات، بەڵام زۆر تر بۆ شاردنەوە بەکار ئەهێنرێ و کە گوترا دڵ بۆ ئەوە زیاتر ئەڕوا، کەواتە هیچ پێویست نییە لادەین لەوەی کە باشتر ئەچێتە دڵەوە ﴿وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾ حوکم و بڕیار ئەدرێ لەنێوان ئەوانەدا بەدادو بەڕاستی بەم ڕەنگە هەرکام شایستە بێت بۆ هەر جۆرە سزایەك بەو جۆرەی لەگەڵ ئەکرێ ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە بە هیچ ڕەنگ ناهەقیان لەگەڵ ناکرێ.

ئینجا بەدوای باسی بەڵێن و هەڕەشەکاندا، گەردشێك ئەکات بەدڵ و دەروون بەناو ئاسمانەکان و زەویداو مردن و ژیان و زیندوو بوونەوە تا بیر بکەێتەوە لەو دەسەڵاتە بیسنوورەی خواو بەهۆی ئەوەوە بڕوا بەهێزو پتەو ببێ بەو بەڵێن و هەڕەشەیانەی کەلە لایەن خواوە هاتووە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بێدار بنەوە بە ڕاستی و بێگومان کەهەر خوایەو موڵکی خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەویدا، واتە ئەم بوونەوەرەو هەرچی لەم بوونەوەرەدایە کە مەگەر داهێنەرەکەی بیزانێ و بیناسێ.

﴿أَلَآ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٥٥ هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٥٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾

**باسی ئەم بوونەوەرە لە قورئاندا زۆر زۆر هاتووەو لە هەر شوێنێكدا مەبەستێكی تایبەتی هەیە لەو باسە، لێرەدا وەك دەست نیشانمان كرد، مەبەست نیشانەو ڕابەرو بەڵگەیە لەسەر ڕاستی بەڵێنو هەڕەشەكانی خوا، لەبەر ئەو مەبەستە ئەیهێنێ بە دوای داو ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ﴾ بێدار بنەوە ﴿إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ﴾ بەڕاستی بەڵێنو هەڕەشەكانی خوا هەقو ڕاستە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئەوانە ـ واتە بێبڕواكان ـ نەزانو نەفامن، نەبە تێڕوانینو بیركردنەوەی خۆیانو نەلەڕێگای پەیڕەوی كردنی پێغەمبەرانەوە زانا نابن بە كاروباری ڕۆژی دواییو ﴿هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾ هەر خوا گیان ئەدات. بەبێ گیان و گیان ئەسێنێ لە گیاندار و زیندەوەران، ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ هەر بۆ لای ئەو ئەگێڕێنرێنەوە بە زیندوویی لە ڕۆژی دواییدا، بێگومان هەركەس بێبەش نەبێ لە هەموو فامو ژیرییەك ئەزانێ هەر خوا گیان ئەداتو گیان ئەسێنێ دەی ئەبێ بڕوا بێنێو بزانێ كە ئەو كەسەی كە گیان ئەداتو گیان ئەسێنێ ئەبێ بتوانێ گیان دووبارە بداتەوە لە پاش لێ سەندنەوەی، هەرچۆنێ لە یەكەمجارەوە گیانی پێدا، خوا پەنامان بدات لە نەفامیو نەزانی آمین. ئینجا بانگ كردنێكی گشتی ئاڕاستە ئەكات بۆ هاتنی هەمووان بۆلای قورئانو بەپیرەوە چوونی قورئان، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی بە تێكڕایی ﴿قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ بەڕاستی هاتووە بۆتان ئامۆژگاریەكی گەورەو گرنگ لەلایەن پەروەردگارتانەوە، واتە ئەم قورئان كە دواترینو تێرو تەواوترین بەرنامەی خوایە بۆ جیهانو جیهانیان هەتا ڕۆژی دواییو هەتا هەتایە، لێرەدا چوار سیفەتی باسكردووە بۆی:**

١- ئامۆژگاریو بیرخستنەوەی هەر شتێ کە دڵ نەرم ئەکاتو پاڵی پێوە ئەنێ بۆ کردنی چاکەو خۆپارێزی لە خراپە، بێگومان بەوە ڕووکەشو ڕواڵەتو کردەوە ئاشکراکان پاکو خاوێن ئەبن.

٢- ﴿وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ﴾ شیفاو دەرمان هۆی پاکو خاوێن کردنە لەو هەموو دەردو نەخۆشیە دەروونیانە کە نەخۆشی گەورەو سەرچاوەی هەموو نەخۆشیەکانی تری دەروونی بریتییە لە بێبڕواییو بەد عەقیدەیی، دەی دیارە کە قورئان بیروباوەڕو ڕاستو پاکو خاوێنی دیارییکردووەو داینـاوەو بێجگە لەوە هیچ بیروباوەڕو عەقیدەیەکی تر وەرناگرێ، پێویستی کرووە پاک کردنەوەی دڵو دەروون لە هەر سیفەتێکی بەدو ڕازاندنەوەی بە هەموو ئەو سیفەتە شیرینانە کەلە قورئانو کردارو وتارو ڕەوشتی پێغەمبەردا(ﷺ) هەن.

٣- ﴿وَهُدًى﴾ ڕێنمـوونیو ڕێ نیشاندانە بۆ هەمووان، یان گەیاندنو خستنە سەر ڕێی ڕاستە بۆ ئەوانەی کە بڕوادارن یان ئامادەبن بۆ بڕواهێنان.

٤- ﴿وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەزەییو میهرەبانییە بۆ بڕواداران.

هەرچەندە قورئان بۆ میهرەبانی هاتووە بۆ هەمووانو بۆ هەموو جیهانو جیهانیان، بەڵام لەڕاستیدا بەرو بەرهەمی میهرەبانی ڕاستەقینەی هەر بۆ بڕوادارانەو تایبەتییە بەوانەوە، بێگومان قورئان هۆی ئامۆژگاریو شیفاو ڕێنموونیو میهرەبانییە، بەڵام ئەوەندە هۆیەکی بەهێزە وەک ئەوانە بێت وایە لەبەر ئەوە ناوی بەوانە براوە، ئەوەش شتێکی باوە لە زمانی عەرەبو لە ڕەوانبێژییدا. بەڵێ بەڕاستی ئەم قورئانە بە ئامۆژگاریەکانی دڵو دەروون زیندوو ئەکاتەوە، شیفای ئەدات لەشتی پڕو پووچ کە ڕووی تێئەکات، لەگومانو دوودڵی کە زاڵ ئەبێ بەسەر دڵو دەروونـدا، لەلادانو ترازان کە نەخۆشی ئەخات، لەبێ ئارامی کە سەرگەردانی ئەکات، ئەم قورئانە هات بۆ ئەوە شیفاو ڕزگاربوون برژێنێ بەسەر خەڵکیدا، بڕواو ئارامیو ئاشتی ببارێنێ بەسەریاندا.

قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٥٨﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ

﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: هەر بەهۆی بەهرەو چاکەو میهرەبانی خوا ﴿فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ﴾ هەر بەهۆی ئەوەی کە باسکرا دەی با ئەوانە خۆشنوودو کەیف خۆش بن، واتە هەر ئەوە شایستەیە بۆ خۆشنوودیو کەیف خۆشی، نەك ماڵو سامانو شتو مەکی ئەم دنیا گڕو فڕێکەو دێتو دەچێت ﴿هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ﴾ ئەوەی لای خوایە چاکترە لەوەی لای ئەوانەو کۆی ئەکەنەوە لە شتو مەکی ئەم دنیایە.

ئەو دوو وتەیە بە چەند شتێك تەفسیر کراونەتەوە، هەرکام ئەگونجێو ڕیوایەتیشیان پێهاتووە، بەڵام بەپێی جێو شوێنەکە باشتر ئەوەیە کە مەبەست بە(فضل) یارمەتیدانو تەوفیقی خوایە بۆ پاكو خاوێن کردنی دڵو دەروونو شیفاو ڕێنموونی قورئان، مەبەست بە(رحمة) بەرو بەرهەمی ئەو میهرەبانییە یە کە خوا بەخشی بەم ئوممەتەو پێی جوێ بوونەوە لە هەموو ئوممەتەکانی تر، بە هەر حاڵو لەسەر هەر بار ئەوەی لای خوا چاکەو چاکترە لە هەموو ئەوەی کە خەڵکی کۆی ئەکەنەوە لەم ژیانی دنیادا، کە چاکترە هەر لەبەر ئەوەی نییە کە ئەمەی ئەم جیهانە نامێنێو دوایی هاتووەو ئەوەی ڕۆژی دوایی هەر ئەو ئەمێنێو دوایی نایەت، هەر لەبەر ئەوە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئەو بەهرەو میهرەبانییەی لای خوا خۆشبەختی هەردوو جیهانی تێدایە، ئەوەتا موسڵمانان دەستیان گرت هەر بە ئیسلامەکەیانەوە قاپی خێرو بێری دنیاشیان لێکرایەوەو هەموو گەلو ئوممەتەکانی تر چاوەڕوانی ئەمان بوون! کاتێ دەستیان لە ئیسلامەکەیان بەردا کارەکەیان پێچەوانە بووەیەوەو ڕێگەی ئەم ئوممەتە ڕوونو ئاشکرایە، ڕێگەی ئەم ئوممەتە تەنها لەوەدایە کەئەم قورئانە بۆی داناوەو نەخشەی کێشاوە لە ڕێبازەدایە کە یەکەم چینی ئەم ئوممەتە دایانە بەر، هەر ئەوە ڕێگەی ئەم ئوممەتەیە، شتو مەکی ماددیو ئەو شتانەی کە لەجیهانی ماددەدا بەنرخن، ئەوانە ڕادەو پلەی خەڵکی دیاریی ناکەن لەم جیهانو زەوییەدا، لەم ژیانو جیهانەدا چ جای ئەو جیهانو ڕادەو پلە یان لە ژیانو جیهانی دواییەدا، بەڕاستی بە پێچەوانەوە شتو مەکی ماددیو ئەو شتانەی کەلە جیهانی ماددەدا بەنرخن، لەوانەیە ببن بە هۆی سەرلێ شێوانو بەدبەختی نەك هەر بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵکو لەم ژیانی دنیاشدا، ئەوە شتێکی ئاشکرایە لەم شارستانییە ماددییەی ئەمڕۆدا!

ئەو ڕەنامەی کە حاکم بێت لەهەر وڵاتێکدا هەر ئەوە نرخ دائەنێ و دیاریی ئەکات بۆ شت و مەکی ماددی لە ژیانی خەڵکیدا، هەر ئەو شت و مەکە ئەگێڕێ بەهۆی کامەرانی و خۆش بەختی، یان هۆی سەر لێ شێوان و بەد بەختی، هەرچۆنێ ئەیگێڕێ بە هۆی پێشکەوتن و بەرزی ئادەمێتی یان دواکەوتن و پەست و هەڵخلیسکان بۆ ناو چاڵی بەدبەختی، جا لەبەر ئەوەیە ئەوەندە بە گرنگ گیراوە باسی و نرخ و سوودی ئەم ئایینە لەژیانی بڕوادارانی ئەم ئایینە وەك دەست نیشانی کرد بۆ ئەم مەبەستە لەم ئایەتەدا کە خەریکین پێیەوە و ئەژین لەسایەیدا.

ئەو کەسانەی کە هەوڵ و کۆششیان هەر بۆ نرخ دانە بەشت و مەکی ماددی و بەرهەمی ماددی، گوێیان نییە لە ئاین و شتە بە نرخەکانی ئایینی، لەڕاستیدا ئەوانە دژو دوژمنی ئادەمی و ئادەمێتین و ئەیانەوێ ئادەمی لە ڕادەو پلەی ئاژەڵ و چوار پێ بەرزتر نەبنەوە! ئەوانە بەبێ مەبەست و ئامانج ئەوە ناکەن بەڵکو مەبەستی سەرەکی بەدی خۆیان هەیە. مەبەستی بەدیان ئەوەیە کە بڕواو عەقیدەی ئاسمان نەمێڵن و شت و مەکی ماددی بگێڕن بە بتێکی پەرستراو لەباتی خواو هەر شتێکی ترو هەر بیروباوەڕێکی تری ئاسمانی و هەر ڕەوشت و کرداری شیرینی ئادەمێتی دەست پێوە بنێن و لە پێناوی ئەو تەنیا بتەدا!

لەم کاتەدا کە ئەم ئایەتە دڵی بڕوادارانی بەستەوە هەر بە فەزڵ و ڕەحمەتی خواوە، لەم کاتەدا دەست نیشان ئەکات و پلار ئەوەشتێنێ لە نەفامان کە ئەیانەوێ کارو کردەوەو بیرو باوەڕی خۆیان بە گوێرەی ئەوە نەبێ کە لەلایەن خواوە هاتووە، بەڵکو بەگوێرەی ئارەزوو و بۆچوونی خەڵکی بێت، ئەمە لە بارێکەوە، لەبارێکی تریشەوە لە مەوپێش ئەو هەموو بەڵگەی هێنایەوە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی(ﷺ) لەسەر ناڕاستی و بێ جێیی بێ بڕوایی و گومانی بێبڕواکان. ئینجا لێرەدا باسی لاری و ناڕاستی بڕیارەکانیان ئەکات کە بەدەم درۆ لە خۆیانەوە بڕیاری حەرام و حەڵاڵ دەرئەکەون. بەکورتی ئەوانە بۆچوون و مەزهەبیان ناڕاستە چ لەبارەی بیروباوەڕەوە، چ لەبارەی حوکم و بڕیارەکانیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ﴾ بڵێ بەو بێبڕوایانە: ﴿أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ﴾ هەواڵم بدەنێ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان نییە بە فروستادەو شەریعەتی خوا پێم بڵێن: ئایا ئەوەی کە خوا هێناویەتییە خوارەوە بۆتان ڕشتوویەتی بەسەرتاندا بەو هەروەها ڕزق و ڕۆزیەی کە پێی ئەژین و حەڵاڵی کردووە بۆتان و هەر ئەویش ماف حەڵاڵ و حەرام کردنی هەیە،

فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ

---

﴿فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا﴾ ئینجا ئێوە گێڕاوتانە لەوە حەرامو حەڵاڵ، واتە ئەوەی کە خوا بەخشیویەتی پێتانو حەڵاڵی کردووە ئێوە بەش بەشی ئەکەن بەم ڕەنگە هێندێ حەرام ئەکەنو هێندێ حەڵاڵ وەك لە سورەتی ﴿المائدة﴾و ﴿الأنعام﴾دا بەدرێژیی باسکرا، واتە کارو بڕیارەکەتان ناڕاستو بەدو بێ‌جێیە، چونکە ئەو ڕۆزیانە هینی خوایە بە تەنیاو مافی ئێوەی پێوە نییە، ئەو حەڵاڵی کردووە بۆتان، دەی ئایا بەچی ئێوە ئەو بڕیارە ئەدەنو هێندێکی حەرام ئەکەن؟ ﴿قُلْ﴾ بڵێ: ﴿ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ﴾ ئایا خوا ئیزنی داوە پێتان لە حەرامکردنی هێندێو حەڵاڵکردنی هێندێکی تر؟ ﴿أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾ یان بەدەست قسە بە دەم خواوە درۆ هەڵدەبەستنو درۆی خۆتان ئەسەپێنن بەسەر خوادا؟ واتە هیچ چارەتان نییە ئەبێ دان بنێن بە یەکێ لەم دووبارە: ئیزنی خوا یان دەست هەڵبەست کردنی خۆیان، دیارە نابێ لافی ئیزن لێبدەن، چونکە ئێوە بڕواتان بە پەیامو وەحی نییەو زۆر بە توندی ئینکاری ئەکەن، کەواتە ئەبێ درۆتان کردبێ بەدەم خواوە، دەی ﴿وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئایا ئەوانەی کە درۆ دەست هەڵبەست ئەکەن بەدەم خواوە، ئایا ئەبێ گومانی ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا چییە؟ ئایا ئەوانە لایان وابێ لەو ڕۆژەدا قوتار ئەبن بەبێ سزاو تۆڵە؟ نەخێر شتی وا نابێو ئەوانە سزاو تۆڵەی سەخت ئەدرێن لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە. بەڕاستی پرسیارێکی سەختی دڵ تەزێنەو ئەبێ هیچکەس خۆی بۆ نەگیرێ بەرامبەری، لەگەڵ ئەو هەموو لاریو نالەبارییەی کە زۆر لە ئادەمیزاد لەسەریەتی خوا قاپی میهرەبانی خۆی کردووەتەوە لەبەندەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا زۆربەیان سوپاسی ناکەنو لەسەر

ناسوپاسی و سپڵەیی بەردەوامن وەك دەست نیشان ئەكات بەم فەرموودەی كە كۆتایی باسەكەی پێ دێنێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بە ڕاستی و بێگومان خوا خاوەنی فەزڵ و بەهرەیە بەسەر خەڵكیەوە، ئەوەتا ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی بە لێشاو ڕشتووە بەسەریاندا، قاپی میهرەبانی خۆی خستووەتە سەر پشت بەمەی ئەو بەرنامەی بۆ ناردوون كە ڕێنموونی و شیفای تێدایە، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەو بەرنامەوە خۆشبەختی هەردوو جیهان وەرگرن و بگەن بە پلەی هەرە بەرزی ئادەمێتی ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بەلام زۆربەی خەڵكی سوپاس ناكەن و سپڵەن بەرامبەر ئەو فەزڵ و چاكە و میهرەبانییە، ئەوەتا لائەدەن لەو بەرنامە ڕاستە، هاوبەشی ڕەوا ئەدەن بۆ پەروەردگاری تاك و تەنیای میهرەبانیان.

لەپاش ئەوەی هەموو كەس و خەڵكی ئاگادار كرد بە فەزڵ و چاكە و میهرەبانی خۆی بەسەریانەوە، بەمەی پێویستە لەسەریان سوپاس و چاولەبەربن بۆ پەروەردگاریان لەپاش ئەوە ئینجا ئامۆژگاریان ئەكات بە ئاگاداری و چاودێری و ڕەقابەی تێر و تەواوی بۆ خۆیان و هەموو كار و كردەوەكانیان كە خەریكن پێیانەوە و بە ون نەبوونی هیچ شتێ لە ئاسمان و زەویدا لەزنینی ئەوەوە بۆ ئەو مەبەستە لە پێغەمبەری ئازیزەوە(ﷺ) دەست پێ ئەكات و بێگومان لەوەدا دڵنەوایی و ئارام دانێكی گرنگی تێدایە بەخۆی و یارەكانی و بڕواداران، بەمەی هەمیشە وان لە ژێر چاودێریی و خاوەن دارای خوای خۆیاندا، كەواتە با باكیان نەبێ لە بێبڕوا و دوژمنان ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٍ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆنیت لە هیچ كارێ لە كارە گرنگەكانتدا چ تایبەتی بە خۆتەوە و چ گشتی كە چارەسەری كاری ئوممەت بكەیت ﴿وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٍ﴾ هیچ قورئانێك ناخوێنی لەبەر هیچ كارێكت و لەبارەی هیچ كارێكتەوە ﴿وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ﴾ ئێوە هەمووتان ـ ئەی بەندەكانی خوا ـ هیچ كردەوەیەك ناكەن لە هەر بارێكەوە،

إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾

﴿إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ﴾ مەگەر ئێمە شایەت و ئامادەو ئاگادارو چاوێرین بەسەرتانەوە لەو کاتەدا کەدەستی پێئەکەن و خەریکین پێیەوەو ڕانەپەڕن بۆی، واتە ئەی پێغەمبەر تۆ خەریکی هەر کارێك بیت و هەر قورئانێك بخوێنی لەو بارەیەوە ئێوەش ئەی هەموو بەندەکان هەر کارو کردەوەیەك بکەن و خەریك بن پێیەوە ئێمە شایەت و چاودێرو زانایین بە هەمووی! بەڕاستی ئەم فەرموودەیە لەلایکەوە ئارام دەرەو لەلایەکی ترەوە ترسێنەرە، لەلایەکەوە خۆشی و ئولفەت دەرەو لەبارێکی ترەوە دەرکەرو ڕاقرێنەرە. بابیربکرێتەوە: ئەم ئادەمییە کە لاوازو بێ دەستەو هیچ کارێکی خۆیشی بەدەست نییە ئەبێ چی بێت و چۆن بێت کاتێ کە کردەوەیەك ئەکات و خەریك ئەبێت بەکاری خۆیەوە، لە کاتێکدا هەست بکات بەمەی خوا بەو هەموو گەورەیی و دەسەلاتەوە کە داهێنەرو پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەیە، ئەو خوایە کە ئەم بوونەوەرە هەمیشە ئەلەرزێ لەسام و بیمیدا، ئەو خوایە هەمیشە ئاگا و زانایە بە هەموو نیازو نیەت و کارو کردەوەی ئەم گیانلەبەرە بچووکە، چاوی قودرەتی لە هەموو کاروباریەتی، دەی ئەم گیانلەبەرە بچووکە بێ دەسەلاتە ئەگەر هۆشی بەلای خۆی بێت ئەبێ چۆن سام و بیم نەیگرێ بە وێنەی ئەم ئایەتە؟ ئەی چۆن زاتی ببێ شتێ بکات کە ئەو پێی ڕازی نەبێ؟ بێگومان هەر کاتێ لەسەر هۆش بێت و ئەو ئاگاداریی و دیتنەی خوای لە یاد بێت هەرگیز زاتی نابێ خەتەرەی هیچ شتێکی بکات کەمۆی خەشم و ناڕەزایی ئەو بێت، بێگومان بڕوادار بەبێ هۆشی و نەفامی کاری بەد ئەکات، خوا بە میهرەبانی خۆی ئەو هەست و هۆشەمان تێدا دروست بکات، آمین. بەڵێ ئەم ئایەتەو وێنەی ئەم ئایەتە هەرچۆنێ دڵی بێدار ئەخاتە سام و بیرو لەرزە، هەروەها لەلایەکی تریشەوە دڵی بڕوادار ئەخاتە خۆشی و کامەرانی و کەشخە کەبیر ئەکاتەوە لەوە ئەم گیان لەبەرە هەرگیز تەنیا نییەو وازی لێ نەهێنراوە بەبێ یارمەتی دەرو چاودێریی و خاوەنداری هەمیشەیی خوای لەگەڵە. زانین و چاودێریی و خاوەنێتی خوا گشتییە بۆ هەموو شتێك لەم

بوونەوەرەدا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ئاوا نابێ و ون نابێ لە پەروەردگارت بە ئەندازەی کێش و قورسی زەڕەیەك نە لە زەوی لای خوار، نەلە ئاسمان و لای سەروو، واتە بچوکترین شت کە ببێ لەم بوونەوەرەدا لەزانینی خوادا هەیەو هیچی لێ ون نابێ، وتەی زەڕە بۆ چەند شتێك بەکار هێنراوەو ئەمێنرێ:

١- مێروولەیەك بەحاڵ بەرچاو ئەکەوێ.

٢- ئەو وردیلکانەی کە نابینرێن، مەگەر لەبەر ڕووناکی خۆر کەلە کون و کلاو ڕۆژنەوە دێتە ناو ماڵ.

٣- لەم چەرخی تازەدا بە ئەتۆم ئەڵێن کەلەم دواییەدا دەرکەوت بۆ زانایانی تازە.

هەریەك لەمانە بگیرێ ـ وەك وتمان ـ وێنەو نموونەیە بۆ بچووکترین شت، جا بەپێی ئەوە ئێستا واتای سێیەمی لێ بگیرێ ڕێك ترە، چونکە شوێنەکە شوێنی زیادە ڕەوی و مبالەغەیە، بێجگە لەوەش لەسەر ئەم بارە ئەبێ بە موعجیزەو هەواڵدان بە شتێ کەبە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە تا ئەم دواییە کە دۆزرایەوەو پێی زانرا، وەك لەم ڕستە سەربەخۆشدا دەست نیشان ئەکات موعجیزەیەکی تر کە ڕێی پێبرا لەپاش پارە کردنی ئەتۆم کەلە پێشەوە خۆی زانراو دۆزرایەوە، ئینجا لە پاشان پارە کردنەکەش زانرا، هیچ دوور نییە لەم ڕستەیەوە ڕێ برابێ بەو پارە کردنە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ نە بچووکتر لەو زەڕەو نە گەورەتر نییە مەگەر یەکسەر هەمووی زانراوە لای خواو ژمارە کراوە لە نامەیەکی بڵندی پایە بەرزو ئاشکراو ڕووندا، کە هەموو شتێ تێدایەو لەزمانی شەرعدا بە ناو بانگە بە:(لوح المحفوظ) ئینجا ڕەوە ئەی هەرکەسێك هەی، وەرە خەیاڵ بهاوێژەو بیر بکەرەوە لەو هەموو وردیلەو ئەتۆم و بچوکتر لە ئەتۆم لەم زەوی ئاسمانەدا، لەکاتێکدا کە زانین و چاودێری و سەرپەرشتی خوای لەگەڵەو هەموو ڕاوەستاوەو ڕاگیراوە، هەر دەروون و ویژدانێك کە بێدار بێت ئەبێ بکەوێتە لەرزەو بیم، هەر دڵێك هۆشدار بێت ئەبێ بکەوێتە ئەوپەڕی بەندەیی و ملکەچی و سام و ترس بیگرێ مەگەر بڕوای بەهێز ئارامی پێبدات و بیهێنێتەوە سەر خۆی بە هۆی هەستکردن بە میهرەبانی و نزیکی لە خواوە، بڕوا بە گەورەیی و ئاگاداری و چاودێریی خوا هەرچۆنێ سام و بیم و دڵە لەرزە فەراهەم ئەهێنێ هەروەها ئارامی و ئاسایشیش ئەدات،

﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾

---

وەك لەم مژدەو چاڕدانەدا دڵ پاراو ئەكاتەوە بەو چاكەو بەهرەیەو ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ بێدار بن لە دۆستەكانی خواو نزیكەكان لێیەوە مەترسیان لەسەر نییە، ئەوانە غەمبار نابن لەوەی مەبەستێكیان لە دەست دەرچێ، چۆن مەبەستی ئەكەن یان غەمبار ئەبن لەكاتێكدا كە خوایان لەگەڵە لە هەموو كارو كردەوەیەكیاندا، لە هەموو بزووتنەوەو وەستانێكدا، چۆن غەمبار ئەبن لەكاتێكدا ئەوان دۆستی خوان و پەیوەندیو پەیوەستیان هەیە بە خواوە واتە لە خۆشی ئەو پەیوەندیو پەیوەستیەوە باكیان لەهیچ شتێكی ناخۆشی نییەو غەمبار نابن بۆ هیچ شتێ كەلە دەستیان دەرچێ، مەبەست ئەوە نییە كە ئیتر غەم ڕوویان تێناكات یان لە هیچ شتێك ناترسن و غەم بۆ هیچ شتێك ناخۆن، چونكە ئەوان ترسیان لە خوا بەتین ترە لە خەڵكی و غەمبار ئەبن لەسەر هەر كەم و كوڕیەك بەرامبەر بە خوا، ئەمە لەدنیادا، لە ڕۆژی دوایشدا ترس و غەمیان نییە لەپاش ئەوەی بۆیان دەرئەكەوێ نزیكییان لە خواو سەعادەت مەندیان.

ئەو دۆستانی خوا ئەمانەن: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ كەسانێك كە بڕوایان هێناوە هەمیشە لە خوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لە هەر شتێ كە پێویستە خۆپارێزی لێی، بە پێی فەرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) واتە ئەوانەن كە بڕوای ڕاستەقینەیان هێناوە، خۆ پارێزن بەڕاستی، بڕواش ئەوەیە كە جێگیرو دامەزراوبێت لەدڵداو بە كردەوە دەركەوێ و كردەوە نیشانە بێت لەسەر بوون و دامەزراوی ئەو بڕوایە، كردەوەش بریتییە لە هەڵسان بەوەی خوا فەرمانی پێداوە، دوور كەوتنەوە لەوەی جڵەوگیریی لێكردووە، ئەبێ هەر بەم جۆرە تێبگەین لەدۆستەكانی خواو بەو شێوەیە بیانناسن، نەك بەو جۆرو شێوە ناڕاست و ناڕەوایە كە بەناو بانگە لەناو نەفام و نەزانەكاندا وەریان گرتووەو پێی گەیشتوون كە بریتییە لە كەسانێكی گێلی دوورە پەرێزو بێباوەڕەكانی ئاگا لەبەسەرهات و كاروباری خەڵكی و هەقیان بەسەر هیچ شتێكەوە نییە، بەڵكو ئەوانە كەسانێكی زیریی چالاكن و ئەیانەوێ ژیان ببنەسەرو ژیانی خەڵكیش ڕێك و پێك بكەن بەپێی بەرنامەی خواو هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی لەسەر ئەو بەرنامەیە جڵەوی ژیان بگرنە دەست،

لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾

---

ئەوانە: ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ هەر بۆ ئەوان هەیە موژدە لە ژیانی دنیاداو لە ژیانی ڕۆژی دواییدا، لە زۆر ڕیوایەتدا موژدەی ژیانی دنیا بریتییە لە خەوێکی موژدەدەری چاك كە ئەبینرێ پێیەوە یاخۆی ببیینێ، موژدەی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە لەكاتی مرداندا پێی ئەگوترێ: خوا لێت بوردووەو لەو كەسەش كە هەڵی گرتووی تا گۆڕەكەت، لە(ئیبنو عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- هاتووە كە موژدەی دنیا بریتییە لەوەی كە خوا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا﴾ (زجاج وفراء) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتەو وێنەكانیەتی.(عطاء) ئەفەرموێ: موژدەی دنیا ئەوەیە كە مەلائیكە لەكاتی مردندا دێنو موژدەی ئەدەنێ بە بەهەشت، موژدەی ڕۆژی دواییش ئەوەیە: مەلائیكە دێن بە پێشوازیانەوەو سەلامیان لێ ئەكەنو موژدەیان ئەدەنێ بە گەیشتن بە ئامانجو ڕێزو خۆشی، هێندێ ئەفەرموون: موژدەی دنیا بریتییە لە موژدەدان بەسەركەوتنو فەتحو غەنیمەتو ناوبانگی چاكو خۆش ویستنی خەڵكی بۆیان، موژدەی ڕۆژی دوایی نایەتە باسكردنو باسی ناوێ، ئەم موژدەیانە كە باسكران هەموویان هەنو هەركامو هەموویان دەست ئەدەن بێن بە تەفسیر، بەڵام ئەگەر حەدیسی صەحیح هاتبێ نابێ لێی لادرێو ئەبڕرێ بەسەر ئەوەدا، لەسەر هەر بارو ڕایەك ئەوا خوا ئەفەرموێ: موژدەیان بۆ هەیە لە هەردوو دنیادا، شتێكی ئاشكرایە كە: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ﴾ گۆڕاندن بۆ وتەكانی خوا نییەو هەموو هەواڵو بەڵێنو بڕیارەكانی ڕاستەو تەدی دێن، كە یەكێ لەو وتەیە یان هەواڵدانە بەم موژدەیە كە: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ هەر ئەوە گەیشتنە بە ئامانجی زۆر گەورەو هیچ خۆشیو ئامانجێك لەوە گەورە تر نییە، لەبارەی پەیوەندی ئەم سێ ئایەتە بە ئایەتەكانی پێشیانەوە دوو جۆری تریش گوتراوە:

١- له پێشەوە بەڵێن و هەڕەشەی گشتی ئاڕاستەی گوێ ڕایەڵان و سەکێشانی کرد، ئینجا بەو بۆنەیەوە بەڕوونی باسی بڕوادارو دۆستەکانی خوا ئەهێنێ.

٢- له پێشەوە باسی بەدیی و خراپی ئەوانەی کرد کەبێبڕوان و درۆ دەست هەڵبەست ئەکەن بەدەم خواوە، ئینجا بە دوای ئەوەدا باسی ئاگاداری و چاودێریی خوای کرد بۆ پێغەمبەرو ئوممەتەکەی، ئینجا بەو بۆنەیەوە بە بەڵێن و مژدە دان بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی بڕواداران ڕوون ئەکاتەوە لەم ئایەتەدا، ئینجا لەم کاتەدا ڕووی فەرموودە ئەکاتە سەرداری بڕواداران و دۆستەکانی خوا دڵ ئارام و دڵنیا ئەکات لەزیانی بێبڕوا دەلەسە چیەکانی مەککەو دەوروبەری کە لەو کاتەدا خاوەنی هێزو قسە ڕەوا بوون، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ﴾ با قسەو وتەی ئەوانە غەمبارت نەکات، ئەو وتەو پڕو پاگەندەو قسە بەدانەی کە ئەوان ئەیکەن بۆ دژایەتی و بەرگری ئایینەکەت ﴿إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ واتە چونکە بەڕاستی زاڵبوون و هێزو دەسەڵات هەمووی هینی خوایەو هیچکەس خاوەنی نییە، نە ئەوان و نە هیچ کەسانێکی تر، کەواتە بڕواداران و دۆستەکانی خۆی زاڵ ئەکات نەك بێبڕواو دوژمنەکانی. لێرەدا زاڵبوون و هێزو دەسەڵاتەکە تایبەتی ئەکات بە خواوەو پێغەمبەرو بڕواداران بەشدار ناکات وەك لە شوێنی تردا بەشداریان ئەکات، چونکە بەشەکەی ئەوانیش هەر هینی خوایەو ئەیبەخشێ بەوان، لەم شوێنەدا کە باسەکە باسی چاودێری و پارێزگاری خوایە بۆ دۆستەکانی کەواتە ئەبێ هەر باسی ئەو بکات، لە شوێنی تردا وەك لە سورەتی ﴿المنافقون﴾دا بۆ بەرپەرچ و دەم کوت کردنی ئەو ناپاکانە هاتووە لایان وابوو خۆیان زاڵن و خاوەنی هێزو دەسەڵاتن، با پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) غەمبار نەبێ بەو قسەی بێبڕوایانە، چونکە هەموو زاڵ بوون و هێزی هەر بەدەست خوایەو خوایش لەگەڵ ئەوە، ﴿هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ هەر خوایش بیسەری زانایە، لەڕاستیدا قسەکانی ئەوانە ئەبیستێ و ئاگا و زانایە بە پیلان و کارە بەدەکانیان، کەواتە دۆستەکانی ئەپارێزێ لە قسەو کرداری بەدی دوژمنەکانی، هەموو شتێ هەر بە دەست ئەوە و هەرچی لەم بوونەوەرەدایە موڵکی ئەوە.

أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِۗ﴾ ئاگادار بن کە بەڕاستی هەر بۆ خوایەو موڵکی خوایە هەرکەس وا لە ئاسمانەکانو زەویدا لەجنو مەلائیکەو بڕوادارو بێبڕواو یاخیو لە خواترس، کەواتە هەموو خاوەن هێزێك موڵکی ئەوەو وا لە ژێر دەسەلاتی ئەودا چ جای بێهێزو بێگیانو بێدەسەلات، هێنانی(من) کە بۆ زاناو دەسەلاتە، نەك(ما) کە زۆر تر بۆ نەزانو بێدەسەلات بەکار ئەهێنرێ، بۆ دەست نیشانە بەوەو بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستەیە، ﴿وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ﴾ ئەو هاوبەش ڕەوادەرو بت پەرستانە کە نزاو هاوار ئەکەنە غەیری خوا، بە هاوبەشی خوایان دائەنێن، ئەوانە لە ڕاستیدا شوێنی هاوبەش نەکەوتوون ـ چونکە خوا پاكو بێگەردە لەوەی وێنەو هاوبەشی ببێ، ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾ لەوانە لەو شوێن کەوتنەدا هیچ نین بێجگە لەوەی گۆترەکاری ئەکەنو بەدەم پڕ قسەئەکەنو شتی ناڕەواو ناڕاست بڕیار ئەدەن کە هیچ کەڵكو سوودێکی نییە، بێگومان هەرکەسێ ژیرو تێگەیشتوو بێت خۆی دوور ئەخاتەوە لەشتی وا، ئینجا هێندێ لە بەرهەمی دەسەلاتو هێزی خوا ئەخاتە بەرچاو کە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکران لەسەر تاكو تەنیایی خوا لە هەر جۆرە وێنەو هاوبەشێك، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًاۚ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە شەوی بڕیار داوەو گێراویەتی بۆ ئێوە بۆ ئەوەی ئارامی تێدا بگرنو لەو تاریکیەدا بحەوێنەوە لە ماندوویەتی گەڕانو کارو کردەوە، ڕۆژی گێڕاوە بە ڕووناكو هۆی بینین بۆ ئەوەی بڵاوبینەوەو بگەڕێنو هۆی ژیانو ئاوەدانی فەراهەم بێنن. بێگومان ئەمەو هەموو ئەو چەشمەندازو بەڵگە بوونەوەریانە دڵو دەروون پاراو ئەکەنەوەو ئەیانخەنە سۆزو بڕوای زۆر بەتین، بەڵام لەبەر ئەوەی هەمیشە وان بە پێش چاوەوەو دەقیان پێوە گیراوە، لەبەرچاو کۆن ئەبنو فەرامۆش ئەکرێن، لەبەر ئەوە قورئان هەموو جارێ دڵو دەروون بێدار ئەکاتەوەو**

ئەیانهێنێتەوە هۆش بێجگە لەوەش دوایی ئایەتەکان ئەهێنێ بە ڕستەو فەرموودەیەك هەرکەسێك بە تەواوی بێهۆش نەبێ خەبەری ئەبێتەوە ئەم ئایەتەی دوایی هێنا بەم فەرموودەیە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ بەڕاستی لەوەی کە باس کرا چەند بەڵگەو ڕابەرێکی ڕوون هەیە بۆ کۆمەڵ و کەسانێ کە ئەبیستن و ئەو ئایەتانەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەریاندا وەری ئەگرن بە هۆش و تێگەیشتنەوە هەرچەندە ئەو ڕابەرو بەڵگەیانە ڕابەرو بەڵگەن لە خۆیانداو ڕابەرو بەڵگەن بەسەر هەرکەسێکەوە کە بخوێنرێتەوە بەسەریدا یان نەخوێنرێتەوە بەڵام لەبەرئەوە سوودو بەهرەیان بۆ کەسانێکە کە بیانبیستن و وەریان گرن، لەبەر ئەوە تایبەتیکردن بە بیسەرانەوە دەست نیشان ئەکاتە بەوەی هەرکەس بیسەرێ ئەبێ بیانبیستێ و سوود وەرگرێ و هەرکەس سوود وەرنەگرێ ئەوە کەڕەو بیسەر نییە، بەڕاستی پلارێکی سەخت و دڵتەزێنەو هەر بە قورئان ئەکەوێ قسە بکات.

ئەم قورئانە ڕابەرو چەشمەندازە بوونەوەریەکان بەکار ئەهێنێ لە کاتێکدا کە باسی مەسەلەی خوایەتی و بەندەیی ئەکات، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم بوونەوەرە بە خۆی و هەموو بەش و پارچەکانییەوە بەزمانی حاڵیان قسە ئەکەن و ئەدوێن لەگەڵ ژیریی و سروشتداو ناچاریان ئەکەن بەدانانان بە قسەو بڕیارەکانیانداو ناتوانن بەرپەرچی قسەو بڕیارەکانیان بدەنەوە هەروەها ئەدوێ و قسە ئەکات لەگەڵ خەڵکیدا بەو ڕێك و پێکی و گونجاوییەی کە هەیە لە پەیوەندیان بەم بوونەوەرەوە، بۆ وێنە لێرە ئەو شەوەی کە ئارامی تێدا ئەگرن و ئەو ڕۆژەی کە چاو ئەکەنەوە تیایداو شت ئەبینن، دوو شتی ئاشکران پەیوەندی نێوانیان هەر بەژیانەوە ئەو ڕێك و پێکی و گونجاویەی کە هەیانە هەستی پێئەکرێ بە تێڕوانین و سەرنج دانێکی سادەش، بەبێ پێویست بە بیرکردنەوەی قوڵ، بە بێپێویست بە خوێندەواری و زانیاری، بەڵکو هەر بە سروشت و ژیریی کە سەرنجی ئەم بوونەوەرە ئەدەن تێئەگەن لە قسەکانی و وەری ئەگرن، مەگەر کەسێك کە سروشت و ژیرییەکەی لەکار کەوتبێ، بەڵێ تا زانیاری و خوێندەواری بەرز ترو فراوان تر بێ زیاتر تێ ئەگات ئەگەر بێبڕوایی کوێر نەکردبێ و لەکاری نەخستبێ. درۆی دەست هەڵبەست بەدەم خواوە بە بڕیاردانی هاوبەش بۆی جۆرێکی تریش هەیە کە بریتییە لە ڕەوا دانی ئەولاد بۆی، لەناو نەفامی عەرەبدا ئەم جۆرەش هەبوو، ئەوە بوو مەلائیکەیان بەکچی خوا دائەنا، وەك جوولەکەو گاوریش ئەو درۆ ئەکەن وەك باسکرا.

قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَانٍ بِهَذَا

جا لەکۆتایی ئەم باسەدا لەو جۆرە ئەدویٚ و بەڵگەو نیشانە ئەمێنێتەوە لەسەر ناڕاستی و ناڕەوایی ئەم جۆرەش و کۆتایی ئەمێنێ بە هەڕەشە لێیان بەسزای ڕۆژی دوایی و ئەفەرمویٚ: ﴿قَالُوا﴾ ئەوانە ئەڵێن: ﴿اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا﴾ خوا ڕۆڵەو ئەولادی بۆ خۆی داناوەو ڕاگیری کردووە. ئەو بیرو باوەڕە ئێجگار سادەو نەفامییە، بناغەکەی کەم و کوڕی بۆچوونە، تێناگات لەو جیاوازییە زۆر فراوانەی کە هەیە لەنێوان سروشتی خوایەتی کە بێسەرەتایەو بێدوا هاتنە، سروشتی ئادەمێتی کەلە نەبوون دروستکراوەو سەرەتای هەیە ئاشمێنێتەوە، هەروەها کەم و کوڕی بەهۆی باوی خوا کە هات و دەرچوو بەوەی کە ڕۆڵەکانی ئەم جیهانە دواهاتووە بەزاوزێ فەراهەم بێت و بەدی بێت، کە بریتییە لە تەواو کردن و بەسەر گرتنی ناتەواوی و ئەو کەم و کوڕییەی کە لەماندا هەیەو خوا پاك و بێگەردە لەهەر کەم و کوڕی و ناتەواوییەك. ئەوەتا ئادەمی ئەمرن و ژیان ئەمێنێ لە پاش ئەوان تا کاتی دیاریی کراوی خۆی بەهۆی ئەو کاردورستی خوا کە داخوازی بوو بۆ ئەوەی کە ئادەمیش بمێنێتەوە تا کاتی نەمانی ژیان لەسەر ئەم زەوییەدا، هۆی ئەو مانەوەو درێژە کێشانەش بەو ڕۆڵەو زاوزێیە پێکدێت. ئادەمی پیرو بێهێز ئەبن، ئەو ڕۆڵەو ئەولادەش جێگرو پڕ کەرەوەی ئەو بێهێزیی و لاوازییەیە و لە شوێنی ئەودا هێزێکی گەنج و لێهاتوو دێتە کایەوە، بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵات، بەو جۆرەی خوا ویستبێتی، بۆ کۆمەك کردن و بەخێوکردنی پیرو پەك کەوتەکان. ئادەمی ئەبێ بەربەرەکانی بکات بەدەرویخۆیدا، ئەبێ بەربەرەکانی دوژمن بکات چ لە ئادەمی و چ لە گیانلەبەرانی تر، کەواتە پێویستی هەیە بە پشتیوان و یارمەتی دەر، بێگومان شایستەترو شاوتر لەو کات و بەسەرهاتانەدا ڕۆڵەو ئەولادە، ئادەمی پێویستی هەیە بە پەیداکردن و زۆر کردنی ماڵ و سامان بەئەرك و تێکۆشان، دەی ڕۆڵەو

ئەولادەکە بەش و مەبەستی خۆشیانی تێدایە باشتر هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن لەو زۆر کردن و پەیدا کردنەدا. هەروەها هەموو شتەکانی تر کە پێویستن بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی و پەرەدان بە ژیان تێیدا تا کاتی دیاریی کراوی خۆی. بێگومان هیچکام لەوانەی باسکران پەیوەندیان بە خواو خوایەتیەوە نییە، نە پێویستی بە درێژەدانە بەژیان، نە پێویستی بە کۆمەك و یارمەتی دەرە، نە پێویستی بە ماڵ و سامان هەیە، نە پێویستی هەیە بە هەر شتێکی تر کە بە خەیاڵدا بێت یان نەبێت، جا لەبەر ئەوە هۆی بوونی رۆڵە و ئەولاد بۆ خوا بە هیچ رەنگ لەکایەدا نییە، چونکە سروشتی خوایەتی دوورو پاکە لە پێویستی بە هەر شتێ کەلە زاتی پاکی خۆی بەدەربێت، بەڵام سروشتی ئادەمی کەم و کوڕی و پێویستی و ناچاری هەیە بەو شتانەو بەو تەواو کردنە، کەواتە داخوازە بە رۆڵە و ئەولاد بە داخوازیەکی تەواو، مەسەلەکە هەروا بێ هۆو گۆترەکاری نییە، جا لەبەرئەوە بەرپەرچی ئەو وتەو بریاری ئەوانە هەر ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَـٰنَهُۥ﴾ پاکی و بێگەردی بۆ خوا لە هەر شتێ شیاو و شایستە نییە بۆ زاتی پاکی، ئەم وتەیە بەکار ئەهێنرێ لەکاتی سەرسوڕمان و سەرسوڕهێناندا کە لێرەد بۆ سەرشوڕهێنان ئەبێ، جالێرەدا هەڵدەگرێ بۆ ئەو سەرسوڕهێنانەش هاتنی وەك بەرپەرچ دانەوەو بەم فەرموودانەی تریش: ﴿هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ﴾ کە هۆی ئەو پاکی و بێگەردییەیە، هەر ئەو خوایە دەوڵەمەندە و بێپێویستە بە هیچ شتێك ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ هەر بۆ ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی و وا لە زەویدا، کەواتە بێپێویستە بە هیچ شتێك!

قورئان بەم شێوە سووك و ئاسانە ئەدوێ لەگەڵ ژیریی و سروشتدا نەك بەو جۆرە گیرو گرانە کە کەلام و فەلسەفە هێنانی و بوو بە هۆی ئاژاوەو درێژە پێدانێکی سەخت و گران و سەری هەر لە بێئارامییەوە دەرچوو، ئینجا بەرەنگاریان ئەوەستێ بەوەی قسەو بریارەکەیان بێبەڵگەیەو قسەی رووتی بێجێیە، ئەفەرموێ: ﴿إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَـٰنِۭ بِهَـٰذَآۚ﴾ نییە لاتان هیچ بەڵگەو رابەرێك بەمەی کە ئەیڵێن، کەواتە درۆو دەست هەڵبەست بەدەم خواوە،

﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئايا ئێوه شتێك ئەڵێن بەدەم خواوەو ئیسلام هەڵیەسەپێنن بەسەر خوادا کە خۆتان نایزانن؟ بێگومان هەرکەسێك شتێ بڵێ کە خۆی نەیزانێ و بێئاگابێت لێی زۆر ناتەواوی و لەکەیەکە بەسەریەوە، چ جائەوەی کە ئەو قسە نەزانراوانەش بەدەم خواوە بێت!! بەڕاستی تاوانێکی زۆر گەورەیە، چونکە یەکەم درۆ پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو ماف خوایەتییەی کە بەندە ئەبێ هەڵسێ پێی بەرامبەر پەروەردگاری کە بریتییە لەوپەڕی رێزو بەگەورە گرتن و دوور خستنەوەی هەر شتێ کە شایستە نەبێ بۆی، دەی بەو قسەی ئەوانەو بڕیاری ئەولاد بۆی هەموو کەم و کوڕی و ناتەواوییەکی بۆ بڕیار ئەدەن وەك دەست نیشانمان بۆ کرد لەمەوبەر، ئەو قسەو بڕیاری ئەوانە بەڵگەو نیشانەیە لەسەر گومڕایی و تێنەگەیشتن لە پەیوەندی نێوان خواو بەندەکانی، دەی ئەوەش ئەبێتە هۆی گومڕایی و تێنەگەیشتن لە هەموو پەوەیندیەکانی ژیان و ئادەمی، دەی هۆی ترازان و تێکچوونی رێگەی ژیان و کەوتنە ناو هەموو شتێکی پڕو پووچی بێ سەرو بن و دەرچوون لە بەرنامەی خواو ترازان لە رێگەی ئادەمی و ئادەمێتی، کەواتە مەسەلەکە تەنها تێکچوونی عەقیدەو بیروباوەڕ نییە، بەڵکو مەسەلەی هەموو ژیانە، هەرچی دوژمنایەتی و ئاژاوەو شەڕو شۆڕ کە فەراهەم هات لەنێوان کەنیسەو زانیاری و ژێرییدا کە سەری لەوەوە دەرچوو ئایین فڕێ دراو بێبڕوایی و ماددێتی هاتنە کایەو ژیان و جیهان تێکچووو شێوا بە سەریەکدا، ئەوانە هەموو لەو زانین و بۆچوونە بەدە پەیدابوو، نەزانین و بۆچوونی بەدی پەیوەندی نێوان خواو بەندە، جا لەبەر ئەوەیە ئیسلام ئەوەندە مەسەلەی عەقیدەی بەڕوونی پاك و خاوێن کدووەتەوە لە هەر شتێکی نەشیاو ناشایستە. عەقیدەیەکی روون و ڕەوان و بێگەرد، هیچ رێگە نادا بۆ دەستکاری و گۆڕاندن، دڵ و دەروون ناخاتە ناو تاریکی و تەم و غوبار! جا لەبەر ئەوە بە هەمووان ئەبێ بوەستن بەرامبەر خوا، هەمووان بەم شەریعەتە قسەیان لەگەڵ ئەکرێ. هەمووان ئەبێ بەم شەریعەتە رەفتار بکەن، هەمووان ئەبێ چاودێرو پارێزەر بن لەسەر ئەم عەقیدەیە، هەر بەوە پەیوەندی نێوانی هەمووان رێك و پێك ئەبێ و ڕائەوەستێ، سەرەنجام و بەرهەمی رێك و پێك بوونی پەیوەندی نێوان ئەوان و خوای پەروەردگاریان. ئینجا لە کۆتاییدا ئەم هەڕەشەیە ئاڕاستە ئەکات،

قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٠﴾ ۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە درۆ دەست هەڵبەست ئەکەن بەدەم خواوەو شتی درۆ بڕیار ئەدەن بۆ خواو ئەیسەپێنن بەسەریدا، ئەوانە ناگەن بە ئامانجو ڕزگار نابن، نەلە ڕێگەو ڕۆشتنندا، نەلە دنیاداو نەلە ڕۆژی دواییدا، بێبەشن لە نازو نیعمەتی بەهەشت، بێبەشن لەوەی کە بەتەمای هەن لەلایەن تاکا کارو هاوبەشەکانیانەوە، بەڵێ لەدنیادا خۆشیو دەستکەوتێکیان ئەبێ، بەڵام هیچی تێدا بەسەر نییەو سەری لە خراپەوە دەرئەچێ، ئەبێ بە مایەی داغو غەمو پەژارەی زۆر سەختی نەبڕاوە وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ بۆ ئەوانە هەیە خۆشیو ڕابواردن لەدنیادا یان ئەوەی کە دەستکەوتیان ئەبێ، یان ئەوەی کە ئەوانەی تێدایە، بەڵام شتێکی کەمو بۆ ماوەیەکی کەم ﴿ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ﴾ ئینجا لەپاش ئەو ماوە کەمە هەر بۆلای ئێمەیە گەڕانەوەیان بەزیندوو کردنەوەو حیسابو پرسیار ﴿ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو گەڕانەوە پێیان ئەچەژێن سزایەکی بەتین بە هۆی ئەوەی ئەوانە بڕوایان نەهێناو بەردەوام بوون لە سەری تا مردن، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات لەو حاڵو بارو سزایە، ئامین.. لە پێشەوە دەست نیشانکرا بۆ ئەو گەلو ئوممەتانەی کە تێپەڕیان کردو لەناو چوون، بۆ دوا ڕۆژو سەرەنجامی بڕوا نەهێنانو یاخی بوونیان، هەرچۆنێ دەست نیشانی کرا بۆ ئەوەی بۆ هەموو ئوممەتێك فروستادەیەك بووەو کاتێ کە هاتوون بۆ سەریان بەدادو بە هەقیانەت حوکمو بڕیار دراوە لەنێوانیاندا، جا بەو بۆنەیانەوە ئەوەتا قورئان گەردشو گەڕانێك ئەکات بەم ئوممەتەو ئەندازێك بە درێژیی بۆ ئەو دوو شتەی کەدەست نیشانیان بۆ کرا، بەشێك لە بەسەرهاتو داستانی نوحو گەلەکەیو بەشێك لەداستانی موساو گەلەکەیو فیرعەون ئەخاتە بەرچاو، کە**

بەوە نەرئەکەوێ دوا ڕۆژی بڕوا نەهێنانیان. هەروەها لە پاشان بە کورتی دەست نیشان ئەکات بۆ داستانی یونس سەلامی خوا لە خۆیو هەموو براکانی بێت، ئەو داستانانەی کە قورئان ئەیانهێنێ لەهەر شوێنکدا ئەڵقەو بەشێک ئەهێنێ کە ڕێکەو پێویست بێت لەگەڵ مەبەستی شوێنەکەدا، بۆ وێنە لەم سێ داستانو سەرگوزەشتانەدا ئەندازو بەشێک باس ئەکات کە ڕێکو پێک بێت لەگەڵ ئەو هەڵوێستی قورەیشەی کەلەم سورەتەدا باسی کرد، هەڵوێستی بەدو یاخێتی کۆمەڵێکی زۆری بەدەسەڵاتی بەهێز لەگەڵ دەستەیەکی کەمی بێدەسەڵات، لەگەڵ ئەوەدا ئەو دەستە کەمو بێدەسەڵاتە هیچ باکی نەبێ و بێباکانە بەر بەرێتەوە لەو گەلو کۆمەڵە زۆرەو شانازی بکات هەر بەبڕواو عەقیدەکەیەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ﴾ ئەی پێغەمبەر بخوێنە بەسەر بێبڕواکاندا هەواڵە گرنگەکەی نوح لەگەڵ گەلەکەیدا، کەوێنەی گەلەکەی تۆ بوون لە بێبڕوایی و سەرکێشیدا، ﴿إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ﴾ لەو کاتەدا کەڕووی کردە گەلەکەیو پێی گوتن: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەگەر سەخت و گرانە لەسەرتان بوونو مانەوەی من لە ناوتاندا، ئامۆژگاری من بۆتان بە ئایەتەکانی خوا کە تاکو تەنیایی خوا نیشان ئەدەنو بیرو باوەڕی بت پەرستی ئێوە پووچەڵو بێنرخ ئەکات، ئەگەر ئەوە سەختە لەسەرتانو پێتان هەڵناگیرێ، ﴿فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ ئەوا من هەر پشتم بە خوا بەستووەو کاری خۆم هەر حەواڵەی ئەو کردووە، واتە هیچ گوێم لە ئێوە نیەو دەربەست نیم، یان چیتان لە دەست دێت بیکەن، یان من هەر لەسەر کاری خۆم ئەڕۆمو بەردەوام ئەبم ﴿فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ﴾ کەواتە کارو بڕیاری خۆتان کۆبکەنەوەو بڕیاری تەواوی لەسەر بدەن بە هەمووتانەوە سەبارەت بە ئازارو زیانو پیلان دەربارەم، لەگەڵ هاوبەشەکانتان، واتە ئەو بتانەی کە کردووتانە بە هاوبەشی خواو بەتەمای ئەوەن تکاتان بۆ بکەنو یارمەتیتان بدەن، یان هەرکەس هاوبەشو هاو ئایینتانە، بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە ﴿ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ﴾ ئینجا با کارو بڕیارەکەتان پۆشیدەو شاراوە نەبێ لەسەرتان، بەڵکو ڕوونو ئاشکرا بێت ﴿ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ﴾ ئینجا کارو بڕیارەکەتان بەجێ بهێنن لە مندا‌و هیچ مۆڵەتم مەدەنو لێم مەوەستن، واتە بە هەمووتانەوە چیتان لەدەست دێت بەرامبەر من بەجێی بێنن بەبێ سەرلێکردنەوەو مۆڵەت دانی من!

﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٧٢ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ٧٣﴾

---

بەڕاستی بەر لێبڕینەوەیەکی ڕوون و سەختەو هۆی خەشم و ڕق و پەلامار دانە، کەسێك ئەوە ئەڵێ کە خاوەنی هێزێکی تەواو بێت، پشت ئەستوور بێت و دڵنیا بێت لە زۆریی دەسەڵات و چەکی خۆی، ئەوەی کە بە دەست نووحەوە بوو(علیه السلام) بریتی بوو لە هێزی بڕوا کە هەموو هێزێك لاوازە لە ئاستیدا، کۆو کۆمەڵ و زۆریی چاو نادات لە بەردەمیدا. ئەوەی بە دەستیەوە بوو بڕوای تێرو تەواو بوو بە خوا بە تاك و تەنیایی کە ئەو بڕوایە خاوەنەکەی پەیوەست ئەکات بە هێزی هەرە گەورەوە کە زاڵە بەسەر بوونەوەردا بە خۆی و هەرچی وا لە بوونەوەردا، کەواتە ئەو بەر لێبڕینەوەی هێزی ڕاستەقینەی هەرە گەورە بوو بۆ هێزێکی لەڕو لاواز کە هیچ نرخ و بوونێکی نییە بەرامبەر هێزی ڕاستەقینە، بانگکەرانی ڕێگەی خوا ئەبێ پەیڕەوی فروستادەکانی خوا بکەن، ئەبێ دڵیان پڕ بێت لە هێزو دڵنیا بن بەو هێزی بڕوایەی کە هەیانی، ئەبێ پشت هەر بە خوا ببەستن بەرامبەر سەرکێشان و ستەمکاران هەرکەس بن و لە هەرکوێ هەن! ئەو سەرکێش و ستەمکارانە هیچیان بە دەست نییە بێجگە لە ئازاردان، ئەوەش بۆ تاقیکردنەوەیە لەلایەن خواوە، نەك لەبەر دەستەپاچەیی خوا - پاك و بێگەردی بۆ ئەو - لە کۆمەك و یارمەتیدانی دۆستەکانی، نەوەك لەبەر وازهێنانی لێیان بۆ دوژمنەکانی، بەڵکو تاقیکردنەوەیە کە دڵ و ڕیزەکانی دۆستەکانی پێ پاڵفتە ئەبێ، ئینجا پاش ئەوە نۆبە دێتەوە بۆ بڕواداران، بەڵێنی خوا بەدی دێت بە زاڵکردن و دەسەڵات پێدان و دامەزراندنیان لە وڵاتدا. ئینجا لەسەر داستانەکە ئەڕوات و ئەو بەشەی کە لێرەدا پێویستە باسی ئەفەرموێ.

ئینجا ئەفەرموێ پێیان: ﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ﴾ ئەگەر ئێوە هەر پشتم تێئەکەن و ڕووم لێ وەرئەگێڕن ﴿فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍ﴾ دەی من داوای هیچ کرێ و پول و پارەیەکم لێ نەکردوون لەسەر ئەو ئامۆژگارییە، لەسەر هیچ شتێکی تر هەتا کارەکەی منتان بەلاوە قورس و گران

بێت، یان هەتا من زیانباربم بە ڕوو وەرگێڕانی ئێوەو غەمی ئەوە بخۆم کە ئەو کرێیەم لە دەست دەرئەچێ، بە هۆی ئەوەوە گوێم ببێ لە پشت تێکردنو یاخی بوونتان لێم ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾ کرێو ئەجرو پاداشتی من هەر لەسەر خوایە کە منی ڕەوانە کردووە بۆ سەر ئێوە، کەواتە ئەو پاداشتم ئەداتەوەو ئێوە بڕوا بهێنن و نەیهێنن ﴿وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ فەرمانم پێدراوە کە من لە ملکەچو فەرمانبەرو گوێڕایەڵان بم بۆ ئەوەی کە من بانگی ئێوە ئەکەم بۆی، کەواتە واز ناهێنم لە هیچ شتێ لەوەی فەرمانم پێدراوە، ئینجا بزانین پاش ئەوە چییانکرد ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ ئینجا هەر بڕوایان پێ نەهێناو هەر بەرەوام بوون لەسەر بڕوا نەهێنان، ﴿فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ﴾ ئینجا ئێمەش ئەومان ڕزگار کردو هەرکەسیش لەگەڵی بوون لە کەشتییەکەدا ﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ﴾ گێڕانمانن بە جێنشینانی ئەوان لە زەوی و لە وڵاتدا لەگەڵ ئەوەدا دەستەیەکی کەم بوون ﴿وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وە ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە نوقممان کردنو خنکانمانن لە ئاوەکەدا، پێشخستنی هەواڵی گێڕانیان بە جێنشین لە باسی خنکانو لەناوبردنی بێبڕواکان لەبەر گرنگیی ئەو هەواڵەیە کە مەبەستێکی سەرەکییە، لەبەر پەلە کردنە بە دڵخۆش کردنو کەیف خۆش کردنی گوێگرانی بڕوادار، دەست نیشانە بە پێش کەوتنی بەزەیی و میهرەبانی خوا لە خەشمی.

ئا بەو جۆرە بە کورتی بەسەرهات و هەواڵەکەی دوایی پێهێناو فەرمووی: ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ﴾ ئینجا سەرنج بدەو بڕوانە ئەی پێغەمبەر ئایا چۆن بوو دواڕۆژو چارەنووسی ترسێنراوەکان؟ واتە بێگومان دواڕۆژو چارەنووسی ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بە تۆ لەگەڵ ئەوانە کە بڕوایان هێناوە. ئەوەیە باوی خوا لە جیهانداو بەڵێنی خوا بە دۆستەکانی بەو جۆرەیە، جا ئەگەر دواکەوت و ڕێگەکە سەخت و درێژ بوو لەسەر دەستەی بڕوادار، نابێ پەلەبنێتەوە، بەڵکو ئەبێ بزانێ کە ڕێگەی خوا بەو جۆرەیە، خوا دۆستەکانی ئاخەڵەتێنێ - پاك و بێگەردی بۆ ئەو - دوژمنانی خوا لەدەستی دەرناچن، خوا دۆستەکانی نادات بە دەمیانەوە، بەڵکو فێریان ئەکات و ڕامیان ئەکات و تۆێشووی ئەو ڕێگەیان پێئەدات لەو تاقیکردنەوانەدا!

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٧٤﴾﴾

ئینجا زۆر بەکورتی دەست نیشان ئەکات بۆ چەند پێغەمبەرانێ کەلە پاش نوح هاتن، بەڵگەو موعجیزەیان بۆ هێنان‌و سوودی نەبوو بۆ بێبڕواو گومراکان. ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ ئینجا لەپاش نوح چەند نێرراوو فروستادەیەکمان نارد بۆلای گەلەکانیان، بەم ڕەنگە چوون بۆلایان موعجیزەو بەڵگە ڕوونەکانیانەوە واتە هەرکام لەو نێرراوانە چوون بۆلای گەلی خۆیان بەڵگەو موعجیزەی خۆی کە خوا پێی دابوو بەس‌و پێویست بوو ﴿فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾ کەچی نەبوون بە بڕوادارو بڕوایان نەهێنا بەوەی کەلە پێشەوە بڕوایان پێنەهێنا، ئەم فەرموودەیە دوو تەفسیر هەڵئەگرێ:

١- لەپێش هاتنی موعجیزەکاندا بانگیانکردن‌و بڕوایان نەهێنا بەوەی کە فروستادەکان داوایانکرد بڕوای پێبێنن، لەپاشان موعجیزەیان بۆ هێنان‌و کەچی پاش ئەوەش هەر بڕوایان نەهێنا‌و هەر بەردەوام بوون لەسەر بێبڕوایی، وەك پێش هاتنی موعجیزەکان.

٢- هیچکام لە دواییەکانیان بڕوایان نەهێنا بەوەی کە پێشووەکانیان بڕوایان پێنەهێنا، واتە ئەو گەلانە هەرچەند لەکات‌و شوێن‌و چەرخدا جیاواز بوون بەڵام لەسروشتدا یەك بوون‌و ئەوانەی دوایی تەمێ خوار نەبوون بە پێشووەکان‌و هەروەك ئەوان بڕوایان نەهێنا‌و شوێنی ئەوان کەوتن‌و ڕێبازی ئەوانیان دایە بەر ﴿كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ بەو جۆرو شێوەیە مۆر ئەنێین بەسەر دڵی دەست درێژی کەرەکاندا، ئەوەش بە پێی باوی خوا کەهەر لە کۆنەوە هەر دڵی خاوەنەکەی وەستاندی‌و قاپیەکەی داخست.

ئەو بارو ڕەنگە ئەگرێ‌و وشك‌و ڕەق ئەبێتەوە لەسەری‌و تازە دەست نادات بۆ بارێکی تر، نەك مەبەست ئەوە ـ وەك چەند جار ڕوونکرایەوە ـ کە خوا ئەو دڵە دائەخات‌و بەرگری ئەکات لە ڕێنموونی وەرگرتن، نەخێر ئەوە مەبەست نییە، بەڵکو خوا هەموو هۆی ڕێنموونی وەرگرتنی بۆفەراهەم ئەهێنێ‌و بەڵام بەندە نەفامەکەبەمەیلی خۆی ئەوڕێگە ڕاستە ناداتە بەر.

ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا مُّجۡرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ

---

**ئینجا دێتە بەسەر داستانی موسا(علیه السلام) دەست پێئەكات لە قۆناغی بڕوا نەهێنان و بەر لێ بڕینەوە، دوایی پێئەهێنێ بە باسی نوقم كردن و خنكاندنی فیرعەون و لەشكرەكەی، بە فراوانترو درێژتر لەوە لە داستانی نوح دا باسی كرد، بە گرنگ تر هەڵوێستە بەدەكانیان ئەگرێ كە وێنەی هەڵوێستی بت پەرستەكانی مەككە بە بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ)، هەڵوێستی ئەو دەستە كەمە بڕوادارەی كە لەگەڵی بوون. ئەم ئەڵقەیە كە نیشانی ئەدات لەم داستانەدا دابەش ئەكرێ بە پێنج هەوڵوێست، ئەو هەڵوێستانەش ئەدوای یەكدا دێن بەم جۆرو شێوەیە: ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئینجا ڕەوانەمان كرد لەپاش ئەو نێرراو پێغەمبەرانە موسا و هارون بۆلای فیرعەون و كۆڕو كۆمەڵەكەی بە بەڵگەو موعجیزەكانمانەوە. ئەو ئایەتە موعجیزانە ئەو نۆیە بوون كە لە سورەتی ﴿الأعراف﴾ دا باسكران، بەڵام لێرەدا باسیان ناكات، چونكە پێویست نییە باسكردنیان، ئەو دەست نیشانە بە كورتی بەسە، ئەوەی گرنگ بێت باسی وەرگرتن و بە پیرەوە چوونی فیرعەون و كۆمەڵەكەیەتی بۆ ئەو ئایەتانە كە ئەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ ئینجا ئەوانە خۆیان بە گەورەو زاڵ زانی لەوەی ملكەچ كەن و گوێ ڕایەڵ بن ﴿وَكَانُواْ قَوۡمًا مُّجۡرِمِينَ﴾ ئەوانە گەل و كۆمەڵێكی خراپكارو تاوانبار بوون، بەڵێ ئەو دوانە چوون و فروستادەیی خۆیان پێ ڕاگەیاندن ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا﴾ ئینجا كاتێ هەقیان بۆ هات لەلایەن ئێمەوەو بەوەحی ئێمە وەك لەسەرەتای سورەتی ﴿الشعراء﴾ەوە باس ئەفەرموێ كە ئەوەش ئەو موعجیزە ئاشكرایانە بوون و بەڕوونی خوایەتی خوایان نیشان ئەدات و ناهەقی و پڕو پووچەڵی فیرعەونیان ئاشكرا ئەكرد ﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان ﴿إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ بەڕاستی ئەمە جادوویەكی ڕوون و ئاشكرایە ﴿قَالَ مُوسَىٰٓ﴾ موسا فەرمووی پێیان: ﴿أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ﴾ ئایا ئێوە دەربارەی ئەو هەقە كە كاتێ هاتووە بۆتان ئەڵێن جادووە، واتە بێزاری هەیەو سەر سوڕئەمێنێ لەو قسەی ئێوە كە بەو هەقە ئاشكرا ئەڵێن: جادوو،**

أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ

﴿أَسِحْرٌ هَٰذَا﴾ ئایا ئەمە جادووە! ﴿وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ﴾ لە کاتێکدا کە جادوبازان ناگەن بە ڕزگاریان نابێ لە ناخۆشی لەکاتێکدا من گەیشتووم بە ئامانج و بەڵگەو نیشانەی بەهێزم پێیە، پشەی یاخیەکان هەروا بووە کە دەستەپاچە بوون و هیچیان بەدەستەوە نەما ئەو جۆرە قسە ناڕەواو بێجێیانە ئەکەن، ئەوەتا لەپاش داماویان ئەو قسە بەدەیاتکرد دەربارەی پێغەمبەرو قورئانەکەی. ئینجا لەوێدا کۆڕو کۆمەڵەکە هۆی ڕاستەقینەی سەرپێچی و سەرکێشیەکەی خۆیان دەربڕی بەم ڕەنگە ﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان بە موسا: ﴿أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا﴾ ئایا هاتووی بۆ لامان و بۆ سەرمان بۆئەوەی لامان دەی لەوەی کە زانیومانە باوك باپیرمانی لەسەر بووە، واتە ئێمە ئاینێکی خۆمان هەیە کە لەباوك و باپیرمانەوە بۆمان بەجێماوە، تۆ ئەتەوێ واز لەو ئاینە بێنن و شوێنی ئێوە بکەین ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ پاشایەتی و گەورەیی بۆ ئێوەببێ لەوڵاتدا واتە لەخاکی مصردا، کەواتە هۆی بڕوا نەهێنان و سەرپێچیەکەیان مەترسی بووە لەنەمان و پووچەڵ بوونی بیرو باوەڕەکەیان کەلە باوك و باپیریانەوە بۆیان هاتووەتە خوارەوەو ڕژێمی ڕامیاری و ئابووریان لەسەر دامەزراوەو ڕاگیرە. مەترسیانە لەنەمانی زۆرو دەسەڵاتیان لەوڵاتدا، ئەو زۆرو دەسەڵاتەی کە دەستکەوتیان بوو بوو لەو بیروباوەڕە پڕو پووچەی کە بەکەلەپوور بۆیان هاتبوو.

لەکۆن و تازەدا ئەوە هۆی سەرکێشی و یاخی بوونی یاخی و ستەمکارەکان بووە کە پاڵیان پێوە ئەنێ بۆ بەرگری بانگ و بانگەوازەکانی خوا، پڕو پاگەندە کردن و دەست هەڵبەست کردنی درۆ و دەلەسە بۆ ئەوانەی کە خەڵکی بانگ ئەکەن بۆ ڕێگەڕاستەکەی خوا، کە بانگکردن بۆ ئەو ڕێگەیە جاڕدانە بۆ شۆڕشێکی تەواو بەسەر ئەو هەموو بیروباوەڕە

بەدانەدا کە مافی خوایەتی لە خوای پەروەردگار ئەسێنێ و ئەیدات بە بت و پەرستراوێکی بێکەڵکی بێنرخ، یاخی و ستەمکارەکان لەسایەی ئەو بیروباوەڕە پووچانەدا ئەژین و یاخی گەری ئەکەن و مافی خەڵکی ژێرپێ ئەکەن. بێگومان چەند پیاوی زیرەك و ژیر هەبوون لەناو قوڕەیشدا کە بەچاکی ئەیانزانی و تێگەیشتبوون لە ڕاستی و بەرزی پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەیانزانی ئەو بیروباوەڕی بت پەرستییە بێنرخ و پڕوپووچە، بەڵام وەك کۆڕو کۆمەڵەکەی فیرعەون مەترسیان ئەکرد لە نەمانی ئەو ڕژێم و دەسەڵاتەی کە بوویان و بۆیان بەجێمابوو، لەبەرئەوە بڕوایان نەئەهێنا هەرچۆنێ کۆمەڵەکەی فیرعەون بەبێ شەرم و کەشخەوە ئەیانگوت بە موسا(علیه السلام): ﴿وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ﴾ بێگومان ئێمە نین بە بڕوادار بە ئێوە لەبەر بانگ کردنتان! لێرەدا هەڵوێستی یەکەم دوایی هات و دەست ئەکات بە هەڵوێستی دووەم. ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ﴾ فیرعەون گوتی بە کۆمەڵەکەی: هەموو جادووبازێکی لێزانی زانا بە جۆرەکانی جادوم بۆ بێنن و کۆیان بکەنەوە بۆم. وا دەرئەکەوێ کە مەبەستی فیرعەون ئەوە بوو کە بیسەلمێنێ بە خەڵکی ئەو بەڵگەو موعجیزانە کە موسا هێنای جادووەو موسا یەکێکە لە جادوبازان، بەهۆی ئەوەوە مەترسی نامێنێ لە نەمان و پووچەڵبوونی بیروباوەڕەکەیان و نەمانی پاشایەتی و دەسەڵاتەکەیان. بەپێی فەرمانی فیرعەون جادوو بازەکان بانگکران ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ ئینجا کاتێ جادووبازەکان هاتن ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ﴾ موسا پێی فەرموون: ئەوەی کە بڕیاریتانداوە فڕێی دەن و بیخەنە بەرچاو ﴿فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ﴾ ئینجا کاتێ فڕێیاندا، وەك لە سورەتی تردا باسی فەرمووە جادووییەکی گەورەیانکرد، دار دەست و حەبلێکی زۆریان هێنا بە جادووبازی و لە پێش چاوی ئەو خەڵکە ئەجولان و ئەشلەژان، ﴿قَالَ مُوسَىٰ﴾ موسا فەرمووی: ﴿مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ﴾ ئەوەی کە ئێوە هێناتان و پێی هەڵسان هەر جادووە نەك ئەوەی کە من هێنام و فیرعەون بە جادووی دانا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓ﴾ بێگومان خوا بەتاڵی ئەکاتەوەو نایهێڵێ، واتە دەری ئەخات کە جادووەو شتێکی بەتاڵ و هیچ و پووچە، ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوەو هەموو هەر ڕێك و باشن.

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَـٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾

---

**﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ واتە چونکە بەڕاستی خوا کردەوەی خراپەکاران چاك ناکات، ئەوەش یاسایەکی هەمیشەیی خوایە کەلەکاتی جەنگو تێهەڵچوونی هەقو بەتاڵدا هەق سەر ئەخاتو بەتاڵ لەناو ئەبات، ئیتر هەرچەندی پێبچێت ﴿وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَـٰتِهِۦ﴾ خوا هەق بەهەق دەرئەخاتو نیشانی ئەداتو دامەزراوی ئەکات بەپێی فەرمانو بەپێی بڕیارەکانی ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ با تاوانبارەکانی پێیان ناخۆش بێت، واتە بە کوێرایی چاوی ئەوانو بەداخی دڵیانەوە خوا ئەوە ئەکات، ئینجا دێتە سەر هەڵوێستی سێیەمو پەردەیەك ئەهێنێ بەسەر باسی پێشوودا، بۆ ئەوەی هەڵوێستو باری ئیسرائیلیەکان نیشان بدات کە خوا موسای بۆ ئەوەی لەمصر دەریانکات، ئەفەرموێ: ﴿فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ﴾ ئینجا بڕوای نەهێنا بە موساو ملکەچ نەبوو لەبەر فەرمانی موسا هیچکەس، مەگەر چەند کوڕو کاڵو گەنجێك لە گەلەکەی ﴿عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِمْ﴾ لەگەڵ ترسو بیمیان لە فیرعەونو پیاو ماقوڵو گەورەکانیان کە لەبەر بەرژەوەندی خۆیان گوێ ڕاڵو ملکەچ بوون بۆ فیرعەون، ئەوانەی کە زەلیلو ژێر دەستەن پەنا ئەبەن بە زۆر دارو ستەمکاران بە تایبەت ئیسرائیلیەکان کە چەند ساڵ کران بەکۆیلەو هەموو جۆرە ئازارێك دران، جا لەبەرئەوە ئەو گەورە پیاوە ماقولانە ڕێگر بوون لە بڕوا هێنانی ئەو کوڕوکاڵە، هێندێ ئەفەرموون: ئەو کوڕوکاڵو گەنجانە چەند کەسێك بوون لە گەلەکەی فیرعەون، کاتێ کە جادووبازەکان یەکیان گرتو بڕوایان هێنا ئەو چەند کەسەش بڕوایان هێنا لەگەڵ ئەوەدا بیمو ترسیان بوو لە فیرعەونو کۆڕو کۆمەڵەکەیان، بە جۆرێکی تریش گوتراوە بەڵام هەرجۆرێ یەکەم لەدڵدا بەمێژترە. لەسەر هەربار ئەوانە بڕوایان هێنا لەگەڵ ئەوەدا بیمو ترسیان بوو لە فیرعەونو**

ئەو کۆمەڵە پیاو ماقوڵە، ترسیان بوو لەوەی ﴿أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ﴾ کە فیرعەون لایانداو بە سزادان هەڵیان گێڕێتەوە لە ئایینەکەیان، لەسەر هەربار مەترسییەکە لە فیرعەون ئەکرا، چونکە هەر ئەو فەرماندەرو فەرمان ڕەوا بوو ﴿وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ کاتێکدا بەڕاستی فیرعەون داگیر کەرو بەهێزو زاڵو سەکێش بوو لەوڵاتی مصردا ﴿وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ بەڕاستی فیرعەون لەزیادە ڕەوی کەران بوو لە دڵ ڕەقی و لەسنووری بەزەیی و داد، کەواتە بیمو ترسی لێ ئەکرا. بێگومان بڕوایەك بە نرخ پێویستە کە زاڵ بێت بەسەر هەموو ترسو شتێکدا، ئەبێ دامەزراو بێت لەسەر ئەو ئایینە ڕاستەی کە گرتوویەتییە گەردن، جا لەبەرئەوە موسا ئەم ئامۆژگاریەی ئاڕاستەی ئەو بڕوادارانە کرد کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ﴾ موسا پێی فەرموون ﴿يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ﴾ ئەی گەلەکەم ئەگەر ئێوە بڕواتان هێناوە بە خوا بە ڕاستی ﴿فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ﴾ دەی هەر پشت بە خوا ببەستن ﴿إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ملکەچ و گوێڕایەڵن بە پێی بڕواکەتان، بڕوای ڕاستەقینە ئەوەیە کەلە کردەوەدا دەرکەوێ و کردەوە بەڕاستی دەرکات، پشت بە خوا بەستن نیشانەی بڕوایەو داخوازیەتی، هێزێکە کە بتوانێ بوەستێ لەبەردەم زۆرو سەرکێشیدا، کەواتە موسا(علیه السلام) چارەسەری هەموو گرێیەکی بۆ باسکردن، بڕوادارەکان گوێڕایەڵی خۆیان دەربڕی وەك ئەفەرموێ: ﴿فَقَالُواْ﴾ ئینجا بڕوادارەکان گوتیان: ﴿عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا﴾ هەر بە خوا پشتمان بەستووەو پشت ئەبەستن، لەبەرئەوە ڕوویان کردە قاپی خوا بەم نزایانە: ﴿رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەی پەروەردگار مەمانگێڕە بە جێگەی ئازارو ئەشکەنجەو سزا بۆ ئەو گەلە ستەمکارانە، بەم ڕەنگە زاڵیان بکەیت بەسەرماندا، تا بەهۆی ئەوەوە وا گومان ببەن کە ئەوان لەسەر هەقن و بیروباوەڕەکەی ئەوان ڕاستە، چونکە سەرکەوتوون بەسەر بڕواداراندا، یان مەمانگێڕە بەلادراو لە ئایینەکەمان لەبەر ئەو گەلە ستەمکارانە، بەم ڕەنگە خۆمان بۆ نەگیرێ لە ژێر سزای ئەواندا و لا بدەین لە ئایینەکەمان و شوێن کەوتنی موسا و فروستادەمان، ئەم بارەش ئەگونجێ، بەڵام باری یەکەم باشتر لە دڵدا دامەزراوو بەهێزە، پێویستە بڕواداران بکەن لای خوا بۆ پاراستنیان لەزاڵ بوونی ستەمکاران، بەهەر جۆرو لەسەر هەر بار ئەو بارو مەبەستی یەکەمە ڕێك ترە لەگەڵ ئەم نزای دووەمەدا،

وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ

﴿ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾ ڕزگامان بكه له دهست گهل و كۆمهڵی بێبڕوایان، بڕواداران ئهبێ داوای خۆشی و ئارامی و سهلامهتی و ڕزگاری بكهن لهسزاو ئازارو ناخۆشی، ئهو داوا كردنه دژی پشت بهستن به خوا نییه، بهڵكو بهڵگهیه لهسهری، ئهوهی كه پێویسته لهسهر بڕوادار ئارامی و خۆگرییه لهكاتی سزاو ناخۆشیدا، ئینجا لهپاش بڕواهێنا خوا سروشی كرده لای موسا(علیه السلام) بهم جۆرهی كه ئهفهرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ ﴾ سروش(وهحی)مان كرده لای موسا و براكهی ﴿أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا ﴾ بهمهی چهند خانووو ماڵێك بڕیار بدهن و ڕێكی بێنن بۆ گهلهكهتان لهمصردا كه تێیدا ئارام بگرن و بحهوێنهوه ﴿وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً﴾ ماڵهكانتان بگێڕن بهرامبهری یهك و لهپێش دهمتانهوه، یان بیان گێڕن بهجێی نوێژ ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ بهڕێك و ڕێكی نوێژ بهجێ بێنن تیایاندا، بۆ ئهوهی بێباك و ترس بن نهك له شوێنی تایبهتی كۆببنهوهو بێبڕواكان زیانتان پێبگهیهنن، لهو كاتهدا ناچاربوون بهوه تا كاتی سهركهوتن فهرماندرا به نوێژكردنیان له كهنیسهو جێی تایبهتیدا، لهم فهرمانهدا ئاماده كردنێكی ڕۆحی ههیه لهگهڵ ئامادهیی نیزامیدا، ئهو ئاماده كردنه ڕۆحییه ههرچهند هێندێ له نهفامان نرخێكی پێنادهن بهڵام به تهجرهبه دهركهوت كه ئهو پێویستهو ئهو ئامادهییه ڕۆحییه یهكهم چهكه له مهیداندا بۆ خۆگری له جهنگ و تێك ڕژاندا، تهنیا چهك و كهرهسهی جهنگ شتێكی وا نییه وا ننییه لهكاتی تهنگانهدا، ئهم فهرمانه تایبهتی نییه بهو ئیسرائیلیانهوه، بهڵكو زۆر جار گهلی بڕوادار ئهكهوێته نا گهل و كۆمهڵی نهفامان ـ به وێنهی ئهو ئیسرائیلیانه ـ ئهو كاته ئهبێ به پێی ئهم ڕێنموونییه ڕهفتار بكهن كه لهم فهرمانهوه وهرئهگیرێ:

١- كهنارگیری له كۆمهڵی نهفامان و كۆبوونهوهی دهستهی بڕواداران پێكهوه بۆ پاك و خاوێن كردنی خۆیان و ڕامكردن و ڕێك و پێككردنی خۆیان، ههتا خوا ڕۆژو بهڵێنی خۆی ئههێنێ.

وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ

---

**٢- گۆڕانی جێ و شوێنی خۆیان بە جێگەی نوێژو خواپەرستی، تا بەهۆی ئەوەوە مەبەست بکات بەکەنار گیریەکەو هەڵسێ بە خواپەرستیەکەی لەسەر بارێکی ڕێك و ڕاست، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسێ بە نیزام و ڕێك کردنی خۆی ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ موژدە بدە بە بڕوادارەکان بە سەرکەوتن و بە بەهەشت.**

**لەپاش ئەوە موسا(علیه السلام) نائومێد بوو لە فیرعەون و کۆمەڵەکەی، چاوەڕوانی هیچ خێرو چاك بوونێکی نەما لێیان، ڕووی کردە پەروەردگاری و ئەم نزایەی کرد، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ﴾ موسا گوتی بەم جۆرە نزاکەی کرد ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ بە خشیوتە بە فیرعەون و کۆمەڵەی لە گەورەو پیاو ماقوڵەکانی، خشڵ و زێڕو زیوو پێویسیاتی چاك و شیرین لە ماڵ و ناو ماڵ، ماڵ و سامانێکی زۆر لەم ژیانی دنیادا ﴿رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ﴾ ئەی پەروەردگارمان بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکەن و لایدەن لە ڕێگەی تۆ، لە هەڵخەلەتاندن و هاندانیان، یان بە زۆرو ژێر پێکردنیان، بەهەر حاڵ نیعمەت و ماڵ و سامان لە دەستی زۆردارو ستەمکاراندا دڵ و دەروونی خەڵکی بێ ئارام ئەکات و تێکی ئەدات مەگەر دڵ و دەروونی کەسانێ کە بڕواکەیان بەهێزتر بێت و بزانن کە ئەو ماڵ و سامانە تاقیکردنەوەیە، هەروەها لەڕاستیدا شتێکی بێ نرخەو هیچ نییە لەچاو ئەوەی کە خوا ئەیدات بە بڕواداران و چاکان، بێ گومان زۆریەو گشتی لەبەشی یەکەمن، جا موسا(علیه السلام) بە گوێرەو لەچاوی ئەو زۆریەو گشتییەوە ئەوەی فەرمووە، ویستی و داوای کرد کە ئەو گومڕا کردنە بوەستێ، داوای کرد کە هێزی ستەمکار هۆی ستەمەکەی نەمێنێ. واتە ئەی خوایە ئەوەی بەخشیوتە بەوانە سەرەنجامەکەی ئەوە بووو سەری لەوەوە دەرچوو، کەواتە ﴿رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ ئەی پەروەردگارمان ماڵ و سامانەکانیان کوێر کەرەوەو بیسڕەوە، شێوەو دروشمەکانیان بگۆڕە بە جۆرێ سوودی لێ وەرنەگرن، وەك زۆریە ئەفەرموون. وەك ئەگێڕنەوە پارەو هەموو شتەکانی تریان ئەبوون بەبەرد،(مجاهد) ئەفەرموێ: مەبەست نەهێشتن و لەناو بردنیانە،**

﴿وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ۝٨٨ قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا فَٱسۡتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٨٩ ۞ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ﴾

---

ئەم جۆرەش هەر ئەوە ئەگرێتەوە کە زۆربە ئەفەرموون: ﴿وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ مۆر بنێ بەسەر دڵەکانیانداو دڵڕەقیان بکەو بەهێزو دامەزراویان بکە لەسەر بارو حاڵەتی خۆیان ﴿فَلَا يُؤۡمِنُواْ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بڕوا نەهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾ یان کەواتە بڕوانامێنن، ئینجا یاخوا بڕوا نەهێنن هەتا سزای سەختی ئازار دەربیینن. بێگومان موسا وەك هەموو پێغەمبەرەکانی تر ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ هاتوون بۆ ڕێنموونی خەڵکی و هەمیشە ئارەزوومەندی بڕوا هێنانیان، بەڵام مەسەلەی ئەمانە جیاواز بوو بەم ڕەنگە بە ڕوونی بۆی دەرکەوتبوو کە بەهیچ جۆرو ڕەنگ ئەمانە گەڕانەوەیان نابێ و بە مەیل و خواهیشی خۆیان هەر ڕێگەی بێبڕوایی ئەدەنەبەر، بێگومان لەلایەن خواوە ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە، وەك بۆ حەزرەتی نوح دەرکەوت، جا لەبەر ئەوە ئەم نزایەش نزایەکی ڕاست و ڕەوا بووو جێگەی هیچ ڕەخنەو باسێك نییەو ئەمە ڕازی بوون بە بێبڕوایی نییە، ئەگەر ئەو نزایە ناڕەوا بوایە خوای پەروەردگار بەم شێوەی لێی وەرنەئەگرت کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا﴾ بەڕاستی نزاکەتان وەرگیرا ﴿فَٱسۡتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ شوێن و ڕێگەی ئەوانە مەکەون کە نازانن و نەفامن، بەهۆی ئەوەوە بە نەزانین هەڵئەخلیسکێن، بەبێ ئارامی ئەژین، لەکارو کردەوەکانیاندا نازانن لە ڕێگەی ڕاست ترازاون یان نا؟ ئەو نزایە کە موسا کردی هەر لەلایەن خۆیەوە ئەیکرد، بەڵکو لەلایەن هاورنیشەوە بوو، بێجگە لەوەش ئەم ئامینی لەسەر ئەکرد، کەواتە لەبەر ئەوە فەرمووی نزاکەتان وەرگیرا، ئینجا دێتە سەر هەڵوێستی چوارەم، ئەفەرموێ: ﴿وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ﴾ تێپەڕمانکرد بە نەوەکانی ئیسرائیل و لە دەریاکە پەڕاندمانەوە ﴿فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ﴾ ئینجا فیرعەون و لەشکرەکەی شوێنیان کەوتن، بەڵام نەك بە نیازێکی پاك و لەبەر کارێکی چاك، بەڵکو ﴿بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ﴾ لەبەر ستەمکردن و دوژمنایەتی و دەست درێژی لێیان،

حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾

---

**﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ﴾ هەتا کاتێك خنکانو نوقم بوون گەیشت بە فیرعەون، واتە چوو بە ناو دەریاکەدا تا گەیشتە ئەوەی نوقم ببێو ئومێدی ڕزگار بوونی نەما، لەو کاتەدا ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ ئەوا بڕوام هێنا کە هیچ خوایەك نییە بێجگە لەو کەسەی کە ئیسرائیلییەکان بڕوایان پێهێنا، من لە ملکەچو موسڵمانانمو لەوانەم کە بەناچاری ملکەچ ئەکەن. دیارە بڕوا هێنانی وا هیچ نرخێکی نییەو ئەبێ بەرامبەری ئەمە بگوترێ کە قورئان ئەفەرموێ: ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ ئایا ئێستا بڕوا ئەهێنیو لاف ملکەچی لێ ئەدەیت؟ لە کاتێکدا تۆ لەوەوپێشو تا ئێستا لە خراپەکارانو تێکدەرانی وڵاتو ستەمکاران بوویت؟ ئێستا بڕوا ئەهێنێ کە ناچاریو ئەزانی تێدا چوویتو ڕزگار بوونت نییە؟ ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ﴾ ئینجا ئەمڕۆ دەرت ئەهێنین لە بێخی دەریاکەو ئەتخەینە سەر ئاوەکە بە جەستەو لەشەکەتەوە بەبێگیان، یان ئەتخەینە شوێنێکی بەرز، بە لەشەکەت بەبێ گیان بۆ ئەوەی ببێ بە نیشانەو بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ ئەوەی کەلە دوای تۆ دێت، پەندو ئامۆژگاریت لێ وەرگیرێ، ببینرێ دوا ڕۆژو چارەنووسی ئەوانەی کە یاخینو بڕوا ناهێنن، یان ببێ بە نیشانە بۆ ئیسرائیلییەکان لەسەر ڕاستی موسا ئەوەتا خنکایت لە دەریاکەداو لەسەکەت بەبێگیان بینرا، چونکە وەك لە ڕیوایەتدا هاتووە ئیسرائیلییەکان بڕوایان نەئەکرد کە فیرعەون نەمابێ، بەهەر حاڵ ئەوەی کە بەسەر فیرعەون هات بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایە بۆ خەڵکی لەسەر ڕاستی بەڵێنەکانی خواو پێویستە بێدار کردنەوەیان، ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾ بەڕاستی زۆر لە خەڵکی بێئاگان لە ئایەتەکانی ئێمە، واتە زۆر لە خەڵکی زۆر بەتینە لە بێئاگاییدا لەگەڵ ئەوەدا ئایەتەکانی ئێمە زۆر ڕوونو ئاشکران، بێگومان ئەمە پلار لێدانە بۆ ئەم ئوممەتە.**

وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٖ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخْتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِي شَكّٖ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾

---

ئینجا داستانەکە دوایی ئەهێنێ بە باسی دوا ڕۆژی کامەرانی و بەختەوەریی ئیسرائیلی یەکان هەتا دووبەرەکیان پێکهێنا لە ئایینەکەیاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٖ﴾ سوێند بە خوا ئیسرائیلیەکانمان نیشتەجێ کرد لە شوێنی نیشتەجێیەکی ڕاست و ڕەوادا کە شوێنی خۆش و ئارامی و کامەرانی بوو کە وڵاتی شام و فەلەستین بوو، ﴿وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ لە خۆراک و ڕۆزییە پاک و خاوێنەکانی ڕۆزیمان دان ﴿فَمَا ٱخْتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُۚ﴾ ئینجا ئەوانە دووبەرەکی نەبوون مەگەر لە پاش ئەوەی زانینیان بۆ هات، واتە یەک بوون هەتا زانینی ئایینیان بۆ هات، ئەو کاتە دووبەرەکی لە کاروباری ئایین و دنیایاندا، ئەو زانینەیان بەکارهێنا لە مەبەستی خۆیاندا بە تەئویل و لادان بە ناهەق و ناڕەوا لە تەوراتدا، جا دووبەرەکییەک بەو شێوە زۆر بەدو خراپە، بە چەند جۆری تر تەفسیری ئەو زانینە کراوەتەوە، بەڵام بەو جۆرە لە دڵدا جێگیر ترە کە مەبەست زانینی تەورات و دووبەرەکی لەودا، بەهەر جۆر مەبەست بێت خوا حیساب و پرسیاریان لێ ئەکات لە ڕۆژی دواییدا وەک ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بە ڕاستی پەروەردگارت ـ ئەی پێغەمبەر ـ حوکم و بڕیاری خۆی ئەدا لە نێوانیاندا لە ڕۆژی دواییدا، هەموو هەق و ناهەقێک دەرئەخات، ئینجا لەپاش ئەم داستانە دڵنیایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات لە ڕاستی ئەوەی ڕوویداوە بۆ فروستادەکانی پێش خۆی، دەری ئەخات کە هۆی بڕوا نەهێنانی گەلەکەی کەم و کوڕی بەڵگە و موعجیزەکان نییە، بەڵکو باوی خوا هەر وا هاتووە لە بێبڕوایانی

ڕابردوودا، باوی خوا لەدروستکردنی ئادەمیدا هەر هاتووە کە جیاوازن لە ئادەمییان بۆ خێرو شەڕ چاکەو خراپەو ڕێنموونی و گومڕایی.

دواترین قسەو باس لەبارەی ئیسرائیلیەکان بوو کە نامەدارن و لەنامەکەی خۆیاندا داستانی پێغەمبەرانیان ئەخوێندەوەو زانا بوون پێیان، جا لێرەدا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەگەر گومانی هەیە لەو باس و داستانە، دەی پرسیار بکات لەو نامەدارانە کە زانان بەو باس و هەواڵانە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ﴾ ئەگەر تۆ لە گوماندای لەوەی کە هێنامانە خوارەوە بۆلات ﴿فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ﴾ دەی پرسیار بکە لەوانەی کە نامەیان خوێندووە لەپێش تۆوە، بێگومان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هیچ جۆرە گومان و دوو دڵیەکی نەبووە لەم قورئانەی کە بۆی نێرراوە، وەك ڕیوایەتیش کراوە کە فەرمووی نە گومانم هەیەو نە پرسیاریش ئەکەم، کەواتە مەبەست بەم فەرموودەیە چییە؟ لەدوایشدا ئەم فەرموودەیە ئەهێنێ بەم جۆرە دڵنیایی لەسەر ئەکات بە سوێند لەسەر خواردن، ﴿لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ سوێند بە خوا هەق و ڕاستت بۆ هاتووە لە لایەن پەروەردگارتەوە، کەواتە لەدەستەی گومانداران مەبە، بێگومان ئەم فەرموودەیانە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئەخەنە سۆزو پەرۆش بۆ دەست گرتن و پشت بەستن بەم قورئانە، ئەو دڵەی لەو کاتەدا لە هەموو لایەکەوە ئازارو ناڕەحەتی دائەباریێ بەسەریدا، لەو کاتەدا هێندێ لە موسڵمانان پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، بەهۆی ڕووداوی شەوڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) کە جێگەی بڕوا نەبوو بۆ ئەوانە، خەدیجەو ئەبوو تالیب لە دنیا دەرچوون ئەرکێکی قورسی خستە دڵی بە فەڕی تا ئەو ڕادەی ئەو ساڵەی ناو نابوو بە ساڵی غەمباری، بانگەوازەکەی وەك وەستاوی لێهات بەهۆی زیادە دوژمنایەتی و سەرکێشی قورەیشەوە ئەم فەرموودەیە وەك دڵی بەفەڕی پێغەمبەر(ﷺ) ئەخاتە زیادە سۆزو پەرۆش،

﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾﴾

**هەروەها پلار ئەدات لە گومانداران وەك ئەم فەرموودەی تریش:** ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ **لەوانە نەبیٚ کە بڕوایان نەهێناوە بە ئایەتەکانی خوا تا بەهۆی ئەوەوە لە ڕیزی زیان باران و خەسارەت مەندان بیت. ئەم پلارانە ئەبنە هۆی گەڕانەوە بۆ هەر کەس لەوانە کە بیانەویٚ بگەڕێنەوە چونکە لەکاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی درابیٚ کە پرسیار بکات، ئینجا ئەویش نە پرسیار ئەکات و نە گومانیشی هەیە، کەواتە ئەوپەڕی بڕوای هەیە بەو هەقەی کە بۆی هاتووە، دەی ئەوە پەند و تەمیٚ یە بۆ خەڵکی تریش کە دوو دڵ نەبن و لە گومانداران نەبن، ئەمە بەرنامەیە بۆ ئەم ئوممەتە کەبە هەر شتێکدا بڕوای بەهێزی نەبوو، پرسیار بکات لەزنایان، با ئەو شتە لە چەرگەی بڕوای عەقیدە بێت، چونکە پێویستی سەرشانی موسڵمانە کەبڕوای خۆی بەهێز و پتەو بکات بە عەقیدەو بەرنامەی شەریعەکەتەکەی، بەکوێرانە شوێن نەکەویٚ و لاسایی خەڵکی بکاتەوە، ئینجا هیچ ناڕێکی و دژایەتیەك نییە لەنێوان ڕەوادانی پرسیار لە کاتی گوماندا، لەگەڵ ئەوەی جڵەوگیری لێکراوە مانەوەیە لەسەر ئەو گومانەو هەوڵ نەدانە بۆ نەهێشتنی، بێجگە لەوەش ئەو فەرموودەیە:** ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكّٖ﴾ **داخوازی بوونی گومان نییەو واناگەیەنیٚ کەلە ڕاستیدا گومان هەیە، بەڵکو ئەوە ئەگەیەنیٚ کە ئەگەر لە فەرزێکدا گومان بوو، وتەی(إن) زۆر جار بەکار ئەتهێنیٚ بۆ شتی نەگونجاو کە بەهیچ ڕەنگ نەبیٚ و دەست نەدات بۆ بوون، بۆ وێنە:** ﴿قُلۡ إِن كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٞ﴾ **لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتی ڕابوردووەدا چەند باس و لێکۆڵینەوە کراوەو بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە بەڵام بەڕاستی ئەو قسەو باس و لێکۆڵینەوە لەدڵدا جێگیرو پەسەند نین، ئەوەی کە گوتمان پەسەندو دامەزراوە. ئینجا ئایا ئەوەی کە هاتووە لەلایەن خواوە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەق و ڕاستەو جێگای گومان و دوو دڵی نییە، دەی ئەبیٚ هۆی سەرپێچی و یاخی بوونی ئەوەی ئەو بیٚبڕوایانە چی بێت، بیٚگومان هۆی ئەوەیە کە باوی خوا وا هاتووە هەرکەس هەوڵ نەدات و هۆی ڕێنموونی نەگرێتە دەست ڕێنموونی نابێت و ناکەوێتە سەر ڕێگەی ڕاست، هەرکەس چاوی دڵی نەکاتەوە ڕووناکی نابینیٚ، هەرکەس هۆو کەرەسەی زانین بەکار نەهێنیٚ و پەکی بخات سوود وەرناگرێت لێی، کەواتە دوا ڕۆژی ئەوانە هەر گومڕاییيەو ترازانە لە ڕێی ڕاست، ئیتر هەرچەند لە چەند شوێندا دەست نیشان هەیە بۆ ئەوە.**

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾

---

یەكێ لەو شوێنانە ئەمەیە كە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڕاستی ئەمانەی كە بڕیاری پەروەردگار پێویست و جێگیر بووە لە سەریان بڕوا ناهێنن بەبڕوا نەهێنان و سزادانیان ﴿وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ﴾ هەر چەند هەموو ئایەت و موعجیزەو بەڵگەیەكیان بۆ هاتبێ بڕوا ناهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾ هەتا سزای سەختی ئێش و ئازار دەر ئەبینن، لەو كاتەدا بڕوا ئەهێنن، بەڵام هیچ سوودی لێ وەرناگرن، چونكە بڕواكەیان بە ناچارییەو بەبێ مەیل و خواهیشی خۆیانە، لەپێش چەند كایەتێك بەسەرهاتی فیرعەونی بۆ باسكردین كە لەكاتی ناچاریدا بڕوای هێنا، بەڵام لێی وەرنەگیراو پێی گوترا: ئایا ئێستا بڕوا ئەهێنی؟ هەروەها ئەو هەموو گەل و ئوممەتانی تر كە بڕوایان نەهێنا تا كاتی هاتنی سزاكەیان و كەوتنە ناچاری، بەڵام ئەگەر نەگاتە ئەو كاتە خوای میهرەبان بڕواكەیان لێ وەرئەگری وەك گەل و ئوممەتەكەی یونس، كەلەم ئایەتەدا دەست نیشانی ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ﴾ واتە ماتووڵ باوی خوای بەو جۆرە هاتووە دەی با شارێ شارانەی كە هەڕەشەیان لێكرا بە سزادان و لەناو بردن و لە ڕیشە هێنران، واتە - با هەموو دانیشتووەكانیان - بڕوایان بهێنایە لەپێش هاتنی سزاكەیاندا، تا بەهۆی ئەوەوە بڕواكەیان سوودی پێ بگەیاندنایە، بەڵام هیچكام لەوانە بەو جۆرەیان نەكرد و هەموو بڕوایان نەهێنا تا سزاكەیان هات ﴿إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ﴾ بێجگە لە گەلەكەی یونس ﴿لَمَّآ ءَامَنُواْ﴾ كاتێ كە هەموو بڕوایان هێنا پێش هاتنی سزاكەو دوایان نەخست تا كاتی هاتنی ﴿كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ﴾ لاماندا و بەرگریمانكرد لێیان سزای سەر شۆڕی و زەلیلی ﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەژیانی دنیادا

﴿وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ﴾ ماوەمان دان و ژیانمانن بە خۆشی خۆیان تا ماوەو کاتێک کە ئەو ئەندازەیە خوا بڕیاری داوە لەدنیادا، لەوتەی ﴿قَرۡيَةٌ﴾وە دەرئەکەوێ کە پەیامەکانی لەشارو دێهاتو ئاوەدانیدا بوون، نەک لەناو کۆچەرەکاندا کە زۆر تر نەفام و نازانن و ملکەچی وا گوێڕایەڵی کەمە تیایاندا، تەفسیرەکەم لەسەر ئەوە کرد کە ﴿إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ﴾ موتەسیل بێت، زۆر لە زانایان ئەیکەن لە مونقەتیع، بەڕاستی هەرچەند باری مونقەتیعیش ڕێک و گونجاو بێت بەلاّم لەدڵی خۆمدا باری موتتەسیلی گونجاو ترو بەهێزترە، لەبەر ئەوەی تەفسیرەکەم لەسەر ئەم بارە کرد، ئایەتەکە درێژە نادات بە داستانەکە، بەڵکو دەست نیشان ئەکات بەکورتی بۆ سەرەنجام و دوا ڕۆژی ئەو گەلە، چونکە لێرە هەر ئەوە مەبەستە، کەواتە با ئێمەش هیچی تر نەڵێین، بەڵکو هەر ئەوە ئەڵێین: گەلی یونس سزایەکی ڕیسواو ئابڕو بەر ڕووی تێکردبوون، ئینجا کە بڕوایان هێنا لەدوا کاتدا پێش هاتنی سزاکە خوا سزاکەی لێ لادان و نەیهێشت بیانگرێ، وازیان لێ هێنرا تا کاتی دیاریی کراوی خۆی بژین لە دنیادا، ئەگەر ئەمانیش بڕوایان نەهێنایە ئەو سزایە داگیری ئەکردن و لەناوی ئەبردن وەک گەل و ئوممەتە بێبڕواکانی تر کە بەپێی باوی خوا کەبە گوێرەی کردەوەی بەدی بەندەکانی دووچاریان ئەکات. ئەم ئەندازەیە بەسە لێرەدا بۆ ئەوەی تێبگەین و ئاگادار بین دووشتی گرنگ:

١- بانگکردن و هاوار کردن لە بێبڕوایان کە فریای خۆیان بکەون و دەست بگرن بە هۆی ڕزگاربوونیان، بەڵکو بەوێنەی گەلەکەی یونس خوا بیانپارێزێ لە سزای ڕیسواکەر، کە ئەوە مەبەستە لە هێنانی ئەم داستانەدا....

٢- ڕزگارکردنی ئەو گەلە بەهۆی بڕوا هێنانەکەیانەوە باوێکە لە باوەکانی خوا، هەرچۆنێ لەناو بردن و سزادانیان باوێک ئەبوو لە باوەکانی خوا ئەگەر بڕوایان نەمێنایەو هەر بەردەوام بوونایە لەسەر بێبڕوایی خۆیان، کەواتە هیچ زۆر پێهێنان و ناچار کردن نییە

له کردەوەکانی خەڵکیدا، بەڵکو ئەوەی کەبەندە ناچاربێت و بێدەسەڵات بێت له ئاستی پەیدا بوون و فەراهەم هاتنی سەرەنجام و بەرهەمی کردەوەکەیەتی، بەم جۆرە هیچ جۆرە قۆرت و گرێ و پێچی پەیدا نابێ هیچ کەسێکدا سەبارەت بەو ئایەتانەی که زاڵی و گشتێتی مەیل و خواهیش خوا نیشان ئەدەن و بۆ هەموو کردەوەکانی بەندە لەگەڵ زاڵی و گشتێتی مەیل و خواهیشی خوا نیشان ئەدەن بۆ هەموو کردەوەکانی بەندە لەگەڵ ئەوەدا بەندەیە خاوەنی مەیل و هەڵبژاردن دابنرێ. یەکێ لەو ئایەتانە ئەم ئایەتەیە که لێرەدا هاتووە و ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ﴾ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ﴿لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾ هەرکەس و وا لەزەویدا هەموو پێکەوە بڕوایان ئەهێنا بەم ڕەنگە ئەم ئادەمییەی بە جۆرێکی تر دروست ئەکرد، که تەنها ڕێگەی بڕوای بدایەتە بەر وەك مەلائیکە، یا یەك ئادەمی ئەبوو ئەندامەکانی ڕاکێشێ بۆ بڕوا هێنان، ئەگەر خوا ئەوەی بویستایە ناچاری ئەکردن و بە زۆر هەمووی ئەگێڕان بە بڕوادار، بەڵام کار دروستی خوا داخواز بوو بۆ ئەوەی ئەم دروستکراوە بە جۆرێکی تایبەت دروست بکات کە ئامادەیی ببێ بۆ چاکە و خراپە و گومڕایی و ڕێنموونی، بەدەسەڵاتدار و توانای کرد بۆ هەڵبژاردنی ئەم ڕێگەیە یا ئەو ڕێگەکەی تر، بڕیاریدا که هەرکاتێ ئەو هەست و هۆش و لێهاتن و توانای خۆی بەکار بێنێ له دۆزینەوەی خێر و چاکە و ڕاستیدا، بیرکردنەوە لەو پەیام و بەڵگە و نیشانانە که لەلایەن پێغەمبەرانەوە پێی ڕائەگەیەنرێ، هەرکاتێ بەو جۆرەی کرد ئەوا بڕوا ئەهێنێ و بەو بڕوایە ڕێگەی ڕزگاری ئەداتە بەر، بە پێچەوانەی ئەوە ئەبێ کاتێ که هەست و هۆش و لێهاتن و توانای خۆی لەکار خست و بیری نەکردەوە لە هۆی ڕزگاریەکەی، ئەو کاتە سەری هەر لەبێبڕوایی و خراپەکاریەوە دەرئەچێ، کەواتە بڕوا هێنان خراوەتە ژێر دەستی خۆی و وازی لێ هێنراوە بۆ هەڵبژاردنی خۆی، نە پێغەمبەر و نە هیچکەس زۆر ناهێنێ بەخەڵکی لەسەر بڕوا هێنان، چونکە هیچکەس دەسەڵاتی نییە بەسەر دڵی خەڵکیدا،

أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ

---

لەبەر ئەوە بە بێزاری دەربڕینەوە ئەفەرموێ: ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ دەی ئایا ئەی پێغەمبەر تۆ زۆر ئەهێنیٚ بەخەڵکی هەتا بن بە بڕوادارو بڕوا بهێنن، واتە نەخێر تۆ ناتوانی بە زۆر بڕوا بێنی بە خەڵکی، بەڵکو بڕوا هێنان هەر بە دەست خوایە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴾ نەبووەو نەگونجاوە بۆ هیچ کەسێك، کارو پیشەی نییە کە بڕوا بێنێ مەگەر بەئیزنو مەیلی خواو بەبێ ئەو باوو ڕەوشتەی کە دایناوە، کەواتە هەرگیز بڕوا ناهێنێ ئەگەر ڕێگەی بڕوا نەداتە بەرو ڕێگەکەی تر بداتە بەر، مەبەست ئەوەیە نەك مەبەست ئەوەبێت کە ئەم بڕوای ئەوێو ڕێگەی بڕوا ئەداتەبەر، کەچی بەرگری ئەکرێ لێی، نەخێر مەبەست بەو ئایەتە ئەمە نییە، بەڵکی مەبەست ئەوەیە: بڕوا ناهێنن مەگەر کاتێ ڕێگەی بڕوا بداتە بەر، وەك باسکرا، ئەو کاتە خوا ڕێنموونی ئەکاتو بەئیزنی خوا بڕوا ئەهێنێ، کەواتە هیچ شتێ بەدی نایەتو تەواو نابێ مەگەر بەبڕیارێکی تایبەتی بۆی خەڵکی ڕێگەی ئەدەنەبەر، ئینجا خوایش دوا ڕۆژو سەرەنجام بەدی ئەهێنێ، ئەوەی کە ڕێگەی بڕوا ئەداتە بەر بەم ڕەنگە ژیرەو بیر ئەکاتەوە لە ئایەتو بەڵگەکانی خوا، خوا ڕێگەی بڕوای بۆ ئاسان ئەکات ﴿وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بەد ترین پیسی واتە بێبڕوایی کە سەرچاوەی هەموو بەدیو پیسیەکە، بڕیار ئەدات بەسەر ئەوانەی کە ژیر نینو ڕێگەی بڕوا نادەنە بەر وتەی(رجس) بریتییە لە ناشیرین ترینو چڵكو چەپەڵی ڕۆحی، ئینجا باشتر کارەکە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە سەرنج بدەن ئایا چییە ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدا لەو هەموو ڕابەرو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەو ئەو هەموو ڕژێمو یاسا نایابانەی کە هەیە لەمانگو خۆرو ئەستێرەکانو شەوو ڕۆژ... هتد، کە هەرکام لەوانە بەسە بۆ هەرکەسێك کە ژیر بێباوەڕەکانی، بۆ بڕوا

هێنان بە تاك و تەنیایی ئەو پەروەردگارەی کە داهێنەرو بەڕێوەبەری ئەو بوونەوەرەیە: ﴿وَمَا تُغْنِي ٱلْآيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ ئایەتەکان و ترسێنەرەکان هیچ سوود ناگەیەنن بە کەسانێ کە بڕوا ناهێنن، چونکە بیر ناکەنەوەو کوێرن لە ئاستیان یان ئایا ئایەتەکان و ترسێنەرەکان چ سوودێك ئەگەیەنن بە گەل و کۆمەڵێك کە بڕوا ناهێنن؟ واتە هیچ سوودێك ناگەیەنن، چونکە ئەم بوونەوەرە نایاب و سەرسوڕهێنەرە لە هەموو چەرخ و کاتێکدا بۆ هەموو کەسێك چ خوێندەوارێك بەسەو ئاشکرا ترین ڕابەرو نیشانەیە لەسەر تاك و تەنیایی و دەسەڵات و کار دروستی پەروەردگار، مەگەر بۆ کەسێك کە چاوی دڵی کوێر بووبێ و هەست و هۆش و ژیریی لەکار کەوتبێ، بەڵام بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە زۆر جار دڵی بێئاگا ئەبێ لێی، لەبەر ئەوە زۆر جار قورئان خەڵکی بێدارو ئاگادار ئەکاتەوە لەو خەوی بێئاگاییەو سەرنجی ڕائەکێشێتەوە.

ئەم بوونەوەرە گرنگ و پان و فراوانە کە تەنها خوا ئەزانێ ئەندازەو ڕادەی فراوانیەکەی، ئەم بوونەوەرە بە خۆی و هەموو بەش و پارچەکانیەوەو هەرچی لەناویدایە، خوای خۆی ئەناسێ و موسڵمان و ملکەچە بۆی، بێجگە لەهێندێ ئادەمی و جن کە خۆیان ئەکەن بە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخ، سەرنج ڕاکێشانی دڵ و ژیریی بۆ تێڕوانین و بیرکردنەوە لەم بوونەوەرەدا، هۆیەکە لە هۆیەکانی بەرنامەی قورئان بۆ زیندوو کردنەوەی دڵی ئادەمی، بەڵکو نەبزو دەماری لێبدات و بکەوێتە بزووتنەوە، وەرگرتن و گوێڕایەڵی، بەڵام ئەو بێبڕوا نەفامانەی عەرەب و وێنەیان بیرناکەنەوەو گوێڕایەڵی ناکەن، دەی ئەبێ ئەوانە بە تەمای چی بن و چاوەڕوانی چی بن؟ بێگومان باوی خوا گۆڕانی بۆ نیبە، چارەنوس و دوا ڕۆژی بێبڕوانیش شتێکی بەناو بانگە، هێندێ جار مۆڵەتیان ئەدات و لەناویان نابات، بەڵام ئەوانەی کە هەر سوورن لەسەر بێبڕوایی و ناگەڕێنەوە ئەبێ دووچاری تۆڵەو سزای خۆیان ببن وەك ئەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِهِمْ﴾ کەواتە ئایا ئەوانە چاوەڕوانی چی ئەکەن بە تەمای هیچ هەن بێجگە لەوێنەی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئەوانەی کە تێپەڕیان کرد لە پێش ئەواندا، واتە نابێ بە تەمای هیچ بن بێجگە لەوێنەی ئەو سزاو بەسەرهاتە سەختەی کە دووچاری گەلە ڕابردووەکان بوو کە بڕوایان نەهێنا و یاخی بوون لە پێغەمبەرەکانیان،

قُلْ فَانتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾

---

﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ بە شێوەی ترساندن و هەڕەشە: ﴿فَانتَظِرُوٓاْ﴾ کەواتە چاوەڕوانی بکەن بۆ ئەوەی کە باسکرا ﴿إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾ بەڕاستی منیش لەگەڵ ئێوەدا لەوانەم کە چاوەڕوانی ئەکەن بۆی، ﴿ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە بێ بڕوا و یاخیەکانمان لەناو بردووەو ئینجا فروستادەکانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە پێیان ڕزگارمان کردن، بە وتەی ئێستا و ئامادە ئەفەرموێ، نەك بەڕابووردوو، لەبەر ئامادەکردنی و خستنە بەرچاوی شێوەی ڕزگار کردنەکە، کە ئەوەش یاسا و باوێکی شیرینە لە ڕەوانبێژیدا، ﴿كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بەوێنەی ڕزگار کردنی ئەوانەی پێشوو ڕزگار ئەکەین ئەم بڕوادارانە، واتە پێغەمبەرو بڕواداران و هاوەڵەکان، یان هەر مەبەست هاوەڵەکان بێت و پێویست نییە بە باسی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ڕزگار بوونی ئەو جێگە قسەو باس نییەو ڕزگار بوونی بڕواداران بەهۆی بڕوا هێنانە بەو، لەنێوان وتەی: ﴿كَذَٰلِكَ﴾و ﴿نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بە تێهەڵکێش فەرمووی: ﴿حَقًّا عَلَيْنَا﴾ واتە ڕزگار کردنی ئەم بڕوادارانە ڕاست و پێویست بوو لەسەرمان و پێویست بوو بە فەزڵ و بڕیارو میهرەبانی خۆمان، ئەم دوو ڕستەیە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە هەرکام لەوانەش هەر ئەگونجێ بەڵام ئەمەی کە کردم بە تەفسیر بێ ئەك ترو لەدڵدا جێگیر ترە، بەڵێ کارەکە هەر بەو جۆرە هات و بە پێی بڕیاری خوا کە ئەبێ تۆمەی پاکی بڕوادار ئەبێ بمێنێ و بڕوێ و گەشە بکات و ڕزگار ببێ لە پاش هەموو سزاو ئەشکەنجەو بیم و ترسێك، لەپاش هەموو بەسەر هاتێکی سەخت. ئەو داستان و سەر گوزەشتانەی کە لەم سوورەتەدا هاتن شایەتێکی ڕاست و ڕەوانن لەسەر ئەوە، بێگومان هەرواش ئەبێ، دەی با بڕواداران دڵنیا و دڵ ئارام بن.

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا﴾

**ئەم سورەتە ئێرە گەردش و خولانەوەی کرد بەدڵ و دەروون، بەدەوری چەند مەسەلەو مەبەستێکی سەرەکی و گەورەی عەقیدەی ئیسلام: بڕیاردانی پەروەردگارێتی و سەرپەرشتی و چاودێریی و حاکمێتی تەنها بوو، بەبێ هیچ جۆرە هاوبەش و تکاکار، گێڕانەوەی هەموو کاروبارێك بۆلای خوا، بۆ باوو ڕەوشتێ کە بڕیاری داوەو هیچ کەسێك ناتوانێ دەست گۆڕانکاری تێدا بکات، ڕاستی پەیام و وەحی، زیندوو بوونەوەو ڕۆژی دوایی و دادپەروەری لەو ڕۆژەدا، ئینجا ئەو مەبەست و مەسەلە سەرەکیانە کۆ ئەکاتەوە لەم چەند ئایەتە کورتانەی کە دێن و سورەتەکەیان پێداویی دێت، فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە جاڕی پێبدا بەناو هەموو ئادەمیدا بەگشتی و بەتێکڕایی، دواترین بڕیارو قسەی ئەمەیە کە لەسەر بارو بڕیاری خۆی ئەڕوا بە ڕێك و ڕاستی، هەتا خوا بڕیاری خۆی ئەدات کە بڕیار هەر بڕیاری ئەوە. ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی بەگشتی، ئەی خەڵکینە: ﴿إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى﴾ ئەگەر ئێوە لە گومان لەڕاستی ئایینەکەمدا کە بانگی ئێوەی بۆ ئەکەم و ئێوە بە نەفامی وا ئەزانن کە من لام داوە لەڕێگەی ڕاست، ئەگەر ئێوە لە گومان دان: ﴿فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوا من هیچ کات ناپەرستم ئەوانە بەناهەق و ناڕەوا، ﴿وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ﴾ بەڵکو ئەو خوایە ئەپەرستم کە ناوی ﴿ٱللَّهَ﴾یە و ئێوە ئەمرێنێ، واتە ئەگەر ئێوە لە گوماندان ئەوا من هەواڵتان ئەدەمێ بەوەی کە بێجگە لەوە هیچ بارو گۆڕانێکی ترم نییەو تەنها ئەو خوا ئەپەرستم کە مردنی ئێوەی بەدەستە، هێنانی ئەم سیفەتە بەتایبەتی بۆ بیرخستنەوەیانە، ئەجەل و مانەوەیان هەر بەدەست ئەوە کەواتە هەر ئەو شایستەیە بۆ پەرستن نەك ئەو پەرستراوانی ئەوانە کە نەگیان ئەدەن و نەگیان ئەسێنێ لە کەس، دیارە ئەمەش ترساندن و هەڕەشەی تێدایە، ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ فەرمانم پێدراوە کە من لەبڕوا داران بم، کەواتە من بەپێی ئەو فەرمانە ڕەفتار ئەکەم و لێی تێپەڕ ناکەم ﴿وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا﴾ فەرمانم پێدراوە بەمەی کە بەڕێك و ڕاستی ڕووی خۆت ڕاگیر بکە بۆ ئایینەکەت بە جۆرێ هەر ڕووت بۆلای ئەوبکەو لادە لە هەر شتێکی تر، واتە بە تەواوی ڕووبکەرە پەرستنی ئەوو ڕوو وەرگێڕە لە غەیری ئەو،**

وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا

---

﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ **بەهیچ جۆر لەهاوبەش پەوادەران نەبی،** ﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ﴾ **هاوار مەكەو مە پەرستە بێجگە لە خوا هەر شتێ كە سوودت پێناگەیەنێ ئەگەر بیپەرستی و زیانت پێناگەیەنێ ئەگەر نەیپەرستی، واتە بێجگە لە خوا هیچكەس و هیچ شتێكی تر نە سوودو قازانجی بە دەستەو نەزیان، هەر شتێكیش كە ئەوانەی بەدەست نەبێ شیاوو شایستەی پەرستن نییە،** ﴿فَإِن فَعَلْتَ﴾ **كەواتە تۆ ئەگەر كاری واتكرد، واتە پەرستنی بێجگە لە خوا** ﴿فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ **بێگومان ئەو كاتە تۆ لە ستەمكاران ئەبی و ناهەقی ئەكەیت،** ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ﴾ **ئەگەر خوا دووچارت بكات بە هەر زیانێك هیچ لادەرو چارەسەرێك نییە بۆ ئەوە بێجگە لەو،** ﴿وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ﴾ **ئەگەر نیازی خێرو خۆشی پێبكات ئەوا هیچ بەرگری كەرێك نییە بۆ چاكەو بەهرەی خواو هیچ شتێك ناتوانێ ئەو چاكەو بەهرەیە بگێڕێتەوە، واتە هەر خێرو خۆشی و چاكەیەك كە خوا بیكات بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی ئەیدات و ئەیبەخشێ، ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ و بەرگری بكات،** ﴿يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ **خوا بەو خێرو خۆشی و فەزڵە بەهرەمەند ئەكات هەركەس لە بەندەكانی كە خوا خۆی بیەوێ و مەیلی بكات** ﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ **خوای گەورە لێبووردەی بە بەزەییە، ئەگەر ئەو سیفەتانە نەبوایە هیچكەس شیاوی ئەو چاكەو بەهرانە نەئەبوو، بەڵكو بەهۆی تاوان و گوناهەوە هەموو كەس، بەڵكو هەموو گیانلەبەرانی لەناو ئەبرد هەر لەدنیادا پێش سزای ڕۆژی دوایی وەك ئەفەرموێ لە ئایەتی تردا:** ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ﴾ **ئەگەر خوا خەڵكی**

بگرتایە بەهۆی کردەوەی بەدو خراپیان‌و بە پێی ئەوە ڕەفتاری لەگەڵ بکردنایە هیچ گیانلەبەرێکی نەئەهێشت و وازی لێ نەئەهێنا کە لەسەر زەوی‌و بەسەر پشتی زەوییەوە.

ئەمە کورتەو پاڵفتەی هەموو عەقیدەی ئیسلامە لەوەی لەو سورەتەدا هات، فەرماندرا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە جاڕی پێبدا لەناو خەڵکدا، ڕووی فەرموودەی تێکرا وەك ئەم بەسەر پێشانگایەك بێت لەوانەوە، بە تایبەتی ئەوانە مەبەست بن بەم ئایەتە، ئەم جۆرە ئوسلوب‌و ڕەوشتە لە پەندو تەمێدا زۆر بەکارە دەرووندا، بەم ئایەتانە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) وەستا بەرامبەر ئەو کۆمەڵە زۆرو بەدەسەڵاتە، بەرامبەر ئەو هەموو بیروباوەڕە پڕوپووچەی کە ساڵە های ساڵ جێگیر بوو بوون لە مێشك‌و لە دەماغیاندا خویان پێوە گرتبوو، بەرامبەرو ڕووبەڕووی مێژووی هاوبەش ڕەوادەران‌و بت پەرستان، ئەوە هەرچەند سەخت‌و گران بوو بەپێی بۆچوونی خەڵکی کارێکی نەگونجاو بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ پێچ‌و پەنا و بە هەموو هێز جاڕیدا لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی کەمی بێدەسەڵاتی لەگەڵ بوو لە مەککەدا، هێزو دەسەڵاتی ئاشکرا هی ئەو بت پەرستانە بوو. هەرچەند کاروبارەکە بەو جۆرە بوو، بەڵام ئەبێ بانگ کردن بۆلای خوا بکرێ‌و ئەرکی هەڵگیری‌و بخرێتە گەردن‌و سەرشان، هەق‌و ڕێی ڕاست ئەبێ بە هێزو بڕوای بەهێزەوە دەستی بۆ ببرێ، جا لەبەر ئەوە ئەم جاڕە دواییەشیدا بۆ هەموو کەس‌و هەموو ئادەمی: ﴿ قُلْ ﴾ بڵێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی خەڵکینە بە تێکڕایی ﴿قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ﴾ بەڕاستی هەقتان بۆ هاتووە لەلایەن پەروەردگارتانەوە، ئەمە دواترین جاڕە، ئەمە وتەیەکە جیا بوونەوەیەکی تێرو تەواو نیشان ئەدات، هەرکەس هەر باوەڕو هەر ڕێگەیەك هەڵئەبژێرێ بۆ خۆی ئەتوانێ و سەربەستە، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ﴾ ئینجا هەرکەس ڕێنموونی وەرگرتبێ ئەکەوێتە سەر ئەم هەق‌و ڕێگە ڕاستە، ڕێنموونی‌و شوێن کەوتنەکەی هەر بۆ خۆیەتی، واتە سوودو پاداشت‌و بەرهەمەکەی هەر بۆ خۆیەتی ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ هەرکەسیش ون و گومڕا بوو بێت‌و لایدابێ لەو ڕێگە هەق و ڕاستە ئەوە هەر بە دژی خۆی گومڕا ئەبێ و لائەدات، چونکە سزاو تۆڵەکەی هەر بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە،

﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ﴾ من وەكیل و لێپرسراو نیم بەسەرتانەوە لەلایەن خواوە کە بە زۆر بتان خەمەسەر ڕێگەی هەق و ڕاست و بەرگریتان بکەم لە لادان و گومڕایی، واتە: بەڵکو ڕێ نیشان دەرو ڕاگەیەنەرم پێتان، ئێوە حەواڵەی ئیرادەو هەڵبژاردنی خۆتان کراون، لە پاشان بۆ بڕیارو قەدەری خوا، ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بەم بەندو تەمێ بەرزو شیرینە کە ئاڕاستەی پێغەمبەری خۆشەویستی ئەکات(ﷺ): ﴿وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ﴾ شوێنی ئەوە بکەوە کە شورش کراوە بۆ لات ﴿وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ﴾ بە ئارام و خۆگریە هەتا خوا حوکم و بڕیاری خۆی ئەدات لەنێوان تۆو ئەو بێبڕوایانەدا، ئەو بەڵێنەی کە پێی داویت بەدی ئەهێنێ ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ ئەو باشترینی هەموو حاکم و بڕیار دەرانە، چونکە ئەو حوکم و بڕیار هەر بە هەق و بە داد ئەدات، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرمانبەری و گوێڕایەڵی فەرمانی خوای خۆی کرد، خۆی گرت بەرامبەر ئەو هەموو ناخۆشییە، تا خوا بڕیاری داد و هەقی خۆیدا، بەڵێنەکەی خۆی بەدی هێنا، بەم شێوەیە ئەوانی گرفتاری کردەوەی بەدی خۆیانکرد، ئەمانیشی کرد بە جێنشین لە وڵاتدا، جڵەوی ژیان و جیهانی خشتە دەستیان، کردنی بە مامۆستای جیهان، ئەوانەی کەلەپاش ئەوان هاتن هەر بە بەهرەمەندی مانەوە هەتا بەرە بەرە لایاندا لە ڕێبازە ڕاستەکەی ئەوان. ئینجا بە پێی تاوان و پلەی لادانەکەیان کشانەوە لەو ڕێزو بەرزیەی کە خوا پێی دابوون، لەسایەو پەنای ئیسلامدا، تا لەم دواییەدا بە تەواوی ژێر پێ و پێشێل کران و نیشانەو دروشمی حوکم و میریی و دەوڵەتیشیان نەما مەگەر هەر بەناوی ڕووت، بەڵام سوپاس بۆ خوای میهرەبان ئەوا لە هەموو لایەکەوە بێداری و خەبەر بوونەوەی موسڵمانان پەیدا بوویەوە، موسڵمانان ڕێگا ڕاستەکەی خۆیان دایەوە بەر، کە ڕێگەکەیان تێکۆشان و فیداکاریە لە ڕێگەی خوادا، بە هۆی ئەوەوە بەرەبەرە بەرز ئەبنەوە بۆ ڕادەو پلەی بەرز یخۆیان، بە ئیزنی خوا ئەمان بەردەوام ترو بەهێزتر ئەبن لەسەر کاری خۆیان، بێگومان بە پێی ئەوە یارمەتی خواو زاڵ کردنیان مسۆگەرە بە پێی بەڵێنی خوا، بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ئەوە سەربازو تێکۆشەرانی ئەفغان بوو کە بەکەمی ژمارەو بەبێ نەوایی و بەکەمی چەکەوە هەڵسان بەرامبەر دڕندەترین و ڕەق ترین هێز لە دنیادا وەستان کە هێزی ڕووسە، لە پاش جێگیر بوون و دامەزراون و پێکهێنانی دەوڵەتێکی بەکرێ گیراو هەر لە ئەفغانیەکان لە

ژێر چاودێریی ئەو دوژمنە خوێنە خوارەدا، ئەو کۆمەڵە موسڵمانە ڕەش و ڕووت و بێ دەسەڵاتە ئەو هێزی ڕووسەی ناچار کرد بە ڕیسوایی و بەبێئابڕوویی و بەزیانێکی زۆرەوە کشانەوەو وڵاتەکەیان پاککردەوە لەو چڵک و پیسییە، ئێستا ماوەتەوە چڵکی بەکرێ گیراوەکان بە ئیزنی خوا بە تەواوی وڵات پاك ئەکەنەوە لەوانیش، داواکرین خوای میهرەبان یارمەتیان بدات کە دەوڵەتێکی ئیسلامی ڕاستەقینەمان بۆ پێك بێنن کە ببن لە مامۆستاو ماندەرو پێشەوا لە ناوچەو وڵاتەکانی تری ئیسلامدا، خوا بە میهرەبانی خۆی پاداشتی برا تێکۆشەرەکانی ئەفغان بداتەوەو ئەم ئاواتەشمان نیشان بدات، آمین.

وصل الله وسلم علي سيدنا محمد وآله وصحبه وتابعهم بإحسان إلي يوم الدين.

لەم بەیانی ڕۆژی جمعەدا دوایی هات، خوا بە میهرەبانی خۆی وەری گرێ و ئەوەی کە ماوە لەپاش ئەم سورەتە تا سورەتی ﴿الكهف﴾ پێم تەواو بکات کە لەوێدا تەفسیری هەموو قورئانەکە تەواو ئەبێ، سوپاس بۆ خوا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾

## سورەتی «هود»
## مەککەییەو(١٢٣) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە لە پاش سورەتی ﴿یونس﴾ هاتووەتە خوارەوە، سورەتی ﴿یونس﴾یش لە پاش سورەتی ﴿إسراء﴾ هاتووە، بە هۆی ئەوەوە دەرئەکەوێ کە لە سەخت ترین کاتدا هاتووە، لە پاش لە دنیا دەرچوونی ئەبو تالیب و خاتوو خەدیجە هاتووەکە ئەو ساڵە ناو برا بە ساڵی غەم و پەژارە، بت پەرستەکان کەوتنە ئەوپەڕی بێشەرمی، بە تایبەتی پاش ڕووداوی شەوڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) کە شتێکی زۆر دوور بوو لای بێبڕواکان و بوو بە هۆی دەم بازی و لاقرتی کردنی ئەوان، بوو بە هۆی پاشگەز بوونەوەی هێندێ لەوانەی تازە موسڵمان بووبوون و بڕوای بەهێزیان بۆ پەیدا نەبووبوو، لەو کاتەدا قوڕەیش ڕاپەڕین لە خۆی و بانگەوازەکەی تا ڕادەیەك بزوتنەوەی نەماو هیچکەس لە مەککەییەکان و دەورو بەری موسڵمان نەئەبوون، ئەوەش کەمێك پێش ئەوە بوو کە خوا دەروو بکاتەوە بە هۆی پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم کە سام و ترسی خستە دڵی قوڕەیشییەکانەوە وەك(ئیبن و ئیسحاق)بە درێژیی ئەم باسە ئەکات، هەروەها خاوەنی(امتاع الاسماع).

ئینجا با بێینە ژێر سایەی ئایەتەکان و دڵی خۆمانی بۆ بکەینەوە تا پیت و فەڕەکانی بیارێنێ بەسەر دڵ و دەروون و هەست و هۆشماندا، بە یارمەتی خوا. لە یەکەم جارەوە لە پاش ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ دەروازەی سورەتەکە ئەکاتەوە بەم سێ ناوە(ألف، لام، را) کە هەر کام ناوە بۆ پیتێ لەو پیتانەی کە ئەو خەڵکە ئاشنا بوون پێیان و قسەو گفتو گۆیان پێئەکردو وتەو وتاری خۆیان پێك ئەهێنا لەوان و لە وێنەیان، لە سەرەتای هێندێ لەو

سورەتانەی کە ناوی ئەم پیتانەیان لە شوێنەوە هەیە بە تایبەتی سورەتی ﴿یس﴾ ڕای زانایانمان باسکرد لە بارەی ئەو ناوو پیتانەوە، یەکێ لەو ڕایانە ئەمە بوو کە قورئان بەر ئەبڕێتەوە لە بێبڕواکان کە ئەم قورئانە پێکهاتووە لە وێنەی ئەم پیتانە کە ئەوان وتەو وتاری خۆیانی لێ پێك ئەهێنن لەگەڵ ئەوەدا دەستەپاچەو پەککەوتوون لەوەی وێنەی بڵێن، کەواتە با بڕوا بێنن کە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووەو هیچکەس ناتوانێ لاسایی بکاتەوەو وێنەی بڵێ، جا لەسەر ئەم ڕایە ئەڵێین: ﴿الٓر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ﴾ پێك هاتووە لە وێنەی ئەم پیتانە نامەیەکی بەرزو بەڕێز کە ئایەتەکانی داڕێژراوەو هۆنراوەتەوە بە جۆرێ کە هیچ کەمو کوڕیو دژایەتیو پێچەوانەیی کار دروستیو بەرژەوەندی ڕووی تێناکات، هەموو وشەو وتەیەکی بەجێیەو لە شوێنو جێگای خۆیدایە، ﴿ثُمَّ فُصِّلَتۡ﴾ ئینجا جیا کراونەتەوەو بەش بەش کراون بە پێی مەبەستەکانیان، ئەوەتا بەشێ باسی خواپەرستییەو بەشێ باسی حەرامو حەڵاڵەو... هەروەها، واتە ئەم نامەیە خاوەنی ئەم دوو سیفەتەیە لە یەك کاتدا بەبێ دواو بەر، یان لە دوو کاتدا بەبێ دواو بەر، بەم ڕەنگە بە کورتی مەبەستی ئایەتەکانی هاتوون لە هێندێ سورەتدا لە پاشان بە درێژی لە هێندێ لە سورەتەکانی تردا، ﴿مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ واتە من ئەم نامەیە کە هاتووە لەلایەن لێزانو کاردروستێکی زانای با خەبەر، یان ئایەتەکانی داڕێژراوەو ئینجا جیا کراونەتەوە لەلایەن کار دروستێکی با خەبەرەوە، کەواتە ئەم نامە بەرزە خوا بەم جۆرەی لێکردووەو ناردوویەتی تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) دەخلی لەوەدا نییەو لە توانای ئەویشا نییە،(زەمەخشەری) وتەیەکی شیرینی هەیە لێرەدا سیفەتی(احکمت) ئەگێڕێتەوە بۆ(حکیم)و(فصلت) ئەگێڕێتەوە بۆ(فصلت) واتە ئایەتەکانی داڕشتووە کاردروستێکی لێزان، ڕوونو جیای کردوونەتەوە زانای باخەبەر بە هەموو کاروبارو چۆنێتی هەموو شت، ئایەتەکانی بەو جۆرە هاتوون ﴿أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۚ﴾ لەبەرئەوەی ئێوە هیچ شتێ نەپەرستن جگە لە خوا، ﴿إِنَّنِي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٌ﴾ بە ڕاستی من بۆ ئێوە لەلایەن ئەو خواوە ترسێنەرمو ئەتان ترسێنم بە سزای خوا ئەگەر بڕوا نەهێننو واز نەهێنن لە پەرستنی بێجگە لە خوا، ﴿وَبَشِيرٌ﴾ موژدە دەرم پێتان ئەگەر بڕوا بێننو تەنها خوا بپەرستن، بەم فەرموودەیە پەیامەکەی خۆی ڕائەگەیەنێ لەگەڵ کارو کردەوەی لەگەڵ ئەواندا،

وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَـٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾

---

﴿وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ﴾ ئەو ئایەتانە هاتوون بەمەی کە ئێوە داوای سڕینەوەو لێبوردن بکەن لە پەروەردگارتان، ئینجا بگەڕێنەوە بۆ لای و تۆبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لەوەی کە کردووتانە، ئەگەر مەبەست داوای لێبوردن بێت لە گوناهو تاوانی لەوەو بەرو مەبەست لە تۆبەو داوای لێبوردن بێت بۆ ئەوەی کە ڕوو ئەدات وەك هێندێك ئەفەرموون ئەوا هیچ گیرو گرفتێك نییە کاتێ داوای دووەم پاش ئەکەوێ و وتەی(ثم) جێی خۆیەتی، هەروەها ئەگەر مەبەست بە یەکەم داوا بێت بە دەم و مەبەست بە دووەم کردەوەی چاك بێت و سەرۆ گرتنی ناتەواوی لەوەو پێش، چونکە ڕادەی کردەوە لەپاش گوتنە، هەروەها ئەگەر مەبەست بە یەکەم وازهێنان بێت لە گوناهو مەبەست بە دووەم گەڕانەوە بێت بۆ گوێڕایەڵی، یان مەبەست بە یەکەم داوای سڕینەوە بێت و مەبەست بە دووەم پەشیمان بوونەوە بێت لەگەڵ بڕیاری نەگەڕانەوە بۆ حاڵی پێشوو، کە ئەمەش ڕای بەهێزە، بەڵام ئەگەر مەبەست بە هەردوو هەر یەك شت بێ وەك هێندێك لەسەر ئەوەیە ئەو کاتە ئەبێ وتەی(ثم) لەسەر ڕووکەشەکەی نەبێ، بەڵکو بە واتای(و) بگیرێ وەك(فراء) ئەفەرموێ، ﴿يُمَتِّعْكُم مَّتَـٰعًا حَسَنًا﴾ واتە داوای لێبوردن بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان تا بتان ژیەنێ بە ژیانێکی جوان وشیرین، پێتان ببەخشێ ئەوەی کە هۆی خۆشی و ڕابواردنە، ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ تا ماوەی ناو براوو دیاریکراو لای خوا ﴿وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ﴾ تا ببەخشێ بە هەموو خاوەن کردەوەیەکی چاکی زیاد، پاداشت و سەرەنجامی کردەوەی لە ڕۆژی دواییدا بە تێرو تەواوی، بەڵام لە دنیادا بەو جۆرە نییە، بەڵکو هەر کەسە بەجۆرێك پاداشت ئەدرێتەوە بە پێی زانین و کاردروستی خوا. ئینجا هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە بڕوا نامێنن و ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ ئەگەر ڕوو وەرئەگێڕن، ﴿فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾ ئەوا بە ڕاستی من مەترسی ئەکەم لەسەرتان سزای ڕۆژێکی گەورە کە ڕۆژی دوایی یە، واتە دڵم بۆتان ئەسوتێ و بەزەییم

دێتەوە پێتاندا، ﴿إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ﴾ هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەتان بە مردن و ئینجا زیندوو کردنەوەو حیساب و پرسیار ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەو خوایە تواناو دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا کە یەکێ لەو شتانە ئەو زیندوو کردنەوەو حیساب و پرسیارەیە، ئەمەیە ئەو نامەیە، یان ئایەتەکانی ئەو نامەیە، ئەمەیە ئەو یاساو مەسەلانەی کە گرنگن و ئەم نامەیە هاتووە بۆ باسکردن و چەسپاندنیان و هەموو ئایینەکەی لەسەر دائەمەزرێنێ، تاک و تەنیایی خواو پەرستنی بەبێ هیچ هاوبەش، بڕوا بە پەیام لە لایەن خواوە، بانگکردن بۆ داوای لێبوردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئەو دووانەش سەرەتا و یەکەم جاری کردەوەی چاکە، کردەوەی چاکیش تەنیا دڵپاکی و هەڵسان نییە بە نیشانەو دروشمی خواپەرستی، بەڵکو کرەوەی چاک گشتیە بۆ ئەوەو هەموو جۆرە چاک کردنێك لەناو گەل و وڵاتدا لە ئاوەدان کردنەوەو بەکارهێنانی هەرچی هۆی ژیانی بەختەوەری و کامەرانییەو بەکارهێنانی هەموو هێزو وزەکان کە خوای میهرەبان لەم جیهان و زەوییەدا دایناوە بۆ بەندەکانی، لە ئایەتەکانەوە دەرئەکەوێ کە خواپەرستی و داوای لێبوردن و تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا هۆو مایەی ژیانی خۆشی و کامەرانییە، لەگەڵ ئەوەدا زۆر لە پیاوچاکان کە دڵیان لای خوایەو دەمیان وا بە تۆبەو داوای لێبوردنەوە، کەچی وان لە ژیانێکی سەخت و تاڵداو دوورن لە خۆشی و کامەرانی، بێگومان ئەمە پرسیارێکە بە دڵو دەمی زۆر کەسدا دێت و گوزەر ئەکات، کەواتە پێویستی هەیە بە هێندێ لێکۆڵینەوەو ڕوون کردنەوەو نەهێشتنی ئەو گرێیە. کەواتە ئەڵێین: ژیانی خۆشی و کامەرانی هەرچۆنێ پێك دێت لە فراوانی و زۆری شت و مەك و هۆو کەرەسەی ژیان، هەروەها پێکدێت بە جۆرو چۆنێتی ژیان، بۆ وێنە ژیانێك بەسەر ببرێ لە سایەی دادو یاسایەکی ئازادی و سەربەستیا، ئەو ژیانە خۆش و شیرینە هەرچەند کەم و کوڕی هەبێ لەبارەی گوزەران و کەم بوودی یەوە زۆر خۆش و شیرینەو بە ژیان کامەرانی و بەختەوەری سەیر ئەکرێ لەچاو ژیانێك کە بەسەر ببرێ لە سایەی یاسایەکی بەدو ستەم و فەوزاو بێنیزامیدا، هەرچەند زۆر تێرو تەواو بێت لە بارەی شت ومەکی فراوانی هۆو کەرەسەی گوزەران و ژیاندا، ئەی شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئازادی و سەربەستی و دادو دووری لە ستەم و ناڕەوایی تەنیا لە ژیانێکدا دەستکەوت ئەبێ

کە دامەزرابێ لەسەر بڕوا بە خواو ملکەچی تەنها بۆ خواو دانانی تەنها خوا بە حاکمو کاربەدەست، هەروەها پێشکەوتنو کامەرانیو ئارامی بە کردەوەی پاکو خاوێن بەرهەم دارو دوور لە ستەمو ناڕەوایی دەستکەوت ئەبێ، بێجگە لەوەش کە گوتمان هەرکەسێک کە بڕوادارو لەخواترس بێت هەمیشە بە ئارامو دڵنیایەو دڵخۆشە، چونکە ئەزانێ هەموو ناخۆشیو ناتەواوییەک هەروا ناڕواو بێ سەرو شوێن، بەڵکو پاداشتی چاکو بە نرخ تری هەیە لە ڕۆژی دواییدا، کەواتە ئەوەی لە ئایەتەکەدا فەرمانی پێدا هۆو مایەی ژیانو گوزەرانی شیرینو خۆشە لەم دنیایەدا ئیتر هەرچەند کەمو کوڕی هەبێ لە شتو مەکو کەرەسەی ژیاندا، مەبەست لەو قسەو باسە ئەوە نییە کە بێنەوایانو تەنگ گوزەرانان سەر کز کەنو هەر بەوە ڕازی بنو هیچ هەوڵێک نەدەن بۆ خۆیان، بەڵکو مەبەست ئەوەیە هەر هیچ نەبێ بڕواداری لەخواترس خۆپارێزو کامەرانو دڵئارامە بەهۆی بڕواو لەخواترسیو خۆپارێزیەکەیەوە بە هۆی ئەوەی ئەزانێو ئومێدەوارە کە هەرچی لە دەست دەرچێ لێرە لەو دنیا باشترو بە نرخ تری پێ ئەدرێتەوە وەک گوتمان. ئینجا لەپاش هەموو ئەوانە شتێکی ڕوونە کە پەرستنی خواو دوور کەوتنەوە لە پەرستنی هەر شتێکی تر بەمە پێکدێت کە بەرنامەی ژیان هەر لە خواو لە شەریعەتی خواوە وەرگیرێو هیچ بەرنامەیەکی تر لە ئارادا نەبێ، دەی هەر کاتێ گەلو کۆمەڵ بە بەرنامەو شەریعەتیخ ڕەفتار بکەن هیچ کەمو کوڕیو لاریو ناتەواوییەک ڕوو ناکاتە ژیانیان، چونکە سروشتی شەریعەتو بەرنامەکە دەست نادات بۆ هیچ ناڕەواییو کەمو کوڕییەک، هەر ناڕەواییو کەمو کوڕییەک هەبێ ئەبێ موسڵمانان نەیهێڵنو بەرگری بکەن، کەواتە هەر گەلو کۆمەڵی موسڵمانان ژیانیان ڕێکو پێک نەبێ ئەوە خۆیان ناتەواونو بە پێی بەرنامەو شەریعەتەکەیان نەجوڵاونەتەوە، ئەوە شتێکە بە درێژایی مێژووی ئەم ئایینو شەریعەتە بینراوەو بەراورد کراوە، بۆ نموونە لە چەرخی(عومەی کوڕی عەبدولعەزیز)دا –خوا لێی ڕازی بێ– کە گەورەترین دەوڵەتی لەژێر دەستدا بوو لەو دەوڵەتە پانو فراوانەدا یەک بێنەواو پەک کەوتە دەست نەئەکەوت، کەسیان دەست نەئەکەوت کە زەکاتو خێر وەرگرێو هەموو ئەیانگوت: عومەر بە دادو دادپەروەری بێ پێویستی کردووین.

﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٥﴾

---

لەپاش جاڕدان و ڕاگەیاندنی کورتەو پاڵفتەی ئەم نامەیە کە باسکرا، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ لاری و نالەباریی هێندێ لە بارەی وەرگرتن و پێشوازی لەم نامەیە کاتێ کە فروستادە ترسێنەر و موژدە دەرەکە پێیان ڕائەگەیەنێ، ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ﴾ ئەم ئایەتەبەچەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە، هێندێکیان زۆر بە دوور دانراوە، لە نێوان ئەو تەفسیرانەدا دوانیان بە نزیك تر زانراوە لێرەدا باسی ئەکەم:

١- بێدارو ئاگادار بن کە بە ڕاستی ئەو بێبڕوایانە لە کاتی خوێندنەوەی قورئان بەسەریاندا سەریان دائەخەن و سنگیان ئەپێچنەوەو ئەیلکێنن بە سکیانەوە بۆ ئەوەو بە نیازی ئەوەی کە خۆیان بشارنەوە لە خوا یان لە پێغەمبەر(ﷺ).

٢- بێدار بن کە بە ڕاستی ئەوانە سنگیان ئەپێچنەوە لەسەر کینەو دوژمنایەتی و ئەوەی لە دڵیاندایە دەری نابڕن و ئەیشارنەوە بۆ ئەوەی خۆیان بشارنەوە لە خوا، لەسەر هەر بار ئەوا خوا ئەدا لە دەماخیان و هەوڵ و کردەوەکەیان بەبێ نرخ و بە پووچەڵ دەرئەکات بەمەی کە خوا ئاگادارە بە هەموو شتێکی نهێنی و هەر لە خۆیان نموونەیەکیان بۆ باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ﴾ بێدار بن ئەوانە کاتێ کە ئەچنە ناو جێگاو بان و خۆیان دائەپۆشن بە پۆشاك و ئەو شتانەی کە خەوتوو خۆی پێ دائەشارێ، کە لەو کاتانەدا بە پێی باوی خەڵکی قسەو باسی نهێنی ئەکرێ، ئەوانە لەو کاتەدا: ﴿يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ﴾ خوا ئاگایەو ئەزانێ هەرچی ئەوانە نهێنی پێئەکەن و دەری نابڕن، هەرچی دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن.

ئینجا پابەر ئەمێنێ لەسەر ئەو زانینی خۆیە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا زاناو ئاگایە بە هەر نیازو خوتورەو خەیاڵێك کە لە سنگەکاندا هەیەو هاتووچۆ ئەکەن، واتە زاناو ئاگایە بە پۆشیدە ترین و شاراوە ترین چ جای ئەوەی کردەوەی ئەوانە.

لێرەدا جزمی یانزەیەم کۆتاییهات بەیارمەتی خوا دەست دەکەم بەجزمی دوانزەیەم

﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ

**ئینجا شێوەیەکی تر لە شێوەکانی زانینە گشتیەکەی خوا ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ:**

**﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾ هیچ گیان لەبەرێك نییە کە لە زەویدایەو ئەگەڕێ، مەگەر لەسەر خوایە ڕزق و ڕۆزیەکەی، ﴿وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَا﴾ جێ و شوێنی ئارامگاو مانەوەی ئەزانێ، جێ و شوێنی کە کاتیەو دانراوە تێیدا ◘ کات و ماوەی لێدەرچوونی ئەزانێ و لەهەر شوێنێکدا بێباوەڕەکانی ڕۆزی خۆی ئەداتێ، ﴿كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ هەر کام و هەموو لەوانە ـ هەروەها هەموو شتێکی تریش ـ نووسراوەو دیاریکراوە لە نامەیەکی ڕوون یان ڕوونکەرەوەدا کە ناو براوە بە (لوح المحفوظ) وەك لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە، بەڕاستی هێندێك بیر کردنەوە ئەبێ سەر سام ببێ و بکەوێتە دڵە لەرزە، وەرە بڕوادار بیرێك بکەرەوە لەو هەموو گیانلەبەرانە کەڕووی زەوی داگیر کردووەو هەموو درزو کون و کەلەبەرو ناو سکی پڕ کردووە، کە بەهیچ جۆر نایەنە ژمارە بۆ هەموو ئادەمی، وەرە بیرێك بکەرەوە لەوەی کە زانینی خوا گشتییە بۆیان و بەجێ و شوێنیان و بەبارو حاڵ و هەموو ڕووداوو بەسەرهاتیان و بە هەموو ڕۆزیەکیان کە خۆی بە میهرەبانی خۆی بڕیاریداوە لەسەر زاتی پاکی خۆی!! ئەم زەوییەی وا دروستکردووە کە هەموو پێویستیەکی ئەو گیانلەبەرانەی تێدایە، ئەو گیانڵەبەرانەشی وا دروستکردووە کە بتوانن ڕۆزیەکی خۆیانی لێ وەرگرن هەرکام بە جۆرو شێوەیەکی تایبەتی گونجاو بێت، بە تایبەتی ئەم ئادەمی‌یە کە کراوە بە جێنشین لێهاتن و ئامادەیەکی تایبەتی پێداوە کە بتوانێ هەموو جۆرە خێرو بیرێکی لێ فەراهەم بێنێ، دەسەڵاتداری کردووە بەسەر گۆڕینی ڕووی زەوی، گەشە پێدان و گۆڕینی**

باری ژیان ـ وەك بەچاو ئەبینریٚ لە هەموو چەرخ و وڵاتێکدا ـ لە کاتێکدا کە تێکۆشان ئەکات بۆ فەراهەم هێنانی ڕۆزیەکەی کە خوا هۆو کەرەسەکانی دروستکردووەو لەم بوونەوەرەدا بۆی داناوە ئەبیٚ بەندەش کارو کردەوەو دەسەڵاتی بخاتە کار بۆ فەراهەم هێنانی! مەبەست ئەوە نییە کە هەرکەس ڕۆزیەکی دیاری کراوی هەیە بەبیٚ کارو کردەوەو تێکۆشانی خۆی بۆی دێت و دوا ناکەویٚ، لەدەست دەرناچیٚ بە دانیشتن و تەمبەڵی، وەك هێندێك وا ئەزانن و وا حاڵی بوون! نەخێر ئەو کەسەی وا تێگەیشتووە هەڵەیە، چونکە پێچەوانەی فەرمانەکانی ئیسلامە کە پێویستیان کردووە کارو کردەوەو بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە خوا کردوونی بەهۆی پێکهێنان و فەراهەم هێنان، بەڵیٚ بۆ هەموو کەس ڕۆزیەکی خۆی هەیە، ئەمە ڕاستە، ئەو ڕۆزییە خوا لەم زەوی و بوونەوەرەدا دایناوە، دیاری کراوە لەلایەن خواوە بە پێی ئەو باروو ڕەوشەی کە خوا بڕیاریداوە، کەواتە نابیٚ هیچ کەسێك دابنیشیٚ بەبیٚ تێکۆشان و کارو کردەوە لەکاتێکدا دەزانیٚ ئاسمان ئاڵتوون و زیو نابارێنیٚ، بەڵکو ئاسمان و زەوی زەخیرەو کەرەسەی ڕۆزیان تێدایە بۆ هەموو گیانلەبەران، هەرکەس بە پێی باوو فەرمانی خوا هەوڵ و تێکۆشان بکات بێبەش نابێت، ڕۆزی بە هەوڵ و تێکۆشان فەراهەم دێت، ئیتر چ حەڵاڵ و حەرام، بەڵام جۆرو شێوەکەیان جیاوازە، سەرەنجام و دوا ڕۆژیشیان جیاوازە.

ئینجا هەروەها بەندەکانی خوا ئاشنا ئەکات بەخوای میهرەبانی خۆیان، ئاگاداریان ئەکا و دەست نیشانیان بۆ ئەکات بە بەرهەمی دەسەڵات و کاردروستی خوا لە دروستکردنی ئەم بوونەوەرەدا، ئەفەرمویٚ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد لە شەش ڕۆژدا، ﴿وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾ عەرشەکەی خوا بەسەر ئاوەوە بوو خوا ئەم زەوی و ئاسمانەی دروستکرد، ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە ئایا کام لە ئێوە چاکترو جوانترە لەبارەی کردەوەدا.

لەبارەی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا لەشەش ڕۆژدا لە چەند شوێنێکدا قسەمان لێکردووەو ڕای بەهێزمان دیاریی کردووە، هەروەها لەبارەی عەرشەوە، کەواتە لێرەدا پێویست نییە هیچ بڵێین، ئەوەی کە تا ئێستا قسەمان لێنەکردووە دوو شتە:

١- لەپێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا عەرش بەسەر ئاوەوە بوو، وەك لە چەند حەدیسێکیشدا ئەوە هاتووە، بەڵام ئایا مەبەست بەو ئاوە چییەو چۆنە؟ یان لە کوێ بووە؟ یا عەرش چۆن بەسەر ئەو ئاوەوە بووە؟ لەو بابەتەوە قسەو باسی زۆر کراوەو ڕیوایەتی زۆریش هاتووە، بەڵام هیچکام لەوانە لە ئایەتەکە وەرناگیرێ، هیچکام دەقێکی تری تەواوی نییە لەسەری، ئەوانە لەو شتە غەیبیانەن کە هەر لەلایەن خواوە ئەزانرێن، کەواتە هەق وایە ئێمەش زیادەڕەوی نەکەین و هەر ئەوە بڵێین کە دەقی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ. هەروەها ئێمە بۆمان نییە ئەم جۆرە ئایەتانە ڕێك بخەین لەگەڵ ئەو بۆچوون و نەزەریاتانەی کە ناو ئەبرێن بە عیلمی و زانیاری، چونکە ئەمانە هەمیشە دەست ئەدەن بۆ گۆڕاندن و هەڵوەشاندنەوەو کاتێ کە ڕادەی پلەی زانیاری بەرزتر ئەبێتەوەو خەڵکی ڕێیان ئەکەوێ لە تازەترین کە زیاتر جێگەی باوەڕە، دەی کەواتە ڕاست نییە کە ئێمە قورئان ڕێك بخەین لەگەڵ ئەوانەدا، چونکە قورئان لەلایەن خواوە هاتووەو دەست نادات بۆ هەڵەو گۆڕان، بۆچوون و نەزەریان بەو سەیر ئەکەین و هەرگیز نابێ هەوڵ بدەین بۆ ڕێك خستنی قورئان لەگەڵیان یان ڕێکخستنی ئەوان لەگەڵ قورئان، بەڵام جۆرێکی تر هەیە کە پێی ئەگوترێ حقائقی عیلمی و بە تاقیکردنەوەو بەراورد کردن ژیریی ئەتوانێ ئەتوانێ کارو قسەیان تێدا بکات، وەك ئەوەی ئاو ئەسڵ و بنەڕەتی بۆ هەموو زیندەوەر، یان هەموو زیندەوەرەکان، بەڵکو هەموو شتێ نێرو مێیە، ئەم جۆرە شتانە قورئان ڕێگەی داوە بۆ ژیریی کاری تێدا بکات بە ئەوپەڕی ئازادی و سەربەستی.

وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ

---

**٢- ئەم ئایەتە نیشان ئەدات كە دروستكردنی زەوی و ئەم ئاسمانە لە شەش ڕۆژداو لەسەر ئەو بارو شێوەیە بۆ تاقیكردنەوەی ئەم ئادەمییەیە، كەواتە با بزانین كە تاقیكردنەوەكە زۆر گەورەیە، ئەم ئادەمی یە زۆر گەورەو گرنگە، مەبەست بەو تاقیكردنەوە وەك چەند جاری تر گوترا ئەوە نییە كە بەوە بۆ خوا دەركەوێ ـ پاكی بۆ خوا ـ مەبەست ئەوەیە بۆ خەڵكی دەركەوێ، مەبەست ئەوەیە ئەوەی خوا ئەیزانێ خەڵكی بە كردەوەی خۆیان دەری بخەن، تا بەهۆی ئەوەوە هەركەس تۆڵەو پاداشتی خۆی وەرگرێ بە پێی ویستو دادی خوا. جا لەبەر ئەوە بڕوا نەبوون بە زیندوو بوونەوە حیسابو پرسیارو تۆڵەو پاداشت هەق وایە جێگەی سەرسوڕمان بێت بۆ هەركەسێك كە ژیر بێت، دەرئەكەوێ كە بێبڕوایان ئەڵاّو نەزانن كە سەریان سوڕئەمێنێ لەو زیندوو بوونەوەو حیسابو پرسیارە، وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن قُلْتَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر بڵێیت بەوانە: ﴿إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ﴾ بەراستی ئێوە زیندوو كراوە ئەبن لەپاش مردن، ﴿لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئەوانەی كە بێبڕوان ئەڵێن: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە هیچ نییە بێجگە لەوەی كە جادوویەكی ڕوونە، واتە ئەم قسەی تۆ وەك جادوو وایە لە هەڵخەڵەتاندنو ناڕاستیدا، یان ئەم قورئانەی كە تۆ ئەخوێنی بەسەرماندا هەروەكو جادوو وایە، لەمەدا كە فامو هۆشت لا نەهێشتووینو سەرت لێ تێك داوین، بەڵام ئای چەند ئەو قسەی ئەوانە درۆو بێجێو ناڕەوایەو جێگەی سەرسوڕمانە!!**

**ئینجا هەروەها باسی لاریو نالەباری ئەو بێبڕوایانە ئەكات كە پەلە ئەنێنەوە بە هاتنی ئەو سزای كە پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەی ئەكرد لێیان پێی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر دوا بخەین لێیان ئەو سزایەی كە ترسێنران پێی تا ماوەیەكی كەمی دیاریی كراوی ژمێرراو ئێمەو لەزانینی ئێمەدا،**

﴿لَيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۚ أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٨ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ٩ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ نَعۡمَآءَ بَعۡدَ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ ١٠﴾

---

**﴿لَيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۚ﴾ ئەوانە ئەڵێن: ئایا چی ئەو سزای وەستاندووەو بەرگری ئەکات؟ واتە ئەگەر محمد ڕاست ئەکات دەی ئەو سزایە بۆ نەهات و چی هۆی ڕەستانیەتی؟ دیارە بە لاقرتیەوە ئەوەیان ئەگوت، کەواتە بەم جۆرە سەختە دەم کوتیان ئەکات: ﴿أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ﴾ بێدار بن ڕۆژی ئەو سزایان بۆ دێت لا نادرێ لێیان، واتە کاتی هاتنی نەهاتووەتە پێشەوە مەگەر کاتە هات بە هیچ ڕەنگ دوا ناکەوێت و هیچ شتێ بەرگری ناکات و دوای ناخات ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ بێگومان دەوری ئەوان ئەدات ئەوەی کە ئەوانە بە گاڵتەیان دائەنا و لاقرتیان پێ ئەکرد، ئیتر ئەو سزا سزای ئەم دنیا بێت یان سزای ڕۆژی دوایی. بێگومان زۆر لە ئوممەتە پێشووەکان کاتێ کە پێغەمبەرەکانیان ئەهاتن بەو موعجیزەی کە ئەو بێبڕوایانە پەڵپیان پێ ئەگرت و ئینجا بەوەش هەر بڕوایان نەئەهێنا، خوای ترسێنەر لەناوی ئەبردن و لەڕیشەی ئەهێنان، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو ئەو پەیامانە کاتی بوون و بۆ دەستە و چینێ بوون، ئەو موعجیزانەش کە ئەدران بە هەرکام لەو فروستادانە کاتی بوون و هەر ئەو دەستە و چینانە ئەیانبینی، نەئەمانەوە بۆ دەستە و چینێ تر تا خەڵکی تر بڕوابێنن، بەڵام پەیام و شەریعەتی ئەم دواترین ئوممەتە هەتاییەو بۆ هەموو گەل و چینەکانە، هەروەها موعجیزەکەشی شتێکی کاتی و مادی نەبوو، کەواتە دەست ئەدات بۆ مانەوە و بۆ ئەوەی هەموو چینەکانی داهاتوو بیری لێبکەنەوەو بەهۆی ئەوەوە بڕوا بێنن، جا بەهۆی ئەوەوە کار دروستی و لێزانی خوا داخواز بووبۆ ئەوە کە ئەو جۆرە سزایانە نەدا بەسەر ئەم ئوممەتەدا، سزا لەم ئوممەتەدا بۆ کەسانێك بێت لە کاتی دیاریی کراوی خۆیاندا، هەروەها ئەو دوو ئوممەتەی پێش ئەم دواترین ئوممەتە خوا سزای گشتی و لە ڕیشە هێنەری نەدا بەسەریاندا، بەڵام هاوبەش ڕەوادەرانی یەکەم کە بەرەنگاری ئیسلام**

وەستان لەبەر نەفامیان بیریان نەئەکردەوە لەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە، بەهۆی ئەوەوە بڕوایان نەبوو بەزیندوو بوونەوە لەبەر نەفامیان کاتێ کە سزاکەیان دوا بکەوتایە لەبەر چەند هۆیەك ئەکەوتنە لاقرتی کردن و ئەیان گوت: ئایا چی بەگری ئەکات و بۆچی نەمات؟ ئەو سزای کە خوا بڕیاری دا بێت بە پەلەنانەوەو پێش ناکەوێت لەکاتی دیاریی کراوی خۆی، ئەگەر بە پێی بۆچوون و تێگەیشتنی خەڵکی دواکەوتووبێ ئەوە میهرەبانییە لەلایەن خواوە تا هەرکەس ئامادەیی تیا بێ بڕوا بێنێ، لەو ماوەدا کە خوا مۆڵەتی تورەیشیدا چەندەها کەس موسڵمان بوون کە فیداکاری و تێکۆشانیان کرد بۆ ئیسلام، یان بەچەو نەوەکانیان لەپاشان موسڵمان بوون و بوون بە فیداکارو پارێزەری ئیسلام، ئەمە شتێکی ئاشکرایە لای هەموو کەس، ڕەنگە چەند شتێ ببێ کە خوا ئەیزانێ و ئێمە بێئاگاین لێی، بەڵام نەفام و نەزانەکان پەلە ئەنێنەوە. بەبۆنەی پەلە نانەوەی نەفامان بۆ هاتنی سزا، بێئارام و دانەمەزراوی ئەم ئادەمی‌یە باس ئەکات کەڕاست و ڕێك و دامەزراو نابێ بە بڕوا نەبێ، ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً﴾ سوێند بە خوا ئەگەر ئێمە لەلایەن خۆمانەوەو بە میهرەبانی خۆمان چاکەو بەهرەیەك بچەژێن لە ئادەمی و پێی ببەخشین، ﴿ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ﴾ ئینجا لە پاش ئەوە ئەو چاکەو بەهرەیەی لێ داڕنین و بیسێنینەوە ﴿إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ﴾ بەراستی زۆر نائومێدو زۆر سپڵە ئەبێ لەو کاتەدا، لەبەر بێئارامی و پشت نەبەستنی بە خوا نائومێد ئەبێ و چاوەڕوانی چاکەو بەهرەی نامێنێ، زۆر سپڵە ئەبێ و بیر ناکاتەوە لەو چاکەی کە خوا لەگەڵی کرد، ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ﴾ ئەگەر پێی بچەژێن و پێی ببەخشین چاکەو هۆی خۆشی و کامەرانی لەپاش زیان و هۆی دڵتەنگی یەك کە دووچاری بووبێ، ﴿لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي﴾ ئەڵێ: بێگومان ڕۆشت و کرد لێم ئەو ناخۆشی و زیانەی کە دڵتەنگ و ناڕەحەتی ئەکردم ﴿إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾ بێگومان لەو کاتەدا زۆر خۆشنودو دڵ خۆش و شانازی کەرو خۆ بەزل زانە بەسەر خەڵکیداو بەچاوی سووك تەماشایان ئەکات. ئەم ئادەمییە بەو جۆرە بێئارام و خۆ نەگرە نەلەکاتی خۆشی و نەلە کاتی ناخۆشیدا،

إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدْرُكَ

---

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ﴾ بێجگە لەوانەیان کە خۆگرو بەئارامن‌و بەئارام بوون، نەلەکاتی ناخۆشیدا نائومێد ئەبن، نەلەکاتی خۆشیدا لە خۆئەگۆڕێن‌و بەرەڵا ئەبن، ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کردەوە چاکەکانیان بەجێهێنابێ، لەکاتی ناخۆشیدا بە خۆگری‌و دامەزراوی، لەکاتی خۆشیدا بە سوپاس‌و کردەوە چاکەکان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ ئەوانە بۆیان هەیە لێبوردن‌و سڕینەوەی گوناهو کەم‌و کوڕیان‌و ئەجرو پاداشتێکی گەورە.

ئەو نەفامانە کە بێئاگان لەکار دروستی خواو بێئاگان لەباوی خوا لەم بوونەوەرەدا، بێئاگا‌و نەزانن، تێناگەن لە لێزانین‌و کاردروستی خوا، لەناردنی فروستادەکانی خوا لە تیرەی ئادەمی لەبەر ئەوە داوا ئەکەن کە فروستادە فریشتە بێت یان فریشتەی لەگەڵ بێت، بێئاگان لە نرخ‌و گرنگی‌و گەورەیی پەیامی خوا لەبەر ئەوە داوایان ئەکرد کە فروستادە با گەنج‌و خەزنەی هەبێ، ئەو بێبڕواو سەکێشانە هەمیشە کۆتایی ناهێنن لەبەربەرەکانێ، ئەی ئایا ئەبێ پێغەمبەر (ﷺ) واز بێنێ لە کارەکەی خۆی یان هێندێ لەوەی پێی سپێرراوەو ڕاینەگەیەنێ‌و دڵتەنگ‌و بێئارام ببێ بە قسەو داوا ناڕەواکانی ئەوان؟ نەخێر شتی وا هەرگیز نابێ‌و لەسەر کارو فەرمانی خۆی بڕواو بەردەوام بێت وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدْرُكَ﴾ سەبارەت بە وتەی (لعلك)و ئەم ئایەتە لێکۆڵینەوەو قسەو باسی زۆر کراوە، لە ناو ئەوانەدا دڵم بەئارام ترە بەمەی کە بۆ پرسیار بێت بە شێوەی بێزاری دەربڕین‌و ڕەوا نەدان‌و دان پیا نەنان، واتە ئینجا ئایا تۆ واز هێنەری لە ڕاگەیاندنی هێندێ لەوەی سروش کراوە بۆ لات، دڵتەنگ ئەبی پێی ـ وەك ئەو شتانەی کە بێبڕواکان بێزارن لە بیستنی ـ ئایا واز ئەهێنێ لەوەو دڵتەنگ ئەبێ پێی،

أَن يَقُولُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُۖ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ

---

﴿أَن يَقُولُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ﴾ لەبەر ئەوەی ئەوانە ئەڵێن، یان لەبەر ئەوانە ئەڵێن: با بباریێنرایە بەسەریدا گەنج و خەزنەیەكی زۆر، یان فریشتەیەك لەگەڵی بهاتایە كە شایەت بوایە لەسەر فروستادەیی یەكەی، واتە ئەگەر ڕاست ئەكات و پێغەمبەرەو ڕێزی هەیە لای خوا با خوا ماڵ و سامانی زۆری پێدایە لەلایەن خۆیەوەو خۆی و یارەكانی بێباوەڕەكانی پێویست بوونایە، یان فریشتەی لەگەڵ بوایە كە شایەتی بۆ بدایەو ئیتر گومان نەئەما لە ڕاستییەكەدا، واتە نەخێر واز نەهێنی و دڵتەنگ نەبی، ﴿إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌۚ﴾ تۆ ئەی پێغەمبەر هەر ترسێنەری و كارو فەرمانی تۆ ترساندنە بەوەی كە سروش كراوەتە لات، كەوالە پێویستە لەسەرت ڕاگەیاندنی هەرچەند بێبڕواكان پێیان بێت و دەم بەرەڵا بكەن لێت، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ خوا توانا و دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێكدا، واتە خوا كار بەدەست و چاودێرەو كاروباری ئەوانە هەر بە دەست خوایەو ئەو حیساب و پرسیاریان لێ ئەكات لەسەر كردەوەكانیان، تۆ لێپرسراو نیت لە بێبڕوا هێنان و نەهێنانیان، ئەم ئایەتە تەنگی و سەختی و ئەو كات و ماوەیە نیشان ئەدات لە مێژووی ئەم ئایینەدا، دەست نیشان ئەكات بۆ ئەو ناڕەحەتی و دڵتەنگییەی كە ڕووی كردبووە بەدڵی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)، هەرچۆنێ نیشان ئەدات قورسی و ئەركی گرانی بەربەرەكانی لەگەڵ ئەو بێبڕواو نەفام و سەركێشانە، بە تایبەتی لەو كات و ساڵەدا كە ناو نرا بە ساڵی غەم و پەژارە. ئینجا وا زئەهێنێ لەو باسەو ئەگوێزێتەوە بۆباسی وتەیەكی بەدی ئەوانە چەند جار ئەیانگوت كە گوایە ئەم قورئانە دەستی هەڵبەستەو محمد لەدەم خواوە ئەیلێت، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُۖ﴾ واتە واز بێنە لەوەی كە گوترا ئەی ئایا ئەوانە ئەڵێن: محمد ئەو قورئانەی دەست هەڵبەست كردووە بەدەم خواوە؟ ﴿قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ئەگەر وەوەی من پێتان ڕائەگەیەنم دەست هەڵبەستی خۆم بێت دەی ئێوەش (دە) سورەتی وێنەی بێنن كە دەست هەڵبەست كراو بن لەلایەن خۆتانەوە، واتە ئێوەش هەرەبن وەك من ئەگەر من توانیبێتم شتی وا دەست هەڵبەست بكەم ئەبێ ئێوەش بتوانن،

وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا

---

**نەك خۆتان بەڵكو ﴿وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بانگ بكەن بۆ كۆمەك و يارمەتیتان هەركەس كە ئەتوانن بانگی بكەن بێجگە لە خواو تێپەڕ بكەن لە خوا ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن لەوەدا كە ئەڵێن دەست هەڵبەستی منە ﴿فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ﴾ ئینجا ئەگەر ئەوانەی كە بانگیان ئەكەن بۆ یارمەتی و پشت گیری نەهاتن بە هاوارتانەوەو نەیانتوانی داواكەتان بەجێ بێنن، بێگومان ئێوەش نەتانتوانیوەو لەبەر دەستەپاچەییتان هاوارتان لەو كردووە ئەگەر ئەو بانگكراوەنەتان نەیان توانی و دەستە پاچە بوون ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ﴾ ئەوا بزانن ئەم قورئانە نەهێنراوەت خوارەوە مەگەر بەزانینی خواو بە پێی زانینی خوا هێنراوەتە خوارەوەو ڕوونكەرەوەی شتێكە كە خوا ویستی و فەرمانیداوە بە ڕاگەیاندنی لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەر ئەو توانایە بە ناردنە خوارەوەی، هەر لە زانینی خوادایە ناردنی ئەو قورئانەی كە ئەو هەموو هەواڵە غەیبیانەو ئەو هەموو شتە گرنگانەی تیایە لە هەموو ژیرییەك تیایاندا سەرسامەو هەتا بێت شتە نایابەكانی دەر ئەكەون، ﴿وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ بزانن كە هیچ خوایەك نییە بێجگە لەو خوایەی كە ناوی ﴿ٱللَّهِ﴾یە، هەرچی پەرستراو بە بتەكانی ئێوە هەیە سەجەم شایستەی پەرستن نین ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ملكەچ و موسڵمانن؟ واتە كەواتە ملكەچ و موسڵمان بن، چونكە دەركەوت كە هەموو دەستە پاچەن لەئاستی ئەم قورئانە، ئەم قورئانە موعجیزەیە. ئەم دوو ئایەتە بە جۆرێ تریش تەفسیر كراوەتەوە بەڵام ئەم جۆرەم بەلاوە بەهێزتر بوو لەبەر ئەوە هەڵم بژارد.**

**قورئان بەری بڕیەوە لە بێبڕوایان بە چەند جۆرێك: بە هەموو قورئان، بە (دە) سورەت، بە سورەتێك، زانایانی تەفسیر لەم بارەیەوە فەرموویانە لە یەكەم جاردا بە هەموو قورئان بەری بڕیەوە لە پاش ئەوە بە (دە) سورەت، ئینجا بە یەك سورەت، بەڵام بەڵگەیەكی بەهێز نییە لەسەر ئەوەی كە ئاوا بە ڕیز بووبێ چونكە وا دەرئەكەوێ كە سورەتی (یونس) پێشتر**

هاتبێته خوارەوەو کەچی لەوێدا بە سورەتێك بەری بڕیوەتەوە سەبارەت بەم (دە) سورەتە لێرەدا خاوەنی تەفسیری (المنار) بە درێژیی دواوەو بە کورتی هۆکەی ئەکات بەوە کە مەبەست بە بەربڕینەوە بووە بە داستانو سەرگوزەشتەکان، دەی ئەو سورەتانەی کە بە درێژی باسی ئەو داستانو سەرگوزەشتانەی تێدا هاتبێ تا کاتی هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتی (هود)ە (دە) سورەت بوون، لەبەر ئەوە بە (دە) سورەتی بەری بڕییەوە بەڵام ماتوڵ لە سورەتی (یونس)دا بەری بڕیوەتەوە بە یەك سورەت کە لە پێش ئەم سورەتەدا هاتووە، بێگومان لە پاش بەربڕینەوە بە یەك سورەت پێویستی نامێنێ بە بەربڕینەوە بە (دە)سورەت، کەواتە ئەمەش هەر بەهێز نییە، کەواتە چاك وایە خۆ ماندوو نەکرێ بەم جۆرە شتانەوە کە جێگەی گومانن، پیاوە گەورەو هەڵکەوتووەکانی ئوممەت هەر شتێکیان بۆ ڕوون نەبووبێ خۆیان پێوە خەریك نەکردووە، ئەگێڕنەوە کە ئیمامی عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- مەبەستو واتای وتەی (أبّا)ی بۆ ڕوون نەبووەتەوە لە سورەتی (عبس)دا، لە پاشان خۆی خەریك نەکردووە پێیەوەو فەرموویەتی: عومەر بمرێو لەناوچی تۆ بەتەمای ئەوەی کە هیچت لێ یاخی نەبێو لە هەموو شتێکی قورئان بزانی؟ ڕەنگە ئەم جیاوازی بەربڕینەوانە بەپێی جیاوازی ڕووداوو بەسەرهاتی ئەو خەڵکە هاتبێ، لەهەر کاتێکدا پێویستی بە جۆرێك لەو جۆرانە بووبێو هەر ئەوە بەس بووبێ بۆ بەرەنگاری بێبڕوایان، خوا خۆی باش ئەزانێ، بێگومان هەر هەق ڕوونو ئاشکرایە بە تایبەتی لە پاش ئەو بەرلێبڕینەوە، دەرکەوتنی دەستەپاچەیی بێبڕواکانو خۆشیو سامانو دەسەڵاتی ئەم دنیایە، جا لەبەر ئەوە ئەوا دەست نیشان ئەکات بە بارو حاڵیانو دواڕۆژیان نەخشە ئەکێشێو ئەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا﴾ لەم ئایەتەدا چەند ڕایەك هەیە کە دەربارەی کێو کام تاقم هاتووەتە خوارەوەو بە پێی ئەو ڕایانە تەفسیر کراوەتەوە، لەناو ئەو ڕایانەدا لەناو دڵمدا ئەمە پەسەندو جێگیرە کە مەبەست ئەو بێبڕوایانەیە کە لە ژیاندا هیچ گوێیان نییە لە ڕۆژی دواییو مەبەستیان تەنیا ئەم ژیانی دنیایەیەو خۆشیو ڕابواردن لەم دنیایەدا، کەواتە هەموو کردەوەو تێکۆشانیان هەر بۆ ئەو دەستکەوتە کەم نرخەیە، جا ئەوانە بە پێی کردەوەکانیان بەرو بەرهەمی کردەوەی خۆیان لەم دنیایەدا وەرئەگرن، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا بەشیان ئاگرە -خوا پەنامان بدات لێی- جا لەسەر ئەو ڕایە ئەڵێین: هەرکەسێك ژیانی ئەم دنیای ئەوێو خۆشیو ڕابواردن بە خۆراكو پۆشاكو ماڵو سامانو ئەو شتانەی کە هۆی جوانیو ئارایشن، نیازو مەبەستیان هەر ئەوەیە،

نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَىٰ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ

---

﴿نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا﴾ ئێمە بەرو بەرهەمی کردەوەکانیان پێ ئەدەین لەم دنیایەدا کە بە ئارەزووی خۆیان ڕابوێرن پێی، ﴿وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ﴾ ئەوانە لەم ژیانەدا، یان لە کردەوە کانیاندا کەمو کوڕیان لەگەڵ ناکرێت لەبەرو بەرهەمی کردەوەکانیانو مافی خۆیان پێئەدرێ، واتە بێبڕواییەکەیان نابێتە هۆی کەمو کردنەوەی بەرو بەرهەمو مافەکەیان، یان مەبەست ئەوەیە کەمو کوڕیان لەگەڵ ناکرێ لە سنووریو ویستو ئیرادەی خۆیان وەك لەئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾ پێش ئەخەین بۆیو پەلە ئەکەین بۆی لە دنیادا ئەوەی کە بمانەوێ بۆ هەرکەس کە ئیرادەئەکەین، یان مەبەست ئەوەیە ستەمیان لەگەڵ ناکرێو شایستەی هەر شتێ بن پێیان ئەدرێ بە تەواوی. لەم دنیایەدا بەو جۆرە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکرێ، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا بەم شێوەن کە ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ﴾ ئەوانە نییە بۆیان لە ڕۆژی دواییدا جگە لەئاگر، ﴿وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ هەرچیان کردبێ لە دنیادا لە کردەوەیەك کە بە ڕووکەشو ڕواڵەت گەورەو گرنگ بووبێ هەموو بە بۆشو بێبەهەرم نەرچووو ڕۆشت، یان هەرچیان کردبێ لە ڕۆژی دواییدا دەرئەکەوێ بۆشیو بێبەرهەمیان، هەرچیان کردو بەردەوام بوو بەهیچ دەرچوو، چ کردەوەکانیان بۆ ژیانی دنیا، چ ئەو کردەوە چاکەیان کەئەیان کردو بەنیازی خوا نەبوون، بە ڕووپامایی ئەیان کرد- خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات-ئینجا لایەك ئەکاتەوەبۆلای هەڵوێستی بت پەرستەکان،دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبارەی ئەو قورئانەی کە شایەتی بۆ ئەدات لەبەر ئەوەی کە ڕەوانە کراوی خوایە، وەك نامەی (موسی)یش کە لەپێش ئەمەوە هاتووە ئەو شایەتیەی بۆ ئەدات، لایەك ئەکانەوە بەلای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەوەو ئەیخاتە بەرچاو بۆئەوەی دڵی

پێغەمبەر (ﷺ)و ئەو دەستەیە کە شوێنی کەوتوون دامەزراوو ئارام دار بکات، ئینجا هەڕەشەش بکات لەوانەی کە بڕوایان نەهێنا پێی، شێوەیەك لە شێوە سەختەکانی سزای ڕۆژی دواییان ئەخاتە بەرچاو کە ئەیچەژن بە بێئابڕوویی و ڕیسوایی، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ ئایا کەسێك لەسەر نیشانەو بەڵگەیەکی ئاشکراو گەورە بێت لەلایەن پەروەردگاریەوە، واتە پێغەمبەر (ﷺ) کەلە دەروونی خۆیدا بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرای هەیەو هەستی پێئەکات، بە هۆی ئەوەوە بڕوای تێرو تەواوو بێگومانی هەیە بەوەی خوا (وەحی) سروشی بۆ کردووە، بێگومان ئەزانێ و هەست ئەکات بەبوونی ئەو خوایە لە دەروونی خۆیدا،﴿ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ ﴾بەشوێنی ئەوەوەو بەدوای ئەودا بێت شایەتێکی گەورە لەلایەن پەروەردگاریەوە لەسەر ڕاستیەکەی و ڕاستی ئەوەی کەلەدەروونی خۆیدا دەستی ئەکەوێت و هەستی پێئەکات، واتە ئەم قورئانە کەلەلایەن خواوە هاتووە بۆی و شایەتێکی ئاشکرایە بۆی و خۆی بە خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەلایەن خواوە هاتووەو هەموو کەس دەستەپاچەیە لە ئاستی ﴿ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ ﴾ لە پێش ئەم شایەتی خۆیەوە نامەی موسا شایەتە بۆی، لە کاتێکدا ﴿ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾ ئەو نامەی موسایشە کە پەیڕەوی کراوی ئیسرائیلیەکانەو میهرەبانییە کە لەلایەن خواوە هاتە خوارەوە بۆ سەریان، ئەو نامەیە شایەتی ئەدات لەسەر ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەوە یەکەم: موژدەی داوە بەهاتنی و سیفەتی نیشانەکانیشی باسکردووە، دووەم: ڕێك و پێکە لەگەڵ ئەمدا لە عەقیدەو بناغەی ئاییندا، بۆیەك ڕێگەو بەرنامە بانگ ئەکەن، واتە ئایا کەسێك بەو جۆرە بێت ئەبێ جێگەی گومان بێت و بڕوای پێنەهێنرێ و سەرکێشی بکرێ لێی؟ واتە نەخێر، بڕوا نەهێنان پێی زۆر کارێکی بەدەو جێگەی بێزاری دەربڕینەو سەرسوڕمان بێگومان یەکەم کەسێك کە بڕوای بەو شایەتە هێنا پێغەمبەرە (ﷺ) لەپاش ئەو بڕوادارەکانە کە پەیڕەوی ئەویان کرد، وەك لە سورەتی (البقرة)دا ئەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ پێغەمبەر بڕوای هێناو بڕوای هەیە بەو قورئانەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای، بڕوادارەکانیش بڕوایان هێناوە،

أُولَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾

---

﴿جا هەر بەو جۆرە لێرەشدا ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ ئەوانەی کە لەسەر بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەو ڕوونن لە یەکەم جارەوە پێغەمبەرو لە پاش ئەو شوێن کەوتووەکانی، ئەوانە بڕوایان هەیە بەو شایەتە کە قورئانە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هەڵوێستی ئەو دەستەو کۆمەڵانەی کە بڕوایان نییە پێی و هەڕەشەیەکی سامناکیان ئاڕاستە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾ هەرکام و هەرکەس لەو دەستەو کۆمەڵانە کە دژ وەستاون و بڕوا ناهێنن ئەوە ئاگر جێگەی بەڵێنیەتی و ئەبێ پێی بگات و لادان و ڕزگار بوون نییە لێی، چونکە بەڵێن دەرەکە خوایە. ئینجا پێغەمبەر دڵنیا ئەکات و پاش ئەوە بڕیارداران بەهۆی ئەوەی ئەو هەقەی پێیە کە بڕوای تەواوی پێی هەیە، ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾ کەواتە لەهیچ جۆرە گومان و دوو دڵیەکدا نەبی لەبارەی ئەو قورئانەوە واتە ماتوڵ ئەو قورئانە بەو جۆرەیە کە باسکرا، ﴿إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ بەڕاستی ئەو قورئانە هەر هەقە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن، ئیتر لەبەر نەزانی و نەفامیان، یان لەبەر لاری و سەرکێشی، بێگومان پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) هیچ جۆرە گومان و دوو دڵیەکی نەبووە لە قورئانەکەیدا لەکاتێکدا ئەو لەسەر بەڵگەو ڕابەری ڕوون بووە لەلایەن خواوەو ئەوپەڕی پلەی بووە لە بڕوادا، هەرچەند بەو جۆرە بووە بەڵام بێگومان ئەم فەرموودەیە باشتر ئەیخستە سۆزو پەرۆش لە بڕواکەیدا، لەبارێکی تریشەوە ئەم فەرموودەیە نیشانی ئەدات کە ئەو کاتە کاتێکی زۆر سەخت و تەنگی بووە، کاتێک بووە ـ وەك دەست نیشانمان بۆ کرد ـ کە ناو براوە بە ساڵی غەم و پەژارە، کاتێك بووە کە بانگ و بانگەوازەکەی وەستا بوو لە هەموو بارێکەوە دوژمنان و

سەرکێشەکان بەرەنگار وەستابوون، کەواتە پێویست بوو بەوەی ئەو سەختیی و تەگبیە لەدڵی بەفەڕی دەربکات بەو تەمێ و دڵ دامەزراندنە، هەروەها ئەو دەستە موسڵمانانە کەلەو کاتە سەختەدا کەم و بێدەسەلات بوون پێویست بوون بەو تەمێ و بەهێز کردنە، بێگومان موسڵمانان زۆر جارو لە زۆر شوێن و وڵاتدا دووچار بوون و دووچار ئەبن لەسەر ئایینەکەیان، دووچاری کوشتن و بڕین و سزادان زیاتر لەوەی کە ئەو یەکەم چینە دووچار بوون، چونکە نەفامەکانی ئەمڕۆ زۆر بێشەرم و ڕەق و بێبەزەیی ترن لە نەفامەکانی ئەو یەکەم چەرخە، ئەو کاتە هەر نەفامەکانی مەککەو دەورو بەری هەڵئەسان بەو دوژمنایەتیی و ئەو کردەوە بەدو ناڕەوایانە، بەڵام ئەمڕۆ نەفامەکانی وڵاتی ئیسلام بە جارێ پەلاماری بانگکەرانی ئیسلام ئەدەن لەسەر نەمانی سەلیبیی و سەهیۆنیی و ماددییە بێبڕواکانی هەموو جیهان و ئەو نەخشەی کە ئەیکێشن بۆ بەکرێ گیراوەکانی خۆیان لەوڵات و جیهانی ئیسلامدا، کەواتە با ئەم موسڵمانە تێکۆشەرانەی ئەمڕۆ بیربکەنەوە لەم ئایەتەو تیماری هەموو داخ و دەردو ئێش و ئازارو غەم و پەژارەی خۆیانی پێبکەن بە ئیزنی خوا، چاو بڕنە پێشەواکانی یەکەم چەرخ و چین، بە یارمەتیی و ئیزنی خوا سەرکەوتن و پاشەڕۆژی کامەرانی مسۆگەرە بۆیان، بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا هەیە بە پێش چاویانەوە ئەو بەکرێ گیراوانی بێگانە بەرەبەرە هاتن بە ڕیسوایی و نەفرینەوە ڕۆشتن بەبەرنامەو بانگەوازە کانیانەوە بەڵام بانگکەرانی ڕێگەی ئیسلام وەك بەرنامەکەیان دەست نادات بۆ نەمان و فەوتان، بەڵکو پاشەڕۆژی هەر سەرکەوتن و دەرکەوتنە، هەروەها ئەوا خۆشیان سەریان هەڵدایەوە لە هەموو لایەکەوە، تەنانەت لە جەرگەی وڵاتی ئەو بێگانەو بێبڕواو خوێن مژانەدا، ئەوەتا سوپاس بۆ خوا ئەو وریا بوونەوەو خەبەر بوونەوەی ئیسلامی جیهانییە دڵی هێناوەتە لەرزەو نازانن بە چ جۆرو شێوەیەك بەربەستی بکەن و تازە بۆ نیشان ناکرێ؟!!

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾

---

ئینجا هەروەها ئەڕوات لەسەر ئەو بێبڕوایانە کە ئەیانگوت: ئەم قورئانە دەست هەڵبەستە، بەرەنگاریان ئەوەستێو شێوەو ڕێنەیەك لە بەسەرهاتو ڕووداوە سامانەکەیان ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئایا چ کەسێك ستەمکار ترە لەو کەسەی کە دەست هەڵبەستی کردبێ بەدەم خواوەو درۆی خۆی سەپاندبێ بەسەر خوادا، بەم ڕەنگە هاوبەش یان کوڕو کچو نەوەی بۆ ڕەوا دابێ، یان بە هەر جۆرێکی تر، واتە هیچ کەس لەو کەسە ستەمکار تر نییە، بێگومان ڕەوادانی هەر شتێو هەرکارو کردەوەیەك کە ناشایستەو دژی خوایەتی بێت هیچ جیاوازی نییە لە بەدیو خراپیدا لە بێبڕوایی و دان نەنان بە بوونی خوا لەڕووی ڕاستیدا، کەواتە بێبڕوایی ماددی وەك هەڵبەستەکە وایەو جیاوازیەکی نییە لە ستەمکاریداو زیاتر نییە لە ستەمدا لەو. ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ﴾ ئەوانە ئەبرێنە حوزوری پەروەردگاریان لە ڕۆژی دواییدا بۆ پرسیاریانو کردەوەو وتەکانیان ئەخرێتە ڕوو، ﴿وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ﴾ شایەتەکان لە پێغەمبەرانو مەلائیکەو کەسانێکی تر کە خوا فەرمان بدات، ئەو شایەتانە شایەنی لێ ئەدەن لەو کاتو شوێنە سەختو سامناکەداو ئەڵێن: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ﴾ ئا ئەوانەن ئەو کەسانەی کە درۆیان دەست هەڵبەست کرد بەدەم پەروەردگاریانەوە لەدنیادا، ڕاو بڕیاری درۆینەی خۆیان ئەسەپاند بەسەر خوادا، پەنا بە خوا لەو شەرمەزاریو ئابڕوو بردنە!! لەو کاتو شوێنە سامناکەداو لەناو ئەو هەموو کۆڕو کۆمەڵەدا دەست نیشانیان بۆ ئەکەن بەدەست هەڵبەستی درۆ، بەدەم کێوە؟ بەدەم پەروەردگاریانەوە نەك بەدەم کەسێکی ترەوە، ئینجا وتەیەك کە ڕێكو ڕاست بێت لەگەڵ ئەو تاوانە گەورەیەدا ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ لە پێشەوە بەوتەی ﴿أَلَا﴾ واتە بێدارو ئاگادار بن هەمووان ئاگادار ئەکرێن با باش گوێ بگیرێ لەو بڕیارە سەختەی ئەدرێ بەسەر ئەو ستەمکارە بەش بڕوانەدا: نەفرینی خواو دوور خستنەوە لە بەزەیی خوا لەسەر ئەو ستەمکارانەیە، واتە ئەو هاوبەش ڕەوادەرانەی کە درۆیان دەست هەڵبەست کرد،

ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ

﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا﴾ ئەو كەسانەی کە ڕێ ئەگرن و بەربەست ئەکەن لە ڕێگەی خوادا، واتە ئایینە ڕاستەکەی خوا، نیازی لاری و چەوتی بۆ ئەکەن و ئەیانەوێ بەو شێوە بەدە نیشانی بدەن و باسی بکەن، ﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوانەی بێبڕوان بە ڕۆژی دوایی، ئەوانە کە لائەدەن لە ئیسلام کە هەر ئەوانە ستەمکارن ئەیانەوێ ژیان و هەموو کارو بارێك لارو چەوت بێت و بەلارو چەوتی بڕوا، بێگومان بەرهەمی لادان لەڕێگەی بەرنامەی خوا هەر لارییە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، لە هەموو بارو ڕوویەکی دەروونی و هەموو بارو ڕوویەکی ژیانەوە، شتێکی ئاشکرایە کە بەندەیی و فەرمانبەریی هەرکەسێکی تر بێجگە لە خوا ڕیسوایی و زەلیلی پێك ئەهێنێ لە دەرووندا لە کاتێکدا کە خوا ڕێزو سەربەستی و سەربەرزیی پێ خۆشە بۆ بەندەکانی، ستەم و دەست درێژیی پێك ئەهێنێ لە ژیاندا لەکاتێکدا دادو دادپەروەری ئەوێ لە ژیان و لە جیهاندا، هەوڵ و تێکۆشان و کردەوە بێباوەڕەکانی سوودو بێباوەڕەکانی هودە ئەکات، چونکە لەبەر خوا ناکرێن و لەبەر ئەو بتە پڕو پووچانە ئەکرێن، کەواتە هەمووی زایەو بێسەرو شوێن ئەڕۆن، خوا پەنامان بدات، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەو نەفرین لێکراوو دوور خراوانە نەبوو بە دەستە پاچەکەری خوا لە وڵات و زەویداو لە دەست قودرەتی خوا دەرنەچوون، ئەگەر خوا بیویستایە هەر لە دنیادا ئەیگرتن بەهەر سزایەك کە مەیلی ببوایە، ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ نەبوو بۆیان بە هیچ جۆر بێجگە لە خوا هیچ کاربەدەستان و دۆست و یارمەتی دەرانێ کە کاربەدەستیان بکات و یارمەتیان بدات و بەرگری سزای خوایان لێبکات، ئەوانە هەرچەندە بەو جۆرە دەستەپاچەو بێکەس و بێدەربوون خوا سزاکەی دواخستن بۆ ڕۆژی دوایی ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ سزایان بۆ دوو قات ئەکرێتەوە، واتە بێجگە لەهەر سزایەك کە دووچاری بوون لە دنیادا سزای ڕۆژی دواییشیان هەیە کە سزای هیچ نییە لەچاو ئەودا، یان هەردوو قاتەکە لە ڕۆژی دواییدا هەیە، قاتی لەسەر لادان و بێبڕوایی خۆیان و قاتێ لەسەر گومڕاکردنی خەڵکی، ئەوانە هەست و هۆش و چاوی دڵی خۆیان لەکار خستبوو خۆیان کوێر کردبوو، وەك بیستن و بینینیان نەبووبێ،

مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾

---

**ئەوەندە بیستنی هەق قورس و گران بوو لە گوێچکەیانداو بینینی هەق تاریك بوو لەبەر چاویان توانای بیستن و بینینیان نەبوو وەك ئەفەرموێ: ﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ﴾ ئەوانەی توانای بیستنی ئەو هەقەو ئەو قورئانەیان نەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێنان ﴿وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ﴾ ئەو هەموو ڕابەرو بەڵگەو نیشانانەیان نەئەبینی کە بە فراوانی پرژو بڵاو بوو لە خۆیان لە بوونەوەرداو قورئانیش سەرنجی ڕائەکێشان بۆیان، بەڵکو خۆیان کوێر کرد بوو لە ئاستیان، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانە کەسانێك بوون کە زیانباری خۆیان بوون و نەفسی خۆیان لەکیس چوو، کەهیچ زیانێك ناگات بەوە، زیانباری خۆیان بوون لە دنیادا، هەستیان نەکرد بە ڕێزی ئادەمێتی خۆیان، بەم ڕەنگە دروستکراوێکی وەك خۆیان پەرست و لایاندا لە پەرستنی پەروەردگاری هەموو بوونەوەری، لە ڕۆژی دوایشدا دووچاری سەرشۆڕی و نەفرین و سزای نەبڕاوە بوون ـ خوا پەنامان بدات ـ آمین. ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ ون بوون لێیان، واتە بێگومان ون ئەبێ ئەوەی کە دنیادا درۆو دەست هەڵبەستیان پێئەکرد، بە تەما و ئومێدی هەرچی بوون بە هیچ دەرچووو بەش بڕابوون لە هەموو شتێ، ﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ﴾ بەڕاستی و بێگومان هەر ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا زیان بار ترینن، بە جۆرێ کە هیچ زیانێکی تر هاوتای زیانی ئەوان ناکات، لەبەرامبەر ئەو بەش بڕاوو سیاچارانەوە بڕوادارو خاوەن کردەوە چاکان هەن کە بەختەوەر ترینن وەك دەست نیشانیان بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێهێناوە ﴿وَأَخْبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ﴾ ئارام و دڵ دامەزراون بۆلای پەروەردگاریان و دڵنیا و ملکەچن و بڕوای تەواویان هەیە، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە خاوەن و هاوەڵی جوێ نەبووەوەی بەهەشتن، لەوانە لەویەهەشتەدا هەمیشەیین بەبێ بڕانەوە ـ خوا بەشدارمان بکات بەو بەهرەو میهرەبانییەدا ـ**

﴿ مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ ۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ

---

ئینجا چیرۆکێکی ڕاست و ڕێک و سەرو بەر ئەهێنێتەوە بۆ ئەو دوو دەستەیە ئەفەرموێ: ﴿مَثَلُ ٱلْفَرِيقَيْنِ كَٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْأَصَمِّ وَٱلْبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ ۚ﴾ وێنەی نایاب و شێوەی ئەو دەستەیە وەك كوێرو كەڕو بیسەرو بیناوان، دەستەی سیا چارەی یەكەم وەك كوێرو كەڕ، دەستەی بەختەوەری دووەم وەك بیسەرو بینایە، ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ﴾ ئایا ئەو دوو دەستەیە یەكسانن و وەك یەك وان لەبارەی بارو حاڵی و سیفەت و دوا ڕۆژەوە؟ بێگومان هەموو فامدارو ژیرو نەفامێكیش ئەزانێ نەخێر وەكو یەك نین، ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا ناكەنەوە؟ واتە شتەكە ڕوون و ئاشكرایە و هەر بیر كردنەوەی ئەوێ، كەواتە بیر نەكردنەوەو بڕوا نەهێنانتان شتێكی بەدەو مایەی بێزاری دەربڕینە.

لەم سورەتەدا داستان و سەرگوزەشتەی كۆمەڵێك لە پێغەمبەران و گەل و ئوممەتەكانیان ئەهێنێ لەپاش چەند گەردش و خولانەوەیەك كە كردی بەدڵ و دەروون لە ئاسمانەكان و زەوی و كون و قوژبنی دەروون و مەیدانی ڕۆژی دوایی، لەو گەردش و خولانەوەیەدا چەند شتێكی سەرەكی و بنەڕەتی بیروباوەڕی ئیسلامی نیشاندا، وەك دەست نیشانمان بۆ كردن، ئینجا دەست ئەكات بە گەردش و خولانەوەیەكی تر لەوڵاتان و ڕووداوەكانی مێژووو هێندێ لەداستانی پێشووەكان، بزووتنەوەی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام ئەخاتە بەرچاو بەرامبەر بە بەربەرەكانێی نەفامان بە درێژایی چەرخەكانی ڕابردوو، لەیەكەم جارەوە دەست ئەكات بە داستانی (نوح) (علیه السلام) لەگەڵ گەلەكەی، هێندێ درێژەی پێ ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ﴾ سوێند بە خوا نوحمان ڕەوانە كرد بۆ لای گەلەكەی ﴿إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ كە بەڕاستی من بۆ ئێوە ترسێنەرێكی ئاشكرام و بە ڕوونی ئەتان ترسێنم، واتە لە یەكەم جارەوە ئەوەی پێ ڕاگەیاندن و ئەوەی پێ گوتن، بەڵام نەیفەرموو: ئەوەی پێ گوتن. بەجۆرێك

نەیفەرموو کە هەواڵێك بێت و بیگێڕێتەوە لێیەوە بەڵکو بەم جۆرە فەرمووی کە وەك ئێستا ئەو کاتە بێت و ئێمە واین بە بەچاوەوەو وتەکەی ئەبیستن، کە ئەو شێوەیە زۆر بەکارەو لە ڕەوان بێژییدا زۆر پەسەندە، ئەوە لەبارێکەوە لەبارێکی تریشەوە کارو پیشەی ڕەوانە کراوە کە پاڵفتە ئەکات و کورتەکەی ئەدا لە گوێچکەی گوێگراندا کە ئەوەش زۆر بەهێزە لەدیاریی کردنی مەبەست و ئامانجی پەیام و فروستادەکەیدا، ئینجا مەبەستی پەیامەکە ڕوون تر ئەکاتەوە بە کورتەیەکی تر، ئەفەرموێ: ﴿أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ واتە ڕەوانەمان کرد بەوەی کەبڵێ پێیان بێجگە لە خوا کەسێکی تر نەپەرستن و تەنها ئەو بپەرستن، هۆی ئەو جڵەوگیرییە ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ بەڕاستی من مەترسی ئەکەم لێتان لە سزای ڕۆژێکی ئازار دار کە بباری بەسەرتانداو داگیرتان بکات ئەگەر بێجگە لە خوا هیچ کەسێکی تر بپەرستن، بەو وتە کورتانە ڕاگەیاندن و ترساندنەکەی دوایی پێهێنا، بێگومان ڕۆژی ئازاردار نییە، بەڵکو ئازاردەرەو خەڵکی لەو ڕۆژەدا ئازار دران، بەڵام بەم جۆرەی کە فەرمووی سزاکە سەخت تر نیشان ئەدات، چونکە لە جێیە ئەو ڕۆژە ئازاردار بێت ئەبێ ئەوانەی کە لەو ڕۆژەدان حاڵ و باریان چۆن بێت؟ بەرامبەر ئەو تەمێ و پەندە گرنگە ئەو نەفامانە چەند ڕەخنەیەکیان گرت، وەك دەست نیشانیان بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾ئینجائەوکۆمەڵەپیاوماقوڵەی کەبڕوایان نەهێنابوولەگەلەکەی وتیان:

١- ﴿مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا﴾ ئێمە تۆ نابینین بێجگە لەوەی کە ئادەمیەکی وێنەی ئێمەی، واتە ماتوڵ کە ئادەمییت نابێ فروستادە بیت، ئەم ڕەخنەیە شتێکی جێگیرو دامەزراوە لە دڵی نەفامەکاندا لە هەموو چەرخ و چینێکدا کە ئادەمی نابێ و دەست نادات بۆ فروستادەیی خواو ئەو ڕادەو پلەی نییە، بەڵکو ئەوەی کە دەست ئەدات بۆ ئەو کارە گرنگە ئەبێ فریشتە بێت یان شتێکی تر، ئەوە ڕەخنەیەکی نەفامانەیەو سەرچاوەکەی بێبڕوایی یەو نەناسینی ئەم ئادەمییەیە کە خوا کردوویەتی بە جێنشین لە زەویدا، ئەوەی پێویست بێت بۆ هەڵسانی بەو کارە زۆر گرنگە پێی بەخشیوە، بێجگە لەوەش ـ وەك لە چەند شوێندا باسمانکرد ـ فروستادە ئەبێ کەسێك بێت گونجاو بێت لەگەڵ ئەو خەڵکەداو هەست بکات بە خۆشی و ناخۆشی و پێویستی و داخوازییەکانیان، سروشتێکی تایبەتی و جیاوازی نەبێ، ئەو داواو ئەرکەی کە ئەیخاتە سەر شانی ئەو خەڵکە شیاو و گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی خۆیشی و ئەوانیشدا، هۆگر بێت لەگەڵیان

بەبێ سڵەمینەوە، کەواتە ئەبێ هەر لە تیرەی ئەوان بێ،ئەو نەفامانە زۆر تر پەڵپی فریشتەیان ئەگرت، دەی فریشتە لەسەر شێوەو سروشتەکەی خۆی نابینرێ بۆ ئادەمی، کەواتە ئەبوو شێوەو نەخشەی ئادەمی بەسەردا بکێشرایە، ئەو کاتە بە ئادەمی دائەنراو هەمان ڕەخنە ئەهاتەوە کایە.

٢- ﴿وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ﴾ نابینین هیچ کەسێك دوای تۆ کەوتبێ و پەیڕەوی کردبێ بێجگە لەوانەی کە سادەو بێنرخ و پەست ترینی ئێمەن، واتە لات و بێنەواکانمان، شوێنت کەوتوون لە یەکەمجارەوە بەبێ تێفکرین و بیرکردنەوەو زانین، ئەمەش ڕەخنەو لەکەدار کردنێکە لەلایەن چینی دەسەڵاتدارو پیاو ماقوڵانەوە ئاڕاستەی بڕواداران کراوە، واتە شایستە نییە بۆ چینی بەرزو پیاو ماقوڵ ڕێگەی ئەو لات و لوت و نەزانانە بدەنە بەرو بەپێی بەرنامەی ئەوان ڕەفتار بکەن، نابێ بێدەنگ بن و واز بێنن لەوانە بڕوابێنن! ئەوانە بێنەواکانیان ناو ئەبرد بەبێ نرخ و پەست، کە باوی زۆردارو سامان دارەکان هەر وا هاتووە بەچاوی سووك سەرنجی هەژارو بێنەواکانیان داوە، لە کاتێکدا زۆرتر ئەمانە شوێن کەوتووی پێغەمبەران بوون - درودی خوایان لەسەر بێ- چونکە بەسروشت ئەمانە نزیك تر بوون بۆ پەیڕەوی و گوێ ڕایەڵی بۆ ئەو بانگکردنەی کە خەڵکی ئازاد ئەکات لە بەندەیی و کۆیلەیەتی زۆرداران، دڵەکان پەیوەست ئەکات بە خوایەکی بەرزو بڵند بەسەر هەموو زۆردارو دەسەڵاتدارەکاندا، لەبەر ئەوەی ئەو هەژارو بێنەوایانە تێك نەچوو بوون بەهۆی کەشخەو نازو نیعمەتەوە، لەبەر ئەوەی مەترسی ئەوەیان نەبوو ڕێزو ڕادەی پلەی بەرزیان لەکیس بچێ بەهۆی بڕوا هێنانیان بە خواو بە ئایینی خوا، وەك زۆردارو سامانداراکان مەترسیان ئەکرد لە نەمانی ئەو کەشخەو کەش و فشەی کە دەستکەوتیان بوو بوو بە هۆی ئایینی پڕوپووچ و بت پەرستییەوە، یەکەم شێوەی بت پەرستی بریتییە بە ملکەچی و شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی بۆ کەسانێ کەدێن و ئەڕۆن، گوێڕایەڵی و بەندەیی بۆ ئەوانە لەباتی ڕوو کردنە بەندەیی بۆ خوا بەبێ هیچ هاوبەشێك، کەواتە هەر ئایینی خواپەرستی هۆی ئازاد کردنە بۆ خەڵکی لە هەموو بارێکەوە و لە هەموو وڵاتێکدا، جا لەبەر ئەوە هەمیشە یاخی و سەرکێشەکان وەستاون بە دژی ئایینی خواو فروستادەکانی خوا، بەرگری خەڵکیان کردووە لە پەیڕەوی کردنی، هەوڵیان داوە ناشیرینی بکەن و بانگ کەرانی خوا لەکەدارو بەد ناوبکەن.

وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى

---

٣- ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾ نابينین هیچ زیادەو فەزڵێك بۆ ئێوە بەسەر ئێمەدا تا بەهۆی ئەوەوە ئێوە نزیك تر بن لەوەی ڕێنموونی وەرگرن‌و ڕاست بدەنە بەر، کەواتە ئەگەر ئەوەی ئێوە وان لەسەری باش بوایە بێگومان ئێمە ئەمان گرتە گەردن‌و ئەمان دایە بەر، ئێوە لێمان پێش ئەکەوتن! ئەوانە بەو جۆرە بەراوردیان ئەکرد، بەترازووی ماڵ‌و سامان کاروباریان هەڵئەسەنگان، سامانداز چاکترو بەرزترە، خاوەن ڕێزی دنیایی تێکەیشتووترە، دەسەڵاتدارو زۆر دار زانا ترو ئاشنا ترە بە چاك‌و خراپ!!! هەر کاتێك ئیسلام لەئارادا نەبوو نەفامی دێتە پێشەوە هەموو ترازووو سەنگ‌و کێشانەیەك تێك ئەدات، ئینجا دواترین لەکەدار کردن کە ئاڕاستەی ئەو پێغەمبەرەو شوێن کەوتووەکانیان کرد ئەمەبوو: ﴿بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ﴾ واتە بەڵکو کارەکەتان لەوە خراپ ترە ئەوەش ئەمەیە کە ئێمە گومانتان پێ‌ئەبەین کە درۆزنن‌و درۆئەکەن، واتە ئەی نوح تۆ درۆ ئەکەیت لەمەی لافی پێغەمبەرێتی لێ ئەدەیت، شوێن کەوتووەکانی ئێوەش درۆ ئەکەن کە لافی بڕوا لێ ئەدەن، نەیان گوت ئێوە درۆزنن بەڵکو گوتیان گومانتان پێ ئەبەین، تا کەس نەڵێ ئەمانە هەر ئەیانەوێ قسەی خۆیان سەرخەن، بێگومان بەم شێوەیە نزیك ترە لە وەرگرتنەوە، ئینجا بەرامبەر ئەو هەموو نەم درێژیی ئەوانە نوح (علیه السلام) بەم جۆرە نەرمی‌و ناسکی‌و چاوپۆشییەوە بەرپەرچی دانەوە کە ئەگەر تۆزێك پیاوەتیان تێدا بووایە سەرکێشی‌و یاخیەتیەکەیان نەئەما، بەرپەرچی دانەوە بەو بێ باکی‌و دڵنیاییەی کە بووی بەو ڕێگە ڕاستەی کە لەسەری بوو، دڵنیایی‌و پشت پڕییەی کە بووی بە خوای خۆی، بە ڕوونی‌و ڕاستی بەرنامەکەی، بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی بەو یاخی‌و نەفامانە: ﴿يَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم خۆشەویستی نیشاندا لەگەڵیان‌و ئەوانی بەهێنی خۆی دانا‌و خۆیشی بە هێنی ئەوان، ﴿أَرَءَيْتُمْ﴾ پێم بڵێن‌و هەواڵم بدەنێ. ﴿إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى﴾ ئەگەر من لەسەر بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرا بەم ڕەنگە لەلایەن پەروەردگارمەوە،

وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِنَّهُم مُّلَٰقُوا رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ

---

**﴿وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ﴾ ڕەحمەت و میهرەبانیەکی گەورەی پێبەخشی بەم ڕەنگە لەلایەن خۆیەوە واتە پێغەمبەرێتی ﴿فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ﴾ ئینجا ئەو ڕەحمەت و میهرەبانییە داشارابێت لەئێوەو ئاشنا نەکراین پێی، ﴿أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ﴾ ئایا ئێمە بە زۆر ئەیلکێنین و ئەیچەسپێنین پێتانەوە لەکاتێکدا ئێوە بێزارن لێی و خۆشیتان لێی نایە؟ واتە نەخێر شتی وا ناکەین، چونکە بڕواو بیروباوەڕ بە زۆر پێك نایەت، بە خواهیش و ملکەچی بەدی دێت و هیچکەس بێجگە لە خوا ناتوانێ ئەو بڕواو بیروباوەڕە پێك بێنێ لەدڵی هیچ کەسێکدا.**

**بەم جۆرە نوح (علیه السلام) لەو لوتف و میهرەبانییە تەمێی ئەوانەی کرد و سەرنجی ڕاکێشان و دەستکاری دڵ و دەروونی کردن، ﴿وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا﴾ ئەی گەلەکەم داوای هیچ ماڵ و پووڵ و پارەیەکتان لێناکەم لەسەر ئەم ڕاگەیاندن و بانگکردنە تا بەهۆی ئەوەوە گومان ببەن کە من مەبەستم سوود و دەستکەوتی خۆمە، ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾ ئەجرو پاداشتی من لەسەر بانگکردنە کە هەر لەسەر خوایە. وا دەرئەکەوێ کە ئەوانە بە عاریان زانیبێ لەگەڵ ئەو هەژارو بێنەوایانەدا کۆ ببنەوە لای نوح، یا لەسەر یەك بەرنامەبن، لەبەر ئەوە داوایان کردووە کە ئەو هەژارو بێنەوایانە دەربکات لە دەوری خۆی، ئەویش دیارە داوای وا بێجێ وەرناگرێ و فەرمووی: ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا﴾ بێگومان من دەرکەرو پاڵ پێوەنەری ئەوانە نیم کە بڕوایان هێناوە، ﴿إِنَّهُم مُّلَٰقُوا رَبِّهِمْ﴾ بەڕاستی ئەوانە ئەگەن بە حوزوری خوای خۆیان لە ڕۆژی دواییدا، کاری ئەوانە بە دەست خوایە، نەك بەدەست من.**

**﴿وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ بەڵام من ئێوە ئەبینم بە گەل و کۆمەڵێك کە نەفامن و نازانن چی نرخی هەیە لای خوا لە ترازووی خوادا، نازانن کە هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﴿وَيَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ﴾ ئایا کێ من ئەپارێزێ و پەنام ئەدات ئەگەر من ئەوان بتارێنم و دەریان کەم کە بڕوادارن و لای خوا ڕێزدارن؟**

أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣١﴾

---

**﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بیرناکەنەوەو ئامۆژگاری وەرناگرن؟ واتە ئایا هەر لەسەر نەفامی خۆتان بەردەوام ئەبن‌و بیرێك ناکەنەوە لە حاڵی خۆتان‌و ئەوان تا بزانن ئێوە لەسەر ناهەقن، بیرێك بکەنەوەو بگەڕێنەوە لەوەی وان لەسەری. نەفامە بێبڕواکان لایان وابوو کە فروستادە ئەبێ دەسەڵاتدار بێ‌و چۆن مەیلی ببێ ماڵ‌و سامان ئامادەیە لای، ئەبێ غەیب زان بێت، ئەبێ فریشتە بێت نەك ئادەمی، لەبەر ئەوە ئەوا خۆی نیشان ئەدات پێیان، ئەو شتانە دائەڕنێ لە خۆی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ﴾ ناڵێم پێتان کان‌و پنق‌و ڕۆزی‌و خەزنەکانی خوا لای منە، واتە بەمەی کە ئەڵێم فروستادەی خوام بۆ سەر ئێوە لافی ئەوە لێنادەم ﴿وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ﴾ من غەیب نازانم، واتە خۆم بە خۆم نازانم مەگەر خوا زانام بکات بە هەر شتێ لەغەیب‌و کە خۆی ئیرادەی کردبێ. ﴿وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ﴾ من ناڵێم من فریشتەم، بەڵکو ئادەمیم وەکو ئێوە ﴿وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ﴾ ناڵێم دەربارەی ئەوانەی کە چاوی ئێوە بە سووك‌و عەیب دار سەرنجیان ئەدات، دەربارەی ئەوانە ناڵێم ﴿لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا﴾ هەرگیز خوا خێرو خۆش بەختی نابەخشێ بەوانە، وەك ئێوە ئەڵێن: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ خوا زانا ترەو زانینی تەواوی هەیە بەوەی کە لە دەروونی ئەوان دایە، کەواتە من هەر ڕووکەش‌و ڕواڵەتەکەیان ئەزانم کە بە چاك ئەیان ناسم‌و ئومێدی خێرو چاکەم هەیە پێیان، ﴿إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی من لە ستەمکاران ئەبم ئەو کاتە، واتە ئەگەر هەرکام لەوانەتان پێبڵێم ناهەقی ئەڵێم‌و ئەچمە ڕیزی ستەمکاران‌و کاران‌و ناهەق بێژان، ستەمکارو دەست درێژیی کەر لە هەق‌و ڕاستی، ستەمکارو دەست درێژیی کەر لە خۆم کە دووچاری خەشمی خوای ئەکەم، ستەمکارو دەست درێژیی کەر لە خەڵکیش بەمەی لەڕادەیەکدا نیشان ئەدەم کە خوا پێی نەداون‌و لەو ڕادەیەدا نین، ئینجا لەم کاتەدا کە ئەو سەرکێشانە نائومێد بوون لەوەی کەچاری قسەڕاستەکانی نوح بکەن. لەم کاتەدابەپێی باوی سەرکێش‌و خۆ بەزل زانیان وازیان لەوە هێناو دەستیان کرد بە بەرلێ بڕینەوەو پەلپ گرتن،**

قَالُوا۟ يَـٰنُوحُ قَدْ جَـٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾

---

وەك ئەفەرمووێ: ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان بە نوح: ﴿يَـٰنُوحُ قَدْ جَـٰدَلْتَنَا﴾ ئەی نوح بەڕاستی دەمەقاڵێ و ئاژاوەو قسە بەشەڕدانت کرد لەگەڵمان، واتە دەستت کرد بەوە، ﴿فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا﴾ ئینجا ئەو دەمەپاڵێ و قسە بەشەڕەدانەت زۆر لەگەڵ کردین و درێژەت پێدا، یان مەبەست ئەوەیە: جۆرێ لە دەمەقاڵێ و ئاژاوەت لەگەڵمان کرد، ئینجا لەپاش ئەوە بەدوای ئەوەدا چەند جۆرێکی ترت هێنا، بەجۆرێ یاس بووین و هیچمان بەدەستەوە نەما ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ دەی ئەو سزای کە هەڕەشەت پێکرد لێمان بیهێنە بۆمان ئەگەر تۆ لەڕاست گۆیانیت و ڕاستت لەو هەڕەشەیەدا، ئەو داوای ئەوانە لەڕاستیدا دەستە پاچەیی و بێهێزیی و لاوازییە لە شێوەو پۆشاکی هێزو دەسەڵاتدا نیشانیاندا، مەترسی کردنە لە زاڵ بوونی هەق لەدیمەن و پۆشاکی بەر لێ بڕینەوەو بێباکیدا دەریان خست. ئینجا ئەو دەم درێژیی و بێشەرمی ئەوانە لەخشەی نەکرد بەنوح و لای نەدا لە ڕەوشتە شیرینەکەی خۆی، بەرگری نەکرد لەوەی کە واز بێنێ لە ڕێنموونی و ڕوونکردنەوەی هەق و ئەوەی ئەوانە بێئاگاو نەزانن پێی، لەبەر ئەوە فەرمووی پێیان: ﴿إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ﴾ تەنها خوا بۆتان ئەهێنێ ئەگەر بیەوێ، واتە من دەسەڵاتم نییە لەوەدا، ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ ئێوە نین بە یەك خەرو دەستەپاچە کەر لەهاتنی ئەو سزایە کە خوا بیەوێ هاتنی و ئێوە لەدەستی قودرەتی خوا دەرناچن ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ﴾ پەندو ئامۆژگاری من سوودتان پێناگەیەنێ ﴿إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ﴾ ئەگەر من بمەوێ پەندو ئامۆژگاریتان بکەم، سوودتان پێناگەیەنێ ﴿إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ﴾ ئەگەر خوا ویستبێتی و بیەوێ گومراتان بکات و لەڕێگەی ڕاست بتان ترازێنێ، یان ئەگەر خوا بیەوێ لەناوتان بەرێ بەهۆی کردەوەی بەدو بێبڕواییتانەوە ﴿هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ ئەو خوایە پەروەردگارو داهێنەرو کاربەدەستتانە، هەر بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، ئەو کاتە بە پێی کردەوەکانتان ڕەفتارتان لەگەڵ ئەکات.

أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴿٣٥﴾ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾ وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ ﴿٣٨﴾

---

ئینجا لێرەدا لایەك ئەكاتەوە بۆ لای بێبڕواكانی قورەیش كە هەڵوێست بەپیرەوە چوونیان بۆ پێغەمبەرو قورئانەكەی، وێنەی هەڵوێستو بە پیرەوە چوونی گەلەكەی نوح بوو، ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ﴾ واتە واز بێنە لە باسی لەمەوبەرو وەرە سەر قسەی بەدی هاوبەش ڕەوادەرانی مەككە، ئایا ئەوانە ئەڵێن: محمد ئەم قورئانە بەدەمی خواوە دەست هەڵبەست كردووەو ئەم داستانی نوحە دەست هەڵبەستە؟ واتە وتەكەیان ناڕاستەو مایەی بێزاری دەربڕینە، ئینجا بەرپەرچیان ئەداتەوە بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي﴾ ئەگەر من ئەوە دەست هەڵبەست بكەمو كردبێتم ئەوا لەسەر خۆمە گوناهو تاوانەكەم، واتە ئەگەر ئەوەم كردبێ ئەوا تاوانم كردووەو تۆڵەی تاوانەكەم لەسەر خۆمە، ﴿وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ﴾ منیش بەریم لە گوناهو تاوانی ئێوە كە من بەدرۆزنو دەست هەڵبەست كەر دائەنێن، بێجگە لە بێبڕوایىو تاوانەكانی ترتان، (موقاتیلو ئیبنو جەریر)و كەسانێكی تۆ لەسەر ئەمەن كە ئەم ئایەتە تێهەڵكێشە وەك بەو جۆرە هێنامان، هەرچەند زۆربەو جەماوەری زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن كە تێهەڵكێش نییەو هەر لەداستانەكەی نوحە (علیه السلام) بەڵام بەڕاستی ڕای یەكەم كە كردمان بە تەفسیر زۆر بەهێزو جێگیر ترە لە دەرووندا زانینی تەواوی لای خوایە.

ئینجا هەروەها لەسەر داستانەكە ئەڕواو تەواوی ئەكاتو ئەفەرموێ: ﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ﴾ وەحی كرایە لای نوح ﴿أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ﴾ هیچكەس لە گەلەكەت بڕوا ناهێنن هەرگیز بێجگە لەو كەسەی كەلەمەو بەرو تا ئێستا بڕوای هێنابێ، واتە ئەو دڵانەی

كه ئامادەییان تێدا بوو بۆ بڕوا هێنان بڕویان هێناوە، بێجگە لەوانە ئامادەییان تێدا نییەو هەرگیز بڕوا ناهێنن، هیچ سوودی نیە خۆ خەریك كردن پێیانەوە، تۆ هیچ زیان بار نابیت بەوەی كە ئەوان وان لەسەری، ﴿فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ كەواتە ناڕەحەتو غەمبار مەبە بەوەی كە ئەوانە بەردەوام بوون لەسەری و ئەیكەن، گوێیان مەدەرێو وازیان لێ بێنە، چونكە كاریان بەسەر چووەو كاتی سزایان هاتووە وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا﴾ كەشتی یان كەشتی یەكە دروست بكە بە چاودێری ئێمەو وەحی ئێمە، واتە لە كاتێكدا وایت لەژێر چاودێریی ئێمەداو بە فێركردنی ئێمە ئەیكەیت، بە چەند جۆرێكی تریش ئەم فەرموودەیە تەفسیر كراوەتەوە لەسەر هەر بارو هەر جۆر وا ئەگەیەنێ كە نوح (علیه السلام) ئەوپەڕی ڕادە پارێزراو ئەبێو كارەكەی تێرو تەواو ئەبێ، ﴿وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ﴾ لەبارەی ئەوانەی كە ستەمیان كردووەو بڕوایان نەهێناوە هیچ وتەو قسەیەك ئاڕاستە مەكەو هیچ داواو نزایەكم لێ مەكە لە بارەی ئەوانەوە واتە نزاو داوای میهرەبانیو بەرگری سزا، یان داواو نزای شەڕیش، ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ هۆی ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ﴾ بێگومان ئەوانە خنكێنراو ئەبنو بڕیاری خنكاندنیان دراوە، ئەم فەرموودەیە وا نیشان ئەدات كە مەبەست داواو نزای ڕزگاركردنو میهرەبانی یە بەوانە.

ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ دروستكردنی كەشتیەكەو كەنارگیری نوح لەو بێبڕوایانەو هەڵوێستی بەدیان، ئەفەرموێ: ﴿وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ﴾ نوح دەستی كرد بە دروستكردنی كەشتییەكە، ئەو شێوە ئەخاتە بەرچاو بەمەی كە بە وتەی ئێستا ﴿وَيَصۡنَعُ﴾ فەرمووی: نەك بەڕابردوو، ﴿وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ﴾ هەموو جارێك كە كۆمەڵێك لەگەلەكەی گوزەریان ئەكردو ڕائەبوردن لەلایدا لاقرتیان پێئەكرد، ئەوان لاقرتیان پێئەكردو نوحیش ﴿قَالَ﴾ پێی ئەفەرموون: ﴿إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا﴾ ئەگەر ئێوە لاقرتی ئەكەن بە ئێمە ئەوا بێگومان ئێمەیش لاقرتی ئەكەین بە ئێوە، هەرچۆنێ ئێوە لاقرتی ئەكەن بە ئێمە.

﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ﴾

---

ئەگەڕێنەوە کە نوح (علیه السلام) کاتێ خەریکی دروستکردنی کەشتی یەکە ئەبوو، پرسیاریان لێ ئەکرد لەوە، ئەویش ئەیفەرموو: ئەمە ماڵێکە دروستی ئەکەم ئەگەڕێ بەسەر ئاودا ئەوەش شتێکی نەناسراو بوو بەدڵی کەسدا گوزەری نەئەکرد لەو کاتو چەرخەدا، دیارە ئەبێ لاقرتیان لێبێ بەشتی وا، نەیان ئەزانێ کە خۆیان نەفامو نەزانن ئەوان شایانن بۆ لاقرتی پێکردن، لەو کاتەدا کە نەیان ئەزانی ئەو کاری ئەوە سەری لە چییەوە دەرئەچێ، لەکاتی هاتنی سزاکەیاندا، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ ئینجا لەمەو پاش ئەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت کە بێئابڕووو سەر شۆڕی بکات، واتە سزای خنکاندنیان لە ئاوداو کێ ئامادە ئەبێتە سەری سزایەکی نیشتەجێی هەمیشەیی، واتە سزای ئاگر لە ڕۆژی دواییدا، نوح (علیه السلام) خەریکی دروستکردنی کەشتی یەکە بوو: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ هەتا کاتێ فەرمانی ئێمە هات بە سوار بوونی کەشتییەکە، یان فەرمان بە هۆی هەڵقوڵانی ئاو لە تەنورەکە کە نیشانەی کاتی سوار بوونی کەشتییەکەبوو، یان فەرمان بە مەلائیکە بە هەڵسانیان بەکارێك کە پێیان سپێررا بوو لەو ڕووداوەدا، یان هەتا کاتێ کاری ئێمە هات کە هاتنی سزادانیانە. ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾ تەنورەکە ئاوی لێ هەڵقوڵا، وشەی (تەنورو فار) بە چەند مەبەستێك تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام باشتر ئەوەیە کە لە ڕووکەشەکە لا نەدەین و تەفسیری بەوە بکەینەوە کە کۆمەڵ و جەماوەری زانایانی لەسەرە، کە بریتییە لە تەنوری نان کردن و کرابوو بە نیشانەی هاتنی ئەو سزایە، لەو کاتەدا: ﴿قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا﴾ گوتمان بە نوح هەڵگرە لەناو کەشتییەکەدا ﴿مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ

﴿اثْنَيْنِ﴾ لە هەموو گیانلەبەرێك دوان، یەكێ نێرو یەكێ مێبن، یان لە هەموو نێرو مێی گیانلەبەران دوان هەڵگرە، ئەمە بەپێی خوێندنەوەی (حفص)، ﴿وَأَهْلَكَ﴾ ژن و منداڵەكانیشت هەڵگرە ﴿إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ﴾ بێجگە لە كەسێك كە بڕیاری خوا پێشكەتووە لەسەری بە خنكاندن، وەك كەنعان ﴿وَمَنْ آمَنَ﴾ هەڵگرە ئەو كەسەیش كە بڕوای هێناوە لە گەلەكەت ﴿وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ بڕوای نەهێنا بوو لەگەڵ نوح كەمێك نەبێ، كە چەند ڕیوایەتێك هاتووە بە ئەندازەو ژمارەیان، بەڵام لەبەر دڵنیا نەبوون بەو ڕیوایەتانە باسی هیچیان ناكەین و هەر بە ڕووكەشەكە واز ئەهێنین و هەر ئەڵێین: كەمێك. ﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا﴾ نوح فەرمووی بە بڕوادارەكان سزار بن و بچنە ناو كەشتییەكە ﴿بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ واتە بچنە ناویەوە لە كاتێكدا ناوی خوا بەرن لەكاتی گەڕان و وەستاندنیدا، یان لەكاتێكدا ئەم ڕستەیە بڵێن وەك كاتی سوار بوونی وڵاخی سواری ئەڵێن: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا﴾ یان بەناو خوایە گەڕان و وەستاندنی، ئەمە مزگێنی نوحە پێیان، بەمەی گەڕان و وەستاندنی بەناوی خوایەو لەژێر چاودێریی و پارێزگاری خوادایە، ﴿رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر لێبووردەی میهرەبانە، ئەم فەرموودەیە هەڵئەگرێ سەر بە خۆ بێت و دەست نیشان بێت بە هۆی ڕزگار بوونیان، واتە ئەگەر میهرەبانی و لێبووردنی خوا نەبوایە ئێوە خۆتان بە خۆتان شایستەی ڕزگاربوون نین، یان مەبەست مزگێنییە پێیان بەمەی نەترسن لە خنكان بە هۆی گوناهو كەم و كوڕی خۆیان، چونكە خوا لێبووردەی میهرەبانە.

ئینجا شێوەیەكی زۆر سامناك ئەخاتە بەرچاو، شێوەی گەڕانی ئەو كەشتییە لەناو ئەو دەریا و شەپۆلە گەورەكانی كەلە گەورەیی و بەرزیا بەوێنەی شاخەكان وان، ئەفەرموێ: ﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ﴾ كەشتییەكە كە ئەیگێڕان لەناو شەپۆل و لەكاتی شەپۆلی دەریاكەدا كەلە گەورەیی و بەرزی و درێژیی و جیاوازیدا وەك شاخەكانی زەوین، هەركەس گەڕابێ لەناو كەشتیدا لەدەریاكاندا لە تایبەت دەریا گەورەكان ئەو وێنەو شێوەیە ئەبینێ وەك بۆمان باس ئەكەن. لەو كاتە سەخت و سامناكەدا كە سواری كەشتییەكە ئەبن، نوح (علیه السلام) سەرنج ئەدا یەكێ لە كوڕەكانی كەنارگیرە لێیان و نایەت لەگەڵیان،

وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾

---

ئەمیش بە پێی بەزەیی باوکێتی بانگی ئەکات وەك ئەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ﴾ نوح بانگی کوڕەکەی ئەکرد، ﴿وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ﴾ لەکاتێکدا کەلە شوێنێکی کەناردابوو لەوانەی کە سواری کەشتییەکە ئەبوون و جیا بوون لە بێبڕواکانیش ﴿يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا﴾ ئەی کوڕی خۆم، ﴿يَٰبُنَىَّ﴾ کە بەزەیی و خۆشەویستی نیشان ئەدات بۆ ئەوەی بێت بەدەم بانگکردنەکەیەوە ـ سوار بە لەگەڵمان ـ ﴿وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ لەگەڵ بێبڕواکان مەبە کە بڕیاری سزاو لەناوبردنیان دراوە، بەڵام کوڕی لاساری گەنج گوێی نەبوو لە سۆزو بەزەیی و هەڵخەڵەتا بوو لە گەنجی و هێزی خۆی، لەبەر ئەوە نەی ئەزانی کە کارەکە زۆر گرنگ و گەورەترە لەوەی ئەو بۆچوونی بۆ ئەڕوا، لەبەر ئەوە: ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ﴾ پەنا ئەبەم بۆلای شاخێك کە پەنام ئەدات لە ئاوەکە، لای وا بوو لافاوێکە هەروا دێت و ئەڕواو ئەنیشێتەوەو کاتێ زۆری هێنا ئەچێتە سەر شاخێك تا بەوە ڕزگاریکات و نەیزانی کار بە جۆرێکی ترە وەك باوکی ﴿قَالَ﴾ پێی فەرموو: ﴿لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾ هیچ پارێزەرو پەنا دەرێك نییە ئەمڕۆ لەبڕیارو سزای خوا بێجگە لەکەسێك کە خوا ڕەحم و میهرەبانی پێکردبێ، واتە هیچ پەناگایەك نییە بۆ تۆ ئەمڕۆ بێجگە لە یەك پەناگا کە ئەو کەشتی یەیە، یان هیچ پەنادەرێك نییە ئەمڕۆ لە سزای خوا، بەڵام کەسێك کە خوا میهرەبانی پێکردبێ ئەو کەسە پەنادراوو پارێزراوە، ﴿وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ﴾ شەپۆلی ئاو هات و کەوتە نێوان نوح و کوڕەکەی و بردی، ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە گەڕا بە یەکێك لە خنکێنراوەکان. بێگومان باوباران و هەرشتێ کە خوا سزای بەندەیانی پێدابێ گوێڕایەڵ بووە بۆ فەرمانی خواو هیچ جۆرە سەرپێچیەکیان نییە بەبێ زیادو کەم، جا بەپێی ئەوە لافاوەکە هەڵساو بوو بەو دەریایەو بێبڕواکانی لە ڕیشەهێناو لەناوی بردن، ئینجا کە هەڵسا بەکارە پێسپێرراوەکەی فەرمان دەرچوو بەوەی کۆتایی بێنێ و بچێتەوە سەر بارو حاڵی خۆی،

وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ﴾ گوترا ئەی زەوی ئاوەكەت هەڵمژەو قوتی بدە، ﴿وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي﴾ ئەی ئاسمان بوەستەو واز بێنە لە باراندنی باران، ﴿وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ﴾ ئاوەكە كەم كرایەوەو برا بەناو زەویدا ﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ كاروبارەكە بەجێهێنرا، واتە تاوانباران لە ناوبرانو بڕواداران ڕزگاركران، ﴿وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّ﴾ كەشتییەكە وەستاو جێگیربوو بەسەر جودییەوە كە شاخێكی دیاری ناسراوە لەلای ژووروی عێراقەوە. ﴿وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ گوترا لەناوچوونو دووری لە بەزەیی خوا بۆ گەلە ستەمكارەكان كە گەلەكەی نوح لێرەدا یەكەمو سەردەستەن. ئەم ئایەتە بەڕاستی دڵو هەستو هۆش داگیر ئەكاتو نازانرێ چی بگوترێ بەرامبەری، گوتراوە ئەمە بەرزو بەهێزترینی ئایەتەكانی خوایە لەڕادەو پلەی ڕەوانبێژیدا، ئینجا لەپاش ئەوەی ئەو كارە بەو جۆرە دوایی هاتو هەموو شتێ بڕایەوە لەبارەی بێبڕواكانەوەو دەركەوت نائومێدیو بەش بڕاویان، لەپاش ئەوە سۆزو بەزەیی نوح (علیه السلام) سەری هەڵداو پاڵی پێوەنا بۆ هەوڵدان بۆ چارەسەرێ، ئەوەش ئەمەی دۆزیەوە كە خوا لە پێشەوە بەڵێنیدا بەڕزگاركردنی ماڵو منداڵی، لەبەر ئەوە فەرمووی: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ﴾ نوح هاوارو نزای كرد لە پەروەردگاری خۆی، ﴿فَقَالَ﴾ بەم جۆرە گوتی: ﴿رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی كوڕەكەم لە ماڵو منداڵی منە ﴿وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ﴾ بێگومان بەڵێنی تۆ هەر هەقو ڕاستە ﴿وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ﴾ تۆ زاناترو كاردروست ترو داد پەروەرتری هەموو بڕیاردەرانی، كەواتە هەر بڕیارێ تۆ بیدەیت لەزانینو تەگبیری تەواو دێتو هەر ئەوەش ئەبێ، ئینجا وەڵامو بەر پەرچی دایەوە بەڕوونی بارێكی ڕاستو ڕەوا كە نوح (علیه السلام) لێی بێئاگا بووە، ئەوەش ئەمەیە: كەلای خواو لە تەرازووی خوادا خزمایەتیو پەیوەندی خوێنو گۆشتو نەسەبو نەژاد بەتەنیا هیچ نرخێكی نییە، بەڵكو ئەوەی نرخی بێ خزمایەتیو پەیوەندی بڕواو عەقیدەیە، دەی ئەو كوڕی بێبەش بوو لەم شتە نرخ دارە، كەواتە ئەو كوڕە یەكێ نەبوو لە منداڵو كەسو كاری نوح پێغەمبەر (علیه السلام)و بەكوڕی دانانرێ، ئەو وەڵامو بەرپەرچەی ئاڕاستە كرا زۆر بەهێزو بە شێوەی سەرزەنشتو هەڕەشە،**

قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی بە نوح ﴿يَـٰنُوحُ﴾ ئەی نوح ﴿إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ﴾ بەڕاستی ئەو كوڕە لە خێزان‌و منالّی تۆ نییە ﴿إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ﴾ بەڕاستی ئەو كوڕە خاوەنی كردەوەی خراپ‌و ناپەسندی بوو تا ڕادەیەك وەك بریتی بێت‌و پێكهاتبێ لە كردەوەی بەدو خراپ، كەواتە پەیوەندی بچڕاوە لە تۆ ﴿فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ﴾ كەواتە داوای شتێكم لێ مەكە كە زانا نیت پێی‌و نازانی ڕاست‌و ڕەوایە یان نا؟ ﴿إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ بەڕاستی من پەندی ئامۆژگاریت ئەكەم كە یەكێك بیت لە نەفامان‌و لەڕیزی نەفامان بیت. نوحی خوا ناس بەوە كەوتە دڵە لەرزەو مەترسی كرد كە هەڵەی كردبێ دەربارەی پەروەردگاری، بەهۆی ئەوەوە پەنای هێنا پێی‌و داوای لێبووردن‌و میهرەبانی كرد وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ نوح وتی ﴿رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من پەنات پێ ئەهێنم لەوەی كە داوای شتێكت لێبكەم كە زانا نەبم پێی‌و نەزانم كە ڕاست‌و ڕەوایە ﴿وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەگەر نەبووری لێم‌و میهرەبانیم پێ نەكەیت لە زیانباران ئەبم‌و ئەچمە ڕیزی ئەوانەوە. ئەم ئایەتە ئەدا لە بەنۆكەی دڵی ئەوانەی كە ئەنازن‌و شانازی ئەكەن بە نەسەب‌و نەژادی پاك‌و چاكەوەو لایان وایە ئەوەیان بەسە، بەڕاستی ئەوەش زۆرە لەناو نەفامانی ئەم ئوممەتەدا، ئەوە لە گاورو جولەكەوە هات‌و كەوتە ناو موسڵمانان، ئینجا بەزەیی‌و میهرەبانی خوا هات‌و دڵئارامی كرد، پیت‌و فەڕی باراند بەسەر خۆی‌و ئەوانەی لەگەڵی بوون‌و نەوە صالّحەكانیان، ئەفەرموێ: ﴿قِيلَ﴾ گوترا بە نوح لەپاش نیشتنەوەی ئاوی دەریاكەو دەستدان‌و گونجانی زەوی بۆ ژیان‌و كارو ئیش بەسەر پیشتیەوە گوترا پێی: ﴿يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا﴾ ئەی نوح بچۆرە خوارەوەو دابەزە لە كەشتییەكە یان لە شاخی جودی بە ئارامی‌و خۆشی لەلایەن ئێمەوە یان دابەزە بە سەلام كردن لێت لەلایەن ئێمەوە**

وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَاۖ فَٱصْبِرْۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾

---

﴿وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ﴾ به‌ چه‌ند پیت‌و فه‌ڕو خێرو بێرێك له‌ نه‌وه‌و ڕۆزی‌و هۆی ژیان به‌سه‌ر خۆته‌وه‌، به‌سه‌ر چه‌ند گه‌ل‌و ئوممه‌تێك كه‌ په‌یدا ئه‌بن له‌وانه‌ی كه‌ له‌گه‌ڵ تۆن، واته‌ ئه‌وانه‌ كه‌ له‌گه‌ڵ تۆن له‌ كه‌شتیه‌كه‌دا له‌گه‌ڵ نه‌وه‌كانیان كه‌ په‌یدا ئه‌بن تا ڕۆژی دوایی، بێگومان نه‌وه‌ی هه‌موو مه‌به‌ست نییه‌ به‌ڵكو نه‌وه‌ی ئه‌و سێ كوڕی بڕواداره‌ مه‌به‌ست، چونكه‌ هه‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وانه‌ مایه‌وه‌ وه‌ك قورئان ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ﴾ واته‌ هه‌ر نه‌وه‌ی نوحمان هێشته‌وه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ ئه‌گوترێ به‌ نوح ئاده‌می بچووك یان ئاده‌می دووه‌م، مه‌به‌ست به‌م چه‌ند گه‌ل‌و ئوممه‌ته‌ بڕواداره‌كانن تا ڕۆژی دوایی كه‌ شیاو‌و شایسته‌ن بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ باسكرا، نه‌ك گه‌ل‌و ئوممه‌ته‌ بێبڕواكان كه‌ده‌ست نیشانیان بۆ ئه‌كات به‌م فه‌رمووده‌یه‌: ﴿وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ﴾ له‌ نه‌وه‌ی ئه‌وانه‌ چه‌ند گه‌ل‌و ئوممه‌تێك هه‌ن كه‌ ئه‌یان ژیه‌نین له‌دنیادا به‌خۆشی‌و خێرو بێری دنیایی، ﴿ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ له‌ پاشان له‌لایه‌ن ئێوه‌ سزایه‌كی سه‌ختی ئازار دار لێیان ئه‌دات‌و ئه‌كه‌وێ.

دوا ڕۆژی نوح‌و گه‌له‌كه‌ی به‌و جۆره‌ هات: ڕزگار بوون بۆ خۆی‌و ئه‌وانه‌ی له‌گه‌ڵی بوون، به‌ نه‌وه‌كانیشیانه‌وه‌، هه‌ڕه‌شه‌و به‌ڵێنی سه‌خت بۆ ئه‌وانه‌ی كه‌ هه‌ر ژیانی ئه‌م دنیایان ئه‌وێ له‌ پاشان سزای سه‌ختیان بۆ ئه‌بێ، هه‌مان موژده‌و هه‌مان هه‌ڕه‌شه‌ كه‌ له‌سه‌ره‌تا‌و یه‌كه‌م جاری سوره‌ته‌كه‌وه‌ تێپه‌ڕیان كردو له‌پاشان ئه‌م داستانانه‌ هاتن تا ببن به‌ ته‌فسیرو ئه‌و موژده‌و هه‌ڕه‌شانه‌ نیشان بده‌ن له‌ ڕووداوه‌كانی جیهان‌و ژیاندا، جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ به‌دوای داستانه‌كه‌دا ئه‌م فه‌رمووده‌ی هێنا‌و ئاڕاسته‌ی پێغه‌مبه‌ری كرد (ﷺ) ﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ﴾ ئه‌و داستان‌و سه‌رگوزه‌شته‌ی نوحه‌ له‌ هه‌واڵه‌ گرنگه‌كانی غه‌یب‌و نه‌زانراوه‌كانه‌ كه‌ ڕابوردن، ﴿نُوحِيهَآ إِلَيْكَ﴾ وه‌حیمان كرد بۆ لای تۆ ﴿مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا﴾ نه‌ تۆو گه‌له‌كه‌ت نه‌تان ئه‌زانین له‌ پێش ئه‌م وه‌حییه‌وه‌ كه‌ كردمان بۆ لات ﴿فَٱصْبِرْ﴾ كه‌واته‌ خۆت

بکره هەرچۆنێ نوح خۆی گرت ﴿إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ بەڕاستی پاشە ڕۆژی سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج بۆ خۆپارێزو لە خوا ترسانە، تۆو شوێن کەتووەکانت لە خۆ پارێزەرو لە خوا ترسانن، کەواتە ئێوەن کە ئەگەن بە ئامانج، دوژمنە یاخی و کوڵ نەدەرەکانت لەزیان باران و لەناوچوانن، کەواتە چاوەڕان بەوئەوانیش چاوەڕوانن.

ئەم دواترین ئایەتە کە هێنای بەدوای داستانەکەدا چەند مەبەست و ئامانجێکی داستانە قورئانیەکان نیشان ئەدات لەم سورەتەدا:

١- ڕاستی وەحی کە بێبڕواکان دانیان پێدا نەئەنا، ئەوەتا ئەم داستانانە غەیب و نەزانراو بوون، نە پێغەمبەر(ﷺ)و نە گەلەکەی زانا نەبوون و بێئاگا بوون لێیان لەپێش هاتنی ئەم قورئان و وەحی یەدا، لەو ناوچەو شوێنەدا باسیشیان نەبوو، بەڵکو ئەوانە لە لایەن خوای زانای کار دروستەوە هاتبوون.

٢- یەکێتی ئایین و عەقیدەی خوا لە نوحەوە کە باوکی دووەمی ئادەمییە، ئەوەتا داستانەکان یەك عەقیدەو ئایین باس ئەکەن.

٣- یەکێتی ڕەخنەو دەم بازی بێبڕواکان لە هەموو چەرخ و چینەکاندا، لەگەڵ ئەوەدا لە هەموو چەرخ و پەیامێکدا ئەو ڕەخنەو دەم بازیانە بەبۆش و بێنرخ دەرکران و نەفامان دەم کوت کران.

٤- بەدی هاتنی موژدەو هەڕەشەکان، بەپێی بەڵێن و هەڕەشەکەی هەرکام لەو پێغەمبەرانە ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ.

٥- ڕوون بوونەوەی باوی خوا بەبێ لادان و گۆڕان و لایەنگیری: پاشە ڕۆژی سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج هەر بۆ لە خوا ترس و خۆپارێزەران بووە.

٦- هۆی پەیوەستی و پەیوەندی لەنێوان یەکە یەکەو کۆمەڵی بڕواداران، یەکێتی عەقیدەو بیروباوەڕەکەیانە کە کۆیان ئەکاتەوە لە ملکەچی و فەرمانبەری یەك خواو یەك کار بەدەست و یەك پەروەردگاردا بەبێ هیچ هاوبەشێك.

ئینجا ئایا ئەو تۆفانە گشتی بووە بۆ هەموو سەر زەوی؟ یان هەر بۆ ئەو ناوچەو وڵاتە بووە کە نوحی تێدا ڕەوانە کراوە؟ ئەو خاك و وڵاتە لە کوێدا بووە؟ ئەم جۆرە پرسیارانە وەڵامێکی ڕاست و دڵنیا کەریان نییە، بەڵکو هەر بە گومان و گۆترە کاری ئەگوترێن، بە تایبەتی درۆو دەلەسەی ئیسرائیلیات کارێکی وای کردووە کە پێویستە بێدەنگ بوون و خۆ خەریك نەکردن بەم جۆرە شتانەوە، زانینی ئەم جۆرە شتانە هیچ نرخێکیان نییەو

پەیوەندیان نییە بە مەبەستو ئامانجی داستانە قورئانییەکانەوە، بەڵێ ڕووکەشو ڕواڵەتی ئایەتەکان وا نیشان ئەدەن کە کۆمەڵی ئادەمی لەو کاتەدا هەر بریتی بووە لەو گەلی نوحە، وڵاتی ئاوەدان لەزەویدا هەر ئەو ناوچەیە بووە کە ئەوانی تێدا بووەو ئاوەدانیان کردووەتەوە، ئەو تۆفانە هەموو ئەو ناوچەی گرتووەتەوە، هەرچی تێدا بووە لەناو چوونو خنکان بەو تۆفانە بێجگە لەوانەی کە لەناو ئەو کەشتییەدا بوون. ئەم ئەندازەیە بەسە بۆمان لە تێگەیشتنی ئەو ڕووداوە بوونەوەرییە کە هەواڵی پێداین تاقانە سەرچاوە ڕاستەقینەکە کە قورئانە بۆ ئەو هەواڵە کە مێژوو هیچی لێنازانێ، ئەگەر قورئان ئەم هەواڵەی نەدایە مێژوو لەو ڕۆژەدا کەی بووە؟ مێژوو شتێکی تازە پەیدا بووەو کەمێك لە بەسەرهاتو ڕووداوەکانی ئادەمی باس ئەکات، ئەوەش کە ئەڵێو باسی ئەکات هەڵئەگرێ بۆ ئەوەی هەڵەو ناڕاست بێت، نابێ پرسی مێژوو بکرێ لە هەواڵێکدا کە ئەو سەرچاوە ڕاستە ڕایگەیاندبێ پێمان، هەردوو دڵی یەك هەبێ لەوەدا لەگەڵ بڕوادا ناگونجێ. بێگومان زۆر لە گەلە جۆر بە جۆرەکان لە نووسراوە کۆنەکانی خۆیاندا باسیان کردووە کە تۆفانێك لە چەرخو ڕابوردووە کۆنەکانیاندا کە نەناسراون داوێتی لەوڵاتەکەیان بەهۆی گوناهو تاوانی ئەم تاقمو چینەی کە لەو کاتەدا بووە، لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە لە چەرخی چینەکانی کۆنو تازەیاندا باسی تۆفانی نوح هاتووە، بەڵام هیچکام لەوانە شایانی ئەوە نەبییە کە تێکەڵ بکرێ لەگەڵ هەواڵی ڕاستو ڕەوای قورئان، بەڵێ هەموو ئەو هەواڵو باسانە بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەرئەوەی کە ئەو تۆفانە بووەو شتێکی ڕاستە، پێویستە بزانرێ ئەوەی کە لای نامەدارەکان ناوبراوە بەمەی پاكو پێزدارە، لەلایەن خواوە نەهاتووە، ئەم تەوراتو ئینجیلەی هەن لای جوولەکەو نەسرانییەکاندا ئەو تەوراتو ئنجیلە نییە کە هاتە خوارەوە بۆ موسا وعیسا ـ سەلامی خوایان لێبێ ـ پێویستە دەست نیشان بکەین بۆ چەند شتێکی گرنگ کەلەم ڕووداوو داستانەوە وەرئەگیرێ:

ئەو گەلی نوحە کە ئاشنا بووین بە نەفامیو سووریان لەسەر ناهەق، بە بێزاریو دوژمنایەتیان بۆ بانگو بانگەوازەکەی نوح کە کورتەکەی بریتییە لە ناسینی خواو فەرمانبەری خوا بە تاكو بەبێ هیچ هاوبەشێك. ئەو گەلە لەنەوەی ئادەمن، ئادەمیش لە چەند شوێنێکدا قورئان ئەفەرموێ: هاتە خوارەوە بۆ ئەم سەرزەوییە بۆ هەڵسانی بەکاری جێنشینی، خوا پەیمانی لێ وەرگرت کە پەیڕەوی خوا بکاتو بە پێی ڕێنموونی ئەو بجوڵێتەوە، دوور بێت لەشەیتان کە دوژمنی خۆیو ئەولادو نەوەیەتی تا ڕۆژی دوایی،

کەواتە ئادەم بە موسڵمانیو خواناسیو فەرمانبەری خوا هاتووە، بێگومان کوڕو ڕۆڵەکانی ڕێنموونی کرد بۆ ئیسلامو خواپەرستی، هەروەها دەستەو چینەکان لەپاش یەکتر، ئیسلام یەکەم بیروباوەڕە کە ئادەمی پێئاشنا کرابێ لەسەر زەویدا، هیچ بیروباوەڕێکی تر نەبوو بۆ ئەم ئادەمییە بێجگە لە ئیسلام، کەچی بینیمان گەلەکەی نوح کەلە نەوەی ئادەمنو پاش ئەوهاتن بە چەند چینو چەرخێك کە تەنیا خوا ئەزانێ ژمارەیان، ئەو گەلە وەرگەڕان بۆ ئەم نەفامییەی کە ئەم داستانە باسی کرد بۆمان، کەواتە پێویستە لەسەر هەموو بڕوادارێك بڕوای هەبێ بەمەی کە ئەم نەفامێتی یە بە هەموو بیروباوەڕو بۆچوونو باوو کردەوەکانی یەوە شتێك بوو هات بەسەر ئادەمیو ئادەمێتیدا لەپاش بیروباوەڕی پاكو خاوێنی خواپەرستی، لەو بیروباوەڕە پاکە لایدا بە هۆی شەیتانەوە کە زاڵە بەسەر ئەم ئادەمییەدا کاتێ کە بێئاگابوو لە یادی خواو دەستگرتن بەسەر بەرنامەی خواو پەیڕەوی تەنها ئەوو شوێن نەکەوتنی هیچ شتێکی تر، بێگومان خوا ئەم ئادەمییەی دروستکردو ئەندازێ لە خود موختاریو سەربەستی پێدا کە بتوانێ ڕێنموونی وەرگرێو دەست بگرێ هەر بەو ڕێنموونییەوە، بەهۆی ئەوەوە دوژمنەکەی زاڵبێ، هەرچۆنێ ئەتوانێ لادات لە ڕێنموونی خواو پەیڕەوی بەرنامەیەکی تر، بەهۆی ئەوەوە شەیتان توڕی ئەداتە ناو ئەو نەفامییەی کە بینراوەو ئەبینرێ، توڕی ئەداتە ناو ئەو چاڵی نەفامییەی کە گەلەکەی نوحی تێ تووڕدا، کاتێ کە زانرا یەکەم بیروباوەڕ بریتییە لە بیروباوەڕی پاكو خاوێنی خواپەرستی بە تاكو تەنیا، کاتێ کە ئەوە زانرا ئیتر بزانین پێویستە دوور کەوتنەوەو فڕێدانی ئەو بیروباوەڕانەی کە دژو پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕە پاکەیە کە قورئان دەست نیشانی بۆ کردو باسمانکرد. ئەوەش ئەمە بوو یەکەم بیروباوەڕی ئادەمی بیروباوەڕی خواپەرستییەو خوا بۆی داناوە نەك وەك بیروباوەڕێ کە ناوبراوە بە بیروباوەڕی (علماء الأدیان المقارنة) یان بیروباوەڕی ئەوانە کەلایان وایە بیروباوەڕی خوا پەرستی جۆرو بارێکە لە جۆرو بارەکانی عەقیدەی ئادەمیو پێش ئەم چەند باوەڕی تر بووەو ئەم دواکەوتووە لێیان، وەك ئەو هەموو بیروباوەڕی جۆر بەجۆری بت پەرستی یەی کە هات بەسەر ئەم ئادەمییەدا، هێندێ لە نووسەران لەبارەی ئیسلامو بەرگری کردن لە ئیسلام کەوتنە هەڵەیەکی زۆر گەورە، شوێنی ئەو بۆچوونو نەزەریاتە پڕوپووچانە کەوتن، بۆ نموونە یەکێ لەوانە باس ئەکەین کە بریتیە لە نووسەری بەناوبانگ مامۆستا (عقاد) لە نامەکەیدا (الله) لەبەشی عەقیدەو بیروباوەڕا ئەڵێ: ئادەمی بەرزبوویەوەو تورەقی کرد لە عەقیدەو بیروباوەڕا، هەرچۆنێ بەرزبوویەوەو تورەقی کرد لە

زانیاریی پیشەسازی دا، بەم ڕەنگە بیروباوەڕی یەکەم جاری بە پێی ژیانی یەکەم جاری بووەو هەروەها زانیاری پیشەسازیەکەشی، بەکورتی بەرەبەرە ئادەمی پێشکەوت لەو دوو بارەیەوەڵ تا گەیشتە ئێستا، وەك ڕوونی ئەکاتەوە لە بارەی بیروباوەڕەکەیەوە کەلە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا ئەڵێ: زانایانی ئایینەکان سێ جۆرو بار باس ئەکەن کە تێپەڕی کردووە بەسەر گەلە پێشوەکاندا کە کۆچەرو لادێی بوون، لەبارەی بڕوا بە پەرستراوو پەروەردگاردا:

یەکەم: بڕیار دان و بڕوا بەبت و پەرستراوی زیاد لەیەك تا دەیان و سەدان و بەبێ جیاوازی و باودانی هێندێ هێندێکدا، بەڵکو گەشتنە ئەو ڕادەی هەر بنەماڵەیەکی گەورە پەرستراوی تایبەتی خۆی هەبوو.

دووەم: هەروەك یەکەم بەڵام باوی هێندێ لەبتەکان ئەدرا بەسەر هێندێکدا، ئیتر لەبەر ئەوە بتی گەورە ترین کۆمەڵ و تایفەبوو، یان لەبەر ئەوەی بەبتی شتێ دانرا بوو کە سوودو بەرهەمی زۆرو گەورەی هەبوو، وەك باران، یان باو گێژەڵوکە کە جێگەی ئومێدو مەترسییە.

سێیەم: بڕیاردان و باوەڕ بە تەنیا پەرستراوێك. بە پێی ئەم باسە ئاشکرایە کە ئەبێ ئادەمی خۆیان بە خۆیان عەقیدەێ بیروباوەڕیان بۆ خۆیان دانابێ، جا لەبەر ئەوە ئەو جیاوازی و گۆڕان و گۆڕانکاری‌یە پەیدا بووە لە عەقیدەو بیروباوەڕەکەیاندا، بە پێی جیاوازی و گۆڕانی بیروبۆچوونی خۆیان.

دەی شتێکی ئاشکرایە کە ئەم بۆچوون و باوەڕەی کە ئەو مامۆستایە هێناوەیەتی لەو کتێبەدا دژی ئەوەیە کە قورئان هێناویەتی و بە هیچ کلۆجێك ناگونجێ لەگەڵی، چونکە وەك وتمان دەقی قورئان ئادەم بە یەك کەس دائەنێ و ئایین و عەقیدەکەی تەنها بە خواپەرستی بە تاك و تەنیا، هەر ئەوە ئایینە پاکەی ڕاگەیاندووە بە ئەولادو نەوەکانی و هەر فێری ئەوەی کردوون، کەواتە ئەبێ گوێ نەگیرێ لە هیچ قسەو باس و بڕیارێکی تر بێجگە لەوەی قورئان هەواڵ و بڕیاری لەسەریەتی.

بێبڕواکانی گەلەکەی نوح تێپەڕیانکردو دوور خرانەوە لە ژیان و لە بەزەیی و میهرەبانی خوا، بڕوا دارەکان ڕزگاربوون و بەهرە مەند بوون بە بەڵێنەکەی خوا کە فەرمووی: ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ هەروەها هەواڵ و بەڵێنی خوا بە پەیدا بوونی چەند گەل و کۆمەڵێك کە خوا ئەیانژیەنێ ماوەیەك و ئینجا بەهۆی لادانیان لە ئایین و بەرنامەی خوا دووچاری سزا ئەکرێن لەلایەن خواوە،

وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًاۖ

---

**یەکێ لەو گەلانەی کە گەلەکەی (عاد)ە کەلە ئەوەی نوحە کە دەربارەی ئەم گەلە ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًاۚ﴾ رەوانەمان کردو ناردمان بۆلای تایفەی (عاد) براکەیان کە هودە، ئەو تیرەیە نیشتەجێ بوون لەلای خوارووی نیوە دوورگەی عەرەبدا، هود یەکێ‌بوو لەو تایفەیە، کەواتە برایان بوو لە نەژادو نەسەبدا، بەو جۆرە نیشانی داو ناوی برد تا دەست نیشان بکات بۆ ئەوەی کە بەسۆزو پەرۆش‌و دڵسۆز بووە بۆیان، کەواتە هەق وابوو ئەوانیش هەڵوێستی باشیان ببوایە لەگەڵ ئەو برا دڵسۆزەیان، کەچی لەبەر ئەوەی بەدو خراپ بوون، بەدڕو دوژمن دەرچوون، لەبەر ئەوەی پەیوەندی برایەتی بڕوا پێیان بچڕی، برایەتی نەسەب‌و نەژادیان نرخی نەما، جا بە هۆی ئەوەوە جیا بوونەوەو دوورکەوتنەوەی تەواو پێکهات لەنێوان ئەوان‌و ئەو برا دڵسۆزەیان، وەك لە کۆتایی باسەکەدا بۆمان باس ئەکات.**

**﴿قَالَ﴾ هود گوتی پێیان: ﴿يَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم، بەم وتە شیرینە بانگی کردن تا سەرنجیان ڕاکێشێ‌و بۆ گوێ‌ڕایەڵی‌و فەرمانێکی پێدان کە هەرکەسێك بێبەش نەبێ لە فام‌و ژیریی سەرپێچی ناکات لێی ﴿ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ خوا بپەرستن، واتە بە تەنیاو بەبێ هیچ هاوبەشێك، وەك دەست نیشان ئەکات بۆئەوە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓۖ﴾ نییە بۆ ئێوە هیچ خوایەکی تر بێجگە لەو خوایە کە ناوی ﴿ٱللَّهَ﴾یە واتە ئەو بتانەی کە ئێوە ئەیان پەرستن خوا نین‌و شایانی پەرستن نین، ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ﴾ ئێوە نین بێجگە لەوەی درۆو دەست هەڵبەست کەرن لە پەرستن‌و ناوبردنی بێجگە لە خوا بە پەرستراوو شایانی پەرستن‌و بڕیار دان بە پەرستراو.**

**ئینجادڵنیایان ئەکات لەسەری ئەوەی کەبانگکردنەکەی پاك‌وخاوێنەو هیچ مەبەستێکی خۆی تێدا نییە بەمەی کە ئەفەرموێ پێیان: ﴿يَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم: ﴿لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًاۖ﴾ لەسەر ئەم بانگکردن‌و ڕاگەیاندنە داوای هیچ پاداشت‌و کرێیەك ناکەم لە ئێوە**

إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾

---

﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ﴾ کرێو پاداشتی من هەر لەسەر کەسێکە کە منی دروستکردووە لە نەبوون، ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نین‌و نازانن کە چۆن فروستادەی خوا داوای ڕزق‌و کرێو پارە ئەکات لە ئێوەو لە غەیری خوا؟ واتە بۆچوون‌و گومانەکەتان مایەی سەرسوڕمانە! یان ئایا ئێوە ژیر نین‌و نەفامن‌و تێناگەن لەوەی پێتان ئەبێژرێو هەق‌و ناهەق جوێ ناکەنەوە لە یەکتر، واتە با ژیر بن‌و بزانن کە برا ناپاکی ناکات لە برای خۆی‌و خۆی ناخاتە بەر خەشمی خواو براو گەلەکەی بەم ڕەنگە بانگیان بکات بۆ شتێ کە زیانی تێدا بێت. ئینجا تەمێو ئامۆژگارییان ئەکات بەمەی داوای لێبوردن بکەن لە خواو بگەڕێنەوە بۆلای، بەلێنیان پێ‌ئەدا بە ڕزق‌و ڕۆزی زۆرو هێزو دەسەلاتی زیاد، فەرمووی: ﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ﴾ داوای لێبوردن بکەن لە پەروەردگارتان ﴿ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾ ئینجا لە پاش ئەوە بگەڕێنەوە بۆلای بە گوێڕایەلی‌و پەرستنی، ﴿يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا﴾ واتە ئەگەر ئێوە وا بکەن خوا ئەبارێنێ بەسەرتاندا بارانێکی زۆر خێرو بێر دار، ئەوانە زۆر پێویست بوون بە باران بۆ کشتوکاڵو مەڕو ماڵاتیان، ﴿وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ﴾ واتە هێزو دەسەلاتی زیادتان ئەداتێ لەگەڵ ئەو هێزو دەسەلاتەی کە هەتانە، ﴿وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ﴾ ڕوو وەرمەگێڕن لەوەی بانگتان ئەکەم بۆی بە تاوانباری‌و بەردەوامیتان لەسەر تاوان کردن.

قَالُواْ يَـٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ

---

ئەوەبوو بانگکردنەکەی هود وا دەرئەکەوێ موعجیزەی لەگەڵ نەبووە، ڕەنگە هۆی ئەوەش ئەمە بووبێ کە تۆفانەکەی نوح نزیك بووبێ لێیانەوەو باس و یادەکەی لە دڵو زیاندا جێگیر بووبێ، بێجگە لەوەش هود ئەوەی بیر خستنەوەو ترساندنی پێی، وەك لە سورەتێکی تردا باس ئەفەرموێ. گەلەکەی هود وەڵام و هەڵوێستیان بەم جۆرە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿يَـٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ﴾ ئەی هود تۆ هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونت بۆ نەهێناوین لەسەر ڕاستی داواکەت، ئیتر ئایا موعجیزەی نەبووبێ وەك گوتمان لەبەر نزیکی موعجیزەکەی نوح یان لەبەر ئەوە لە ڕاستیدا تاك و تەنیایی خوا ئەوەندە ڕوونە پێویست ناکات بە موعجیزە، بەڵکو هەر تەمێ و بیرخستنەوە بەسە؟ یان هەر موعجیزەیەکی بۆ هێنابێ ـ لەبەر سەرکێشی خۆیان ـ گوێیان پێ نەدابێ، وەك هەر نەبووبێ؟ ﴿وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ﴾ بەڕاستی ئێمە واز هێنەری بت و پەرستراوەکانی خۆمان نین لەبەر ڕتەو قسەی تۆو دەست بەرداریان نابین تەنیا قسەی تۆ بە بێبەڵگەو نیشانە ﴿وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە نین بەبڕوادار لە بەر تۆو قسەی تۆ ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ﴾ ئێمە هیچ نالێین دەبارەی تۆ کە بانگمان ئەکەیت بۆ وازهێنان لە ئایینەکەمان و شوێن کەوتنی تۆ، هیچ نالێین بێجگە لەوەی کەمێندێ لە پەرستراوەکانمان دووچاری کردووی بەشتی بەدو خراپ، واتە شێتی و تێکچوون، واتە هیچ هۆیەکمان دەست ناکەوێ بێجگە لەوە. ئینجا لێرەدا هیچ نەما بۆ هود بێجگە لەوەی بەرامبەریان بوەستێ بە بەرلێ برینەوەو ڕوو کردنە خواو پشت بەستن پێی و هەڕەشەو ترساندن و بچڕان و جیا بوونەوەی لێیان، بەم ڕەنگە

﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان ﴿إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ﴾ بەڕاستی من خوا ئەکەم بەشایەت ﴿وَٱشۡهَدُوٓاْ﴾ ئێوەش بدەن و شایەت بن کە: ﴿أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ * مِن دُونِهِۦۖ﴾ من بەریم لەوەی کە ئێوە ئەیکەن بە هاوبەش و تێپەڕ ئەکەن لە پەرستنیدا ﴿فَكِيدُونِي جَمِيعٗا﴾ ئینجا ئێوەش پیلان و دوژمنایەتی بەکار بێنن دەربارەم هەمووتان و بە کۆمەڵ، واتە خۆتان و هاوبەشەکانتان ئەوەی لە دەستتان دێت و پێتان ئەکرێ بەکاری بێنن و ﴿ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ﴾ ئینجا هیچ مۆڵەتم مەدەن و لێم مەوەستن، ﴿إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ﴾ بەڕاستی من شتم بەستووە بەخوا کە پەروەردگاری منە و پەروەردگاری ئێوەیشە، کاری خۆم حەواڵەی ئەو کردووە، واتە چی لە دەستتان دێت بەکاری بێنن و باکم نییە لە ئێوە، چونکە من پشتم بە خوا بەستووە و ئێوە ناتوانن هیچ شتێ بکەن کە خوا مەیلی نەبێ، بەڕاستی زۆر سەرسوڕئەمێنێ لە تەنیا پیاوێك کە بەرەنگاری گەل و کۆمەڵێکی ڕەقی سەرکێشی نەفام بوەستێ، کە نەفامیەکەیان لەو ڕادەیەدا بێت کە ئەو بت و پەرستراوانە بەدەسەڵاتدار بزانن بەسەر شێتکردنی پیاوێك کە بانگیان بکات بۆلای خوا، بانگکردنەکەی بە وڕێنە دابنێن! سەرسوڕ ئەمێنێ لە تەنیا پیاوێك کە بەرەنگاری گەل و کۆمەڵێکی ئاوا بوەستێ بیروباوەڕەکەیان پووچەڵبکاتەوە و خۆیان بە نەفام دەربکات و تەشەریان لێبدات و سەر زەنیشتیان بکات بەو جۆرە، ئینجا بەریان لێ ببڕێتەوە بەو جۆرەی کە زانیمان، سەرسوڕئەمێنێ لەکاری ئاوا، بەڵام ئەو سەرسوڕمانە نامێنێ کاتێ کە بزانین هۆی ئەو بێباکی و پشت پڕییە چییە؟ بێگومان هۆی ئەوە بڕوای بەهێزی ڕاستەقینەیە بە خوا، بڕوایە بە ڕاستی بەڵێنی خوا، بڕواو ڵئارامییە بە یارمەتی خوا، ئەو بڕوایەی کە تێکەڵی دڵبووە، تا ئەو ڕادەی بەڵێنەکە ئەگێڕێ بە شتێکی بەدی هاتوو کە جێگەی گومان و دوو دڵی نەمێنێ بە دەوریدا، سەرنجی نادات بە بەڵێنێکی داهاتوو کە بەدی بێت یان نا؟ ئینجاشێوەیەکی زاڵی و دەسەڵاتی خوانیشان ئەدات، کەئەبێتەهۆی ئەوپشت بەستن و پڕییە،

مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَيَسۡتَخۡلِفُ رَبِّي قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ

---

**ئەفەرموێ: ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ﴾ هیچ گیانلەبەرێك نییە مەگەر خوا بگرێ پشتی سەرو مووی پێستە سەریەتی، واتە خوا زاڵە بەسەرداو کاربەدەستیەتی، بەجۆرێ هەرکام ملکەچ و ژێربارە بۆ ویست و مەیل و ئیرادەی خوا، ئەم وتەو ڕستەیە بەکار ئەمێنرێ بۆ گەیاندنی ئەوپەڕی ملکەچ کردن و ژێر بار کردن، چونکە هەرکەس بەو جۆرە بگیرێ دەستەپاچەو ملکەچ ئەبێ و توانای سەپێچی نامێنێ، ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە، واتە لە هەموو کارو کرداریدا ئەو پەڕی دادو دادپەروەریی بەکار ئەمێنێ، کەواتە ناهەق و ناهەق خوازان زاڵ ناکات بەسەر هەق و هەق خوازاندا، هەق زایە ناکات و هیچ ستەمکارێك لەدەستی دەرناکات.**

**لەم چەند وتەی هود پێغەمبەردا هۆی ئەو بێباکی و بەر لێ برینەوەو خۆ بە بەرزگرتنەی ئەو پێغەمبەرە ئەو چەند ڕستەیە نەخشەی ئەو بارو حاڵە ئەکێشێ کە هود هەبووی و ڕوون و ئاشکرا بوو بەلایەوە، پەروەردگاری خۆی و ئەو هەموو خەڵکە زاڵە بەسەر هەموو گیانلەبەرێکدا، ئەو سەرکێش و یاخی و دڵ ڕەقانە گیانلەبەرێکن وەك ئەو هەموو گیانلەبەرانە، ژێر بارو زەبوون و دەستەپاچەن بەرامبەر کەواتە ئەبێ هود لەچی بترسێ و بیمی هەبێ؟ ئەوانە زاڵ بێن بەسەریدا مەگەر بەئیزنی خوا، ئینجا ماتوڵ ڕێگەو بەرنامەیان ژۆ جیاوازە ئیتر بۆچی بمێنێتەوە لە ناویاندا؟ ئینجا ئەو هودەی کە دڵ ئارام و پشت ئەستوورە بە دەسەڵاتی خوای خۆی، ئەوانە ئەترسێنێ و هەڕەشەیان لێ ئەکات وەك ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە ڕوو وەرگێڕن لەوەی من پێم ڕاگەیاندن ﴿فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡۚ﴾ ئەوا من پێم ڕاگەیاندن ئەوەی پێی ڕەوانە کراوم بۆلاتان، من هیچم لەسەر نییە بێجگە لە ڕاگەیاندن، بەڵگەتان لەسەر سوربوو، بڕیاری سزادانتان جێگیربوو، ﴿وَيَسۡتَخۡلِفُ رَبِّي قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾ پەروەردگارم گەل و کۆمەڵێکی تر جیاواز لە خۆتان ئەکات بە جێنشینی ئێوەو لەپاش لەناو بردنی ئێوە**

وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔاۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَـٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾

---

﴿وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا﴾ ئێوه زیانی هیچ شتێك ناگەیەنن بەخوا، واتە خوا بێنیازو پێویستە بەئێوەو بە پەرستنی ئێوه ﴿إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم چاودێرو ئاگایە بەسەر هەموو شتێکدا، یان زاڵو کاربەدەستو حاکمە بەسەر هەموو شتێکدا، لەسەر هەربار هەرکەس ئەوە سیفەتو شانی بێت کێ ئەتوانێ زیانی پێبگەیەنێ؟ یان ئەو خوایە کە ئەوە سیفەتی بێت بێگومان پارێزەری ئایینو دۆستەکانی‌یەتی، هیچ کەسێك لەدەستی دەرناچێت، لێرەدا دەمە قاڵێو بەربەرەکانێ دوایی هات، هیچ قسەو باس نەماو نۆبەی بەدی هاتنی هەڕەشەو ترساندنەکەیە وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ کاتێ کارو فەرمانی ئێمە هات، واتە سزادانی ئەو گەلە، یان فەرماندانمان بە بەدی هاتنی هەڕەشەکەمان ﴿نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾ هودو ئەوانەش کە لەگەڵی بوون بە میهرەبانی خۆمان ڕزگارمان کردنو لەو سزایەی کە هاتە سەر گەلەکەی، واتە بەهۆی ئەو بڕوای کەپێمان بەخشین وەك لە (ئیبنو عەباسو حەسەن)ەوە ڕیوایەتکراوە، یان بە فەزڵو بەزەییو میهرەبانی خۆمان نەك بەوەی ئەوان خاوەن مافو ماف دار بن لەوەدا، یان مەبەست ئەوەیە ئەوانەی کە بڕوایان هێنا بەهۆی میهرەبانیەك لەلایەن ئێمەوە، ئینجا ڕزگار لێکراوە کە باس ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿وَنَجَّيْنَـٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ ڕزگارمان کردن لە سزایەکی ئەستوورو بەتینو زۆر قورسو گران کە بریتییە لەو بایەی وڵاتەکەی وێران کردن بە خۆیانو هەموو شتێکیانەوە، وەك لە چەند ئایەتێکدا باسەکەی هاتووە، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە هود پێغەمبەر (علیه السلام) هەروەها لەپاش ئەو ئوممەتەکەیو ئەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ عَادٌ﴾ ئەوەیە تایفەی (عاد)ەی کە بەناو بانگنو شوێنو شوێنەواریان ناسراوو بەناو بانگە، هەرچەندە

کەمێك لەمەوپێش باسی کردن و دەست نیشانی کرد بە سزاو لەناو بردنیان، بەڵام لێرەدا بە وتەی دوور ﴿وَتِلۡكَ﴾ دەست نیشانیان بۆ ئەکات، چونکە وایی هاتن و تێپەڕیان کردو دوورکەوتنەوە لە بەرچاوو لەدەروونداو، بێجگە لەوەش لەبەر بێنرخیەکەیان شایستەی نزیك کردنەوەو نزیك بوونەوە نین، کەواتە با بە وتەی دوور دەست نیشانیان بۆ بکرێ، ئینجا باسی حاڵ و کردەوەی بەدیان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ بڕوایان نەمێنا بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان ﴿وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ﴾ یاخی و نافەرمانی فروستادەکانی خوا بوون، بڕوا نەهێنان بە هەر ئایەتێکی خوا بڕوا نەمێنانە بە هەموو ئایەتەکانی، هەرچۆنێ یاخی بوون و نافەرمانی هەرکام لە پێغەمبەران یاخی بوون و نافەرمانییە لە هەمووان، ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ﴾ شوێنی کارو فەرمانی هەموو زۆردارێکی سەرپێچی کەر لەهەق کەوتن، یان هەموو ستەمکارێ کە زۆر ئەهێنێ بۆ خەڵکی لەسەر کارێ کە ئارەزوو مەیل بکات، یان هەر گەورەو دەسەڵاتدارێك کە خۆ بە زل زان بێت بەسەر خەڵکیدا ﴿عَنِيدٍ﴾ سەرکێشی لەسنوور دەرچوو، ئەوانە بەو جۆرە شوێن کەوتوو بوون لەکاتێکدا پێویست بوو لەسەریان کە خۆیان ئازاد بکەن لە ژێر دەستی ئەوانە، بیرێك بکەنەوە لە خۆیان، نەبن بە ئەڵقە لە گوێ تا ئادەمێتی یان نەمێنێ، ئا بەو جۆرە دەرکەوت کە مەسەلەی هودو عاد مەسەلەی خوایەتی و پەروەردگارێتی خوایە بەتاك و تەنیا و ملکەچی تەنیا بۆ ئەوە نەك بۆ بەندەیانی خوا، حاکمێتی و فەرمانبەری ئەبێ هەر بۆ خوا بێباوەڕەکانی، هەروەها دەرکەوت کە بانگکردن بۆ تاك و تەنیایی خوا هەر لە یەکەم جارەوە داوا ئەکات و سوورە لەسەر ئازادی و خۆ ئازاد کردن لە ملکەچی بۆ غەیری خوا، لەسەر هەڵگەڕانەوەو سەرپێچی لە هەموو دەسەڵات و ملکەچی یەك کە هەرکەسێکی تر لافی پێ لێدات، وازهێنان لە ڕێزی ئادەمێتی، ژێر دەستەیی و فەرمان بەریی بۆ غەیری خوا بە گوناهو تاوانێك دائەنێ کە گەورەترین تاوانەو خاوەنەکەی شایستەی سزای هەردوو جیهانە، (عاد) لەناو چوون، چونکە لایاندا لە فەرمانی خواو شوێنی زۆر دارو سەکێشان کەوتن، لەناو چوون بە جۆرێ دووچاری نەفرینی هەردوو جیهان بوون،

وەك ئەفەرموێ: ﴿وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ بە دوایاندا هێنراو نوسێنرا پێیانەوە نەفرین لەم دنیایەدا،لە ڕۆژی دواییشدا، واتە لەم دنیایەدا نەفرینو لەعنەتیان لێکرا لەسەر زمانی هودو چەندێ لە پێغەمبەرانو هەر بڕوادارێك کە ناوو داستانی ئەوانی بیستبێ، لە ڕۆژی دواییشدا دوور خرانەوەو بێبەش کران لە بەزەییو میهرەبانی خوا، (قتادة) ئەفەرموێ: دوور نەفرین لەلایەن خواوە بەسەریاندا، یەکەم لە دنیاداو دووەم لە ڕۆژی دواییدا، لەدنیادا ئەو سزای دا بەسەریان داو بێبەشی کردن لە هەموو خێرو بەو شێوە لەناوی بردن، لە ڕۆژی دوایشدا سزای ئاگریان ئەدات. ئینجا حاڵو بارو هۆی سزاکەیان ڕوون ئەکاتەوەو مۆری پێدا ئەنێ لەسەریانو جاڕی پێئەدا ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ﴾ بێدار بن بە ڕاستی هۆزی عاد بڕوایان نەهێنا بە پەروەردگاریان. ئینجا وازیان لێناهێنێ ئەم نزا سەختو سامناکە یان لێ ئەکات، ﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ﴾ ئاگادارو بێدار بن لەناو چوونو دووری بۆ عادی گەلەکەی هود، واتە یاخوا لەناو چنو دوور بن لە بەزەیی خوا ـ خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات ـ آمین ـ.

پێویستە بیربکرێتەوە لە چەند شتێك کە ئەم سوورەتە دەست نیشانی بۆ کردن، یەکەم: یەکێتی بانگەوازو بانگکردن لەلایەن هەموو فروستادەو لە هەموو پەیامەکانی خوادا، بانگو بانگەوازی یەکێتی پەرستنو بەندەیی بۆ خوا کە قورئان ئەیگێڕێتەوە لە هەموو فروستادەکەیەوە، بێگومان پەرستنی خوا بە تەنیا هەر بریتی نییە لە بەجێهێنانی نوێژو ڕۆژوو دروشمی پەرستن، بەڵکو بریتی لە ملکەچیو فەرمانبەرییو گوێ ڕایەڵی بۆ خوا لە هەموو کارو فەرمانێکدا، بەم جۆرە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) پەرستنی ڕاڤە کردووە وەك لە حەدیسەکەی (عدی کوڕی حاتەم)دا هاتووەو چەند جارێك لەم تەفسیرەدا هێنامان، زۆر بەداخەوە ئەم شتە ڕاستەقینە ون بوو لە دڵو دەروونداو پەرستن کورت هەڵهێنرا بەسەر بەجێهێنانی دروشمی پەرستندا، بەهۆی ئەوەوە لەناو کۆمەڵو جەماوەردا وا گومان براو

ئەبرێ کە تەنها بەجێهێنانی دروشمەکان بەسە بۆ موسڵمانێتی، ئیتر با لە هەرکارو کردەوەیەکی تردا پەیڕەوی فەرمانی خوا نەکرێ و گوێ ڕایەڵی هەرکەسێکی تر بکرێ، نەخێر ئەو بۆچوونە هەڵەیەو لادانە لە ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام، ئیسلام و ئایینی خوا بریتییە لەبەرنامەیێك کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی بۆ هەموو کارو باری ژیانیان لە هەردوو جیهاندا، ئەم مەسەلەیە لەبەر ئەوەی زۆر ڕوون و ئاشکرایە هیچ پێویست نییە بە درێژە پێدان، سوپاس بۆ خوا ئەو بۆچوونە هەڵەیە خەریکە بە تەواوی ون ببێ و نەمێنێ لە دەروونی خەڵکیدا هەموو کەس خەریکە تێبگات لە مەبەست بەپەرستن و عیبادەت. دووەم لەو شتانەی کە ئەم سورەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات بریتییە لە پەیوەندی باوڕ هێنان و گەڕانەوەی بۆلای خواو پەیڕەوی فەرمانی خوا، بەخۆش بەختی و کامەرانی لەژیاندا، ئەوە شتێکە پێویستی هەیە بەڕوونکردنەوە بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە ئاگایان هەر لە ڕواڵەت و ڕووکەشی ژیان هەیە، ئەو پەیوەندییە لە چەند ئایەتێکدا قورئان دەست نیشانی بۆ ئەکات بەڕوونی، بێگومان ئەبێ هەموو باوڕدارێك باوڕای هەبێ بەو پەیوەندییە ئیتر با نەزانێ و تێنەگات لە چۆنیتیەکەی لەگەڵ ئەوەدا شتێکی ئاشکرایە کە بوون و زاڵبوونی بەرنامەی خوا لەناو هەرگەل و کۆمەڵێکدا هۆی گەیشتن و بەهرەمەندی هەرکارگەرو ئیش کەرێکە بە ئەجرو پاداشتی ڕاست و ڕەوای خۆی، هۆی ئارامی و ئاشتی و دامەزراوییە بۆ هەرکام کە ئەندام بێت لەو گەلەدا، ئەوەش زیاد لە ئارامی و ئاشتی و دامەزراوی دەروونی بە هۆی باوڕاکەیەوە بە خوا کە هەرگیز هیچ ئەجرو پاداشتێك زایە ناکات، میهرەبانەو داوای ڕاستەقینە هەر لای ئەوە، ئینجا بەرنامەی خوا ڕێگە نادات بە تەمیبەڵی و تەوەزەلی، بەڵکو ئەیەوێ هێزو وزەکان بەکەونە کار بۆ زۆری و فراوانی کردنی ماڵ و سامان و دەست خستنی ئەو هەموو خێرو بێرەی کە خوا دروستی کردووە لەم زەوییەدا بۆ بەندەکانی، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگە نادات ماڵ و سامان بەفیڕۆ و لە شتی بێنرخ و بێکەڵکدا بەخت بکرێ چ جای شتی خراپ و زیاندار، بەڵکو ئەبێ بەخت بکرێ لەئاوەدان کردنەوەی وڵات و خێرو خۆشی و سوودو بەرژەوەندی گەل و ئەندامی گەل و وڵاتدا، کەواتە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە

گەڕانەوە بۆلای خوا دەست گرتن بە بەرنامەی خواوە مایەی ژیانی بەختەوەری و شادمانییە، ئەوە شتێکە کە مێژوویش شایەتە لەسەری کە ئەم ئوممەتە هەر کاتێ ژیانی بەدەست بەرنامەی خواوە بووبێ ژیانی کامەرانی و بەختەوەری بووەو خەڵکی تر چاوەڕوانی دەستی ئەم بووە، بەڵێ ئەگونجێ لە ژێر بەرنامەی غەیری خوا ژیانی بەرزو فراوان دەستکەوت ببێ وەك ئێستای ئەوروپا و ئەمەریکا، بەڵام ئەو ژیانە ئارمی و ئاشتی و دامەزراوی دڵ نییە کە خۆشی لەڕاستیدا بریتییە لە ئارامی و خۆشی دڵ، بەڵکو دڵ تاریکە، یەکێکی تر لەو شتانەی کە ئەم سوورەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات و پێویستە بانگکراوان و بڕواداران پەیڕەوی بکەن، ئەو بێباکی و هێزو دامەزراوی و خۆگرییە یە کە هود پێغەمبەر (علیه السلام) نیشانیدا، کاتێ وەستا بەرامبەر ئەو گەلە یاخی و سەرکێش و نەفامەی خۆی تا ئەو ڕادەی جاڕی بچڕان و دوور کەوتنەوەو جیابوونەوەی تەواویدا لەگەڵیان وەك قورئان لە چەند شوێنکدا باسی کرد، هود (علیه السلام) وەستا بەرامبەر ئەو گەلە بەهێزە سەرکێش و یاخییە، باکی نەبوو لە هیچ شتێك، چونکە پەروەردگاری لەدڵیدا بوو، ئەیزانی کە ئەوانە گیانلەبەرێکن وەك ئەو هەموو گیانلەبەرانەی کە لەزەویدا ئەگەڕێن و ژێر بارو داماو و دەستەپاچەن بەرامبەر دەسەڵاتی پەروەردگار، کەواتە نابێ بەنرخ دار سەیریان بکات و نابێ هیچ بیمی ببێ لێیان.

بانگکەرانی ڕێگەی ئیسلام لەهەر کات و وڵاتێکدا ئەگەر بوەستن بەرامبەر دوژمنانی خواو خۆیان جیا بکەنەوە، بێگومان خوا ئەو بەڵێنەی کە داوێتی بە دۆستەکانی بەدی ئەهێنێ لەسەر هەر بارو شێوەیەك کە خۆی ئەزانێ ئیتر بە خەیاڵی دۆستەکانیدا هاتبێ یان نا، بەدرێژایی مێژووی بانگەوازەکانی خوا هەرگیز خوا جیاوازی نەخستووەتە نێوان دۆستان و دوژمنانی، تا دۆستانی خۆیان جوێ نەکردبێتەوە لە دوژمنەکان و بەرامبەریان نەوەستابن لەسەر بیرو باوەڕەکەیان و خۆیان نەکردبێ بە کۆمەڵی خواو وازیان نەهێنابێ لە هەموو شتێ لەبەر ڕەزامەندی خوا.

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآۖ

---

ئینجا لێرەدا واز ئەهێنێ لەداستانی هودو دەست ئەکات بە داستانی صالح‌و سەمود وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ﴾ ڕەوانەمان کرد بۆ لای تایفەی سەمود براکەیان کە صالح پێغەمبەرە (علیه السلام) ئەویش وەك برا پێغەمبەرەکانی وتەیەکی پێ وتن کە بەکەم‌و بنەڕەت‌و سەرەکییە، دەست نادات بۆ گۆڕان: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ﴾ ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن، هیچ پەرستراوێك بۆتان نییە بێجگە لەو، ئینجا سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئەوەی کە خوا لەم زەویەدا دروستی کردوون‌و دایناون ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾ هەر ئەو دروستی کردوون لەم زەوییەو گێڕاونییە ئاوەدان کەرەوە لەم زەوییەدا، کەواتە ئەبوو هەر ئەم بپەرستن، بەدوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە هەروەها بەرنامەیەکی بۆ دیارییکردن کەدەست نادات بۆ گۆڕان بەم ڕەنگە گووتی: ﴿فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ﴾ کەواتە داوای لێبوورن بکەن لێی لەو بێبڕواییەی کە وان لەسەری، ئینجا بگەڕێنەوە بۆلای بە پەرستن‌و گوێڕایەڵی، ﴿إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾ بە ڕاستی پەروەردگارم نزیکی نزا وەرگرە، نزیکە لە بەندەکانی بەزانین‌و ئاگاداریی، نزیکە لێیانەوە بە میهرەبانی، وەرگری نزای هەرکەسێکە کە نزاو لاڵەی لێبکات. بەو جۆرە خوای پێناساندن، کەواتە ئەبوایە گوێ ڕایەڵی یان بکردایە، بەڵام ئەو دڵانە کوێر بوون‌و هەستیان نەئەکرد بە جوانی‌و شیرینی ئەو وتەیە، لەبەر ئەوە وەڵامیان بەم جۆرە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآۖ﴾ ئەی صالح بە ڕاستی تۆ لەناو ئێمەدا پێش ئەمەی کە دەستت داوەتێ جێگەی هیواو ئومێدمان بویت، خاوەن هونەرو پیاوچاك بویت، ئێمە هیواو ئومێدمان بوو پێت لەبەر زانایيت، یان لەبەر ژیرییت یان لەبەر.... واتە بەڵام هیواو ئومێدەکەمان بە هیچ دەرچوو،

﴿أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾﴾

---

﴿أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾ ئایا تۆ جڵەوگیریی ئەکەیت لێمان لەوەی کە شتێ بپەرستین کە باوك‌و باپیرمان پەرستوویەتی؟ واتە کارەکەت ناڕەوایەو بێزاری نەرئەبڕین لێی‌و سەرمان سوڕ ئەمێنێ لێی، ﴿وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ بەڕاستی ئێمە لە گومانێك داین لەوەی کە تۆ بانگی ئێمە ئەکەیت بۆلای، گومانێك کە دڵمانی بێئارام کردووە، ئەو وتەی ئەوانەو بارو حاڵی ئەوانە بە وێنەی بارو حاڵی قورەیشە پێش ئەوەی داوای پێغەمبەرێتی ببیستن لە پێغەمبەر (ﷺ) بە پاك‌و ڕاستگۆیان دانا، کەچی لەپاشان بە جادووبازو ناڕاستیان ناو ئەبرد! بەدرێژیی چەرخ‌و مێژوو یەك بارو سروشتە. (صالح)یش وەڵامیدانەوە بە وێنەی وەلامەکەی نوحی باپیرە گەورەی بەم جۆرە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: پێیان: ﴿يَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم: ﴿أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى﴾ هەواڵم پێبدەن لە بارەی من‌و خۆتانەوە ئەگەر من لەم داوایەدا کە ئەیکەم لەسەر بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون‌و ئاشکرا بم لەلایەن پەروەردگارمەوەو هیچ گومان‌و دوو دڵیم نەبێ لەکارەکەمدا، ﴿وَءَاتَىٰنِى مِنْهُ رَحْمَةً﴾ پێی بەخشیم لەلایەن خۆیەوە میهرەبانی‌و ڕەحمەتێك، واتە فروستادەیی‌و پێغەمبەرێتی، ئەگەر من بەو جۆرە بم ﴿فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ﴾ ئەی ئایا کێ یارمەتی من ئەدات‌و بەرگریم لێ ئەکات لە سزای خوا ئەگەر من یاخی بەم ڕەنگە لێی‌و نافەرمانی بکەم، بەم ڕەنگە ئەوەی کە خوا پێی سپاردووم نەیگەیەنم پێتان‌و شتێ نەڵێم کە ئێوە دڵگران بن پێی؟ واتە ئەگەر من یاخی ببم‌و نافەرمانی بکەم خوا سزام ئەدات‌و هیچ کەسیش نییەو ناتوانێ بەرگری ئەو سزایەم لێ بکات ﴿فَمَا تَزِيدُونَنِى غَيْرَ تَخْسِيرٍ﴾ کەواتە بەو نافەرمانییەی کە ئێوە داوای ئەکەن لە من هیچ شتێك ناگەبەن بە من بێجگە لە زیان بار کردن‌و بەشی من هەر زیان بار کردن ئەبێ بەزیان لەسەر زیان، زیانی خەشمی خوا لێم‌و زیانی بێبەشیم لە پلەی بەرزی پێغەمبەرێتی، زیانی سەر شۆڕی‌و بێئابڕوویی دنیا‌و سزای ڕۆژی دوایی.

وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾

---

﴿وَيَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەكەم: ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةً﴾ ئەمە حوشترەكەی خوایە بە موعجیزەو بەڵگەیەكی ئاشكرا لەسەر پێغەمبەرێتییەكەمو ڕاستیم لە داواكەم دا. سەبارەت بەم حوشترە ڕیوایەتی زۆر هاتووەو هیچكام لەسەرچاوەیەكی بەهێزو دڵنیا كەرەوە نەهاتووە، بەڵكو ئیسرائیلیاتن، كەواتە چاك وایە زیاد لەدەقی ئایەتەكە هیچ نەگوترێ، بەس ئەوەندە هەیە لە ناوبردنی حوشتری خواو دانانی بە موعجیزەو بەڵگەی ڕوون وەرئەگیرێو دەرئەكەوێ كە حوشترێكی تایبەتی بووەو سیفەتو نیشانەیەكی تایبەتی هەبووە كە پێی ناسرابێو بووبێ بە بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەو پێغەمبەرە، ئەوەش بەسە بۆ ئێمە ﴿فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِ﴾ كەواتە لێی گەڕێن با بخواتو بلەوەڕێ لە خاكو وڵاتی خوادا ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ﴾ هیچ سزاو ئازارێكی پێ مەگەیەنن ﴿فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە سزایەكی نزیك بتانگرێ، سزایەكی نزیك كە بێت بەدوای كردەوە بەدەكەی خۆتانداو زۆر دوانەكەوێ، یان سزای نزیك كە سزای ئەم دنیایە، بەڵام ئەو یاخیانە ئامۆژگاریەكەیان وەرنەگرتو وەك دەست نیشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿فَعَقَرُوهَا﴾ كەچی ئەوان لەپاش ئەو ترساندنە ئەو حوشترەیان كوشت ﴿فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖ﴾ ئینجا صالح پێی وتن فەرموون: بژینو ڕابوێرن لە جێو شوێنو وڵاتەكەتاندا سێ ڕۆژ، واتە پاش ئەو سێ ڕۆژە سزاكەتان بۆ

دێت و ئەتانگرێ ﴿ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ﴾ ئەوەی کە گوترا بەڵێنێکە کە درۆی تیا نەکراوە بەڵکو ڕاستەو دەست نادات بۆ درۆ یا درۆ نییە، لەسەر هەر بار ناو بردنی بە بەڵێن بۆ لاقرتی پێکردنە، چونکە وتەی ﴿وَعۡدٌ﴾ بۆ خێر ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ ئینجا کاتێ کارەکەمان ـ واتە سزا ـ هات ﴿نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾ صالحمان ڕزگار کرد، ئەوانەش کە بڕوایان هێنا بوو لەگەڵی ﴿بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا﴾ بە بەزەیی و میهرەبانییەکی گرنگ لەلایەنمانەوە ﴿وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ﴾ ڕزگارمان کردن لە سزاو ڕیسوایی و سەر شۆڕیی ئەو ڕۆژە کە بریتی بوو لە لەناوبردن و بەو جۆرو شێوە بەدە، یان مەبەست بە ڕزگارکردنی یەکەم ڕزگار کردنیانە لە مردن، مەبەست بە ڕزگار کردنی دووەك کە بەپیتی (و) دەست نیشانی بۆ ئەکات ڕزگار کردنیانە لەو شێوە بەدو ناشیرینەی کە بەسەریان هات لەپاش مردنەکەیان، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت هەر ئەو توانا و بەهێزی زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا لە هەموو کاتدا ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ﴾ ئەوانەی کە ستەمی گەورەیان کرد واتە بڕوایان نەهێنا، ئەوانە پیا هەڵشاخانەکە گرتنی و داگیری کردن یان دەنگە ناهەموارەکە کە وەك هەورە تریشقە دڵی هێنایە لەرزە ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ بەهۆی ئەوە گەڕان بە لەشێکی بێگیانی کەوتوو لە جێ و شوێنەکانیاندا بە جۆرێ ﴿كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ﴾ وەك هەرگیز نیشتەجێ نەبووبن لەو جێ و شوێنانەدا، واتە ئەوەندە بە چەسپانی لەناو چوون وەك هەر نەبووبن لەو وڵات و شوێنانەدا، ئینجا جاڕیان لێ ئەدات و دەست نیشان ئەکات لە هۆی سزاکەیان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ﴾ بە وێنەی هۆزی هود ئەمانیش بێبڕوا بوون بە خوای خۆیان، کۆتایی باسەکەی ئەمانیش ئەهێنێ بەم نزا سەختە ﴿أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ﴾ وەك لەوێ تەفسیرمان کردەوە.

وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ ۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾

---

ئینجا دێته سەر داستانی ئیبراهیم لەگەڵ ئەو فریشتانەی کە هاتن بۆ سەر گەلەکەی لوط (علیه السلام) ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ﴾ سوێند بە خوا نێرراوەکانمان هاتن بۆ لای ئیبراهیم بە مزگێنییەوە، ئەو مزگێنییەی کە لەمەوپاش ڕوونی ئەکاتەوە ﴿قَالُوا۟ سَلَٰمًا﴾ گوتیان سەلامت لێ ئەکەین و سەلامت لەسەر بێ، ئیبراهیمیش بە چاکتر وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿سَلَٰمٌ﴾ سەلامتان لەسەر بێت، واتە هەمیشەیی وەك ڕستەکە ئەیگەیەنێ، چونکە بە پێی باو و زمانی عەرەب ڕستەی وا کە پێی ئەگوترێ (فعلی) هەمیشەیی ئەگەیەنێ، جا لەبەر ئەوە وەڵامەکەی ئیبراهیم چاکتر بوو، ئەوانەی لە وێنەو شێوەی ئادەمیدا هاتن لەبەر ئەوە بە پێی پیاوی میوان پەروەر چەسپانی کرد بە هێنانی خۆراك بۆیان، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾ ئینجا ئەوەندە نەوەستاو سستی نەکرد لە هێنانی گوێرەکەیەکی برژاو، واتە بە زوویی گوێرەکەیەکی بۆ سەر بڕین و گۆشتەکەی بە برژاوی بۆ هێنان، برژاندی بە بەردی گەرم کراو لەسەر ئاگر کە بەو جۆرە پاك و خاوێن ترەو بە لەزەت ترە، ئەوانە کە فریشتە بوون خۆراك ناخۆن لەبەر ئەوە دەستیان بۆ نەبرد، ﴿فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ﴾ ئینجا کاتێ ئیبراهیم بینی دەستیان ناگات و درێژ نابێت بۆلای ئەو گۆشتە ﴿نَكِرَهُمْ﴾ بێزراندنی و نەفرەتی لێکردن ﴿وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ لە دەروونی خۆیدا مەترسی لێکردن کە نیازی خراپ و بەدیان هەبێ، چونکە بە پێی باوی کۆچەر لادێکان هەرکەس بە شێوەی میوان لای کەسێك دانیشت و نانی بۆ دانراو نەیخوارد ئەبێ نیازی بەدی هەبێ بەو کەسە، چونکە باوە نان خۆران نابێ بەدنەمەکی بکەن، ئینجا دڵنیایان کردو خۆیان دەرخست بۆ ئیبراهیم بەم جۆرە ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان: ﴿لَا تَخَفْ﴾ مەترسە ﴿إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ﴾ بە ڕاستی ئێمە نێرراوین بۆ لای گەلەکەی لوط، بە هۆی ئەوەوە بۆی دەرکەوت ئەوانە فریشتەن،

وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾

---

﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتۡ ﴾ لەو کاتەدا ژنەکەی واتە هاوسەرەکەی کە سارا خاتوونی ئامۆزای بوو وەستابوو بۆ خزمەت کردن، ئینجا پێکەنیو ئیتر لە خۆشی دەرکەوتنی ئەوانەو نەمانی ترس‌و بیم، یان لە خۆشی ئەوانە هاتبوون بۆ سزادان‌و لەناوبردنی ئەو گەلە بەدە ﴿فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴾ ئینجا ئێمەیش مزگێنیمان دا بەو ئافرەتە ـ واتە لەسەر زمانی ئەو فریشتانە ـ مزگێنی بە کوڕێك کە ناوی ئیسحاق ئەبێ‌و لەپاش ئیسحاق یەعقوب ئەبەخشین بەو ئافرەتە کە یەعقوب کوڕی ئیسحاق ئەبێت‌و ئەو ئافرەتە ئەمێنێ تا ئەو کوڕەزایەشی ئەبینێ، ئەمە لەسەر خوێندنەوەی یەعقوب بە (فەتحە ـ سەرە) ئەگەر (ضمة ـ بۆرە) بخوێنرێتەوەو ئەبێ بڵێین: مزگێنیمان دا بە ئیسحاق لە کاتێکدا لەپاش ئیسحاق یەعقوب پەیا ئەبێ، لەبەر ئەوەی ئافرەتەکە پیرو نەزۆك بوو، مێردیشی هەر پیر بوو، ئەو مزگێنییە زۆر جێگەی سەرسوڕمان بوو، لەبەر ئەوە ﴿قَالَتۡ﴾ ئافرەتەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ﴿يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ﴾ ئای هاوار بۆ من‌و لەناوچم ئایا من منالم ئەبێ لەکاتێکدا من پیرەژنێکم ـ پیرە ژنێکی نەوەدو نۆ ساڵ وەك لە (مجاهد)ەوە ریوایەتکراوە ـ ئەمە مێردەکەمە ئەیبینن بە پیری ـ کە تەمەنی سەد یان سەدو بیست ساڵ بووە وەك لە ریوایەتدا هاتووە ـ ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٌ﴾ بەڕاستی بە پێی باوو ڕەوشتی خەڵکی شتی وا نابێ، بەڵام بۆ قودرەتی خوا شتی وا هیچی تێناچێ‌و سەرکردنەوە لە کاری خوا جێی سەرسوڕمانەو مایەی بێزاریە، لەبەر ئەوە فریشتەکان بەو جۆرە ﴿ قَالُوٓاْ﴾ گوتیان: ﴿ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ﴾ ئایا تۆ سەرت سوڕئەمێنێ لە کارو فەرمانی خوا؟ واتە نابێ سەرت سوڕ بمێنێ، چونکە هیچ شتێ بەرگری‌و بەربەستی مەیل‌و ئیرادەی خوا ناکات، هەرکەس بڕوای وای نەبێ ئەو کەسە نەزانەو تێنەگەیشتووە لە واتاو مەبەست بە خواو خوایەتی. ئینجا گوتیان:

﴿رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ ئەم ڕستەیە سەربەخۆیەو هەڵئەگرێ نزا بێ لەلایەن ئەو فریشتانەوە وەك هەڵئەگرێ هەواڵو بەڵێن بێ، لەسەر باری دووەم بێزاری دەربڕینە لەو سەرسوڕمانەی کە ڕستەی پێشوو ئەیگەیەنێ، واتە با سەرت سوڕ نەمێنێ لەو موژدەیە، چونکە میهرەبانی تایبەتیو فەڕو پیتەکانی خوا لەسەرتانەو دابایوە بەسەرتاندا ئەی ئالو بەیتی ئیبراهیم، ئالو بەیتی پێغەمبەرێتیو پەیامی خوا، کەواتە سەرت سوڕنەمێنێ لە بەخشینی ئەو موژدەیە کە پێدرا، لەسەر باری یەکەم مەبەست دڵ بەهێز کردنو ئارام پێدانە لەسەر بەدی هاتنی ئەو موژدەیە، واتە یا خوا میهرەبانی تایبەتی خواو پیتو فەڕە فراوانەکانی دابارێ بەسەرتاندا ئەی ئالو بەیتی ئیبراهیمو ئەی خانەوادەی ئیبراهیم، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی ئەو میهرەبانیو چاکەی خوا بەسەر ئەو ئالو بەیتە پیرۆزە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ حَمِيدٌ﴾ بەڕاستی خوا سوپاس کراوەو هەموو کارو کردەوەکانی مایەی سوپاسو ستایشە ﴿مَّجِيدٌ﴾ خێرو چاکەی فراوانە، یا بەرزو بڵندە. ئیبراهیم (علیه السلام) بێباكو دڵئارام بوو بەو موژەیەو هیچ لەڵیدا نەما، بەس غەمو پەژارەی لوطي برازایو لەناو چوونو لە ڕیشە هێنانی گەلەکەی دڵە میهرەبانو بەزەیی دارەکەی داگیر کردبوو، لەبەرئەوە پرسیاری لەوە کردو نزاو هاواری بۆ کرد، وەك دەست نیشان ئەکات بۆئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ﴾ ئینجا کاتێ ترسو بیمی ئیبراهیم نەماو باری کرد لێی، مزگێنیەکەی بۆ هات کاتی ئەوە بوو بەربەرەکانێو دەمە قاڵێو لەگەڵ کردین لەبارەی گەلەکەی (لوط)ەوە بەم جۆرە گوتی بەفریشتەکان لوط لەو شارەدایە کە ئێوە ئەتانەوێ وێرانی بکەن، کەواتە چۆن ئەوە ئەکەن؟ ئەو دەمە قاڵێو قسەو باسەی لەگەڵ فریشتەکان بوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان هەر فەرمانی خوایان بەجێ ئەهێناو ئیتر هیچی تریان بە دەست نەبوو، لەبەر ئەوە دەمە قاڵێکەی ئەوانی دانا بە دەمەقاڵێ لەگەڵ خۆی، لەبەرئەوە سەر ناکرێتەوە لەکاری خوا ئەوەی دانا بەدەمەقاڵێ، بە وتەی ئێستا فەرمووی: ﴿يُجَٰدِلُنَا﴾ لەگەڵ ئەمەدا ڕابووردووەو ئەبوو ﴿جادلنا﴾ بوایە، ئەوەش لەبەرئەوەیە ئەو کردەوەی (لوط)ە بخاتە بەرچاو کە ئەوەش باوێکی ڕەوان بێژییە قورئان زۆر جار بەکاری ئەهێنێ، بێگومان (ئیبراهیم) (علیه السلام) یەکێکە لەسەر دەستەو پێشەواکان لەبارەی ملکەچی بۆ خواو سەر نەکردنەوەو پرسیار نەکردن لەکارو فەرمانی خوا،

إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾

---

بەلام چەند سیفەتێکی تێدابوو کە پاڵی پێوەنا بۆ ئەو لێکۆڵینەوەو دەمە قاڵێ وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ﴾ بە ڕاستیو بێگومان ئیبراهیم زۆر لەسەر خۆو پەلەنەکەر بوو، کەواتە پێی خۆش بوو پەلە نەکرێ بە تایبەتی لە تۆڵە سەندندا، ﴿أَوَّٰهٌ﴾ زۆر داخو دوخۆرو غەمبارو ئاخو ئوف کەر بوو لەسەر گوناه، ﴿مُّنِيبٌ﴾ گەڕاوە بۆلای خوا لە هەموو کارێکدا، کەواتە بەهۆی ئەو سیفەتانەوە مافی خۆی بوو ئەو لێکۆڵینەوەو دەمە قاڵێ بکات، صلی الله علیه وعلی سائر اخوانه وخاصة علی خاتم الکل. هەرچەند هۆی دەمە قاڵێکەی بوو، بەلام شایستەو پلەی بەرزی ئەو پێغەمبەرە نەبوو، لەبەر ئەوە فریشتەکان گوتیان: ﴿يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ﴾ ئەی ئیبراهیم واز بێنەو ڕوو وەرگێڕە لەم دەمە قاڵێ، ﴿إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ بەڕاستی کار بەمە جۆرەیە کە بێگومان بڕیارو قەزاو قەدەری خوا هاتووە بە سزادانی ئەو تاوانبارانە، ﴿وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾ بە ڕاستی ئەوانە دێت بۆیان سزایەکی نەگێڕراوەی بەرگری نەکراو.

ئینجا لەلایەن ئیبراهیمو هاوسەری بەڕێزییەوە کۆتایی ئەهێنێو بێدەنگ ئەبێ لێیانو دێتە سەر باسی (لوط)و گەلە تاوانبارەکەی کە فریشتەکان گوتیان، ئێمە بۆ سەر ئەوان ڕەوانە کراوین، ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ﴾ کاتێ کە فروستادەو نێرراوەکانمان هاتن بۆ لای (لوط) تەنگەتاو دڵگران کرا پێیان، واتە هاتنەکەیان بوو بە هۆی دڵگرانیو تەنگەتاوی (لوط). ﴿وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا﴾ واتە ناتواناو دەستەپاچە بوو لەمیوان داریان، چونکە گومانی وا بوو ئەوانە ئادەمینو باوی بەدی گەلەکەشی ئەوە بوو کە پەلاماری میوانیان ئەدا بۆ کاری نێر بازی لەگەڵی، (لوط)یش بەرگری ئەو گەلە بەدەی پێ نەئەکرا، بەهۆی ئەوەوە غەمو پەژارە داگیری کرد. ﴿وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ گوتی ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی سەختی بەتینە،

وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴿٧٨﴾ قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً

---

﴿وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ﴾ گەلەکەی هاتن بۆلای کاتێ کە زانیان بەهاتنی ئەو فریشتانە کە بە ئادەمیان زانین، هاتن گورگە لۆق و پەلەیان پێ ئەکردن و هانیان ئەدان لەسەر ئەو چوونە، واتە سەرۆکەکەیان هانی ئەدان و پەلەی پێ ئەنانەوە، یان یەکتر هانی یەکتریان ئەدا، یان نیازی ئەو کردەوە پیسە پاڵ دەریان بوو پەلەی پێئەکردن و ئەوانیش بەو شێوە هاتن و دەماریان هاتە جۆش و لەرزە، ﴿وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە لە پێشەوە بە هەمیشەیی کردەوە بەدەکانیان ئەکرد و ئەوە باویان بوو، کەواتە بەبێ شەرمانە هەوڵی ئەوەیان ئەدا وەك کارێکی پەسەند بێت! مەبەست بەو کردەوە بەدانە هەر ئەو نێربازییەیە و بە کۆ ئەیفەرموێ لەبەر زۆری لەناویاندا، یان مەبەست چەند کردەوەیەکی بەدی ترە کە پیس ترینیان ئەو نێربازییەیە، ئەو کردەوە بەدانەی تر وەك قومارو چەپڵە لێدان و فیکە کردن و چەند شتێ تر کە ڕیوایەتکراوە ئینجا (لوط) (علیە السلام) ویستی لەو گومڕاییە بیانگێڕێتەوە و سروشتی پاك و خاوێنیان بێدار بکاتەوە و سەرنجیان ڕاکێشێ بۆلای ئەو تیرەکە خوا دروستی کردووە بۆ پیاوان و خۆشی و لەزەتەکەی زیاترو مانەوەی ئادەمی لەسەر ئەوە ڕاگیرە، ویستی بیانخاتە سەر ئەو ڕێگە ڕاستە لەبەر ئەوە فەرمووی پێیان: ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم، ﴿هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي﴾ ئا ئەوانە کچەکانی منن، واتە هەموو ئافرەتەکانی ئەو تایفە و گەلەکە کە کچەکانی خۆیشی لەوانن، ئەوانە کچەکانی منن بە شەرعی بچنەلایان، هەمووی دانان بەکچی خۆی، چونکە پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ وەك باوکن بۆ هەموو ئومەتەکانیان، ﴿هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ﴾ ئەوانە زۆر چاك و خاوێنن بۆتان، زۆر پاکن لە هەموو

بارێکـەوە، ئەمـەی کـە مەبەسـت هـەموو ئافرەتـەکان بێـت ڕای (ئـیبن و عـەباس و مجاهـدو سەعیدی کوڕی جوبەیر)ە، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست کچەکانی خۆی بووە کە بەشەرعی بیان خوازن و لێیان مارە بکات، کە لەمەو بەر داوایان ئەکردو پێی نەئەدان لەبەر بەدیان، بەڵام لەو کاتەدا ڕازی بوو لەبەر لادانیان لەنیازە بەدەکەیان، بەڵام ئەم ڕایە ناچێتە دڵەوە، چـونکە کـچەکانی دووان یـان سـیان بـوون و وەك لـە چـەند ڕیوایەتێکـدا هـاتووەو ئـەو تاوانبارانەش گەل و کۆمەڵ بوون، بە هیچ جۆر دروست نەبووەو نییە مارەکردنی ئافرەت لەزیاد لەیەك کەس لەیەك کاتدا، مەگەر بڵێن: مەبەست مارە کردنی کچەکانی بوو لە سەرۆکەکانی گەلەکەو بەهۆی ئەوەوە واز بێنن. ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئینجا لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەهۆی خەشم و سزای خوا، ﴿وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ﴾ سەر شۆڕو بێئابڕووم مەکەن لەبارەی میوانەکانمەوە، ﴿أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ﴾ ئایا لەناوتاندا نییە پیاوێکی ژیری هەق ناس کە ڕێنموونیتان بکات و بەرگریتان بکات لە خراپە؟ واتە کارەکەی ئێوە نەفامییەو پێچەوانەی ئاین و پیاوەتییە، بەڵام لەگەڵ ئەوانەدا دڵ مردوو بوون و پەندو ئامۆژگاری کاری لێ نەئەکردن و بێجگە لەئارەزووی بەدی خۆیان هیچی تریان نە ئەویست وەك دەریان بری بەمەی: ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ﴾ بێگومان زانیوتەو ئەزانی کە هیچ مەیل و پێویست و مەبەستێکمان نییە لە خواستنی کچەکانتدا، ﴿وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ بەڕاستی تۆ ئەزانی ئەوەی کە ئێمە ئەمانەوێ و مەبەستمانە کە بریتییە لە خواستن و چوونە لای نێرینە، کەواتە بۆچی لەنیازو مەبەستی خۆمان لامان ئەیەیت؟ بە چەند جۆرێکی تریش ئەو وتە بەدەی ئەوان تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە گوتم لەدڵدا بەهێز ترەو خوا خۆی باش ئەزانێ، (لوط) (علیه السلام) نائومێد بوو لێیان، زانی لەچاری ئەم دا نین، لەبەرئەوە لای کردەوە بۆلای میوانەکانی و ﴿قَالَ﴾ پێی گوتن: ﴿لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً﴾ ئەگەر ببوایە بۆم بە ئێوەو بە هۆی ئێوەوە هێزو دەسەڵات بەرگری و جەنگکردن لەگەڵیان،

أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ﴿٨٠﴾ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ

---

﴿أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ﴾ یان ئەگەر بکرایە بۆم کە خۆم بدەمە پاڵ بەهێزێکی بەتین لە خزم و دۆست و عەشیرەت، ئەگەر هەرکام لەو دووبارەم بۆ بکرایە ئەمکردو بەرگریم لێ ئەکردن، واتە بەڵام بەداخەوە هیچ کامم بۆ نییە، هێندێ ئەفەرموون وتەی ﴿لَوْ﴾ بۆ ئاوات خواستنە، واتە کاشکێ و خۆزگە یەکێ لەو دووانەم ببوایەو بۆم بکرایە، بەم جۆرەش هەر چاکە، لەبەر زۆر سەختی و تەنگی کات و بەسەرهاتەکە (لوط) (علیه السلام) بیری بەلای ئەوەوە نەبوو کە گەورەترین هێزی لەگەڵدایەو لە پەنا هێزی خوادایە کە دەست بەرداری دۆستانی نابێت، وەك پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرمووی لەکاتێکدا ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە: ڕەحمەتی خوا لە (لوط)، بەڕاستی لەپەنای هێزدارێکی بەتین دا بوو! ئینجا کارەکە ئەوەندە سەخت و بەتین بوو فریشتەکان خۆیان دەرخست و (لوط)یان دڵئارام کرد بەم جۆرە: ﴿قَالُواْ يَٰلُوطُ﴾ گوتیان پێی: ﴿إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ﴾ بەڕاستی ئێمە نێرراوی پەروەردگارتین ﴿لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ﴾ هەرگیز ناگەنە لای تۆو زیان و خراپەیەك ناگەیەنن بە تۆ نە لەبارەی خۆت و نەلە بارەی ئێمەوە، ئینجا (لوط) قاپییەکەی لێکردنەوەو خوایش بینایی چاوی نەهێشتن، ئێمە هاتووین بۆ ڕزگار کردنی تۆو لەناو بردنی ئەوانە ﴿فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ﴾ ئینجا شەو ڕەوی بکە بە ماڵ و خێزانەکەت لە بەشێك لەشەودا، ﴿وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ﴾ با هیچکەس لە ئێوە لا نەکاتەوەو سەرنجی دوای خۆیداو ئەوەی بەسەر ئەوانەدا دێت وەك (قتادة) ئەفەرموێ، یان با هیچکەس لەئێوە جێنەمێنێ وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ. شەو ڕەوی بکە بە عائیلەو خێزانەکەت، ﴿إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ﴾ بێجگە لە ژنەکەت ﴿إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ﴾ بەڕاستی دووچاری ئەبێ ئەوەی کە دووچاری گەلەکەت ئەبێ، ئەو ژنە بەد بەختە بێبڕوا بوو دەستی تێکەڵ بوو لەگەڵ ئەو گەلە بێبڕوایەدا،

إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ

﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ﴾ بێگومان سزاکەیان کاتی ڕۆژ بوونەوەیەوە ﴿أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾: ئایا کاتی ڕۆژ بوونەوە نزیک نییە، واتە بەڵێ نزیکە، کەواتە چەسپانی بکەن بە شەو ڕەوییەکە تا دەرچن لەناو ئەو گەلە، واتە ئەی (لوط) با دڵشاد بیت بەوەی سزا دانو لەناو بردنی ئەوانە نزیکە، ئینجا شێوەی سەختو سامناکی سزادانو لەناو بردنەکەیان باس ئەکات ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ ئینجا کاتێ سزاکەمان هات بۆیان، یان کاتێ فەرمانماندا بە سزا دانو لەناو بردنیان ﴿جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا﴾ ماڵو شارەکانمان ژێرەو ژوور کردو لای سەرویانمان گێڕا بە ژێرو لای ژێرەوەمان گێڕا بەسەر، ئەوەیە شێوەی وێران کردنی تەواو کە هەموو شتێکی وەرگێڕی، بەوێنە سروشتی ئەو تاوانبارانە کە بەو جۆرە گەڕاو ئادەمێتیەکەیان زیرو زەبەر بوو، ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ﴾ لە پێش وێران کردنەکەدا یان هەر لەو کاتەدا باراندمان بەسەریاندا بەردێک کە لە بەردەو ڕدەو قوڕی ڕەقو وشك پەیدا ئەبێ، بەفارسی واتە سەنگ گڵ، ﴿مَّنضُودٍ﴾ کەبێن بە دوای یەکدا چین لەدوای چین وەك قەترەی باران ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ﴾ باراندمان بەسەریاندا بەردانێك کە نیشانە دار کراو بوون لای پەروەردگارتەوە بۆ ئەو زیادە ڕەوی کەرانەو لەسنوور دەرچووانە، واتە تایبەتی کرابوون لەزانینو بڕیاری خوادا بۆ ئەو تاوانبارانە بێجگە لەوان کەسێکی تری نەئەگرت، یان مەبەست ئەوەیە هەر بەردێك دیاری کراوو نیشان دار کرابوو بۆ یەکێ لەوان ئیتر بەوەی ناوی خاوەنەکەی لێ نوسرابێ یان نیشانەیەکی تریان پێوە بووبێ، هێندێ ئەفەرموون: ئامادە کراو پەروەردە کرابوونو بە جارێ بەرەڵا ئەکران تا کاتی پێویست، بە وێنەی مەڕو ماڵات کە خزمەتو پەروەردە ئەکرێن بۆ ئەوەی زیاد بکەنو پەرە بسێنن بۆ کاتی پێویست،

وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾ ۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ

---

ئینجا یاخی یەکانی ئەم ئوممەتە ئەترسێنێ بە وێنەی ئەو سزایەو ڕووی فەرمووده ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ﴾ ئەو سزاو تۆڵەیە دوور نییە لە ستەم کارانەوە لەوێنەی ئەو گەلە ستەمکارەی (لوط)، واتە دوور نییە لە ستەمکارەکانی ئوممەتەکەی تۆوە کە نزیکە وێنەی ئەو تۆڵەیان بۆ بێت. زۆر لەزانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە ﴿هِيَ﴾ ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو وڵاتو شارانە کە نزیکن لە وڵاتو خاکی پاکی مەککەوە، ئەو کاتە هەرچەند دەست نیشانی تیایە بۆ ترساندنی ستەمکارانی تر، بەڵام مەبەست زیادە دڵنیایی کردنە لەسەر ڕاستی ئەو هەواڵو سەرگوزەشتەی کەلە وڵاتێکدا ڕووی داوەو دوور نییە لە مەککەوە کە دانیشتوانی ڕائەبووردن بە شەوو بە ڕۆژ بەلای ئەو شارەو وێران کراوانەدا، وەك لەئایەتی تردا ئەفەرموێ. ئینجا ﴿بِبَعِيدٖ﴾ ئەگونجێ لەگەڵ وتەی ﴿هِيَ﴾ بەمەی مەبەست ئەوەیە: ئەو تۆڵەیە یان شارانە شتێکی دوور نین، بە چەند جۆرێکی تریش ئەو دژایەتی یە چارەسەر کراوە وەك لە تەفسیرەکاندا گوتراوە. ئینجا هەرکەس بڕوای هەبێ و تێگەیشتبێت لە مەبەست بە خواو خوایەتی هەرگیز سەر ناکاتەوە لە چۆنێیەتی ئەو ڕووداوی وێران کردنەو وێنەی ئەو هەواڵانە، ئیتر ئەو ڕووداوی گەلی (لوط)ە بە هۆی بورکانێك بووبێ کە لەو کاتەدا بە فەرمانی خوا ڕووی دابێ یان هەر بە هۆو جۆرێکی تر بووبێ خوا توانا و دەسەڵاتدارە بەسەر هەرکارو هەر شتێ کە مەیلو ئیرادەی ڕووی تێ بکات، هەرچی ئەو ویستبێتی بیەوێ یاخی نابێ لێی و بەدی دێت، ئینجا دێتە سەر باسی داستانو سەرگوزەشتەی شوعەیب (علیه السلام) ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ﴾ ڕەوانەمان کرد بۆ لای دانیشتوانو نەوەکانی مەدیەن، شوعەیب کە برایان بوو لە نەژادداو هاونیشتمانی وهاوڵاتیشیان بوو،ئەمیش وەك پێغەمبەرەکانی تر ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ﴾ خوا کە ناوی ﴿ٱللَّهَ﴾یە بپەرستن، هیچ خوایەکی تر نییە بۆتان بێجگە لەو، کە ئەمەیەکەم یاسا و یەکەم

بنەڕەتە لە ئایین و شەریعەتەکانی خوادا، کە بەبێ ئەوە هیچ شتێ نرخی نییەو هیچ کردەوەیەکی چاك وەرناگیرێ، لەپاش ئەو یەکەم بەندو بنەڕەتە ئینجا جڵەوگیریی کرد لە نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری کە زۆر بووە لەناو ئەو گەلەدا، نەخۆشی ترازوو بازیو مەن گۆڕیو ناپاکی لەکێشان و پێوانەدا، ﴿وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ﴾ کەم و کوڕی مەکەن لە پێوانە و کێشانەدا، ئینجا دوو شتی کرد بە هۆی ئەو بەرگریو جڵەوگیرییە:

١- ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ﴾ بە ڕاستی من ئەتان بینم بە ماڵ و سامانێکی فراوانەوە، کەواتە ئەبێ پەست و بێنرخ نەبن و تەماع بکەنە ماڵی خەڵکی بە نا هەق و بەدزیو دەست پیسی، بێجگە لەوەش ئەو کردەوە پیسانە سپڵەیتانە بەرامبەر بە خوا کە بێ پێویست و سامان داری کردون.

٢- ﴿وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ﴾ بەڕاستی من مەترسی ئەکەم لەسەرتان ـ ئەگەر کۆتایی نەهێنن سزای ڕۆژێك کە دەورتان بدات بە جۆرێ هیچ کامتانی لێدەر نەچێ ـ یان سزای ڕۆژێك کە لەناوبەرتان بێت و ئەتان هێڵێ.

ئیتر مەبەست ڕۆژی دوایی بێت یان سزای لەناوبردن و لە ڕیشە هێنانی ئەوانە بێت، ئینجا لەبەر زیادە هاندان و بەهێزکردنی ئەو جڵەوگیرییە و بە شێوەیەکی تر مەبەستەکە دووبارە ئەکاتەوە کە فەرمووی: ﴿وَيَـٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم، ﴿أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ﴾ پێوراو و کێشراو تەواو بکەن هەڵسن پێیان بە دادو بەبێ زیادو کەم و کوڕی، ~ لەپێدان و ~ لە وەرگرتندا، ئەوەی کە یاسا بێت ئەوەیە، بەڵام زیاد کردن لە پێدان داو کەم و کوڕی لەوەرگرتندا هەرچەند یاسایەتی و پێویست نەکراوە، بەڵام پێچەوانەی داد نین و ڕێکن لەگەڵی، کەواتە ئەوەی کە پێویستە ئەمەیە زیان نەگەیەنرێ بە خەڵکی، هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: مەبەست بە (مکیال) و (میزان) مەن و ترازوو هۆی پێوان و کێشانە، بەم جۆرە هەرچۆنێ ڕێکترە لەگەڵ ڕووکەش و ڕواڵەتی وتەکاندا، هەروەها بەهێزترە لە گەیاندنی مەبەستەکەدا، چونکە ئەوە نیشان ئەدات هەرچۆنێ خۆپارێزی لەزیادو کەم و کوڕیش لە کێشراو و پێوراوەکەدا هەروەها پێویستە خۆپارێزی لە هۆی زیادەو کەم و کوڕیەکەدا، چاك کردن و نەهێشتنی هۆی ئەو تاوانە، ئینجا کارەکە گشتی تر ئەکات بەم ڕەنگە جڵەوگیریی ئەکات لە زیادەو کەم و کوڕیو لە نرخی هەموو شتێکدا،

وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾ کەمو کوڕی مەکەن لە شتەکانی خەڵکیدا، ئیتر هەر شتێکی تر بێجگە لە پێواراوو هەر مافێکی تر، ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ ناهەقیو خراپەکاری مەکەن لەوڵاتدا، لەکاتێکدا بتانەوێ بەدەست قەست خراپەکاری بکەنو تێك دەربن، کەواتە ئەگەر ناهەقیو خراپە کراو بەدەست قەست نەبوو یان کرا لەبەر دوور کەوتنەوە لە خراپتر ئەوە قەیناکات، مەبەست نییە بەم جڵەو گیرییە، ئەوە پێی ئەگوترێ: (دەفعی اقبح به قبیح) واتە بەرگری کاری خراپتر بە کاری خراپ. هێندێ ئەفەرمون مەبەست ئەوەیە: لە کاتێکدا کە بەوە تێکدەری بەرژەوەندی دینو دنیاتان ئەبن ئەو کاتە دەست نیشان ئەبێ بۆ لای هۆی جڵەو گیرییەکە، واتە خراپەکاری لە وڵاتدا، چونکە ئەو خراپەکاریو تێکدەری بەرژەوەندیتانە، بەم جۆرەش ئەبێ، بەڵام باری یەکەم بەهێز ترو ڕێك ترە لە دەروونلدا. ئینجا دەروونو ویژدان بێدار ئەکاتەوە بۆ کارو شتی چاكو بەردەوام، ئەفەرموێ: ﴿بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ﴾ وتەی ﴿بَقِيَّتُ﴾ بە چەند شتێ تەفسیر کراوەتەوە:

١- ئەوەی کە ئەمێنێتەوە بۆتان لەپاش ڕێكو پێککردنی کێشانو پێوان.

٢- ڕزقو ڕۆزی خوا.

٣- گوێڕایەڵیو فەرمانبەری خوا.

٤- کردەوە چاکەکان کە سەرنجامو بەرهەمیان ئەمێنێتەوە.

٥- وەسیێتی خوا بۆتان.

٦- چاودێرییو ئاگاداریی خوا.

٧- بەشتان لەلایەن خواوە.

بەهەرکام لەمانە دەست ئەداو ئەگونجێ، بەڵام بە پێی شوێنەکە یەکەم لەدڵدا جێگیر ترە، واتە ئەوە چاکە بۆتان ئەگەر ئێوە بڕوادارن و بڕوام پێ ئەکەن لەوەی کە بۆم باسکردن. ئەگەر ئێوە بڕوادارن بە خوا. واتە ئەگەر بڕوادار نەبن ئەوا چاکتر نییە بۆتان، چونکە بە بێ بڕوا بە خوا هیچ شتێ نرخی نییەو بێ کەڵکە. ﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ﴾ بێ گومان من نیم بە پارێزەر بەسەتانەوە، واتە بەس ڕاگەیەنەرو ئامۆژگاری کارێکی پاک و سافم بە سەرتانەوە، بەم پیرۆزە دەست نیسانی بۆ کردن بەمەی کە کاروباریان هەر بە دەست خوایەو ئەو خاوەنی هیچ شتێکیان نییەو فەرمانی پێ نەدراوە بە پاراستنیان لە خراپەو سزادا، پارێزەریان نییە لە گومڕایی و بەرپرسیان نییە لەوە ئەگەر ئەوان گومڕا بوون، بەڵکو هەر ڕاگەیاندنی فەرمانی خوای لەسەرەو ئەوا پێی ڕاگەیاندن، بەم جۆرو شێوەیە سەرنجی ڕاکێشان کە کارەکەیان سەخت و سامناکەو ئەرکی سەرشانیان قورس و گرانە، دوا ڕۆژی سەخت و بەدیان ئەگەڕێتەوە بۆ لای خۆیان.

ئەم پێغەمبەرە (عليه السلام) بەو جۆرو شێوە جوانە فەرمانی خوای پێ گەیاندن، بەڵام ئەو گەلە یاخی و سەرکێشە دامەزراوو جێگیر بوون لەسەری بەدی و گومڕایی، بەهۆی ئەوە بە لاقرتییەوە وەڵامیان دایەوە ئەوپەڕی نەفامی و بێ شەرمیان بەکار هێنا لە وەڵامەکەیاندا بەم جۆرە: ﴿قَالُواْ﴾ کوتیان پێی: ﴿يَٰشُعَيۡبُ﴾ ئەی شوعەیب ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ﴾ ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ ئەدات کەئێمە واز بێنن لەوەی کە باوو باپیرمان پەرستوونی؟ یان واز بێنین لەوەی چیمان ئەوێ و ئارەزووی بکەین لەماڵ و سامانەکەماندا؟ واتە ئێمە باومان وا بووە کە بە ئارەزووی خۆمان جوڵاوینەتەوە لەبارەی ماڵ و سامانمانەوە، دەی ئایا تۆ کە ئێستا جڵەو گیریمان ئەکەیت لە ترازووبازی و مەن گۆڕی، ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ ئەدا بەوەی کە ئێمە واز بێنین لە باوی خۆمان؟ ﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ﴾ بەڕاستی و بێ گومان هەر تۆ لەسەر خۆو پەلە نەکەرو لێزان و کاردروستی. ئەو سەرکێشانە بە لاقرتی پێکردنەوە وەڵامی داواو فەرمانەکانی شوعەیبیان دایەوە بەو شێوە بێ شەرمانە،

قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ

---

**بەڵام شوعەیب گوێی نەدا بەو نەفامانەو هەر بەنەرمیی و میهرەبانیی لەگەڵیان جوڵایەوە کە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ﴾ هەواڵم پێبدەن ئەگەر لەم داواو ڕاگەیاندنەدا کە ئەیکەم لەسەر بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون بمو بڕواو ئارامم ببێ پێی لەلایەن پەروەردگارمەوە، ئەو پەروەردگارە بەش و ڕۆزیەکی جوان و شیرینی پێدابم لەلایەن خۆیەوەو بە لوتف و میهرەبانی خۆی، ئیتر مەبەستی پەیام پێغەمبەرێتی بووبێ ماڵ و سامانی زۆرو فراوانی کەدەستکەوتی بووبێ لە ڕێگەی حەڵاڵەوە نەك لە ڕێگەی دزیی و مەن گۆڕی و ترازوو بازی کە بەو دوو جۆرە تەفسیر کراوەتەوەو هەردوویش ئەگونجێ ئەگەر چی لەدڵدا دووەم بەهێزترە بە پێی نیشانەی جێگەو شوێنەکە، لەسەر هەربار فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر من بەو جۆرە بم ئایا ئەبێ و ئەگونجێ هیچ بڵێم پێتان بێجگە لەوەی پێم ڕاگەیاندوون؟ واتە نەخێر هەر ئەبێ ئەوەتان پێ ڕابگەیەنم کە بەلامەوە ڕاستەو دڵم بڕوای پێی هەیە بە ئارامەوە. ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ﴾ من نامەوێ و نیازی ئەوە ناکەم کە پێچەوانەی ئێوە بکەم بەم جۆرە لەپاش جڵەوگیریی ئێوەو کۆتایی هێنانتان، من مەیل و ئارەزووی ئەوە بکەم کە جڵەوگیریی ئێوەم لێکردووە، واتە نامەوێ کۆتایی بە ئێوە بێنم و لەپاش ئەوە خۆم ئەوە بکەم کە جڵەوگیریی ئێوەم لێکردووە، بەڵکو من لە پێش ئێوەدا دوورم و دژو دوورە پەرێزم لەو شتانەو هەرگیز نایان کەم ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ﴾ من هیچ نیازێکم نییە لەوەی ڕاینەگەیەنم بێجگە لە چاککردن و ڕاست کردنەوەی هەموو لارو ناڕاست و نارەوایەك، تا توانیبێتم و لە توانامدا ببێ، بێگومان چاك کردنی گشتی ژیان و گەل مایەی خێرو خۆش بەختیە بۆ هەموو کەس، ئەگەر چی هێندێ دڵ نەخۆش نەفامەو لای وایە کە چاك کردن و ڕاست کردنەوەی عەقیدەو**

خوو ڕەوشت بە زیانی هێندێ تەواو ئەبێو بێبەشی ئەکات لە هێندێ مەبەستو سوودو قازانج، نەخێر ئەوانە نەفامو نەخۆشنو نازانن بێبەشیان ئەکات لە شتی بەدو پیسو خراپ، لە باتی ئەوەا شتی چاك بە دەست ئەخاتو لە سەرەنجامدا گەلو کۆمەڵێك پێکدێت کە هاوکاریو دڵسۆزی ئەبێتە پیشەو مەبەستو ئامانجیان، بەبێ کینەو ئاژاوەو دەست درێژی کە ئەوە گەورە ترینو پیرۆز ترین ئامانجە لە دنیادا. ﴿وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ﴾ دەسەلاتی من بەسەر ئەو چاك کردنو هەر چاکەیەکی تردا نییەو هۆی پێکهێنانی ئەوە هەر بە خوایەو لەلایەن ئەوەوە دەستکەوتم ئەبێ، ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ پشتم هەر بەو بەستووەو کارو بارم هەر حەواڵەی ئەو کردووە. ﴿وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێمەوەلەوەی کە ئەمەویو هەوڵی بۆ ئەدەمو خەریکم پێیەوە، یان لە هەموو کاروبارمدا هەر ڕوو بۆلای ئەو ئەکەم. بەو جۆرو شێوە شیرینە وەڵامی ئەو گەلە نەفامەی دایەوە ئینجا ئەیانترسێنێو لە بارێکی ترەوە سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ وەرگرتنی تەمێو ئامۆژگاریەکەی، ئەفەرموێ: ﴿وَيَٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِيٓ﴾ با دژیو دوژمنایەتیتان لەگەڵم پاڵتان پێوە نەنێو نەتان گەیەنێتە ئەو ڕادەی ﴿أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَآ أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَٰلِحٍۚ﴾ دووچارتان ببێ وێنەی ئەو سزایەی کە دووچاری گەلەکەی نوح یان گەلەکەی هود، یان گەلەکەی صالح بوو، واتە دووچار بوونی ئەو گەلانە بە هۆی دژیو دوژمنایەتی پێغەمبەرەکانیان بوو، کەواتە کارێکی وا مەکەن کە ئێوەش دووچاری وێنەی سزایەك لە سزاکانی ئەوان بنو ئێوەش لەناو بچن بە وێنەی ئەوان، ﴿وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ﴾ گەلەکەی لوط دوور نییە لێتانەوە، دوور نین نەلە چەرخو کاتدا، نەلە وڵاتو شوێندا، نەلە تاوانو خراپەکاریدا، واتە ئەگەر ئێوە تەمێ خوار نابن بەو گەلە پێشوانە لەبەر دووریتان دەی تەمێ خوار بن بە گەلەکەی لوط کە دوور نین لێتانەوە، ئینجا لەم کاتەدا قاپی لێبوردنو تۆبەو گەڕانەوەیان لێ ئەکاتەوەو تەمادارو ئومێدەواری بەزەییو میهرەبانی خوایان ئەکات بە وتەیەکی زۆر نەرمو ناسك، ئەفەرموێ: ﴿وَٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ﴾ داوای لێبوردنو سڕینەوەی گوناهو توانتان بکەن لە پەروەردگارتان، ئینجا تۆبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆلایو کۆتایی بێنن لە بێباوەڕیو گوناهو تاوانتان،

إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَـٰكَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّى بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ وَيَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ

---

﴿إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم زۆر بەزەیی دارێکی میهرەبان و خاوەن چاکەو کردەوەی شیرینە دەربارەی ئەوانەی کە تۆبە ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆلای، واتە بگەڕێنەوەو داوای لێبووردن لکەن و بگەڕێنەوە بۆلای، ئەو پێغەمبەرە بەو جۆرە سەرنجی ڕاکێشان و بانگی کردن بۆ هۆی بەهرەمەندی و ڕزگاربوون لە سزای هەردوو جیهان، بەڵام ئەو نەفامە بەد هەست و کردارانە نەگۆڕان و هەر سوور بوون لەسەر لاری و ناپیاوی خۆیان، ئەوانە دڵ تەنگ بوون بەرامبەر بەو هەقە ڕوونەی کە بانگی ئەکردن بۆی، نەیان ئەویست تێی بگەن و وەری بگرن، بە هۆی ئەوەوە ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان: ﴿يَـٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ﴾ ئەی شوعەیب ئێمە بەوردی بە باشی تێناگەین و حاڵی نابین لە زۆر لەوەی تۆ ئەیڵێیت پێمان و نازیانین مەبەستت چییە، ﴿وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ ئەبینین لەناوماندا بە زەبوون و بێدەسەڵات و ناتوانی بەرگری بکەیت لە خۆت ئەگەر ئێمە بمانەوێ سزاو ئازارت بدەین، لەگەڵ ئەوەدا تۆ هەڕەشەمان لێ ئەکەیت بە دووچار بوونمان. ﴿وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَـٰكَ﴾ ئەگەر کۆمەڵی خزمە نزیکەکانت نەبوایە خاتری ئەوان نەبوایە بە ردبارانمان ئەکردی و بەو شێوەئەمان کوشتی و لە ناومان ئەبردی، ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ تۆ زاڵ و دەسەڵاتدار نیت بەسەرماندا تا بتوانی یاخی ببی لێمان، بەڵام ئێمە بە هۆی کەس و کارەکەتەوە وازت لێ ئەهێنین.

ئینجا لەوێدا شوعەیب (علیه السلام) غیرەت گرتی کەئەوانە هیچ گوێیان نەبوو لە خواو باکیان نەبوو لە خوا، بەڵکو نرخیان هەر بۆ کەس و کارەکەی دائەنا ئەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان و بێزاری دەربڕی لەخۆیان و لە وتە بەدەکانیان ﴿يَـٰقَوْمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿يَـٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئایا کەس و کارەکەم بەڕێزترو خاتردارترە لەسەرتان لە خواو هیچ ڕێزو

نرخێکی بۆ دانانێن ﴿وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّا﴾ واته وازتان لێ هێناوەو کێڕاوتانە بە وێنەی شتێ کە پاش گوێ بخرێو تورِ بدرێ بۆ دواوە، ئەم وتەیە لە زمانی هەرەبدا وێنەو چیرۆکە بۆ نرخ پێنەدانو لە بیر بردنەوەی هەرشتێ ﴿إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم بەزانین دەوری هەر کردەوەیەکی داوە کە ئێوە ئەیکەن، واتە زاناو ئاگایە بە هەموو کردەوەکانتان، کەواتە هەموو ئەژمێرێو بە پێی ئەو کردەوانە تۆڵەو پاداشت ئەداتەوە ئەم ڕستەو وتەش چیرۆکە بۆ ئەوپەڕی زانینو ئاگاداریو دەسەڵات، بەڕاستی هەڕەشەو ترساندنێکی سامناکە.

بڕوادار ئاوا ڕقو خەشمی بەتین ئەبێ لەسەر پەروەردگاری کاتێ کە بێشەرمی دەربارە کراو ڕێزی خۆی پێنەدرا، ڕقو خەشمێکی وا کە هیچ شتێك دانامرێتەوە، ئەوەتا شوعەیب (عليه السلام) بەوە دڵخۆشو شادومان نەبوو کە ئەو نەفامانە سامو بیمیان دەرئەبڕی لە خزمو کەسو کارەکەی، لەبەر ئەوان ناتوانن دەستی بۆ درێژ بکەن! دڵخۆش نەبووبەوەی کە ئەو کەسو کارە بەرگری لێبکەنو پارێزگاری بکەن، ماتوڵ ئەو کەسو کارە ڕێگەو ڕێبازیان جیاوازە لە ڕێگەو ڕێبازەکەی خۆی، ماتوڵ ئەوانە شەرم ناکەن لە خواکەیو ڕێزیان نییە بۆی، بە ڕاستی ئەوەیە بڕوا بە خوا، ئەبێ بەندە فەخرو شانازی نەکات بە هیچ شتێ بێجگە لە خواکەی، ئەبێ ڕازی نەبێو دڵخۆش نەبێ بەوەی سامو بیم بکرێ لە کەسو کارەکەی ماتوڵ سامو بیم نەکرێ لە خواکەی، ئەمەیە بۆچوونی موسڵمانو لێرەدا جیا ئەبێتەوەو دەرئەکەوێ جیاوازی بۆچوونی موسڵمان لە بۆچوونی ناموسڵمان لە هەموو وڵاتو کاتو چەرخێکدا! بە هۆی ئەم بۆچوونە ئیسلامیەوە شوعەیب ئەو بەر لێ بڕینەوەی ئاڕاستەی گەلەکەی کردو جاڕی جیابوونەوەو بچڕانی خۆیدا لەو گەلەی کە لەوەوپێش یەکێبوو لەوان، بە هەڕەشەوە ئەو جاڕەیدا کە فەرمووی: ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ﴾ ئەی گەلەکەم کارو کردەوە بکەن لەسەر بارو حاڵەتی خۆتانو لەسەر ڕێگەی خۆتان بڕۆن بە پێی هێزو تواناتان ﴿إِنِّي عَٰمِلٞ﴾ بەڕاستی من کارو کردەوە ئەکەمو لەسەر بەرنامەو ڕێگەی خۆم ئەڕۆم بە پێی توانام، واتە کۆتایی ناهێنم لە بانگکردنتان بۆ خواپەرستیو فەرمان بەچاکەو جڵەوگیرییتان لە خراپە

سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَٰذِبٌ ۖ وَٱرْتَقِبُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ

﴿سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ﴾ بێگومان لەمەو پاش ئەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت کە ڕیسواو بێئابڕووی بکات. ﴿وَمَنْ هُوَ كَٰذِبٌ﴾ کێ کەسێکە درۆزنەو درۆئەکات، واتە ئەزانن‌و دەرئەکەوێ کە من یا ئێوە دووچاری ئەو سزایە ئەبێ؟ ئەزانن‌و دەرئەکەوێ کە کام لامان درۆزنە؟ ﴿وَٱرْتَقِبُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ چاوەڕوانی بکەن‌و چاودێریی ئەوە بکەن کە ڕوو ئەدات، بەڕاستی من چاوەڕوانی ئەکەم چاودێریی ئەوەم لەگەڵ ئێوەدا، بەو جۆرو شێوەیەو بەبێ‌باکی ئەوە هەڕەشەو ترساندنەی ئاڕاستە کردن، چونکە لە خۆیەوەو لە خۆڕایی قسەی نەئەکرد، بەڵکو لەسەر بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون بوو، بە هەموو دڵئارامییەوە قسەی ئەکرد، هەروەها بەو شێوەیە جاڕی جیا بوونەوەو بچڕانی تەواویدا لەنێوان خۆی‌و ئەواندا، کە ئەوە بەبێ یارمەتی‌و سەرخستن ناهێڵێ‌و دوژمنەکان سەر شۆڕو ڕیسوا ناکات. وەك بەدوای ئەوەدا هەواڵی ڕزگار بوون‌و سەرخستنی شوعەیب‌و بڕواداران ئەدا لەگەڵ هەواڵی سزادان‌و لەناو بردنی دوژمن‌و بێبڕواکانیش ئەدات‌و ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ کاتێ کارو فەرمانی ئێمە هات، واتە سزادانی ئەوانە یان فەرمانماندا بە سزادانیان، ﴿نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ شوعەیبمان ڕزگار کردو ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو لەگەڵ ﴿بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾ بە بەزەیی‌و میهرەبانییەکی تایبەتی لەلایەنمانەوە، ﴿وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ﴾ دەنگ‌و ڕیا هەڵشاخانە کە ئەوانەی گرت‌و داگیری کردن کە ستەمیان کردبوو، واتە هەموو بێبڕواکان کە ستەمکار بوون‌و گەورەترین ستەمیان بێبڕوایی بوو، ﴿فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾ بە هۆی ئەوەوە گەڕان بە مردووو بەسەر ڕوودا کەوتن لەوڵات‌و جێ‌و شوێنەکانیان، ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ﴾ وەك ئەوانە لەوەو بەر هیچ کاتێك نیشتەجێ نەبووین لەو جێ‌و شوێنانەدا،

أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ ۖ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾

---

﴿أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ﴾ بێداربن‌و ئاگادار بن كه یاخوا تایفەی مەدیەن دوور بن له بەزەیی‌و میهرەبانی خوا هەرچۆنێ تایفەی سەمود دوور بوون‌و دوور خرانەوە، یان بێداربن كه مەدیەن دوور خرانەوه‌و دووری بۆ ئەوان بوو به وێنەی تایفەی سەمود، ئینجا كۆتایی داستانەكانی ئەم سورەتە ئەهێنێ بەدەست نیشان كردن بۆ داستانی موسا لەگەڵ فیرعەون دا، لێرەدا دەست نیشان ئەكات به كورتی بۆ چەند ڕووداوو بەسەرهاتێك كه له شوێنەكانی تری ئەم داستانەدا باسی نەفەرمووە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا﴾ بەڕاستی موسامان نارد به بەڵگە‌و موعجیزەكانمانەوە كه ئەو نۆیەن له سورەتی ﴿الإسراء﴾دا باسی كردوون ﴿وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾ بەڕابەرو به نیشانەیەكی ڕوونەوە كه بریتییە لەو قسە ڕاست‌و ڕوونانەی كه لەكاتی لێكۆڵینەوه‌و وتووێژدا ئەیكردن، یان مەبەست دار دەستەكەیەتی كه یەكێكە لەو نۆیە، بەڵام بەتایبەتی باسی ئەفەرموێ، چونكه گەورەترینی هەموویانە‌و زۆر موعجیزەیەكی بەهێزه‌و دەسەڵاتدار بووە بەسەر هەست‌و هۆش‌و ژیرییدا، بەو ئایەت‌و موعجیزانە ڕەوانەمان كرد، ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِ﴾ بۆلای فیرعەون‌و كۆمەڵی پیاو ماقوڵەكانی كه نزیك بوون لێیەوه‌و جێگەی پرس‌و ڕای بوون‌و بڕیارەكانی فیرعەون ئەوان هەڵئەسان پێی ﴿فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ﴾ ئینجا ئەوانە شوێنی فەرمانی فیرعەون كەوتن‌و كۆتاییان نەهێناو هەر بەردەوام بوون لەسەر پەیڕەوی‌و شوێن كەوتنی فیرعەون ﴿وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ﴾ بێگومان كارو فەرمانی فیرعەون ڕاست‌و ڕەواو ڕوو لەخێرنەبوو، بەڵكو گومڕایی‌و لادان بوو لەڕێی ڕاست، ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ پێش گەل‌و كۆمەڵەكەی ئەكەوێ له ڕۆژی دوایی‌و زیندوو بوونەوەدا، ﴿فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ﴾ ئینجا بێگومان ئەیان خاتە ناو ئاگری دۆزەخ‌و خۆی

لەپێشیانەیە، یان مەبەست ئەوەیە هەر لەدنیادا خستنیە ناو ئاگر چونکە هەر لەگەڵ خنکان چوونە ناو ئاگر وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ﴾ بەیانی و ئێوارە ئەبرێنە سەر ئاگر ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِ﴾ لە ڕۆژی دواییدا ئەگێڕێنرێنەوە بۆ بەتین ترین سزا، ئینجا بۆ سزادانی دەروونیان بە لاقرتی پێکردنەوە ئەفەرموێ: ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡوِرۡدُ ٱلۡمَوۡرُودُ﴾ چونکە وتەی ﴿ٱلۡوِرۡدُ﴾ یان مەبەست ئەو بەشە ئاوەیە کە تینوو ئەچێت بۆی و پەلاماری ئەدات ئان شوێن و چوون و دابارینە بۆ خواردنەوەی ئاو، یان گەیشتنە بە ئاو لە شوێنەکەیدا ئیتر جۆگە یان حەوزەکانی، لەسەر هەربار بە لاقرتییەوە گەیشتنی ئەوانە و چونیان بەناو ئاگری دۆزەخ ناو ئەبات بە گەیشتنیان بۆ سەر ئاو و خواردنەوەی ئاو لەکانی و جۆگەدا، واتە بەد و خراپە ئەو ئاگرەی کە ئەوانە ئەچنە ناوی و دائەبارن بەسەریدا بەوێنەی چوونە سەر ئاوو داباری‌نی تینو بەسەریدا، بەڵێ بەڕاستی بەدو سەخت و سامناکە و لاقرتی پێکردنێکی دڵ تەزێنە، چونکە چوونە سەر ئاو بۆ نەهێشتنی گەمارو تینوی‌یەتییە، بەڵام چوونی ئەوانە بۆ سووتان و ئاگر تێبەردانە و برژاندنی دڵ و جگەرو ناو سکە ـ خوا پەنامان بدات ـ آمین ـ ﴿وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِۦ لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ نەفرین و لەعنەت ئەهێنرا بەدوای ئەوانەدا لەم دنیا و لە ڕۆژی دواییش یدا، واتە خوا کارێکی وای بە سەرهێنان کەلەم دنیایەدا لە پاش لەناوچوونیان خەڵکی هەر لەعنەت و نەفرینیان بەدوادا بنێرێ، لە ڕۆژی دواییشدا ئەهلی مەحشەر هەر نەفرین و لەعنەتیان لێبکات، کەواتە نەفرین و لەعنەت بوو بە شتێکی هەمیشەیی و نووسا پێیانەوە و بەشی ئەوانە هەر نەفرین و لەعنەتە، ئینجا بە لاقرتییەوە ئەفەرموێ: ﴿بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ﴾ زۆر بەدو خراپە ئەو کۆمەك و بەخشینەی ئەوان کە پێیان دراو بریتییە لەو نەفرین و لەعنەتە یان ئەو ئاگرەی کەکرا بەبەش و چارەنووسیان، بەڕاستی وتەو ڕستەکان زۆر سەخت و دڵ تەزێنەو بەڵام لاسایی ناکرێنەوەو وشەو واتاکانی ئێمە پڕ بە پڕیان ناگەیەنێ، ئینجا لەپاش ئەو داستانانە دەست ئەکات بە پەندو تەمێ و ئامۆژگاری کەلەو داستانانەوە وەرئەگیرێ بۆ ئەوەی خەڵکی تەمێ خوارین و بترسن لە سزای هەردوو جیهان کە ڕووی کردە ئەو گەلانەو ئەو ئوممەتانە بە هۆی لادانیان لە ئایین و بەرنامەی خوا،

ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ﴾ ئەوەی کە بۆمان باسکردی لەو داستانانەو لەو بەسەرهاتانە هێندێکە لە هەواڵە گرنگەکانی شارەکانی ڕابوردوو ئەیگێڕینەوەو ئەیخوێنینەوە بەسەرتدا لەم قورئانە یان لەم سورەتەدا ﴿مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ﴾ هێندێ لەو شارانە هەن‌و نیشانەو دروشمیان ئامادەیە وەك شارەکانی گەلەکەی صالح کە وەك کشتوکاڵێکن کە نیشانەی ئامادەیە، هێندێکیان نەماوەو نیشانەو دروشمیان بە تەواوی تێپەڕی کردووە لە وێنەی کشت‌و کاڵێك کە دروێنە کرابێت‌و هیچی نەمابێ وەك شارەکانی گەلەکەی لوط ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ﴾ ئێمە ستەممان لێ نەکردن، واتە بەبێ هۆو تاوان تۆڵەمان لێ نەسەندن ﴿وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾ بەڵکو خۆیان ستەمیانکرد لە خۆیان بە بت پەرستی‌و تاوان‌و کردەوەی بەدو خراپەکاری لە وڵاتداو کۆتایی نەهێنان هەتا بەهیچ جۆر هەقیان وەرنەگرت‌و خراپەیان هەڵبژارد بەسەر خێرو چاکەدا، هەرچەند ماوە بدرانایە خراپتر ئەبوون ﴿فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ ئینجا پەرستراوو بتەکانیان کە ئەیان پەرستن‌و هاواریان لێ ئەکردن‌و هەمیشەیی بوون لەسەر پەرستنیان بێجگە لە خواو لە پەرستنی ئەو تێپەڕیان ئەکرد بۆ پەرستنی ئەوان، ئەو بتانە هیچ بەرگری لێ نەکردن‌و سوودی هیچ شتێکیان پێ نەگەیاندن کاتێ سزاو فەرمانی پەروەردگارت هات ﴿وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ ئەو بتانە بێجگە لەزیانبار کردن هیچ شتێکی تریان فەراهەم نەهێناوەو زیادیان نەکرد بۆ ئەوانەی کە ئەیان پەرستن‌و بە تەمای فریاکەوتنیان بوون، واتە ئەو بت پەرستانە خۆیان بە هۆی بێبڕوایی‌و کردەوە لەدەکانیان زیان بار بوون، بە پشت بەستن‌و بە تەما بوونیان لەو بتانە ئێجگاری بێبڕواییەکەیان بە تین تر بوون‌و زیاتر زیانبار کران ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ﴾ بەو جۆرەو بەو وێنە یەگرتنی خوای تۆو تۆڵە سەندنی کاتێ کە شارەکان‌و دانیشتوانی شارەکان بگرێ‌و تۆڵەیان لێ بسێنێ لەکاتێکدا کە ئەو شارانە واتە دانیشتوانیان ستەمکارو بێبڕوابن،

إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾

﴿إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ بەڕاستی گرتن و تۆڵەسەندنی ئێش و ئازار دەرو بەتینەو چاوەڕوانی ڕزگاربوون ناکرێ لێی ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً﴾ بەڕاستی لەو گرتن و سزاو تۆڵەسەندنەدا هەیە یان لە گێڕانەوەی ئەو داستان و سەرگوزەشتانەدا نیشانەی گرنگ هەیە یان پەندو تەمێ و دەرس هەیە ﴿لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ بۆ کەسێك کە ترسا بێت و بترسێ لە سزای ڕۆژی دوایی، چونکە کە ئەو سزای ئەم دنیای بینی بێگومان ترس و سام ئەکەوێتە دڵیەوە بەهۆی ئەوەوە تەمێ خوار ئەبێ و خۆی ئەپارێزێ لەو شتانەی کە مایەی سزای ڕۆژی دواین، ئینجا دێتە سەر باسی هێندێ لە سیفەت و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ﴾ ئەو ڕۆژە دواییە ڕۆژێکە کە ئادەمی بۆ کۆئەکرێتەوەو کۆئەکرێنەوە لەو ڕۆژەدا، واتە کۆئەکرێنەوە بە زیندوویی بۆ حیساب و پرسیار، ﴿وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە هەمووان ئامادە ئەبن تێیدا، ئادەمی و جنۆکەو مەلائیکەو گیانلەبەرانی تریش ﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ﴾ ئەو ڕۆژە دوا ناخەین مەگەر لەبەر دوایی هاتنی ماوەیەکی ژمێرراوی دیارییکراو، واتە کاتی دیارییکراوی هەیەو ئەبێ هەر لەو کاتەدا بێت بەبێ کەم و زیاد، ئەو کاتەش تەنها خوا ئەیزانێ هیچکەسی ئاگادار نەکردووە بەسەریداو لە دەقی ئایەت و حەدیسدا هاتووە، ﴿يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ لەو کاتەدا کە ئەو ڕۆژە دێت هیچکەس قسە ناکات و دوو لێو ناکاتەوە مەگەر بە ئیزنی خوا، بێدەنگی و سام و بیم دێت و هەمووان داگیر ئەکات، هیچکەس ناتوانێ و زاتی نییە هیچ بڵێ و هیچ تکا

بكات مەگەر خوا ئیزن بدات بۆ هەر کەسێك کە خوا خۆی مەیلی هەبێ، ﴿فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ وَسَعِيدٞ﴾ ئینجا لەناو ئەوانەدا هەیە کەسێك کە بەد زمانەو سەخت گوزەرانەو بە پێی بڕیارو هەڕەشەی خوا شایستەیە بۆ سزای ئاگرو بە بێبڕوایی مردووە، لەناو ئەوانەدا هێندێ لەوانە خۆش بەختو کامەرانەو بە پێی بەڵێنی خوا بە بەهەشتی ئەبێو بە بڕواوە لە دنیا دەرچووە، ئیتر با سزا بدرێ لەسەر گوناهو تاوان، وەك لەم دوو ئایەتی داهاتووەدا شێوەو بەسەرهاتی هەردوو باس ئەکاتو ئەیانخاتە بەرچاو دەربارەی یەکەم ئەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ﴾ واتە ئینجا ئەوانەی کەلە دنیادا هۆی بەد بەختیو سەختی ژیانو گوزەرانیان بووەو لەزانینی خوادا تێپەڕی کردووە کە دوا ڕۆژیان بەو شێوە ئەبێ بەم جۆرە بە مەیلو خواهیشی خۆیان بێبڕواییو ستەمو تاوانیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا ﴿فَفِي ٱلنَّارِ﴾ ئەوانە لەناو ئاگردان، بەجۆرێ، ﴿لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ﴾ بۆیان هەیە لەو ئاگرەدا هاناسەدانو هەڵکێشان زۆر بە سەختیو توندی بە گیرانی قوڕگەوە وەك بارێکی قورسیان هەڵگیرتبێ، بەنکەو دەنگێکی ناخۆشی وەك یەکەم جاری زەڕینی گوێ درێژ، ﴿وَشَهِيقٌ﴾ بۆیان هەیە گێڕانەوەی هەناسەیان سەختیو بە درێژە پێدان تا دەنگێکی ناخۆشی لێ پەیدا ئەبێ وەك دوا دوایی دەنگی زڕەی گوێ درێژ، لەم فەرموودەدا هەرچۆنێ ئەوپەڕی سەختیو نارەحەتی نیشان ئەدات هەروەها ڕیسواو بێ ئابڕووشیان ئەکات ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ﴾ لەکاتێکدا ئەمێننەوە لەو ئاگرەداو هەمیشەیی ئەبن هەتا ئاسمانەکانو زەوی بێو لەماوەی بوونو مانەوەی ئەواندا، ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ﴾ مەگەر ئەو کاتو ماوەی کە پەروەردگارت ویستبێتی نەبوونیان، ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت بەکارێکی بەدی هێنەرو بەجێهێنەرە بۆ ئەوەی کەبیەوێو مەیلی بێ، مەیلو خواهیشی خوا شوێنی زانینو لێزانیو کاردروستی خوا ئەکەوێ، کەواتە هەرچی ئەو ویستی هەر ئەوە ئەبێ،

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ

**﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ﴾ ئەوانەی کە خۆش بەختکراون بەم ڕەنگە ڕێگەی بڕواو کردەوەی چاکیان داوەتە بەر لەدنیادا ﴿فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانە وان لە بەهەشت دا ئەمێننەوە، ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ هەتا ئاسمانەکان و زەوی ببن ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾ مەگەر ئەوەی کە پەروەردگارت ویستبێتی ﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ ئەوەیان پێ ئەبەخشرێ بە نەبڕاوەیی و بێ دواهاتن وبەهەمیشەیی وبێ بچڕاندن، لەم دووئایەتەداگرێ وقسەوباس هەیە، ئەوەش ئەمەیە:**

**بوون و مانەوەی دۆزەخ و بەهەشتی بەستووە بە بوون و مانەوەی ئاسمانەکان و زەوی یەوە، لەگەڵ ئەوەدا بوون و مانەوە لە بەهەشت و دۆزەخدا نەبڕاوەیەو مانەوەی ئەم زەوی و ئاسمانانە بڕاوەیەو ئەبێ نەمێنن، هەروەها لە هەردوو ئایەتەکەدا ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾ کە ئەمەش وا نیشان ئەدات بوون لە دۆزەخ و بەهەشتدا هەمیشەیی و هەموو کات نییە، بۆ نەهێشتنی ئەم گرێیە زانایانی تەفسیر وەڵامیانداوەتەوە لە نێوان ئەوانەدا دوانیان ئەهێنم کە بەلامەوە بە هێز ترینی هەموویانە:**

**١- مەبەست بە وتەی ﴿مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ نەبڕاوەو هەمیشەییە، ئەوەش بە پێی باوی عەرەب کە ئەم جۆرە وتانە بەکار ئەهێنن بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە، وێنەی ئەوە چەند وتەیەکی تر هەیە بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە، وەك ئەوەی ئەڵێن: ئەو کارەناکەم تا ئەستێرە دەرنەکەوێ، یا تا شەبەق ڕووناکی ببێ، یان تا شەوو ڕۆژ بەدوای یەك دابێن، هەروەها چەند وتەی تر هەیە.**

**٢- مەبەست بە ئاسمان و زەوی تەنها ئاسمان و زەوی ئەم دنیایە نییە، بەڵکو مەبەست بە ئاسمان ئەوەیە کە وا بەلای سەرەوە، مەبەست بە زەوی ئەوەی کە وا بەلای خوارەوەو خەڵکی وا بەسەرییەوە، ئیتر ئاسمان و زەوی ئەم دنیا یان ئاسمان و زەوی ڕۆژی دوایی کە ئەبێ لەوێش هەر ئاسمان و زەوی هەبێ ئیتر با جیاواز بێ لەگەڵ ئەوەی ئەم دنیایە**

وەك دەست نیشان هەیە بۆ ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴾ لەسەر هەر بار وتەی ﴿إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾ بۆ گەیاندنی گشتێتیو زاڵی مەیلو ویستو ئیرادەی خوایە بۆ هەموو كارێو هەموو شتێو بەر بەرەڵایی مەیلی ئەوە، وەك لە چەند شوێنێكدا ئەو وتەیە هاتووە بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە، وەك ڕستەی ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ دەست نیشانی تێدایە بۆ ئەوە، واتە ئەو هەمیشەییو بەردەوامی هەیە بۆ دۆزەخیو بەهەشتییەكان، مەگەر خوا ئەوەی نەویستبێ، واتە هیچ بەرگری كەرێك نییە بێجگە لە مەیلو ئیرادەی خواو مەیلو ئیرادەی خوایش بەوە هاتووە كە بوونی ئەوانە هەمیشەیی بێت، هەركەس ئەیەوێ با تەماشای هێندێ لە كتێبە درێژەكان بكات وەك تەفسیری (روح المعاني) یان تەفسیری (الفتوحات الإلهیة) كە ئەم دوو تەفسیرە زۆرنو بە ئاسانی دەست ئەكەون، لەپاش ئەو تێهەڵكێشەی كە هێنای لەبارەی چارەنووسو دوا ڕۆژی خەڵكی لەو دنیا.

لەپاش ئەوە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو كۆمەڵە بڕوادارە بۆ دڵ ئارام كردنیانو بەهێزكردنی دڵیان، هەروەها ئەگەڕێتەوە سەر بێبڕواكان بۆ تەمێو ترساندنیان ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ واتە كاتێ كاری ئەو ئوممەتانە لەدنیاو لە ڕۆژی دواییدا بەو جۆرە بوو كە باسمانكرد بۆت، كەواتە بەهیچ جۆر گومانو دوو دڵیەكت نەبێ لەوەی كە ئەوانەی گەلەكەت ئەیان پەرستنو ئەو بتە پەرستراوانەیان، هیچ گومانت نەبێ لە گومڕایی ئەوانەو بێ نرخی ئەو پەرستنو پەرستراوانە، ئەو پەرستنی ئەمانەو دوا ڕۆژو سەرەنجامیان بەد بەختییە لە هەردوو دنیادا وەك پەرستنو پەرستراوەكانی ئەو گەلانەی ڕابوردوو، وەك دەست نیشان ئەكات بۆ ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ ﴾ ئەمانەی گەلەكەی تر ناپەرستنو پەرستنیان نییە مەگەر وێنەی ئەو بتانەی كە باو باپیریان ئەیانپەرستن لەمەو پێش، پێمان ڕاگەیاندی هەواڵی ئەوانەو بەسەرهاتیانمان بۆ باسكردی، كەواتە بەشو دواڕۆژی ئەمانیش هەر وەك ئەوانە،

وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾

---

﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ﴾ بەڕاستی ئێمە بەشی خۆیانیان پێئەدەین بە تەواوی، بەبێ ئەوەی کەم و کوڕی کرابێ و بکرێ، بەشی خۆیان لە سزا یان بەشی خۆیان لە پاداشت ئیتر چاك یان خراپ، بەڵام پاداشتی کرەوە چاکەکانیان لەم دنیایە ئەدرێتەوە بە تەندروستی و سامان و ڕۆزی و هەر خۆشییەکی ئەم دنیایە، ئەگەر مەبەست بە سزا بێت ئەوا شتێکی ناسراو و بەناوبانگە لە داستانەکانی گەلە ڕابردووەکان چەند وێنەو نموونەیەکی بۆ باسکرد ئیتر سزای لەناوبردن و لەڕیشە هێنان، یان سزای تر ئەوەش وەك سزای گەلەکەی موسا کە دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ بەڕاستی بەخشیمان بە موسا نامەیەك کە تەوراتە، ﴿فَٱخْتُلِفَ فِيهِ﴾ ئینجا دووبەرەکی تێدا کرا وەك لە حەدیسدا هاتووە کە بوون بە حەفتاو یەك کۆمەڵ و تاقم لەوانە هەموویان لایانداو بەش و چارەنووسیان دۆزەخە بێجگە لە یەکێکیان ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەگەر لەبەر وتەو بڕیارێك نەبووایە کە لە لایەن پەروەردگارتەوە پێشکەوت و دەرچوو، واتە دواخستنی بڕیاری سزایان، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە بڕیار ئەدرا لەنێوانیاندا، واتە ئەوانەی کە ئەو دووبەرەکییەیان فەراهەم هێنا لەناومان ئەبردن و لەڕیشەمان ئەهێنان و دواییمان پێئەهێنان، ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ بەڕاستی ئەوانە لە گومان و دوودڵیەکدا بوون کە دوودڵ و بێئارامی کردبوون. ئەو بڕیاری لەناو نەبردن و لەڕیشە نەهێنانەکاردروستیەکی گەورەی تێدایە، چونکە تەورات و ئینجیل دوو نامەی تێرو تەواو بوون و مانەوە تا دواترین نامە هات و هۆی ڕێنموونی بوون تا هاتنی قورئان کە دوا نامەیە بانگی هەموو ئادەمیی بۆ ئەکرێ، بە شوێنکەوتووەکانی ئەو دوو نامەیشەوە لەبەر ئەوەی تەورات لەپاش چەند ماوەیەکی درێژ نوسرایەوەو چەند ڕیوایەتێکی تێکەڵ و پێکەڵی تێکەوت، گومان و دوودڵیەکی بەتین پەیدا بوو تیایدا لەلایەن شوێن کەوتووەکانیەوە تا قورئان بارە ڕاستەکەی هێناو ڕوونی کردەوە بۆیان، ئینجا وەك سزای لە ڕیشەهێنانی لەسەر لابردن هەروا لێیان ناگەڕێ، بەڵکو پاداشت و سەرەنجامی کردەوەکانیان پێ ئەگەیەنێ چ چاك چ خراپ،

﴿وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ۚ﴾

**وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ ئەم ئایەتە بەم جۆرانە خوێنراوەتەوە:**

**١- وإن كلاً لَمَا.**

**٢- وانَّ كلا لَما.**

**٣- وإن كلا لمَّا.**

**٤- وانَّ كلا لمَّا.**

**لەسەر خوێندنەوەی یەك‌و دوو واتە سوێند بە خوا هەموو دووبەرەكی كەران یان هەموو كەس پەروەردگارت جەزاو پاداشتی كردەوەكانیان بە تەواوی جێبەجێ ئەكات‌و پێیان ئەگەیەنێ‌و بەم جۆرە هیچ قورت‌و گرێیەك ناكەوێتە دڵ‌و واتاو مەبەستەكە وەرئەگیرێ، هەروەها لەسەر خوێندنەوەی سێیەم (إن) بۆ نەفیە (لما) بە مەعنای (إلا)یە واتە هیچكام‌و هیچكەس نییە مەگەر پەروەردگارت پاداشتی كردەوەكانیان پێئەگەیەنێ، بەڵام لەسەر خوێندنەوەی چوارەم گرێی تێدایەو جێی لێكۆڵینەوەی زانایانەو بە چەند جۆرێك ویستوویانە كردنەوەی ئەو گرێیە، لەبەر درێژە پێنەدان ئەو باس‌و لێكۆڵینەوەم نەكردو هەركەس ئەیەوێ با تەماشای هێندێ لە كتێبە گەورەكان بكات، یەكێ لەوانە تەفسیری (روح المعاني). ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ بەهێز كردن‌و دڵنیا كردن لەسەر مەبەستی ئایەتەكە بەمەی كە كۆتایی ئەهێنێ بەمەی كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ بە ڕاستی پەروەردگارت ئاگاو با خەبەرە بە هەر كردەوەیەك كە ئەوانە ئەیكەن، بە ڕاستی كاتەكە ئەوەندە سەخت بووە پێویستی ئەكرد بەم هەموو بەڵێن‌و دڵنیا كردنانە، لەو كاتەدا بە یەك جار قورەیش بە هەموو چەكێكەوە وەستان بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو كۆمەڵە كەم‌و بێدەسەڵاتە، بە جۆرێ بانگ‌و بانگەوازەكەیان وەك وەستاوی لێهات، ئەو سزای كە**

هەرەشەی پێئەکرا لێیان بەی نەهاتبوو، سزاو ئازار پەیتا پەیتا ڕووی ئەکردە بڕواداران، دوژمنانیان بە کەشخەو خۆشیەوە ئەسوڕانەوە، بە ڕاستی کاتو ماوەیەك بوو کە هێندێ لە دڵانی هێنایە لەرزە، تەنانەت دڵە دامەزراوەکانیش تەنگیو بێتاقەتی ڕووی تێکردن، کەواتە پێویست بوون بەم هەموو دامەزراندنو دڵخۆشی دانەوە، کەواتە پێویستە لەسەر شوێن کەوتووەکانیان تا ڕۆژی دوایی دەرسو تەمێ وەرگرن لە بەسەرهاتەکانی ئەوان.

ئەو هەموو باسو دڵنیا کردنە وا نیشان ئەدەن کە باوو ڕەوشتی خوا کە دەست نیشانیان بۆ کرا، باوێکی نەگۆڕاوە دەربارەی بەنەکانیو ئایینەکەی، کەواتە ڕێگەی بڕواداران هەر خۆگریو دامەزراویە، کەواتە بەبێزیادو کەم با ڕێگە ڕاستەکەی خۆیان بدەنە بەر، گوێیان نەبێ لە بێبڕوایان هەرچەندە هێزو دەسەڵاتیان هەبێ، دڵیان نەرمو مەیل دار نەبێ بۆیان، بەردەوام بن لەسەر نوێژو باوەریان بە خوا، خۆگربن، وەك فەرمان ئەدا لەم ئایەتەداو ئەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾ واتە ماتوڵ کاری ئەو گەلو ئوممەتانە بەو جۆرە بوو کە باسمانکرد بۆت کەواتە ئەی پێغەمبەر بەڕێكو ڕاستی دامەزراوبە هەرچۆن فەرمانت پێدراوە، بەبێزیادە ڕەویو کەمو کوڕیو ئەو ڕێگە ڕاستە بدەنەبەر کە لەم قورئانەدا پێت سپێرراوە بەبێ لادانو دووبەرەکی، با ڕێكو ڕاستو دامەزراوبن لەگەڵ تۆدا ئەوانەش کە تۆبەیان کردووەو گەڕاونەتەوە لەنافەرمانی ﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ﴾ لامەدەن لەوەی بۆتان دیاریی کراوە، نەبەزیاد نەبەکەمو کوڕی کە ئەوەیە ناوەڕاستی ڕێگەی ڕاستو بە هەر باڕوا دەرئەچێ، لە ڕاستیدا پارێزگاری ئەو بارو حاڵە زۆر گرانەو پێویستی هەیە بە وریاییو خۆپارێزیو چاودێرییەکی هەمیشەیی، هێندێ ئەفەموون: مەبەست بە وتەی ﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ﴾ جڵەوگیرییە لەزیادە ڕەویو لە سنوور دەرچوون، چونکە فەرماندان بە دامەزراویو میانەییو فەرماندان بەوریایی خۆپارێزی لەوانەیە بەندە ڕاکێشێ بۆ زیادە ڕەوی لەترسی خۆپارێزی لەکەمو کوڕی، کە ئەم زیادەڕەوییەش وەك کەمو کوڕی ناڕەوایەو لەگەڵ سووكو ئاسانی ئەم ئایینەدا یەك ناکەوێو دژی ئەو میانەییە کە ئەم ئایینە پێکهاتووە، بەڕاستی ئەم ڕایەم زۆر بەلاوە پەسەند ترە، هەرچەند زۆر لەزانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەیە کە کردم بە تەفسیری،

إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٥﴾ فَلَوۡلَا كَانَ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِن قَبۡلِكُمۡ أُوْلُواْ بَقِيَّةٖ

---

لەسەر هەربار ئەوا دڵنیایی ئەکات و بەندەیان ئەترسێنێ لەلادان بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ بەڕاستی خوا بینایە بە هەر کردەوەیەك کە ئەیکەن، کەواتە ئەبێ خۆپارێزیی بکرێ لەلادان، ئیتر بە کەم و کوڕی یان بەزیادە ڕەوی ﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾ باکەمترین مەیلی دڵتان نەبێ بۆ لای ئەوانەی کە ستەمیان کردووە، واتە بت پەرست و هاوبەش ڕەوادەران وەك لە (ئیبن و عەباس)ەوە ڕیوایەتکراوە. یا ئەو یاخی و سەرکێشانە کە خاوەن هێز و دەسەڵاتن و بەزۆر بەندەیانی خوا لائەدەن لە بەندەیی بۆ خوا و ئەیانگێڕن بە بەندەی خۆیان، ئەوانە مەکەن بە پاڵپشت بۆ خۆتان و پشتیان پێ‌ببەستن، لەسەر هەربار نابێ خۆش ویستنیان لە دڵی بڕواداراندا بێ و چاکەیان لەگەڵ بکرێ و ڕێزیان لێ بگیرێ و بێدەنگ بن لە خراپەیان مەگەر لەکاتێکدا هیچ دەسەڵات نەبێ، بەو جۆرە نەبن لەگەڵ ئەوانە ﴿فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾ تا بە هۆی ئەوەوە ئاگری دۆزەخ دووچارتان ببێ و بتانسوتێنێ، واتە ئەگەر بەو جۆرە بن لەگەڵیان ئاگری دۆزەخ ئەتانسوتێنێ، ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ نابێ و نییە بۆتان بێجگە لە خوا هیچ یارمەتی دەرانێ کە بەرگری ئەو سزا و ئاگرەتان لێ بکات، ﴿ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو یارمەتی نارێن و بە هیچ هۆیەك بەگریتان لێناکرێ لەلایەن خواوە، چونکە ئەو کەسەی کە مەیلی دڵی ببێ بۆلای ئەو دوژمنانی خوا ئەچێتە ڕیزی ئەوان و خوایش بە هیچ جۆر یارمەتی ئەوانە نادات، کەواتە چارەنووس و دوا ڕۆژی ئەوانە هەر بەش بڕاوییە لە بەزەیی خوا، لەم بابەتە و لەوێنەی ئەم ئایەتە زۆر هاتووە لە قورئاندا، بە ڕاستی کارەکە زۆر سەخت و سامناکە و ئەگەر خوا یارمەتی نەدات زۆر کەس لەم مەسەلەدا ماڵ وێران ئەبێ و تیا ئەچێ، مەگەر یادی خوا

پەیوەستی دڵی بە خواوە بە هەمیشەیی بەندە بپارێزێ و ڕزگار بکات، گەورەترین یادو پەیوەندیو پەیوەستی دڵ بە خواوە بە نوێژ پێکدێت لەبەر ئەوە ئەوا فەرمانمان پێئەدات بە نوێژو دەست نیشان ئەکات بەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ﴾ نوێژ بەرپێك و ڕاستی بەجێبێنە لەم سەرو ئەو سەری هەردوو تەرەفی ڕۆژدا، ئەم دوو تەرەفە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە، ئەوەی لە لادا جێگیر ترە ئەمەیە مەبەست بەیانیو لای ئێوارەیە، نوێژ بەرپێك و ڕاستی بەجێبێنە لە چەند سات و بەشێك لەشەو کەکاتی شێوانەو مەغریب و عیشا ئەگرێتەوە کەواتە لەم ئایەتەدا دەست نیشان هەیە بە هەر پێنج فەرزەکە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بە هۆی ئەم فەرمانە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ﴾ بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردەوە بەدەکان لائەبات و ئەیان سڕێتەوە واتە نوێژ بەجێ بێنە، چونکە چاکەکان... هتد، مەبەست بە کردەوە چاکەکان تەنها نوێژ نییە وەك زۆر لەزانایانی تەفسیر فەرموویانە، بەڵکو بە شێوەی گشتی مەبەستەو دیارە سەرۆکی کردەوە چاکەکان نوێژە، کەواتە لێرەدا یەکەم مەبەستە. ﴿ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾ ئەوەی کە باسکرا لە فەرمان و جڵەوگیریی پەندو ئامۆژگارییەو بیر خستنەوەیە بۆ ئامۆژگاری وەرگران و بیر کەرەوەکان، هەرچەند ئەمانە پەندو ئامۆژگارین بۆ هەموو کەس، بەڵام هەر ئامۆژگاری وەرگیران و بیر کەرەوەکان، سوودی لێ وەرئەگرن لەبەر ئەوە تایبەتی کرد پێیانەوە، بێگومان فەرمانبەری ئەو فەرمان و جڵەوگیرییانە پێویستە بە خۆگری هەیە لەبەر ئەوە لە کۆتاییدا ئەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ﴾ خۆگربەو بەردەوام بە لەسەر خۆگری، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ چونکە بەڕاستی خوا پاداشت و ئەجری چاکەکەران زایە ناکات، واتە بە تێرو تەواوی ئەجرو پاداشتیان ئەداتەوەو بەزیادیشەوە کە لای خوارووی یەك بە دەیە.

ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر ئەو شارو دانیشتوانەی لەناو بران و لەڕیشەهێنران، دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو هۆی لەناو بردن و لە ڕیشە هێنانە، ئەفەرموێ: ﴿فَلَوۡلَا كَانَ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِن قَبۡلِكُمۡ أُوْلُواْ بَقِيَّةٖ﴾ دەی با ببوایە و کاشکێ ببوایە لەناو ئەو گەل و ئوممەتانەی کە لەپێش ئێوەدا بوون کە لەناومان بردن بەهۆی تاوان و خراپەکارییەوە یا ببوایە لەناو ئەوانەدا کەسانێ کە خاوەن فام و ژیریی و کردەوەی چاك بوونایە لەکاتێکدا

يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡفَسَادِ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّنۡ أَنجَيۡنَا مِنۡهُمۡۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ ﴿١١٧﴾ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمۡۗ

---

﴿يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡفَسَادِ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ جڵەوگیرییان بکردایە لە بێبڕوایی و خراپەکاریی لەوڵاتدا، واتە ئەو کەسانە نەبوون ... بەهۆی ئەوەوە ئەو گەلانەمان لەناو نەبردایە، چونکە باوی ئێمە وا هاتووە کە کاتێ تاوان و بێبڕوایی و خراپەکاری وڵاتی داگیر کردبێ و جڵەوگیریی نەکرابن، ئێمە ئەو گەل و ئوممەتانەمان لەناو بردووە، دەی لەو گەلانەدا کەسانێ نەبوون کە ئەو بەگری و جڵەوگیرییە بکەن ﴿إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّنۡ أَنجَيۡنَا مِنۡهُمۡۗ﴾ مەگەر کەمێك کە ئەوانەن ڕزگارمان کرد لەناو ئەو گەلانەدا، یان مەبەست ئەوەیە: ئەو کەسانە نەبوون کە بتوانن ئەو جڵەوگیرییە بکەن لەبەر ئەوە ئەو گەلانەمان لەناو بر، بەڵام کەمێك لەوانە هەبوو کە ئەوانەن ڕزگارمان کردن، ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا بوون و بێدەسەڵات بوون و گوێیان پێنەئەدرا، ﴿وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ﴾ ئەوانەی کە ستەمیانکرد بەمەی جڵەوگیرییان نەکرد لە بێبڕوایی و خراپەکاری، ئەوانە شوێنی ئەو نازو نیعمەتە کەوتن کە بە زۆری و لێشاو تێی خرابوون و پێیان درابوو، واتە سەریان کردە ئەو خۆشی و نازو ڕێزەو نەگەڕانەوە بۆ ڕێگەی ڕاست، ﴿وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ﴾ ئەوانە تاوانبار بوون و بە هەمیشەیی خەریکی تاوان و خراپەبوون، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ باوی خوا لەهۆی لەناو بردنی گەلان و لەهۆی ڕزگار کردنیان، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ﴾ باوو ڕەوشتی پەروەردگارت وا نەبووە و کاری بەو جۆرە نەهاتووە کە گەلان و دانیشتوانی شارو وڵاتان لەناو بەرێ بە هۆی بت پەرستی و بێبڕوایی و ستەمەوە لە کاتێکدا کە دانیشتوانیان لەناو خۆیاندا چاکەکارو باش بوو بوون دەربارەی یەکرت، یان لەکاتێکدا کە دانیشتوانیان بێدەنگ نەبوون لەو تاوان و خراپەیە، بەڵکو هەوڵ و تێکۆشانیان کردبێ بۆ بەرگری و نەهێشتنی، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك ڕانەپەڕیبێ بۆ بەر بەست و بەرگریان هەستابن بەڵام بەو جۆرە نەبوون کەکار بکەن و گۆڕانکاری بکەن لەوڵاتدا، ئەوکاتە خوا یان لە ڕیشەی هێناون و لەناوی بردوون یان لەکاری خستبوون و بە گەل و ئوممەتی نەهێشتوونەتەوە، کەواتە ئەو بەرگری کەرانە هەرچۆنێ هەستاون بە پێویستی سەرشانیان بەرامبەر بە خواو بە ئایینەکەیان،

هەروەها فریای گەلەکەنیان کەوتوون و پاراستوونیان لە خەشم و غەزەبی خوا. ئەم ئایەتە بە جۆرێکی تریش تەفسیری کراوەتەوە بەڵام بەڕاستی بە لامەوە زۆر بێهێزو لاوازە لەبەرئەوە باسم نەکرد، ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ ئەگەر پەروەردگارت مەیلی بوایەو بیویستایە هەموو ئادەمی ئەگێڕابە یەك ئوممەت و هەموو کۆئەبوونەوە لەسەر یەك ئایین و بیروباوەڕ، بەڵام وای نەویست، بەڵکو بە جۆرێکی دروستکردن کە دەست ئەدەن بۆ ڕێنموونی و گومڕایی بە مەیل و خواهیشی خۆیان، هەر بارێك هەڵبژێرن و هەر کەس سەرەنجامی کردەوەی خۆی بگرێتە گەردن، خوا ویستی ئەم ئادەمی‌یە بەو جۆرە دروست بکات، کەواتە بە پێی ئەوە ئەبێ دووبەرەکی بن، ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ هەمیشە دووبەرەکیش ئەبن بەم ڕەنگە هێندێ لەسەر هەق و هێندێ لەسەر ناهەق، وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ -خوا لێیان ڕازی بێ- ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ﴾ مەگەر کەسێك کە پەروەردگارت میهرەبانی پێکردبێ، واتە خوا ویستی ئەم ئادەمییە یەك ئوممەت نەبن بەم جۆرە هەرکەس بتوانێ و سەربەست بێ لە هەڵبژاردنی ڕێگەی خۆی، ئەوەش داخوازە بۆ ئەوەی دووبەرەکی بن تەنانەت لە عەقیدەو بیروباوەڕدا، مەگەر ئەوانەی کە میهرەبانی خوا فریایان کەوتبێ بە هۆی ئەوەوە ڕێنموونیان وەرگرتبێ و ڕێی هەق و ڕاستیان دابێتەبەرو دووبەرەکیان تێدا نەکردبێ و یەك بارو یەك بیروباوەڕ بووبن لەو ڕێگە ڕاستەدا ئیتر با ناڕێك و دووبەرەکی بن لەگەڵ ئەو گومڕایانەدا، ﴿وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ هەر لەبەر ئەوەش دروستی کردوون، ئەو دووبەرەکی و میهرەبانی پێکردنە وەك (ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ -خوا لێیان ڕازی بێ- واتە کردوونی بەدوو دەستە: دەستەی میهرەبانی پێکراو، کەواتە دوو بەرەکی نابن لەبڕوا و عەقیدەدا، دەستەی میهرەبانی پێ‌نەکراو، کەواتە دوو بەرەکی ئەبن، وەك لەئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ﴾ واتە دروستکردنەکەیان دوا ڕۆژو سەرەنجامی ئەوە بوون کە بوون بە دوو دەستە، (موجاهید و عیکریمە) ئەفەرموون: وتەی ﴿وَلِذَٰلِكَ﴾ دەست نیشانە بۆ میهرەبانی پێکردن، (حسن و عطا) ئەفەرموون: دەست نیشانە بۆ هەردوو بەرەکە، لەسەر ئەم ڕایەش ئەبێ بڵێین: دروستکردنەکەیان سەری لەو دووبەرەکییەوە دەرچوو،کەواتەلەسەر ڕای یەکەم و ئەم ڕایە پیتی (ل) بۆ عاقیبەتەو لەسەر ڕای دووەم بۆ هۆیە، بێجگەلەم ڕایانە چەند ڕای تریش هەیە لە تەفسیری ئەم ئایەتەداو پێویست نییە باسکردنیان،دیارەئەوانی بەری ئەومیهرەبانییەکەوتبن بەپێی بەڵێنی خوادواڕۆژوچارەنووسیان بەهەشتە، وەك دواڕۆژوچارەنووسی ئەوانەی کەلائەدەن لەڕێگەی ڕاست و دژی هەقن،

وَتَمَّتۡ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَقُّ وَمَوۡعِظَةٞ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾

---

**بریتییه لەدۆزەخ بە پێی بڕیاری خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَةُ رَبِّكَ﴾ وتەو بڕیاری پەروەردگارت تەواو بوو دەربارەی ئەوانەی كە ڕێنموونی وەرناگرنو دژی هەقن، وتەو بڕیارەكەش ئەمەیە: ﴿لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ﴾ سوێند بە خوا دۆزەخ پڕ یەكەم لە جنو لە ئادەمی هەموو پێكەوە ـ خوا پەنامان بدات بە میهرەبانی خۆی ـ.**

**ئینجا لە دوایی سورەتەكەدا ڕووی فەرمووده ئەكاتە پێغەمبەر (ﷺ)و هۆی گێڕانەوەی ئەو داستانانەی بۆ باس ئەكاتو ئەفەرموێ: ﴿وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ﴾ ئەی پێغەمبەر هەواڵت ئەدەینیو بۆت ئەگێڕینەوە بە ڕێكی هەموو جۆرێك لە هەواڵە گرنگەكانی فروستادەكان، ئەو هەواڵەی كە دڵی تۆی پێ بەهێزو دامەزراو بكەین ﴿وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَقُّ﴾ هاتووە بۆت لەم سورەتەدا ئەوەی كە ڕاستو هەقە لە بارەی بانگو بانگەوازەكەتەوە، بەسەرهاتو داستانی ئەو فروستادانەوە، لە بارەی باوو ڕەوشتی خوا لەناو ئەو گەلو ئوممەتانەدا، لەبارەی ڕاستیو بەدی هاتنی موژدەو هەڕەشەكانی خواوە، ﴿وَمَوۡعِظَةٞ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ هاتووە بۆت ئامۆژگاریو بیرخستنەوەو یادو بیرەوەری بۆ بڕواداران كە بەوە پەندو تەمێ وەرگرن لە پێشووەكانەوە، بەڵام ئەوانەی كە بڕوایان نییەو پەندو ئامۆژگارییەو پەندو ئامۆژگاریو بیرخستنەوە كاریان تێناكات، بەڵكو ئەوانە ئەبێ هەڕەشەیان لێ بكرێو جاڕی بڕانو جیا بوونەوەی تەواویان ئاڕاستە بكرێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقُل﴾ بڵێ: ﴿لِّلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەوانەی كە بڕوا ناهێنن ﴿ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ﴾ كارو كردەوە بكەن لەسەر بارو حاڵی خۆتان كەوان لەسەری ﴿إِنَّا عَٰمِلُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە لەسەر بارو حاڵی خۆمان كارو كردەوە ئەكەینو بەردەوام ئەبین لەسەری**

وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ كُلُّهُۥ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

---

﴿ وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴾ چاوەڕوانی بکەن بۆ ڕووداوو بەسەرهاتی خراپ کە بەسەر ئێمە بێت وەك خۆتان بەتەمان، بەڕاستی ئێمە چاوەڕوانین بۆ سزاو بەسەرهاتی خراپ بۆتان بە وێنەی بەسەرهاتو سزای گەلە پێشووەکانی وێنەی خۆتان، ئەوەش شتێکی نهێنیو غەیبی تەنها خوا خۆی ئەزانێ کەی ئەبێ، ﴿وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ تەنها بۆ خوایەو بەدەست خوایە غەیبو نیهێنیەکانی ئاسمانەکانو زەوی، ﴿وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ كُلُّهُۥ﴾ هەر بۆ لای ئەو ئەگێڕێتەوە کاروبار هەمووی ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ﴾ کەواتە ئەو بپەرستەو پشت بەو ببەستەو کاروباری خۆت حەوالەی ئەو بکە، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ بێگومان پەروەردگارت بێئاگا نییە لە هەر کردەوەیەك کە ئێوە ئەکەین.

ئا بەو جۆرە ئەم سورەتە دوایی پێهێنرا، ئەم سورەتەی کە دەستی پێکرا بە تاكو تەنیایی خوا لە پەرستندا، بە گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەو تۆبە کردن بۆلایو گەڕانەوە بۆ لای لەدوا ڕۆژدا، دوایی پێهێنرا بەوەی کە دەستی پێکرا، ئەوەش لەپاش گەردشو خولانەوەیەکی درێژ لەناوچەکانی بوونەوەرو دەروونو ڕووداوو بەسەرهاتەکانی گەلەکانی ڕابوردوو، کەواتە ئەوپەڕی ڕێكو پێکیو هاوکاری هەیە لە نێوان یەکەم جارو سەرەتای سورەتەکە لەگەڵ دوا دواییو کۆتایی پێهێنانەدا، هەرچۆنێ ئەو ڕێكو پێکیو هاوکاری سەرەتاو دوا دواییە هەیە لەگەڵ داستانو مەبەست لەهێنانیدا داستانەکان، ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە خاوەنو نێرەری ئەم قورئانە تەنها خوایە، ئەگەر وا نەبوایەهەرگیزبەو نەئەهات، پاکیو بێگەردی بۆنێرەری قورئانو بۆقورئانەبێوێنەکەی.

## سوورەتی ﴿یوسف﴾
## مەککەییەو (١١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

دوایی هات سورەتی ﴿هود﴾و ئینجا سورەتی ﴿یوسف﴾ دێت کەلە هاتنە خوارەوەشیدا لەپاش ﴿هود﴾ هاتووەو وەك ئەو مەککەییەو لەو کاتە سەختو تەنگەدا هاتووە کە سورەتی ﴿یونس﴾و ﴿هود﴾یان تێدا هاتە خوارەوە، ئەم سورەتە سەدو یازدە ئایەتەو سەرەتاکەشی وەك سەرەتای سورەتی ﴿یونس﴾ وایە، بێجگە لەوەی یەکەم ئایەتی بە وتەی (الحکیم) دوایی پێ‌ئەهێنێ، یەکەمی ئەم بە وتەی (المبین) ئەوەش بە جێگەو شوێنەکەیە، مەبەستی سەرەکی لەسورەتی ﴿یونس﴾دا ئەسڵو بناغەی ئایینەو باسی خوایەتی و سروشو پەیامو زیندوو بوونەوەو حیسابو پرسیارەکە ئەوەش ئەوپەڕی لێزانی و کاردروستییە، مەبەستی سەرەکی لێرەدا پێغەمبەرێك کە چەند ڕووداوو بەسەرهاتی نایابی بەسەر هاتووەو لە هەموو کارەکانیدا پێشەواو پەیڕەوی کراوێکی گرنگ بووە، کەواتە باسو ڕوونکردنەوە لەوێدا پێویستە. ئەم سورەتە کە سەرتابەخواری داستانی ئەو پێغەمبەرەیە (علیه السلام)، ئەو داستانەش چەند بەسەرهاتو ڕووداووی تێدایە کە هەمووی تاقیکردنەوە بووەو پێویستی هەبووە بە ئەوپەڕی خۆگرىو دامەزراویو دەرچوونو گوزەرکردنی ئەو پێغەمبەرە لەو هەموو تاقیکردنەوەدا بەڕێكو ڕاستیو ئەوپەڕی سەربەرزی، هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتەو داستانە بەجێ ترو شایستەتر بووە بۆ دڵنەواییو ئارام دان بەدڵی ئازیزو یارەکانی (ﷺ) کەلەو کاتەدا ژیاون لە ناخۆشترینو سەخت ترین کاتدا، ئەو کاتە سەختەی کە ناوبرا بە ساڵی غەمو پەژارە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾

---

**ئینجا با بێینە ژێر سایەی ئایەتەکان تا دڵمان پاراو بکاتەوە بەم باس و بەسەرهاتە گرنگە، لە یەکەم جارەوە قاپی سورەتەکە ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * الٓر﴾ سەبارەت بەم پیتانە لە چەند سورەتێکدا بە درێژیی و بە کورتی دواوین و زۆر لەڕای زانایانم باسکرد، یەکێ لەو ڕایانە ئەمە بوو کە بەر ئەبرێتەوە لە خەڵکی و لە یەکەم جارەوە بە تایبەتی گەلی عەرەب، بەمەی ئەم قورئانە پێکهاتووە لەو پیت و وتەیانە کە ئەوان قسەو گفت و گوێ پێ ئەکەن لەگەڵ ئەوەدا هەموو داماو و دەستەپاچەن لەوەی وێنەی بڵێن، واتە ئەم پیتانەو وێنەیان، ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ هەر ئەوانەن و لەوانە پێکهاتووە ئەو ئایەتە بەرزو بڵندانەی کە هەموو کەس داماو و دەستەپاچەن لە ئاستیاندا، ئەوانە ئایەتەکانی ئەم نامەیەن کە ڕوون و ڕەوان و ڕوونکەرەوەی مەبەستن، ڕوون و ئاشکران، ڕووی کەرەوەی هەق و ناهەقن، ئەمانەن کە خۆیان بە خۆیان بەڵگەن لەسەر ڕاستیان و لەسەر ئەوەی کەلە توانای خەڵکی بەدەرن و هەموو لەلایەن خواوە هاتوون، ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو نامەیەمان هێنایە خوارەوە بە قورئان و خوێنراوەیەکی عەرەبی و پێکهاتووە لە پیت و وتەی عەرەبی ﴿لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ لەبەر ئەوەی وەری گرن و تێی بگەن و ئینجا ژیریتان بخەنە کار و تا بۆتان دەرکەوێ ئەو نامەیە ڕاستەو لە سنووری توانین و دەسەڵاتی خەڵکی بەدەرە، بزانن ئەو کەسەی ئەم نامەیەکی پێکهێناوە ناگونجێ لەتیرەی ئادەمی و دروستکراوان بێت، کەواتە بەپێی ژیریی ئەبێ وەحی و فەرموودەی خوا بێ، ژیریش ئەبێ ئەوە بزانێ و بیری لێبکاتەوە، لەبەر ئەوەی لەش و قەبارەی ئەم سورەتە داستان و سەرگوزەشتەیە ئەوا بە**

تایبەتی باسی ئەو بارەی ئەکات‌و ئەفەرموێ: ﴿نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ﴾ ئێمە هەواڵت پێ ئەدەین‌و باس ئەکەین بۆت بە جوانترین باسکردن، یا جوانترین باس‌و داستانت پێ ئەدەین، ﴿بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ بەوەی رامان گەیاندووە‌و وەحی‌و سروشمان کردووەبۆلات ئەم قورئانە،ئیتر مەبەست هەموو باس‌و هەواڵ‌و داستانەکانی قورئان بێت، یان مەبەست ئەم باس‌وهەواڵ پێدان‌وداستانەی ئەم سورەتەبێت، بەهەرکام هەڵئەگرێ‌و رێکە.

لەسەر باری یەکەم: شتێکی ئاشکرایە ئەو تەرزو رەوشتەی کە قورئان بەکاری هێناوە لەباس‌و هەواڵ پێداندا هەر لەدەست قورئان دێت‌و لەدەست کەس نایە‌و لاسایش ناکرێتەوە.

لەسەر باری دووەم: دیارە بەگشتی هەموو هەواڵ‌و داستانەکانی قورئان رێک‌و راست ترە‌و ئەوپەری کاردروستیان تێدایە، بە شێوەی تایبەتی ئەم داستانی ﴿یوسف﴾ە زۆر شیرین‌و بێ وێنەیە، چونکە باسی ئەم شتانەی تێدایە: حەسادەت بەرو حەسادەت پێبراو، موڵک‌و مالیک، شایەت دەر‌و شایەت لێدراو، عاشق‌و مەعشوق، بەند‌و بەرەڵا کردن، هەرزانی‌و قات‌و قڕی، گوناهـ‌و لێبوردن، دووری‌و لەیەك بچڕان‌و کۆچ‌و بار کردن، زەلیلی‌و زاڵ بوون، بێجگە لەوانە ئەم داستانە نیشان ئەدات کە رێگرو بەرگری کەر نییە بۆ بڕیارو قەزاو قەدەری خوا. ئەگەر خوا خێرو رێز بدات بە هەرکەس هەموو جیهانیان ناتوانن بێ‌رێزی بکەن، حەسادەت مایەی بێبەشی‌و کەم‌و کوڕییە، ئارام‌و خۆگری هۆی خۆشی‌و دەروو لێکردنەوەیە، تەگبیری کارو بار بە ژیریی ئەکرێ‌و هۆی بەختەوەری یە لەژیاندا، هەروەها چەند شتی تر کە لەم داستانەدا هەن. خوای میهرەبان پێغەمبەری ئازیزی بەهرەمەند کرد بەم قورئانە پیرۆزە بەبێ ئەمەی ئاگاداری بووبێ لێی یان بە تەمای بووبێ لەوە‌و پێش وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾ بەراستی ئەی پێغەمبەر تۆ لەپێش ئەم قورئانەداو راگەیاندنی بە تۆ لە بێ‌ئاگایان بوویت‌و هەر بە خەیاڵیشتدا نەئەهات، کەواتە هەوڵ دانت بەم شتە کەلێی بێ ئاگا بوویت بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوە کە لەلایەن خواوە هاتووە بۆت.

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾﴾

**لەپاش ئەم سەرەتایە ئینجا ێتە سەر داستانەکەو ئەیکات بە چەند زنجیرەیەك، یەکەم زنجیرە دەست پێئەکات لە خەودیتنی ﴿یوسف﴾ەوە تا دوایی هاتنی پیلانی براکانی و گەیشتنی بە مصر، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ﴿یوسف﴾ گوتی بە باوکی: ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ ئەی باوکی خۆم بەڕاستی من لە خەونا یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگم دی بەم شێوە: ﴿رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ﴾ بینیمن بە سوژدە بەری، شێوەی یتنەکەیان زۆر گرنگ بوو، بەم ڕەنگە ئەوانەی بینی لە شێوەی کەسانێکی ژیر کە سەر بخەفێنن بە سوژدە بردنەوە بۆ بە گەورەگرتن و ڕێز پێدان، لەبەر ئەوە باوکی خەوەکەی بە گرنگ گرت و زانی کە ئەو کوڕەی پاشە ڕۆژێکی بەرزو بڵندی ئەبێ، لەپاشدا ئەوە دەرکەوت، هەرکەس شتی وا ببیستێ ئەوەی لێ وەرئەگرێ، لەبەرئەوە ئامۆژگاری کرد کە ئەو خەوە نەگێڕێتەوە بۆ براکانی، وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ باوکی پێی فەرموو: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ﴾ ئەی کوڕی خۆشەویستم خەوەکەت باس مەکەو مەیگێڕەوە بۆ براکانت، ﴿فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا﴾ تا بە هۆی ئەوەوە حیلەو پیلانێکت بۆ بگێڕن، واتە بەهۆی ئەوەوە حەسادەتت پێ‌ببەن و بکەونە پیلانگێڕی بۆت ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئادەمی، کە واتە بەهەر جۆر بۆی بکرێ هەوڵ ئەدات بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری ناکۆکی و دوژمنایەتی، حەساەتیش چەکێکی بەکارە بۆ ئەوە، یەعقوب (علیه السلام) کە ئەو خەوەی کرد بە نیشانە لەسەر پاشە ڕۆژو پایەو پلەی بەرز بۆ ئەو کوڕەی دڵی بو ئەوە ڕۆیی کە ئەو پایەو پلە بەرزەش لە بارەی ئایین و خواناسییەوە ئەبێ و ئەو کوڕەی ئەبێ بە جێگای ئەو فەڕو بەرەکەتەی کە خوا بەخشی بە خانەوادەی ئیبراهیم، لەبەرئەوە فەرمووی بەکوڕەکەی،**

﴿وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ٦﴾

---

**﴿وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ﴾ واته هەر چۆنێ هەڵیبژاردی بۆ دیتنی ئەو خەوە کە بەڵگەیە لەسەر پایەو پلەی بەرزت، هەروەها بەوێنەی ئەوە هەڵت ئەبژێرێ پەروەردگارت بۆ پێغەمبەرێتیو پادشایەتی، یان بۆ کاروباری گەورە بە گشتی، ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ﴾ فێرت ئەکاتو زانات ئەکات بە بەشێك لە خەوپەرژێنو زانینی دوا ڕۆژی ئەو خەوانە کە ئەبینرێن، وەك ئەم خەوی خۆیەو خەوی هاوڕێکانی لە بەندیخانەو خەوی پادشاکەی کە لەمەوپاش دێن، ئەو زانینانە بەهرەیەکن لەلایەن خواوەو ئەیانبەخشێ بە هێندێ لە بەندەکانی، ئیتر لە پێغەمبەران یان لەپیاو چاکانی تریش، مەسەلەی دیتنی خەوو بەڕاست دەرچوونی بە ڕێکی لەزۆر کاتدا، هەروەها خەو پەرژێنو ڕاستی خەو پەرژێن لە هێندێ کاتدا، هەروەها ئەو شتانەی کە دێن بەدڵداو پێیان ئەگوترێ، کەشفو ئیلهام، یان خەتەرەو خەیاڵێك کە ناو ئەبرێ بەوەسوەسەو هیچکام لەوانە دەخڵی بەندەیان نییە، ئەم جۆرە مەسەلانە شتێکی ئاشکرانو هەرکەس ڕێزی خۆی بە لاوە بێت ئەبێ بوونیان بە ڕاست بزانێو ئینکارو دەمە دەمێ نەکات تیایاندا، ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ﴾ چاکەو نیعمەتی خوا تەواو ئەکات بەسەرتەوە، بەم ڕەنگە لەنیعمەتی دنیات بەردەوام ئەکات تا ئەگەیتە نیعمەتی ڕۆژی دوایی، یان پێغەمبەریو پادشایەتیت پێ ئەدات، ﴿وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾ بەسەر خانەوادەی (یەعقوب)ەوە کە بریتین لە باوكو دایكو براکانی یوسفو نەوەکانیان، بەم ڕەنگە ڕزگاریان ئەکات لەناکۆکیو ناخۆشیو شادیان ئەکات بەخۆشیو سەرکەوتنو سەربەرزی، ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ﴾ هەرچۆنێ نیعمەتی خۆی تەواو کرد بەسەر هەردوو باوکەکەتەوە لە پێشەوە ئەو دوانەش: ﴿إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَۚ﴾ (ئیبراهیمو ئیسحاق)ن بێگومان باوكو باپیر هەر باوکن لەراستیدا، بەڕاستی ئەوەی کە خوا کردی دەربارەی ئەو خانەوادەیە زۆر بەڕێزە، هەروەها کارو کردەوەکانی خوا سەرجەم ڕێكو ڕاستو بەجێنو ئەوپەڕی لێزانیو کاردروستیان تێدایە وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت زانای لێزانو کاردروستە.**

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ

ئینجا کۆتایی هێنا لەشێوەی وت و وێژی یوسف و باوکی ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ، ئەو قسەو باسەی لەپێش چاو ون کردو باس و شێوەیەکی تری هێنایە بەرچاو، باس و شێوەی پیلانی براکانی یوسف و نیازو تەگبیری بەدیان دەربارەی ﴿یوسف﴾ ئەو برایانەی کە دایك جیازەی بوون، لەیەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ﴾ بێگومان و بەڕاستی لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، چەند بەڕابەرو نیشانەیەکی ڕوون هەیە لەسەر دەسەڵات و زانین و کاردروستیدا خوا، لەسەر میهرەبانی و لوتفی دەربارەی بەندە هەڵبژێرراوەکانی و پەروەردەیان، لەسەر چەند شتی گرنگی تر، لەو داستانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ هەموو کەس، بەڵام سوودو بەهرەی ئەو نیشانەو بەڵگەیانە هەر بۆ کەسانێکە بەدوای ئەوانەدا ئەگەڕێن و بە گرنگ ئەیانگرن و پرسیاریان لێ ئەکەن، لەبەرئەوە تایبەتی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿لِّلسَّآئِلِينَ﴾ ئەو بەڵگەو نیشانانە هەن بۆ پرسیار کەران و ئەوانەی کە بەدوای ئەو شتەدا ئەگەڕێن، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست بە پرسیار کەران جوولەکەکان پرسیاریان کرد لەم داستانە بۆ تاقیکردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەو کاتە مەبەست بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەند ئەم بارەش ئەگونجێ، بەڵام ڕای یەکەم بەهێزترە لای زانا بەرزەکان، لەسەر هەر بار ئەم سەرەتا سەرنج ڕاکێشێکی بەهێزە بۆ گرنگی ئەم داستانەو بە گرنگ گرتنی، ئینجا دێتە سەر داستانەکەو ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالُوا۟﴾ باسی ئەو کاتە بکەکە ئەو برایانە لەناو خۆیانا گوتیان: ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا﴾ بەڕاستی یوسف و براکەی ـ واتە بنیامین کە برای باوك و دایکی یوسف بوو ـ خۆشەویست ترن لە ئێمە بەلای باوکمانەوە، ﴿وَنَحْنُ عُصْبَةٌ﴾ لەکاتێکدا ئێمە کۆمەڵە پیاوێکین بەهێزو بە دەسەڵات، ئەتوانین هەڵسین بەخزمەت و کارو فەرمان،

إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾

---

﴿إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ به ڕاستی و باوكمان له گومڕایی یه‌كی ڕوون و ئاشكرادایه‌و وا له هه‌ڵه‌دا، باوی دوو كوڕی منداڵ ئه‌دات به‌سه‌ر ئێمه‌دا، به‌ڵێ به‌ڕاستی بێشه‌رمی و بێ ئه‌ده‌بیان كرد، نه‌فامی و هه‌ڵه‌یه‌كی ئاشكرابوو ئه‌و بڕیارو وته‌یه‌یان، به‌ڵام ئه‌م ئاده‌مییه كاتێ له‌به‌رنامه‌ی خوا بڕا دووچاری هه‌ڵه ئه‌بێت و هه‌ڵه‌بازه، ئایا یوسف ئه‌و خه‌وه‌ی گێڕابێته‌وه بۆ ئه‌و برایانه‌ی وه‌ك نامه‌داره‌كان ئه‌ڵێن؟ له شێوه‌ی ئایه‌ته‌كانه‌وه وا ده‌رئه‌كه‌وێ كه نافه‌رمانی باوكی نه‌كردبێ و خه‌وه‌كه‌ی نه‌گێڕابێته‌وه، چونكه ئه‌گه‌ر وا بوایه ئه‌بوو باسێكیان بكردایه‌و ته‌نیا باودان و خۆش ویستنه‌كه‌یان نه‌ئه‌كرد به هۆی داخ و قینه‌كه‌یان له یوسف، ئه‌و قینه به‌تینه‌ی كه بوو به‌هۆی ئه‌و نیازه به‌ده‌یان، نیازی كوشتن كه گه‌وره‌ترین تاوانه له دوای بێبڕوایی و هاوبه‌ش ڕه‌وادان بۆ خوا، ئه‌وه‌تا هێندێكیان گوتیان به‌وانی تر: ﴿ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ﴾ یوسف بكوژن، ﴿أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا﴾ یا توڕی بده‌نه خاك و وڵاتێكی دوورو نادیار، كه ئه‌وه‌ش جیاوازیه‌كی وای نییه له كوشتن بۆ منداڵێكی بێده‌سه‌ڵات، به هه‌ركام مه‌به‌سته‌كه‌ی ئه‌وان پێكدێت كه ده‌ست نیشانیان بۆ كرد به وته‌ی ﴿يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾ واته یه‌كێ له‌و دوو شته بكه‌ن تا به‌هۆی ئه‌وه‌وه ڕوو تێكردن و خۆش ویستنی باوكتان یه‌ك بارو تایبه‌تی بێت بۆتان، واته تا یوسف ببێ دڵی باوكی هه‌ر ڕوو له ئه‌و ئه‌كات، به‌ڵام كه‌له به‌رچاو نه‌ما ئیتر له‌بیری ئه‌چێت و دڵی هه‌ر ڕوو ئه‌كاته ئه‌مان، خه‌یاڵ و بۆچوونیان به‌و جۆره بوو، به‌ڵام له‌وه‌ئه‌ویشدا هه‌ر هه‌ڵه‌بوون، ئه‌وه بوو له‌پاش نه‌مانی له‌به‌رچاو سۆزو خۆش ویستنی نه‌گۆڕاو به‌ڵكو به‌هێز تر بوو، شه‌یتان به‌و جۆره فریوی دان وه‌ك له‌باره‌ی گوناهه‌كه‌شیانه‌وه هه‌ڵیخه‌ڵه‌تاندن كه به تۆبه كردن چاره‌سه‌ری بكه‌ن و بیسڕنه‌وه، وه‌ك گوتیان: ﴿وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ﴾ له‌پاش یوسف و له‌ناو بردنی ئه‌بن به ده‌سته‌و كۆمه‌ڵێكی صالح به تۆبه كردن و گه‌ڕانه‌وه بۆ

لای خوا، بەڵام دیارە تۆبە بەو جۆرە نییە، بەڵکو ئەوە شتێکە کە شەیتان خەڵکی پێ هەڵئەخەڵەتێنێ، لەناو ئەو برایانەدا یەکێکیان ویژدانی هاتە جۆش و لە دڵەوە ڕازی نەبوو بەو ڕاو بڕیاری ئەوانەو ڕایەکی تری دەربڕی کەمیانە بێت و داخو قینی ئەوان دامرێنێتەوەو یوسفیش لەناو نەچێ وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ﴾ لەوانە یەکێکیان گوتی: ﴿لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ﴾ یوسف مەکوژن، ﴿وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ﴾ فڕێی بدەنە ناو بێخی بیرەکەیان شوێنێکی تر بە بەرچاوەوە نەبێ ـ وا دەرئەکەوێ کەلەو دەورو بەرەدا بیرێکی دیاریی و ناسراو بووبێ ـ ﴿يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ﴾ هێندێ لە ڕێبوارو کاروانیەکان ئەیدۆزنەوەو ئەیگرنە لای خۆیان، ئەو ڕای ئەوە هەرچۆنێ میانە بوو هەروەها بە شێوەیەك گوتی کە بیانخاتە گومان و دوو دڵییەوە بەم ڕەنگە گوتی: ﴿إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾ ئەگەر ئێوە کارو کردەوەیەکی بەسەر دێنن و ئەتانەوێ شتێکی پێ بکەن دەی ئەوە بکەن، واتە مەیکەن ئەگەر ئەیکەن ئەوە بکەن، ئینجا ـ وەك لەمەو دەرئەکەوێ ـ هەموو ڕازی بوون بەم ڕایە، بێگومان ئەبێ ئەوەش بە شێوەیەك بێت کە باوکیان پێی نەزانێ، لەبەرئەوە هەوڵیاندا کە بەناوی سەیرانەوە دووری بخەنەوە لە باوکیان و لەپاشان بردیان و خستیانە ناو بیرەکەو لەپاشان کردیان بە گورگ خواردوو، وەك ڕوون ئەبێتەوە لەم ئایەتانەی داهاتوو کە ئەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان بە باوکیان: ﴿يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ ئەی باوکی خۆمان چییە بۆ تۆو چییە کە تۆ لێمان ئەمین نیت لەسەر یوسف و مەترسی ئەکەیت کە نیازی بەدمان ببێ پێی ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ﴾ لەکاتێکدا کە بێگومان ئێمە بۆ ئەو دڵسۆزو ئامۆژگاری کەرین و نیازی خێرمان پێی هەیە، ﴿أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ﴾ بەیانی بینێرە لەگەڵمان بۆ دەرو دەشت با بەئارەزووی خۆی میوەجات و خواردەمەنی بخوات و ڕابوێرێ و کارو کردەوەی خۆش بکات ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ لەکاتێکداو بێگومان ئێمە پارێزەرین بۆی لەوەی دووچاری هیچ ناڕەحەتی یەك ببێ، ئەوانە لە پێشەوە گلەییان کرد لەباوکیان بەوەی کە ئەمین نییە لێیان، ئەمیش لێرەدا بەرپەرچی ئەو گلەیییەی دایەوە بەوەی هۆی سستی و گیروگرفتی لەناردنەکەیدا ئەمەیە خۆی پێ ناگیرێ و ئەبێ لەجیابوونەوەی یوسف لێی و مەترسیش ئەکات لەوەی گورگ بیخوات،

قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓاْ أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾

---

وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ باوكيان گوتی: ﴿إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ﴾ بەڕاستی بردنی ئێوەو جویێ كردنەوەی لە من غەمبارم ئەكات ﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ﴾ و مەترسی ئەكەم كە گورگ بیخوات لەكاتێكدا كەئێوە لێی بێ ئاگابن ﴿قَالُواْ﴾ ئەوانیش گوتیان: ﴿لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر گورگ بیخوات لەكاتێكدا ئێمە دەستەیەكی بەهێزو بە دەسەڵاتین، ﴿إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ بەڕاستی ئەو كاتە ئێمە دەستەپاچەو زیان بارین و كەڵكی هیچمان پێوە نییە، بەو جۆرەو بەو هەموو دڵنیا كردنە قەناعەتیان كرد بە باوكیان كە بینێرێ لەگەڵیان ﴿فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ﴾ ئینجا كاتێ یوسفیان برد لەگەڵ خۆیان ﴿وَأَجْمَعُوٓاْ أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ﴾ هەموو بڕیاریان دا بیخەنە بێخی بیرەكە، یان شوێنێكی تر كە بە بەرچاوەوە نەبێ، كاتێ كە بردیان و ئەو بڕیارەیان دا ئەو كردەوە بەدەیان بەجێهێناو ئەو كردەوەیان كرد كە كردیان، یوسف (علیه السلام) ئەوكارە بەدەی بەسەر هێنراو كەوتە ئەو تەنگی و سەختییەكە بەبیر لێكردنەوەشی دڵ دێتە لەرزە، لەوكاتە سەختەدا خوای میهرەبان دڵ ئارامی كرد بەو جۆرەی كە ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ﴾ رامان گەیاندو خستمانە دڵییە ﴿لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا﴾ سوێند بە خوا هەواڵیان پێ ئەدەیت بەم كارەی كە پێیان كردی، واتە خوا تۆ ڕزگار ئەكات لەم سەختی و تەنگییەی كە هەتە، بەرزو بڵندت ئەكاتەوە بەسەریانداو لەو كاتەدا هەواڵیان بەم كردەوەی كە بەسەریان هێنایت، ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لە كاتێكدا ئەوان هەست ناكەن و نازانن كە تۆ یوسفیت وەك لەمەو پاش قورئان بۆمان باس ئەكات، بە چەند جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە بەڵام ئەوەی كە گوتمان لەدڵدا جێگیر ترە، ئەوەیان كرد،

وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ

---

**﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ﴾ ئێوارە کاتێ تاریکی داهات هاتنەوە بۆ لای باوکیان بە گریانەوەو ئەگریان، واتە گریانیان لە خۆیان هێنا تەك بەڕاستی گریانیان هتبێ ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿يَـٰٓأَبَانَآ﴾ ئەی باوکی خۆمان ﴿إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا﴾ ئێمە ڕۆیشتین و دەرچووین و لەشوێنی کۆبوونەوەمان پێشبڕکێمان ئەکردو هەرکام ئەمان ویست پێش بکەوین لەوی تر، ئیتر لەڕاکردندا، یان لە تیر ئەندازی و نێژیر گرتن یان هەرکارێکی تر، یوسفمان بەجێ هێشت لای شت و مەکەکەمان، ﴿فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ﴾ بەهۆی ئەوەوە گورگ خواردی ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا﴾ بێگومان تۆ دڵنیا و بڕواکەر نیت پێمان و بەڕاستمان نازانی، ﴿وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ﴾ هەرچەند ئێمە ڕاست و ڕاستگۆین، لە (ئیبن و عەباس و موجاهید)ەوە ڕیوایەتکراوە کە ئەوانە کارژۆڵەیەکیان سەربڕی و کراسەکەی یوسفیان خوێناوی کرد پێی بۆ ئەوەی بیکەن بە نیشانە لەسەر خواردنی گورگەکە، دەی دیارە نیشان دانی خوێنی ئەو کارژۆڵە بە خوێنی یوسف درۆیەکی زلە، وەك ئەو کردەوەیە هەر درۆی ڕووت بێت لەبەرئەوە بەو شێوەیە نیشانی ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ﴾ خوێنێکیان هێنا بەسەر کراسەکەیەوە کە درۆ بوو، واتە کراسەکەیان هێنا کە خوێناوی کرابوو بە خوێنێکی درۆ، بەم ڕەنگە خوێنی یوسفیان نیشان داو خوێنی ئەویش نەبوو، (یعقوب) (علیه السلام) بۆی دەرکەوت کە یوسف گورگ نەیخواردووەو بە پیلان ئەو دەنگ و باسەیان دروستکردووە، لەبەرئەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێیان ﴿بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ﴾ واتە نەخێر گورگ نەیخواردووە بەڵکو نەفس و دەروونەکەی خۆتان فەرمانتان پێ ئەکات بە خراپە، کارێکی زۆر بەدی بۆ ئاسان کردن و شیرینی کرد لە پێش چاوتان هەتا کردتان و پێی هەڵسان،**

فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۢ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ

---

**﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ﴾ واته ئینجا بەرامبەر بەو كردەوەی ئێوە كاری من دان بەخۆدا گرتنێكی جوان و شیرینە كە ئەوەش ئەوەیە وەك (حسن) ئەفەرموێ: باسی ئەكات و شكات و دادی خۆی هەر لای خوا بكات، ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ هەر خوا داوا لێكراوی كۆمەك و یارمەتیە لەسەر ئەوەی كە ئێوە ئەیڵێن و باسی ئەكەن، واتە داوای كۆمەك و یارمەتی لەم كارەدا هەر لە خوا ئەكەم.**

**ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ لای یوسف كە بە تەنیا خراوەتە ناو بیرەوە تا بزانین چی بەسەر دێت، ئەفەرموێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ﴾ كاروانێك هات، دیارە پێویستیان بە ئاو هەیە، ﴿فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ﴾ ئینجا ئەوەی كە تایبەتی بە چوونە سەر ئاوو هێنانی بۆیان، ئەوەی خۆیانیان نارد ﴿فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥ﴾ ئەویش ڕۆیشت و دۆڵچەكەی خۆی داهێلا بۆ ناو بیرەكەو یوسفیش دەستی پێوە گرت تا هاتە دەرەوە، ئینجا كاتێ یوسفی بینی ﴿قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ﴾ گوتی ئەی مژدەو خۆشی وەرە كاتی هاتنی تۆیە، یان ئەی هاوەڵەكانم سەرنج بدەن و ببیستن مژدەكەم ﴿هَٰذَا غُلَٰمٞ﴾ ئەمە كوڕێكی منالی گرنگە، ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗ﴾ ئەم ڕستەیە بە چەند جۆرێك تەفسیر كراوەتەوە وەك لە كتێبەكانی تەفسیردا هاتووە، لە ناو ئەوانەدا ئەم جۆرە بەهێز ترە لە دڵدا، كاروانیەكان یوسفیان داشاردو حاڵو باریان دەرنەخست و بە ماڵو شت و مەكی بازرگانییان نیشان دا بۆ ئەوەی بیكەن بە بەندەو بیفرۆشن، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەوەی ئەوانە ئەیكەن، ﴿وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۢ بَخۡسٖ﴾ فرۆشتیان بە نرخ و پارەیەكی كەم و ناتەواو ﴿دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ﴾ فرۆشتیان بە چەند درهەمێكی ژمێرراو، ئەوانە بۆ شتی كەم نرخ مامەڵەیان بە ژمارە ئەكرد، وە بۆ شتی بەنرخ بە كێشان،**

وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًاۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾

---

**﴿وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ﴾ ئەوانە کە فرۆشتیان دەربارەی یوسف لە نەویستەکان بوون‌و یوسفیان نەئەویست، حەزیان ئەکرد ڕزگار ببن لە دەستی، چونکە دۆزرابووەوەو مەترسییان ئەکرد گومان وا ببرێ کە بە زۆر کردوویانە بە بەندەو ئەیفرۆشن، لێرەدا ئەڵقەی یەکەم لە زنجیرەی داستانەکە دوایی هات، ئەڵقەی دووەم دەست پێئەکات لە گەیشتنی یوسف بە مصرو فرۆشراوی بە وێنەی بەندە، بەڵام ئەوەی کە لە مصر کڕی هەستی بە خێرو خۆشی کرد لە ناوچاوی یوسفدا، لەبەرئەوە بە گرنگ گرتی‌و نیشانی دا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ﴾ ئەو کەسەی کە لە مصر یوسفی کڕی، واتە عەزیزی مصر گوتی بە ژنەکەی: ﴿أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ﴾ ڕێزی جێ‌و شوێنی مانەوەکەی بگرە، دیارە کاتێ ڕێزی جێ‌و شوێنی مانەوەو نیشتەجێیەکەی بگرێ باشتر ئەبێ ڕێزی خۆی بگرێ، واتە چاك چاودێری‌و سەرپەرشتی بکە ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ﴾ ئومێدمان وایە سوودمان پێ بگەیەنێ لەبارەی پارێزگاری ماڵ‌و سامانمان‌و بەکاری بێنین لە بەرژەوەندی خۆماندا ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًاۚ﴾ یان بیگێڕین بە کوڕی خۆمان ـ وا دەرئەکەوێ کوڕو ئەولادیان نەبووبێ ـ لەبەر ئەوەی هەستی کرد بە ژیریی‌و هەڵکەوتەیی یوسف، گوتی بیگێڕین بە کوڕی خۆمان، ئینجا لێرەدا ئەوەستێ‌و بە تێهەڵکێش دەست نیشان ئەکات بەوەی کە ئەوەی سازا بۆ یوسف بە تەگبیرو سازاندنی خوا بووە، ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە هەرچۆنێ خۆش ویستنی یوسفمان دامەزراند لە دڵی عەزیزی مصردا، یان هەرچۆنێ یوسفمان دامەزراندو

جێگیرمان کرد له ماڵی عەزیزدا، یان هەرچۆنێ یوسفمان ڕزگار کردو دڵی عەزیزمان نەرم‌و بەزەیی دار کرد لەسەری، وەها گێڕامان بۆی جێ‌و شوێن‌و پایەو پلەی بەرز بۆی له وڵاتی مصردا، ﴿ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ﴾ واته یوسفمان دامەزراند له ماڵی عەزیزدا، تا ڕوو بدات ئەوەی که ڕووی داو به هۆی ئەوەوه یوسف کەوته بەندیخانه، بۆ ئەوەی فێری هێندێ خەو پەرژێنی بکەین که یەکێ لەوانه خەو پەرژێنی خەوەکەی پادشا بوو که بوو به هۆی ڕێزی یوسف لای پادشا تا ئەو ڕادەی گێڕای به کاربەدەست له مصردا، ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ ﴾ خوا زاڵه بەسەر کاری خۆیدا، به جۆرێ هەموو کارەکانی به ئەوپەڕی کاردروستی هاتووەو هەرچی ئەو بیەوێ هەر ئەوە ئەبێ، ئەوەتا یوسف‌و براکانی ویستیان لەناوی بەرن‌و کاری بەدی بەسەر بێنن‌و خوایش پێچەوانەی کارەکەی ئەوانی ویست‌و ئەوەی خوا ویستی بەدی هات، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن که کار بەو جۆرەیه. ئەم ئایەته به دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوه بەڵام ئەوەی که گوتمان بەهێزو ڕێك ترە لەگەڵ باس‌و شوێنەکەدا. خوا به میهرەبانی خۆی یوسفی پەروەردە کرد تا گەیشته ئەوپەڕی هێزو تواناو ژیریی، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ کاتێ گەیشته ئەوپەڕی هێزو توانای، پێمان بەخشی حوکمڕانی‌و زانین، واته زانینی خەو پەرژێن که یوسف لەوەدا بەهرەیەکی تایبەتی بووە، یان مەبەست به حوکم لێزانی‌و کاردروستیه، مەبەست به عیلم تێگەیشتنه له شەریعەتدا، یان مەبەست به حوکم‌و پێغەمبەرێتییەو عیلم‌و شەریعەته وەك له (ئیبن‌و عەباس)ەوە هاتووە، به چەند شتێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ بەو پاداشته نایابه پاداشتی چاکه کاران ئەدەینەوە، واته یوسف له بیرو باوەڕو له کردەوەو ڕەوشتدا چاك‌و چاك کار بوو، ئێمەیش لەبەر ئەوەو به پێی ئەوه پاداشتمان دایەوە.

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾

ئینجا دێته سەر باسی کارێکی زۆر سەخت و تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورس کە هاتە ڕێی یوسف و دووچاری بوو، ئەوەش ئەمە بوو یوسف لە جۆشی گەنجی و جوانیدا کەوتە ناو ماڵ و خانەوادەیەکی زۆر بەرز و بەرێز. لەو کاتەو لەو ژیانی خۆشی و کامەرانییەدا ئافرەتێکی پایە بەرز کە ژنی سەرەك وەزیری مصر بێت، ئەو ئافرەتە بکەوێتە خوارو ژووری ئەو کوڕە جوانە بۆ ئەوەی کاری بێشەرعی پێبکات، لەگەڵ ئەوەدا ئەو کوڕە سەرپێچی بکات و نەچەڵەتێ بەو ئافرەتە! بە ڕاستی کارەکە زۆر زۆر گەورەو گرنگە، ئینجا با گوێ شل بکەین بۆ قورئان بە وتە بەرزەکانی خۆی ئەورووداوەمان بۆ بگێڕێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ واتە ئەو ئافرەتەی کە یوسف لە ماڵیدا بوو کەوتە خوارو ژووری یوسف و ویستی بیخەڵەتێنێ و دڵی دابێنێ بۆ کاری بێشەرعی لەگەڵی و ئەویش لە گوێی نەئەکردو ئەیویست ڕابکات و خۆی قوتار بکات لە دەستی ﴿وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ﴾ ئافرەتەکەش قاپییەکانی داخست بۆ بەرگری کردنی لە دەرچوون و ڕاکردن، ﴿وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ﴾ پێی گوت: وەرە پێشەوە بە پەلەو چەسپانی بکە ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ﴾ یوسفیش گوتی: من پەنا ئەگرم بە خوا بە پەنا گرتن لەوەی تۆ نیازی ئەکەیت و ئەتەوێ، ﴿إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ﴾ بە ڕاستی کارم بەم جۆرەیە: خوا کار بەدەست و خاوەنی منە، جێ و شوێن و پلەو پایەی منی چاك و شیرین کردووە، کەواتە یاخی نابم لێی و گوناه ناکەم، یان بە ڕاستی وەزیر گەورەو خاوەنی منەو ڕێزی گرتووم، کەواتە چۆن ناپاکی بکەم لەگەڵ ئەو کە چاکەی لەگەڵ کردم ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بە ڕاستی ستەمکاران ناگەن بە ئامانج، مەبەست ستەمکاران بە شێوەی گشتی یان بە پێی جێ و شوێنەکە مەبەست شەرواڵ پیسانە، بە هەرکام ئەگونجێ و دەست ئەدات،

وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾

﴿ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ ﴾ سوێند بە خوا ئەو ئافرەتە نیازی تێکەڵی کاری ژن و مێردی یوسفی کرد ﴿وَهَمَّ بِهَا﴾ یوسفیش نیازی ئەوی کرد، بێگومان پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێت- بەلای هەمووانەوە پاك و خاوێنن لە گوناهە گەورەکان لە پێش پێغەمبەرێتیشدا، وەك هێندێ لە گوناهە بچوکەکانیش کە نیشانەی پەستی و ڕیسواییین، نیازی زینا، شەرواڵ پیسی، یەکێکە لەو گوناهانە کە ئەبێ پاك بن لێی، جا لەبەرئەوە زانایان هەوڵیان داوە بۆ نەهێشتنی ئەو گرێیە، کۆڕو جەماوەر لەسەر ئەوەن کە مەبەست بە نیازەکەی یوسف نیازو خەتەرەی دەروونە کە بەپێی سروشتی ئادەمی شتێکی چار نەکراوەو بەرگری ناکرێ بە وێنەی نیازو ئارەزووی ڕۆژووەوانی تینوو بۆ ئاوو نایشی خواتەوە، ئەو نیازو خەتەرە دەروونییەش پێش ئەوە بوو کە نیشانەو بەڵگەکانی خوا دەست پێبکات و لەپاش ئەوە ئەوەش نەما، هێندێ لەسەر ئەوەن کە ئەو نیازە دەروونی و خەتەرە دەروونیەش هەر نەبووە چونکە خوا ئەفەرموێ: ﴿لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦ﴾ واتە یوسفیش نیازی ئەو ئافرەتەی ئەکرد ئەگەر ئەو بەڵگەو نیشانە ڕوونەی خوای خۆی نەدیتایە، ماتوڵ ئەوەی بینی هەر نەبووە، بێگومان دەقی قورئانەکە لە یەکەم جارو لە دواییدا بە ڕوونی باسی پاك و خاوێنی یوسف ئەکات و پەنا بردن و بە خوا خۆی لەگەڵ هەموو هەوڵ و تەقەلای کە ئەو ئافرەتە بەکاری هێنا بۆ هەڵخەڵەتاندنی، ئەو ئافرەتە خان و مان و بە دەسەڵاتە کە یوسف ئەژیا لەگەڵی لەو کۆشك و نیازو ڕێزو نیعمەتە فراوانەدا، لەکاتێکدا کە ئافرەتەکە خاوەنەو یوسفیش ژێر دەستەو چاو لەبەرە لە هەمان کاتدا ئادەمییەو بەشدارە لە سروشت و داخوازی ئادەمیدا، کەواتە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە بە پێی ئەو سروشت و داخوازە لە هێندێ کاتدا لاوازی ڕووی تێبکات و مەیلێکی دەروونی بڕوات بۆداخوازە سروشتەکەی، بەکورتی و پاڵفتەی کردنەوەی ئەو گرێیە یەکێکە لەم دوو بارە:

١- وتەی ﴿وَهَمَّ بِهَا﴾ وەڵام بێت بۆ ﴿لَوۡلَآ أَن رَّءَا﴾ یا وێنەی بڕیار بدرێ لە دوایەوە، ئەو کاتە ئەو نیازو خەتەرەش هەر نەبووە، وەك لە پێشەوە باسکرا.

٢- وەلاًمەکە شتێکی تر بێت، بەلاًم مەبەست بە ﴿بُرۡهَٰنَ﴾ ئەو عیصمەتو پاکییە بێ کە خوا دای بە پێغەمبەران، مەبەست بە بینینەکەی بڕوای بەهێزو هەست پێکردنە بە جۆرێ وەك بینرا بەبێ چاو، یان ئەو بەڵگەو نیشانە ئاشکرا بێت کە خوا کردوویەتی بە هۆی قەدەغە کردنی داوێن پیسی، یان مەبەست ئەو پێغەمبەرێتیو زانینە تایبەتیەیە کە خوا بەخشی بە پێغەمبەران، واتە ئەگەر ئەو بەڵگەو نیشانە ئاشکرا نەبوایە یوسف دووچار ئەبوو تێکەڵی ئەو ئافرەتەی ئەکردو بە گوێی ئەکرد، بەلاًم ئەگەر مەبەست بە ﴿بُرۡهَٰنَ﴾ ئەو شتە ئاشکرایانە بێت کە لە ڕیوایەتە لاوازەکاندا هاتوون، وەك ئەوەی کە وێنەی باوکی خرابێتە بەرچاوی پەنجەی خۆی گەستبێو پێی وتبێ: یوسف تۆ لە ڕیزی پێغەمبەراندا نوسراویو نیازی کردەوەی نەفامان ئەکەی؟ یان وێنەی باوکی هاتبێو دابێتی بەسەر سنگیدا، هەروەها چەند شتێکی تری وێنەی ئەمانە کە لەو ڕیوایەتانەدا هاتووە، لەسەر هەرکام لەوانە نابێ وەلاًمی ﴿لَوۡلَآ﴾ ئەوە بێت کە گوترا، چونکە ئەو کاتە وا ئەگەیەنێ یوسف مەیلی ئەو گوناهانەی کردووەو عیصمەتو پاکیی نەبووەو بەهۆی ئەو نیشانانە گەڕاوەتەوە لەو گوناهە، دەی ئەوەش پێچەوانەو دژی ڕای موسڵمانانە.

کورتەی باسەکە لەسەر ڕای یەکەم: یوسف نیازی ئەو ئافرەتەی نەکرد بە هۆی دیتنی ئەو بەڵگەو نیشانە ڕوونەی خوای خۆی ئیتر ئەو بەڵگەو نیشانەیە هەرچی بووبێ... لەسەر ڕای دووەم: نیازو خەتەرەی سروشتی ئەو ئافرەتەی کرد، ئەگەر ئەو عیصمەتو سیفەتی پێغەمبەرێتیەی نەبووایە دووچاری ئەو گوناهە ئەبوو. کەواتە لەسەر هەر بار خوا پاراستی وەك ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَ﴾ بەو جۆرە یوسفمان ڕاگیر کردو دامانەمزراند بۆ ئەوەی لایدەین لە ناپاکی لە خاوەنەکەیو زیناو داوێن پیسی کە زۆر بەدو خراپە، یان مەبەست بە (سوء) کاری بەدە بە گشتیو (فحشاء) زیناو شەروال پیسیە، هۆی ئەو دامەزران و لادانەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ بە ڕاستی یوسف لەو بەندەیانەمانە کە خۆیان یەك بارو پاكو خاوێن کردووە بۆ بەندەییو گوێڕایەڵی، یان ئایینی خۆیان پاكو خاوێن کردووە بۆ خوا، ئەمە لەسەر خوێندنەوەی (المُخلِصين) بە ژێرە، لەسەر خوێندنەوەی بە سەرە (المُخلَصين) ئەڵێین: بە ڕاستی یوسف لەو بەندەیانەمانە کە خوا پاكو خاوێنی کردوون بۆ گوێڕایەڵی.

وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ

---

﴿وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ﴾ یوسف و ئافرەتەکەش پێش برکێ و چەسپانیان کرد بۆ لای قاپیەکە، یوسف بۆ دەرچوون و خۆ قوتار کردن لە ئافرەتەکە، ئافرەتەکەش بۆ ڕاگیر کردن و بەرگری کردنی لە دەرچوون، ﴿وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ﴾ کراسەکەی یوسفی شەق کردو دڕاندی کە بەوە بیگرێ و بە هۆی ئەوەوە کراسەکەی لەت کرد، ﴿وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ﴾ لەلای قاپی دەرەوە تووشی گەورەی ئافرەتەکە بوون، واتە مێردەکەی کە عەزیزی مصرە، بێگومان ئەو شوێن و کاتە جێگەی پرسیارە لەو ڕووداو و بەسەرهاتە، دیارە ئەو شێوەیە جێگەی گومانە، لەبەر ئەوە ئافرەتەکە ویستی خۆی پاك بکاتەوەو یوسف بە تاوانبار نیشان بدات، لەبەر ئەوە گوتی ﴿قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا﴾ ئایا کەسێ نیازی خراپەی کردبێ لەگەڵ ماڵ و خێزانتدا ئەبێ تۆڵەی چی بێ؟ ﴿إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ مەگەر ئەوەی بەند بکرێ یان سزایەکی بدەیت، یان تۆڵەی ئەو کەسە هیچ نییە بێجگە لەوەی بەند بکرێ یان سزایەکی ئازاردەری بدرێ، دیارە ئافرەتەکە کە یوسفی بە تاوانبار نیشاندا پێویستە یوسفیش بەرگری لە خۆی بکات و ڕاستی کارەکە دەرخات، لەبەرئەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ﴾ ئەو کەوتە خوارو ژووری من و ویستی بە پیلان دڵم بسێنێ و ئەو کارە بەدەم پێ بکات، ئینجا خوا کارێکی سازاند کە پاکی یوسف دەرکەوێ، بەم ڕەنگە یەکێکی لە کەس و کاری ئافرەتەکەی کرد بە شایەت لەسەر پاکیەکەی وەك ئەفەرموێ: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ﴾ شایەتێك لە کەس و کاری ئافرەتەکە ئیتر ئامۆزا یان خاڵۆزا بووبێ، منداڵ بووبێ و خوا هێنابێتیە زمان ــ وەك لە حەدیسدا هاتووە ــ یا پیاوێکی گەورەی دانا بووبێ کە پاشا پرس و ڕای پێکردووە. یان هەرچۆنێ تر وەك بەو جۆرانە ڕیوایەتکراوە بە هەرحاڵ و لەسەر هەر بار ئەو شایەت و هەواڵ دەرە،

إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَٱسْتَغْفِرِي لِذَنۢبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِى ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ

---

یان ئەو بڕیار دەرە مەسەلەکەی بڕیەوەو ئاژاوەو دووبەرەکی نەمێشت بەم ڕەنگە گوتی: ﴿إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ ئەگەر کراسەکەی لای پێش و لەبەردەمییەوە لەت کرابێ و هەڵدرابێ ئەوە ئافرەتەکە ڕاستی کردووەو ئەو لە درۆزنانە لەوەی کە ئەیڵێ، چونکە ئەوە نیشانەیەکە یوسف پەلاماری ئەوی داوەو ئافرەتە چنگە یەخەی وەستاوە ﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ﴾ ئەگەر کراسەکەی لەدواوە شەق کرابێ و هەڵدڕابێ: ﴿فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئەوەئافرەتەکەی درۆی کردووەویوسف لەڕاستگۆیانەو ڕاستی کردووە لە قسەو داواکەیدا، چونکە ئەوە نیشانەیە لەسەر ئەوە کە هەڵهاتووە لەدەستی و ئافرەتەکە کەوتووەتە وای بۆ ئەوەی بیگرێ، ﴿فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ﴾ ئینجا کاتێ مێردەکەی بینی کراسەکەی لە دواوە لەت کراوە، ﴿قَالَ﴾ گوتی بە ئافرەتەکە: ﴿إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ﴾ بەڕاستی ئەو قسەی کە گوتت لەبارەی لەکەدار کردنی یوسف و پاکی خۆت، ئەوە بەشێکە لە پیلان و فێڵی ئێوە ئەی کۆمەڵی ئافرەتان ﴿إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾ بە ڕاستی پیلان و فێڵی ئێوە گەورەیە ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، چونکە باشتر ئەچێتە دڵەوەو زیاتر کار ئەکات لە دەروندا بە تایبەتی خاوەن کۆشکەکان، ئینجا لایەکی کردەوە بۆ لای یوسف و

گوتی: ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾ ئەی یوسف واز بێنە لەم کارو ڕووداوەو باسی مەکە لای هیچکەس، ئەوا دەرکەوت پاکی و ڕاستی تۆ، گوتی بە ئافرەتەکەش: ﴿وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ﴾ داوای لێبوردن بکە لە گوناهەکەت، ﴿إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾ بەڕاستی تۆ لەو کەسانەی کە بەدەستی ئەنقەست گوناه ئەکەن، لەوانەی کە لادەرن لەباری ڕاست، ئەو لادانەش سێ جۆری هەیە:

یەکەم: نیازی شتێ بکات کە ناشیرینە نیاز کردنی و ئینجا ئەو کارەش بکات، ئەمە هەڵەو گوناهی تەواوەو بەندە بەرپرسیارە لێی.

دووەم: ئەمەیە نیازی شتێ بکات کە چاکە بەڵام پێچەوانەی نیازەکەی بەدی دێت، ئەمە لە نیازەکەیدا چاکەو لە کردەوەکەدا هەڵەیە وەك ئەوانەی کە ئیجتیهاد ئەکەن و بەڵام هەڵەئەکەن، ئەمە لێبوراوەو بەرپرسیار نییە.

سێیەم: ئەمەیە نیازی شتی خراپ بکات و بەڵام پێچەوانەی ئەو خراپە ڕوو بدات لێی، جا هەڵەو لادانەکەی ئەو ئافرەتە لەبەشی یەکەمەو پێویستە داوای لێبوردنی لێبکرێ.

ئەو کارو ڕووداوە بەو جۆرە وازی لێهێنراوەو پەردەی بەسەردا درا، بەڵام دیارە شتی وا ئاشاردرێتەوە هەر ئەبێ بە دەنگ و باس وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ﴾ چەند ئافرەتێك لەشارەکەدا، واتە شاری مصر بە بەشەرەوە گوتیان: ﴿امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ﴾ ژنەکەی سەرەك وەزیر کەوتۆتە خوارو ژووری کوڕە گەنجەکەی بەردەستی و بە حیلەو فێڵ ئەبەوێ لەگەڵی یەك کەوێ و کاری بەدی پێبکات، واتە کارێکی بەدی کردووەو جێگەی سەر سوڕمان و بێزاری لێدەربڕینە.

قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ مَا هَـٰذَا بَشَرًا

---

﴿قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا﴾ بەڕاستی ئەو كوڕە دڵی لەت كردووە لە بارەی خۆش ویستنەوە، واتە خۆش ویستنەكەی بۆ ئەو كوڕە گەیشتووەتە ڕادەیەك پەردەی دڵی دڕیوەو گەیشتووەتە ناو دڵی وناشاردرێتەوەبۆی، بەم ڕستەیەتانەوتەشەرەكەمان بەتین تركرد، ﴿إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەیبینین لە گومڕاییەكی ڕوون و ئاشكرادایە، چونكە ئەبینین ئەو ژنی سەرەك وەزیرەو عاشقی كوڕێكی بەردەستی خۆی بووە كە غەریب و نەناسراوەو بەندەیەكی كڕاوە.

لێرەدا ئەو ئافرەتە پیلان و فێڵێكی سەیری بەكار هێنا بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو تەشەرو لۆمەی كە ئاراستەیان كرد بوو وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ﴾ ئینجا كاتێ غەیب و قسە بەدەكانی ئەوانی بیست ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾ ناردنی بە دوایانداو دەعوەتی كردن ﴿وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا﴾ ئامادەی كرد بۆیان جێ و شوێنی پاڵ و پشت كردن و نان و خۆراك خواردن ﴿وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا﴾ كێردێكی دا بە هەریەكێ لەوانە بۆ ئەوەی بەكاری بێنن لە بڕین و پچڕینی خۆراكەكەیاندا ـ لەوەدا دەرئەكەوێ كە شارستانیەتی مصر تا چ ڕادەیەك بەرزو پێشكەوتوو بووە ـ ﴿وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾ گوتی بە یوسف بچۆ بە سەریانداو خۆتیان بۆ دەرخە، ئەویش لەو كاتەدا كە ئەوان خەریكن بە خواردنەوەو كێرد وا بە دەستیانەوە چوو بۆ ناویان و خۆی نیشان دان ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ﴾ ئینجا كاتێ یوسفیان بینی بە گەورەو گرنگیان داناو سەیریان كرد تا ڕادەیەك بێهۆش و سەرسام بوون لە دیتنی جوانی و شیرینیەكەی ﴿وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ دەستی خۆیانیان بڕی و زامداریان كرد بە كێردەكان، چونكە هۆشیان نەما بەلای خۆیان و دەست و كێردەكانیانەوە ﴿وَقُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ﴾ بە سەرسامیەوە گوتیان: پاكی و بێگەردی بۆ خوا كەشتی وای دروستكردووە ﴿مَا هَـٰذَا بَشَرًا﴾ ئەمە بەشەرو ئادەمی نییە،

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ

﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ ئەمە هیچ نییە بێجگە لەوەی فریشتەیەکی بەرزو بەڕێزە، ئەمەیان گوت بەپێی ئەوەی لەدڵدا وا دامەزراوە کە هیچ شتێ لە فریشتە جوانتر نییە وەك هیچ شتێ لە شەیتان پیس‌و ناشیرین تر نییە، ئافرەتەکە بۆی دەرکەوت کە زاڵ بوو بەسەر ئەو تەشەر دەرانەداو هیچ ڕێگەیان نەما بۆ تەشەر دان لەبەر ئەوە، ﴿قَالَتْ﴾ گوتی پێیان: ﴿فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ﴾ ئینجا ئا ئەوەیە ئەو کەسەی کە لۆمەی منتان ئەکرد تێیداو بە تەشەرەوە ئەتان گوت: چۆن عاشقی بوو؟ دەی تەماشا کەن خۆتان چیتان بەسەر هات بە بینینی! ﴿وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ﴾ سوێند بە خوا هەوڵم داو کەوتمە خوارو ژووری وەك گوتتان‌و یبستتان کەچی ئەو پاك‌و خاوێنی بۆ خۆی داناو سەپێچی کرد لە من‌و ڕێك نەکەوت لەگەڵم، هیچ شەرمی لانەماو بە تەواوی ڕاستی دڵی خۆی دەربڕی‌و گوتی: ﴿وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر ئەوە نەکات کە من فەرمانم دا پێی ﴿لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾ بێ‌گومان بەند ئەکرێ، بەڕاستی لە ڕیسوایان ئەبێت‌و ئەچێتە ڕیزی ئەوانەوە ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ﴾ یوسف بەرامبەر ئەو هەڕەشەی ئەو پەنای بە خوا بردوو گوتی: ئەی پەروەردگارم بەند کردن خۆشەویست ترە لام لەوەی کە ئەوانە بانگی من ئەکەن بۆی ﴿وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ﴾ ئەگەر لانەدەی لێم پیلانی ئەوانە ﴿أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ مەیل ئەکەم بۆ لایان‌و دڵ دائەهێنم بۆیان‌و ئەبمە نەفام‌و ئەچمە ڕیزی ئەوانەوە، بەڵێ ئەمەیە نزاو هاواری خواناسان کە خۆیان ئەناسن‌و هەڵناخەڵەتێن بە پاك‌و خاوێنی خۆیان، لەبەرئەوە داوای کۆمەك‌و یارمەتی ئەکەن لە خوا، ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ ئینجا خوای پەروەردگاری نزاکەی لێ وەرگرت،

فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْـَٔايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَعْصِرُ خَمْرًاۖ وَقَالَ ٱلْـَٔاخَرُ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾

---

**﴿فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّۚ﴾ بەم ڕەنگە پیلانەکەی ئەوانی لادا لێی، بەم جۆرە ئەوانەی نائومێد کرد لەوەی کاری لێبکەن، یا بە زیادە دامەزراندنو بەهێز کردنی لەوەی ئەوان بتوانن کاری لێبکەن، یا بە هەردوو بارەکە، هۆی ئەو نزا وەرگرتنەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڕاستی هەر خوا بیسەری زاناو ئاگایە، بیسەری پیلانی ئەوانەیەو نزای یوسف، زاناو ئاگایە بە بەرهەمو سەرەنجاکی پیلانو نزاکە، بەو جۆرە یوسف تێپەڕی کرد لە تاقیکردنەوەی دووەمدا، بە لوتفو چاودێریی خوا بەو ڕزگار بوونە ئەڵقەی دووەم لەداستانە گرنگەکەی دوایی هات.**

**ئینجا ئەوا ئەڵقەی سێیەمو تاقیکردنەوەی سێیەم کە دوا ترینە لە تاقیکردنەوە سەختەکانی ژیانی دەست پێئەکات، لەم ماوەی سێیەمدا چاکەو بەهرەی خوا بەسەر یوسفەوە ڕوونو ئاشکرایە، بەهۆی ئەو زانینە گرنگەی کە خوا پێی بەخشی لەلایەن خۆیەوە، لە خەو پەرژینو هێندێ شتی غەیبیو نادیاریی، ئینجا چاکەو بەهرەی بە دەرکەوتنی پاکییەکەی بە تەواوی لای پادشا، بەدەرکەوتنی ئەو سیفەتو بەهرەیانەی کە گێڕای بە شایانی ئەو ڕاەو پلەو پایەبەرزەو ئەو دەسەڵاتو پادشایەتییەی کە خوا پێیداو بە خەیاڵی کەسدا نەئەهات ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْـَٔايَٰتِ﴾ واتە عەزیزو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون لە پێشەوە ڕاو بڕیاریان لەسەر ئەوە بوو لە مەسەلەی یوسف کە کۆتایی پێبێنن بە گوێ نەدانو باس نەکردنو شاردنەوەی، ئینجا لەپاش ئەوەی چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرایان بینیو زانی لەسەر پاکی یوسف، لەپاش ئەوە پەشیمان بوونەوە لەو ڕایەو ڕایەکی تریان بۆ دەرکەوت کەبریتییە لە بەند کردنی یوسف تا ماوەیەك بۆ ئەوەی ئەو**

مەسەلەیە کۆن بێت و ئەو قسەو باسە نەمێنێ لەناو خەڵکیدا، مەبەستی عەزیز ئەوە بوو، ئافرەتەکەش ئەوی بەلاوە چاك بوو، بەڵکو یوسف ناچار ببێ بۆ ئەو کارەی کە ئەو نیازی بوو، یان خەڵکی بزانن کە یوسف تاوانبار بووە، ئەو ڕاو بڕیارە تازەش ئەو بەند کردنەبوو وەك ئەفەرموێ: ﴿لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ﴾ سوێند بە خوا بەندی ئەکەن هەتا ماوەیەك، دوای ئەوەی بەندیان کرد ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ﴾ دوو کوڕی تری گەنج لەگەڵی چوونە بەندیخانەکە، ئەم دووانە ـ وەك لەمەو پاش دەرئەکەوێ ـ لە خزمەت کارانی پادشا بوون و گومانی ناپاکیان لێکرابوو خوا وای ڕێکخست لەو کاتەدا ئەوانیش خرانە بەندیخانە لەگەڵ یوسف، ئینجا کەدیان یوسف ڕەوشت پاکەو هەمیشە خەریکی خواپەرستی و کردەوەی چاکە چووە دڵیانەوەو بڕوایان پێ‌پەیدا کرد، لەبەرئەوە ئەو دووانە هەرکام خەوێکی بینی داوای خەوپەرژێنیان لێکرد، وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ أَحَدُهُمَآ﴾ یەکێ لەو دووانە گوتی بە یوسف: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ﴾ بەڕاستی لە خەودا خۆم بینی ترێم ئەگوشی کە ئەبێ بە ئارەق ﴿وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ﴾ ئەوی تریان گوتی: ﴿أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ﴾ بەڕاستی لەخەودا خۆم بینی کەبەسەر سەرمەوە نان و خۆراکێکم هەڵئەگرت کە باڵندەو پەلەوەر لێی ئەخوارد ﴿نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ﴾ هەواڵمان بدەرێ ئاگادارمان بکە بە خەو پەرژێنی ئەوەی کە گوتمان، ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ ئەبینین لەو کەسانەی کە چاك ئەزانن خەو ئەزانن خەوپەرژێن بکەن، یان لەوانەی کە چاکە ئەکەن لەگەڵ خەڵکیدا، کەواتە چاکە بکەن لەگەڵمان بە خەو پەرژێنی خەوەکەمان لە پێشەوە لێیان دیتبوو کە خەو پەرژێنەکانی ڕاست دەرئەچوون، خۆیشی لە یەکەم جارەوە فەرمووبووی: من خەو پەرژێن ئەکەم و لەزانایانم، یوسف (علیە السلام) ئەوەی دانا بە هەل و هەڵکەوتێکی چاك بۆ ئەوەی بیروباوەڕی پاك و خاوێنی خۆی باس بکات و ڕای بگەیەنی بەو خەڵکەی کەلە دەوروبەری بوون، لەیەکەم جارەوە دەست پێ‌ئەکات بەدوو هاوڕێکەی و دڵنیایان ئەکات لەسەر ئەوەی خەو پەرژێنەکەیان بۆ ئەکات،

قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾

---

**﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا﴾ نايەت بۆتان هيچ خۆراكێك كە بكرێ بە ڕۆزيتان و ڕۆزی بدرێن پێی لەم بەنديخانەدا مەگەر من هەواڵتان ئەدەمێ پێش ئەوەی پێتان بگات و بێت بۆتان، ئيتر مەبەست خۆراكێك بێت كە لە خەودا ببينن و خەو پەرژينی ئەكات بۆيان، وەك هێندێ ئەفەرموون، يان مەبەست ئەو خۆراكەبێت لە بێداريدا بۆيان ئەهێنن وەك باوە، ئەميش پێش هاتنی هەواڵيان پێ ئەدات كە خۆراكێكی واتان بۆدێت كە سيفەت و نيشانەی وايە، وەك هێنديكی تر لە زانايان بەو جۆرە تەفسيری ئەكەنەوە و لەدڵيشدا ئەمە بەهێزترە، بەهەر حاڵ و لەسەر هەربار بەو فەرموودەيە سەرنجيان ڕائەكێشێ بۆلای ئەوەی كە خوا زانينێكی تايبەتی پێ بەخشيوە و بەڵگە و موعجيزەيە بە دەستييەوە، كەواتە ئەبێ بڕوا بهێنن و ئامۆژگاری يەكەی وەرگرن وەك دەست نيشان ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ﴾ ئەو زانين و هەواڵەش لەو شتانەيە كە پەروەردگارم هەواڵی پێداوم و فێری كردووم، واتە شتێك كە هەر لەخواوە وەرئەگيرێ لەهيچ كەسی ترەوە دەستكەوت نابێ، هۆی ئەو بەهرە و بەخشينەی خواش ئەمەيە كە ئەفەرموێ: ﴿إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ بەڕاستی من سەپێچيم كردووە لە ئايينی گەل و كۆمەڵێك كە بڕوا ناهێنن و بڕوايان نييە بە خوا، ﴿وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوانە بە تايبەتی بێبڕوان ڕۆژی دوايی. باس و هێنانی بڕوا بە ڕۆژی دوايی لێرە و لە چەند شوێنێكی تردا نيشانەيە لەسەر ئەوەی كە بڕوابە ڕۆژی دوايی بەندو بەشێكی سەرەكی و تايبەتييە لە هەموو عەقيدە و بيروباوەڕەكانی ئاسمانيدا، نەك وەك زانايانی (الأديان المقارنة) ئەڵێن كەلە يەكەم جاردا ئەو بۆچوون و بڕوايە نەبووە و لە پاشان هات و تێكەڵی بوو، بەڵێ لە عەقيدە و بۆچوونی بت پەرستيدا لە يەكەم جاردا نەبوو بەڵكو لەپاشدا هات، ئينجا بەڕوونی بيرو باوەڕەكەی خۆی باس ئەكات و ڕای ئەگەيەنێ،**

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ﴾ شوێنی ئایینی باوكو باپیری خۆم كەوتم كە ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقوبە، ﴿مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ﴾ نەبووەو نەگونجاوە هیچ كاتو هەرگیز هیچ شتێ بكەین بە هاوبەش بۆ خوا، ﴿ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ﴾ ئەم هاوبەش ڕەوا نەدانو پەرستنی خوا بە تەنیا لە فەزڵو چاكەی خواوە بووە، واتە ئایینی خوا پەرستی بەبێ هیچ هاوبەشێك ئایینی ئێمەیە، ڕێنموونی كردن بۆ ئەو ئایینە پاكە، چاكەو بەهرەیەكە لەرلایەن خواوە بۆ ئەو كەسانەی كە ئەو ڕێگە ڕاستە ئەدەنەبەر، ئەوەش شتێكە دەست ئەدات بۆ هەر كەسێك كە بیەوێو ڕووی تێبكات، چونكە لە سروشتیاندا ئەو باوەڕە پاكە هەیە، ئەم بوونەوەرەی كە تێیدا ئەژین بەڵگەو شایەتە لەسەری، لەپەیامی پێغەمبەرانیشدا ڕوونكراوەتەوە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵكی سوپاس ناكەنو چاولەبەری ئەو بەهرەیە نین كە خوا ڕێنموونی كردوون بۆیو ئەو ڕێگە ڕاستە نادەنەبەر، بەو جۆرە نەرمو ناسكو سوكو ئاسانە یوسف (علیه السلام) ڕێنموونی كردنو دەستكاری دڵی ئەو دوو هاوڕێیەی خۆی كرد، ئینجا زیاتر ئەچێتە ناو دڵیانەوەو بە ڕوونی بیروباوەڕەكەی خۆی دەرئەخاتو بێنرخیو پڕو پووچی

بیروباوەڕەکەی ئەوانی ئاشکرا کرد. فەرمووی: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ﴾ ئەی دوو هاوڕێکەی بەندی بەندیخانەم ﴿ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ ئایا چەند خواو پەرستراوێکی جیا جیاو بەش بەش کە ئێوە بڕیاری ئەدەن باشە، یان خوایەك کە ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یەو تاكو تەنیایی زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا؟ ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ﴾ بێجگە لە خوا هیچ شتێك ناپەرستن مەگەر چەند ناوێکی ڕووت کە ئێوەو باوكو باپیرتان گێڕاوتان بەناو بە نەفامیو بە گومڕایی، بۆ چەند پەرستراوێك کە بەهیچ جۆرێك شیاوو شایستەی پەرستن نین، کەواتە هەر وتەو ناوی ڕووت ئەپەرستن کە خوا هیچ جۆرە نیشانەو بەڵگەیەکی نەهێناوەتە خوارەوە لەسەر ئەو ناو بردنو ناونانە، ئیتر ناوبراوەکان ببن وەك زۆربەی بت پەرستان دارو بەردو خۆرو مانگو فریشتەو شتی تر ئەپەرستن کە هەن، یان پەرستراوەکان نەبنو بە خەیاڵ بڕیار بدرێن وەك هێندێ بت پەرستانی لەسەرە کە ناو ئەبرێن بە (المشبهة)، هەر شتێکیش خوا بڕیاری لەسەر نەدابێ نابێ بڕیاری لەسەر بدرێ،

إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾

چونكه: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ بڕیار نی یه بۆ خوا نەبێ و بڕیار هەر بۆ ئەوە، بڕیاری ئەویش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ فەرمانیداوە بە هەمووان کە هیچ شتێك نەپەرستن بێجگە لە خواو هەر ئەو بپەرستن بە تاك و تەنیا ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ هەر ئەو پەرستنی خوا بە تەنیا ئایینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕاوە کە ڕابەرو نیشانەی تەواوی لەسەرە ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن کە کارە کە بەو جۆرەیەو ئەو شتە ڕاستە نازانن، یان زۆرە نەزانن و زانینیان نییە، بەهۆی ئەوەوە چەند ناوێك ئەپەرستن کەلە خۆیانەوە دایان هێناوەو نەکەوتوونەتە شوێنی شتێ کە ژیریی داخوازە بۆی و لە ئایینەکانی خوایشدا بەو جۆرە هاتووە، سەرچاوەی ئەو لادانە ئەوەیە هەر شتێ کرابێ بەباوو دەقی پێوە گیرابێ، هەر شتێ کەبینرێ و هەستی پێبکرێ هەر دڵیان بەوە بەستووە، زۆربەی سروشتی خەڵکی بەو جۆرە هاتووە جا بەهۆی ئەوەوە هێندێ وێنە بۆ خوا دائەنێن و هێندێ لەش و قەبارەی بۆ ڕەوا ئەدەن و هێندێ شتە گرنگە بوونەوەریەکان لەخۆرولەانگ ولەئەستێرەکان ئەناسێ، هەروەها ئەو هەموو هەڵەو نەفامی و نەزانینانەی تر.

بەڕاستی یوسف (علیه السلام) بەو چەند وتە کورتانە هەموو نیشانەو دروشمەکانی ئەو ئایینە پیرۆزەی نەخشە کێشا، هەموو پێکهێنەرو ڕاگیر کەری ئەو بیروباوەڕو عەقیدە پاکەی دیارییکرد. هەرچۆنێ هەموو پایە بنەڕەتەکانی هاوبەش ڕەوادان و نەفامی و سەرکێشی هێنایە لەرزە، ئینجا بە ئەو پەڕی لێزانینییەوە بیروباوەڕە پاکەکەی خۆی چەسپاند لە دڵی هاوڕێکانیدا، بەم ڕەنگە لە یەکەم جارەوە خۆی خۆشەویست ئەکات لای ئەو دووانەی کە داوای خەو پەرژینیان لێکرد، بەناو بردنیان بە هاوڕێی خۆی لە بەندیخانەدا، لەوێوە بانگی ئەکرد بۆ بیروباوەڕەکەی خۆی، بەڵکو بەو پرسیارەی کردی سروشت و ژیریی دائەچڵەکێنێ و وریایان ئەکاتەوە هەروەکو باسکرا: ﴿ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ﴾. ئینجا هەنگاوێکی تری نا لەبێنرخ کردنی بیروباوەڕی بت پەرستی و نەفامێتی کاتێ فەرمووی پێیان: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ﴾ ئینجا بە تەواوی کارەکەی ئاشکرا کرد بەوەی بە ڕوونی باسی ئەوەی کردو دیارییکرد، ئەوەی کە شیاوو شایستەی پەرستن و گوێڕایەڵی یە،

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾

---

لەپاش ئەوە هەتا سەر پرسیارو خەوەکەی ئەوان و خەو پەرژینی کرد بەم جۆرەی کە ئەفەرمویٚ: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ﴾ ئەی دوو هاوڕێکەی بەندیخانەم ﴿أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ﴾ ئەوەتان کە گوتی لە خەومدا ترێم ئەگوشی بۆ ئەوەی ببێ بە ئارەق، ئەوە ئارەق دەرخواردی ئاغا و گەورەکەی ئەدات، واتە بەرەڵا ئەکرێ و ئەچێتەوە سەر کاری خۆی و وەك لەوەو بەر ئارەق تێکەرو دەرخوارد دەری پادشا. ﴿وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ﴾ ئەوی تر ئەکوژرێ و هەڵئەواسرێ پەلەور لە سەرەکەی ئەخوات. یوسف (علیه السلام) نەکرد کام خاوەن موژدەیەو کام سیا چارەیە، بەڵام دڵنیایی کرد لەسەر کارەکە بە پێی ئەو زانینەی کە خوا پێی بەخشیبوو، ئەگێڕنەوە کە ئەو هەواڵە سەختەیان بیست پەشیمان بوونەوەو گوتیان: درۆمان کرد، بە هەر حاڵ فەرمووی: ﴿قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ﴾ بڕیار دراو براوەرتەوە ئەو کارەی کە ئێوە پرسی تێدا ئەکەن و داوای خەو پەرژینتانکردو ئەیکەن، کارەکە هەر بەو جۆرە ئەبێ کە خوا بڕیاری داوە، یوسفی پاکی بەند کراو کە پادشا فەرمانیدا بە بەند کردنی بە قسەی فیتنەی ناپاك، بەبێ لێکۆڵینەوە یوسفی پاك پێی خۆش بوو کە هەواڵ و دەنگو باسی ڕاستەقینەی بگات بە پادشا، بەهۆی ئەوەوە بکۆڵێتەوە لە ڕووداوو بەسەرهاتەکەی، لەبەر ئەوە: ﴿لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا﴾ بەو کەسەی لەو دوو بەند کراوە کە یوسف لای وابوو ڕزگارەو بەرەڵا ئەکرێ و ئەچێتەوە سەر کارەکەی خۆی لای پادشا، پێی فەرمووی: ﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ﴾ باسی من بکە لای گەورەو کاربەدەستەکەت ـ واتە پادشا ـ باسی بارو حاڵ و ستەم لێکراوی من بکە، بەڵام خوا نەیویست ئەو باسە بکات، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرمویٚ: ﴿فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ﴾ شەیتان لەبیری بردەوە باسەکە لای پادشا بکات، ﴿فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە یوسف لە بەندیخانەدا ماوەی چەند ساڵێك مایەوە کە هەڵئەگرێ بۆزیاد لە سێ ساڵ تا نۆ ساڵ ـ

زۆر لە زانایان لەسەر ئەوەن ﷺ حەوت ساڵ مایەوە، خوای پەروەردگار ویستی کە یوسف فێر بکات لە هەموو کاتێکدا پشت هەر بە خوا ببەستێ و گوێی نەبێ لە هیچکەس و هیچ هۆیەکی تر، لەبەر ئەوە بەجێهێنانی پێویست و مەبەستەکەی نەخستە دەستی نە پادشا و نە کەسێك کە پەیوەندی بە پادشاوە هەبێت، ئەوەش بەشێك بوو لەو بەهرەو هەڵبژاردنەی ﷺ پێی بەخشی، بەندە هەڵبژێراوەکانی خوا ئەبێ خۆیان تایبەتی و یەك بار بکەن بۆ خوا، جڵەوی هەموو کاروباریان بدەنە دەستی قودرەتی ئەو، گواستنەوەی هەنگاوەکانیان واز لێ بێنن بۆ ئەو، ئەگەر لەیەکەم جارەوە ئەوەیان پێ نەکرا خوا میهرەبانیان لەگەڵ ئەکات بەناچاریی ئەوەیان پێ ئەکات تا هەر ئەو بناسن و هەموو کاروباریان بدەنە دەستی ئەوو سۆزو خۆشی و ڕەزامەندیان هەر بەبڕیارو فەرمانی ئەو بێت.

ئەم ئایەتەبەچەندجۆرێکی تریش تەفسیرکراوەتەوە ئەوانەش هەڵئەگرن، بەڵام ئەوەی کە گوتمان بەهێزەوڕای زۆربەشی لەسەرە،لەسەرئەم تەفسیرەی کەهەڵم بژارد دوو پرسیار هەیە:

١- وتەی ﴿ظَنَّ﴾ کە بۆ گومان و دوو دڵییە چۆن بۆ یوسف بەکار هێنراوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین ئەگەر یوسف ئەو خەو پەرژینەی لەسەر ڕای خۆی بووبێ بەپێی بەڵگەو نیشانەیەك ﷺ بۆی دەرکەوتبێ ئەوا شتێکی یەقینی و قەتعی نەبووەو جێگەی گومانەو مافی خۆیەتی بەوتەی ﴿ظَنَّ﴾ بگوترێ، ئەگەر خەو پەرژینەکەی لەلایەن خواوە بۆ هاتبێ بە وەحی و سروش ئەوا مەبەست بەو وتەیە یەقین و بڕوای تەواوە، وەك لە چەند ئایەتێکدا بەو شێوەیە بەکار هێنراوە، وەك ئایەتی: ﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ﴾و ﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ﴾.

٢- بێگومان داوای کۆمەك بۆ بەرگری ستەم لە خۆ شتێکی شەرعییە، کەواتە بۆچی بووە بە خاڵ و لەکە بەسەر یوسفەوە؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: پایەو ڕادەی بەرزتر بووە لەوەی وەك خەڵکانی ئاسایی دەست بگرێ بە هۆ و سەبەبەوە، بەڵکو ئەو ئەبوو وەك ئیبراهیمی باپیرە گەورەی هەر پشتی بە خوا ببەستایە، کە ئەگێڕنەوە لە کاتێکدا ویستیان فڕێی دەنە ناو ئاگرەکەو جوبرەئیل هات بۆلای و پێی گوت پێویستیەکت هەیە؟ ئەویش فەرمووی: پێویستی بە تۆ: نەخێر!

وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ

---

ئینجا ئەم باسە لێرەدا بەجێئەهێڵێ و سەرنجمان ڕائەکێشێ بۆلای پادشا کە خەوێکی دیتوەو داوای خەو پەرژێنی ئەکات لە کۆڕو دەستەو بەستەکەی، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ﴾ پادشا ووتی: ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ﴾ لەخەودا حەوت ڕەشەوڵاخی قەڵەوم بینی ﴿يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ﴾ کە خواردبوونی و ئەیخواردن حەوتی زۆر لەڕو لاواز ﴿وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ﴾ حەوت گوڵی دانەوێڵەم بینی کە سەوز بوون و دانەکانیان ڕەق نەبوو بوو، وە حەوت گوڵی تری وشك کە زاڵبوو بوون بەسەر گوڵە سەوزەکاندا تا دایان پۆشین و ونیان کردن ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ﴾ ئەی کۆمەڵی پیاو ماقوڵان هەواڵم بدەنێ لەسەرنجام و دوا ڕۆژی ئەم خەوەم، واتە خەوپەرژێنی ئەم خەوەم بکەن ئەگەر ئێوە خەو پەرژێنی خەو ئەکەن، ئەوانیش لەبەر نەزانینی خەو پەرژێنەکەی یان لەبەرئەوەی پێیان ناخۆش بوو بەدۆ خراپ بدەن لە ڕووی پادشا، ئەوەش بەپێی باوی دەست و پێی پیاوە گەورەکان کە ئەیانەوێ شتێ بدەن لە ڕووی گەورەکانیان کە دڵخۆشیان بکات، لەبەرئەوە: ﴿قَالُوٓا۟﴾ گوتیان بە پادشا: ﴿أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ﴾ ئەمە خەوی تێکەڵ و پێکەڵ و پڕو پووچە و خەوێك نییە کە خەو پەرژین هەڵبگرێ: ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ﴾ ئێمە زانا نین بە خەو پەرژێنی خەوی پڕو پووچ و تێکەڵ و پێکەڵ، لەوێدا ئەوەی کە هاوڕێی یوسف بوو لە بەندیخانەکەدا خەوی بینی و بە گوێرەی خەو پەرژێنەکەی یوسف ڕزگار بوو، ئەو هاوڕێیە یوسفی بیر کەوتەوە و زانی کە یوسف خەو پەرژێنی ئەم خەوە ئەزانێ و بەهۆی ئەوەوە هەواڵ و خەو پەرژێنەکەیان پێ ڕائەگەیەنێ وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ﴾ ئەو کەسەی کەڕزگار بوو لەو دووانەی کەلە بەندیخانەکەدا بوون و بیری کەوتەوە لە پاش چەند ساڵێك،

أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ

---

ئەو كەسە گوتی: ﴿أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ﴾ من هەواڵتان ئەدەمێ بە خەو پەرژێن و سەرەنجامی ئەو خەوە، کەواتە من بنێرن بۆلای و ئەو کەسەی کە زانایە بەوە، واتە بۆلای یوسف، ئەوانیش ناردیان و چوو بۆ لای یوسف و پێی گوت: ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ﴾ یوسف ئەی زۆر ڕاستگۆ خەوپەرژێنمان بۆ بکەو هەواڵمان پێبدە لە بارەی دیتنی حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەو کە حەوت ڕەشەوڵاخی لەڕو لاوازبیان خوات، لەبارەی دیتنی حەوت گوڵی دانەوێڵەکە دانەکەی سەوزبێت و پێنەگەیشتبێت و حەوت گوڵی تری وشك گوڵەکانی داپۆشیبێ تا ڕادەیەك ونی کردبن، واتە سەرەنجام و خەوپەرژێنی ئەم خەوەمان بۆ بکە، ﴿لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ﴾ بەڵکو بگەڕێمەوە بۆلای خەڵکی و هەواڵیان پێبدەم بەوەی تۆ باسی ئەکەیت و بڕیاری ئەدەیت، ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ بەڵکو ئەوان ئەوە بزانن و بە پێی ئەوە ڕەفتار بکەن، یان زانا و ئاگادار ببن بە ڕادەو پلەی بەرزیی بۆ لەگەڵ ئەو بارو حاڵەی کە تێیدا ئەژیت و بەوە ڕزگار ببی، وتەکەی پادشای لە یەکەم جارەوە بە تەواوی باسکرد، چونکە داوای خەو پەرژێنی ئەکات، کەواتە ئەبێ بەڕێکی خەوەکەی بگێڕێتەوە، ئینجا ئایەتەکە جارێکی تر ئەیگێڕێتەوە یەکەم بۆ ئەوەی ئەو وردییە بەکار بێنێ، بۆ ئەوەی خەو پەرژێنەکەی بێنێ بەدوای باسی خەوەکەداو بیلکێنێ پێیەوە، یوسفی زۆر ڕاست لە وەڵامەکەیدا تەنها خەوە پەرژێنەکەی باس نەکرد بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا پەندو ئامۆژگاری کرد بە بەرەنگاری و چارەسەریش، وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ یوسف وتی: ﴿تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا﴾ کشتوکاڵ ئەکەن حەوت ساڵ بەسەریەکداو بە پێی باوی هەمیشەیی لەوە وپێشتان، ﴿فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ﴾ ئینجا ئەوەی کە دروێنەتان کرد لێی گەڕێن و بیهێڵنەوە لە گوڵەکەیداو بۆی ئەوەی سۆس و کرم نەیخوات،

إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِي بِهِۦ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ

---

**﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ﴾ مەگەر كەمێك لەوەی كە ئەیخۆن، دیارە بۆ تۆو بەرزیش هەر ئەبێ بیهێڵنەوەو باسكردنی ناوێ بە نیشانەی ئەوەی كە فەرمووی: كشتوكاڵ ئەكەن ... هتد. ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ﴾ ئینجا لەپاش ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵی تر دێت كە سەختو قڕو قاتییەو هەرچیتان پێش خستووە بۆیانو زەخیرەتان كردووە ئەم حەوت ساڵە سەختە ئەیخۆن، واتە لەم حەوت ساڵە قاتیو قڕییەدا هەمووی ئەخۆن ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ﴾ مەگەر كەمێك لەوەی كە ئەیپارێزنو دای ئەشارن بۆ بەزرو تۆو، ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ ئینجا لەپاش ئەو حەوت ساڵە سەختە ساڵێك دێت لەو ساڵەدا خەڵكی پەنا ئەدرێنو ڕزگار ئەكرێن، یان لەو ساڵەدا باران ئەبارێ بۆیان، لەو ساڵەدا ئەگوشن ئەوەی كە ئەگوشرێو ئاوی ئەگیرێ وەك ترێو زەیتونو كونجی، واتە لە پاش ئەو حەوت ساڵە قاتیو قڕییە ساڵی هەرزانی دێت، ئیتر یوسف (علیه السلام) بەوەحیو سروش ئەوەی زانیبێ یان بەوەی لەپاش گرانیو قاتو قڕی هەرزانی دێت یان بەوەی كە باوی خوا وایە لەپاش تەنگایە خۆشی ئەهێنێ.**

**بێگومان ئەو كەسەی كە هات بۆ داوای خەو پەرژینەكە ئەگەڕێتەوە بۆلای پادشا بەو هەواڵو خەو پەرژینە گرنگەوە، باسی پاكیو ڕووداوو داستانەكەی ئەكات بەهۆی ئەوەوە پادشا فەرمان ئەدات بە ڕزگار كردنی، بەڵام ئایەتەكە باسی ئەوانە ناكات، چونكە لەئایەتەكانەوە ئەوانە وەرئەگیرێن، ئەوەی كە گرنگ بێت سەرەنجامەكەیە كە باسی ئەكاتو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ﴾ پادشا گوتی: ﴿ٱئْتُونِي بِهِۦ﴾ ئەو پیاوەم بۆ بێنن ﴿فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ﴾ كاتێ فروستادەكەی پادشا هات بۆ لای یوسفو پێی گوت: پادشا داوات ئەكات كە بچێ بۆلای لەوێدا ئەبینین یوسف ـ كە ئەو ماوە دوورو درێژە بەند كراوە ـ پەلە ناكات بۆ دەرچوون تا مەسەلەكەی ڕوون ببێتەوەو هەقو ناهەق دەركەوێ،**

قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ

---

لەبەرئەوە ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ بگەڕێرەوە بۆلای گەورەو خاوەنەکەت ﴿فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ﴾ پرسیاری لێ بکە ئایا بارو حاڵی ئەو ئافرەتانە چی بوو کە دەستەکانی خۆیانیان بڕی؟ چۆن بوو ئەو دەست بڕینەو لەبەرچی بڕی یان؟؟ ﴿إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ﴾ بێگومان خوای من زاناو ئاگایە بە پیلانی ئەوانە، واتە پیلانەکەیان زۆر گەورەبوو هەر خوا ئەزانێ بەڕادەی، یان ئەو زانایەو ئەزانێ من پاکم‌و ئەوانە فێڵ‌و پیلانیان لێکردم، یوسف باسی ژنەکەی عەزیزی نەکرد، لەگەڵ ئەوەدا ئەو هۆی ئەو پیلانە بوو، لەبەر شەرم‌و پیاوەتی خۆی، وا دەرئەکەوێ ئەو باس نەکردنە بوو بە هۆی ڕاست گوتنی لەخۆی‌و پاکی یوسفی ڕوون کردەوە، فروستادەکە گەڕایەوە بۆ لای پادشاو قسەکەی یوسفی پێ ڕاگەیاند، ئەویش ئافرەتەکانی ئامادە کردو ﴿قَالَ﴾ پێی گوتن: ﴿مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ﴾ ئەو کارە گەورەو گرنگەی ئێوە کە پرسیارتان لێ بکرێ چی بوو ئەو کاتەی کە کەوتنە خوارو ژووری یوسف‌و ویستتان بیخەڵەتێنن‌و کاری خراپی پێبکەن، ئیتر لەگەڵ ژنەکەی وەزیر یان لەگەڵ خۆیان؟ ﴿قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ﴾ گوتیان پاکی‌و بێگەردی بۆ خوا، واتە سەر سوڕ ئەمێنێ لەپاکی یوسف‌و پاکی‌و بێگەردی هەربۆ خوای گەورەیە کە پیاوێکی پاکی ئاوای دروستکردووە. ﴿مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ﴾ هیچ گوناهو بەدی‌و خراپەیەکمان لێ نەدیوەو بێ ئاگاین لە هەر خراپەیەك لەیەری بێ. ئینجا لەوێدا ژنەکەی عەزیز هیچی بۆ نەمایەوە بێجگە لەوەی دان بنێ بە پاکی یوسف‌و گوناهی خۆیدا وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ﴾ ژنەکەی عەزیز گوتی: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ﴾ ئێستا هەق ڕوون بوویەوەو دەرکەوت‌و ئاشکرا بوو کە ئەوەش ئەمەیە: ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ من هەوڵم داو کەوتمە پەیجۆری یوسف کە بێ شەرعی پێبکەم، نەك ئەو، وەك لە یەکەم جارەوە لەکەدارم کردو بوهتانم بۆ کرد،

وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾

**﴿وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ به ڕاستی ئەو لە ڕاستانو ڕاست گۆیانە کە منی بە تاوانبار دانا، ﴿ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ زۆربەی زانایان ئەفەرمون: ئەم ئایەتە فەرموودەی یوسفە (علیه السلام)و هێندێ لەسەر ئەوەن کە هەر لە وتەکانی ژنەکەی عەزیزە بەڕەحمەت بێ. لەسەر باری یەکەم: یوسف فەرمووی: (کاتێ چوو بۆ لای پادشا) وەك (عطاء) لە (ئیبنو عەباس)ەوە ڕیوایەت ئەکات، یان کاتێ فەرمووی کە فروستادەکە گەڕایەوە بۆ لایو قسەو باسەکەی پاشاو ئافرەتەکانی گێڕایەوەو دەرکەوت بۆ هەمووان پاکێتی یوسف، لەو کاتەدا یوسف فەرمووی: (ئەو پەلە نەکردنی منەو هەوڵدانم بۆ دەرکەوتنی پاکیم، لەبەرئەوە بوو وەزیرو پادشا بزانن کە من ناپاکیم نەکردووە لە وەزیر لە پەنهانیو پاشملەی ئەو، یان لەپاشدا، چونکە ناپاکی لەوەزیر ناپاکییە لە پادشایش) لەسەر باری دووەم: ژنەکەی وەزیر گوتی: (ئەوا دان نانو ڕاستی گوتنم لە ناپاکی خۆمو پاکی یوسف لەبەر ئەوە بوو وەزیر بزانێو بۆی دەرکەوێ بە تەواوی کە من ناپاکیم نەکردووە لە یوسف لە پەنهانیو پاشملەیدا، وەك کردم، لەکاتی ڕووبەڕوویدا لە یەکەم جارەوە لەبەر چاوی وەزیر تاوانبارم کرد) لەسەر ئەم بارە ئەبێ ئەو ئافرەتە بەهۆی پاکیو خوو ڕەوشت شیرینی یوسفەوە بڕوای هێنابێ، ئەگەر ئەم فەرموودەیەش هینی ئەو بێت بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر بڕواکەی ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ تا بزانێ کە خوا پیلانی ناپاکان ناگەیەنێ بە پایان، بەڵکو بە تاڵی ئەکاتەوەو ژێری ئەخاتو خاوەنەکەی بێئابڕوو ئەکات، ئەگەر فەرموودەی یوسفیش بێت ئەوا جێی خۆیەتی قسەی ئەوو وێنەی ئەو ئەبێ هەر وابێ، ئەو کاتە پلاریشی تێدایە بۆ ئەوانەی ناپاکیان لەگەڵ خۆیدا کرد.**

**ڕۆژی یەك شەممە ١٧ محرم ١٤١٢ بە یارمەتی خوا لێ بوومەوە لە تەفسیری جزئی (١٢)و دەست ئەکەم بە جزئی (١٣) کە دەست پێئەکات لەئایەتی (٥٣)ی سورەتی یوسفەوە تا یەکەم سورەتی(حجر) داواکارم لە خوای گەورە ئەم تەفسیرەم لێ وەرگرێ.**